ناوی کتێب: ئەمڕۆ ساتمەم کرد، بەسەر دوێنێدا کەوتم

نووسەر: موحسین ئاوارە

بابەت: بیرەوەری

تایپ: نووسەر

پێداچوونەوەو هەڵەگری: نووسەر

دایزاینی بەرگ و ناوەڕۆک: سەید ئارام

تیراژ: (١٠٠٠)دانە

چاپی یەکەم ٢٠٢٠ز

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٦٠٦)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

# دەسپێك

- ئەو بیرەوەری و یادگار و باسانەی لەو کتێبەدا هاتووە کە پێشتر بە دەیان ئەلقەی لە ڕۆژنامەی (بەدرخان) وڕۆژنامەی (باس)دا بڵاوم کردۆتەوە بۆ خوێندنەوەی و تا چەندیش چێژی لێ وەردەگیرێ ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە ، لە هەمان کاتدا بۆئەوەی هەر سەرنج و هەڵەیەك و زانیاریەکی زیاتر هەبێت کە من درکم پێ نەکردبێ بە سەرما تێپەڕیوە و بگەڕێمەوە سەری و جوانتری کەم، تا زیاتر سوود بە خوێنەر و ناوەڕۆکی ئەو کتێبە بگەێنێ کاتێ بە چاپکراوی دەبێتە موڵکی خوێنەران .

لەم کتێبەدا سێ بابەتی سەرەکی لە خۆ دەگرێ، یەکەم بابەت، باس لە خۆم و خانەوادەکەم و کەس و کارە نزیکەکانم و سەربردەی ژیانم دەکەم هەر لە ڕۆژی فام کردنمەوە لە تەمەنی (١٩٥٦) ساڵییەوە .

دووەم بابەت، سەربردەکانی تایبەت بە خودی خۆم و ئەو شیعرانەی بە نموونە دەهێنمەوە کە دەربڕە لەمەڕ ڕووداوەکان و بیرەوەرییەکان .

سێیەم، زیاتر لە گۆشەنیگای ئەو گەڕەکەوە دەست پێدەکەم، گەڕەکی عارەبان کە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری و گەنجێتیی و هەتا کاتی هاوسەرگیری کردنم و دوو منداڵیشم کەوتنە سەر دنیا هەر لەو گەڕەکە بوومە .. لەو گەڕەکەوە دواتر هەنگاو دەنێم بۆ نێو شارە دێرینە ئازیزەکەم هەولێر .

ئەگەر ئەو نووسینانەی سەرەوەم ئەو وتە بە نرخەی شاعیری گەورەی فەرەنسی (ئاراگۆن) لە خۆ بگرێت کاتێ لە کتێبی (ئاراگۆن لە رووبەڕووبوونەوەی سەردەمدا)دا کە نووسەرەکەی (فوئاد ئەبو منصور)ە لە نێوەندی گفتوگۆکردنا لە چاوپێکەوتنێکیدا کاتێ پرسیاری لێ کراوە (ئەرێ ئەوە بوو بەچی؟! ناونیشانی هەموو کتێب و شیعرەکانت بە ناوی - ئێلیزا ، چاوانی ئێلیزا، مەجنون ئێلیزا ، ئێلیزا .. ئێلیزا ..هتد ؟!).

لە وەڵامدا ئاراگۆن دەڵێت (ئەگەر ئێلیزایەکم خۆش نەوێت ، چۆن دەتوانم زۆر ئێلیزای ترم خۆش بووێ ؟ ئەگەر ماڵەکەی خۆم کە نیشتمانێکی بچکۆلانەی خۆمە، خۆشم نەوێ، چۆن دەتوانم، دراوسێیەکانم .. گەڕەك و دواتر شارەکەم و ئینجا وڵاتم و هەموو دنیام خۆش بووێ ؟).

جا منیش وام دەست پێکردووە وەك ئەوەی (ئاراگۆن)ی شاعیر دەفەرمووێ.

هیوادارم ماندوو بوونەکەم، چێژ و سوود و چەند زانیاریەکی دێرین بە نەوەی نوێ و هاوسەردەمەکانم بگەێنێ

**موحسین ئاوارە**

# ڕۆژانێ بوو

(١)

دەنکیلە گەوهەری بیرەوەرییەکانم بە وردو درشتییەوە لە خانە جیا جیاکانی مێشکمدا لە ژێر خۆڵەمێشێکی نیشتووی گەرم، هەر کاتێ بمەوێ هەڵگێڕو وەرگێڕی بکەم، بە فووی ئاهێکی گەرم یان هەناسەیەکی سارد بە هەواوەی خەم، رابردووە تاڵو شیرینەکان، باقو بریقی گەوهەرەکان وەدیار دەخاتو تیشکەکان دەکەونەوە جولە،

ئەو کاتەی فامم کردووەو هەڵمەقۆی پرسیارو چاو گێڕانو دەمم گەرم بووە، لەو ساتەوە وێنەکانی ژیان بە هەموو شێوەکانییەوە بە ڕەنگو بۆنو تامو بینینو هەستەوە زیندوون لەبەر چاومداو بزر نەبوونە.

لە دەفتەر نفووسم کە تەسکەریان پێ دەگوت کاتی خۆی بە پیتی عەرەبی ناوم نوسراوە (محسن رشید احمد) ئێستا بە نازناوێك دەناسرێمەوە بە ناوی (موحسین ئاوارە) دایکم ناوی (فاتمە اسماعیل عمر) ە لەو تەسکەرە نفوسە کۆنەمدا ڕۆژی لە دایکبوونم نوسراوە ١٩٥١/٧/١، مەرج نییە ئەم بەروارەش راستو دروست بێت، رەنگە جیاوازییەکەی بە چەند ڕۆژو چەند مانگێك بێت چونکە زۆربەی هەرە زۆری نەوەی سالانی ئێمە لە هەموو عیراقو کوردستانیش لە تۆمارکردنی ١٩٥٧دا رەمەکی ١ /٧و ساڵێکی تەخمینیان بۆ داناوە.

جا من بۆ منداڵەکانم ئەم گرفتەم چارەسەر کردووە بە دروستی سەعاتو ڕۆژو مانگو ساڵم تۆمار کردووە، بۆیە دەتوانن و دەتوانم ساڵانە ئاهەنگی ساڵڕۆژی لە دایکبوونیان ساز بکەم تەنیا بۆ خودی خۆم نەبێ

كە قەت ئەو ئاهەنگەی ساڵڕۆژی لە دایکبوونم نەکردووەو نایکەم چونکە بە ڕاستو دروستی ئەو بەروارە نازانم چ کاتێکە کە هاتوومەتە دنیا.
جا سەربردەی ژیانم ئەڵقە بە ئەلقە دواتر بە دوورو درێژی دەیخەمە روو لەو ڕۆژەوەی بن پێم گەرم بووەو لە دەرکەیماڵەوە هاتوومەتە دەرو لە نێو گەڕەکدا گیرساومەتەوە کە لە لای من نەك ئەویٚ ساڵو پێرار پێرارە بەڵکو ئەمڕۆیەو نەك دوێنیٚ.

– دایکم

سەرەتا دەمەویٚ ئەوە بڵێم کە شوێنگەی دایك هێندە پیرۆزو گەورەیە (ناپلیۆن) ڕاستی فەرمووە کە دەڵێت (دایك بە دەستی ڕاستی لانك رادەژەنیٚو بە دەستی چەپیشی جیهان رادەوەشێنیٚ).... دایکم دایکێکی سادەو ساکارو میهرەبانو هێمنو لەسەرەخۆ بوو، هەر چەندە نەخوێندەوار بوو بەڵام زۆر وردو زیرەكو کەمدوو بوو، زیاتر هەستی رادەگرتو رادەما، کەم وا دەبوو لە قسان بە وەڵام بێت تەنیا ئەگەر پەیوەندی بە خۆیەوە هەبووایە بە یەك ڕستەی کورت دەهاتە دەنگ، زۆر خۆ راگرو بە پشوو بوو، خزمەتێکی زۆری میوانانی دەکرد بە تایبەتی ئەوانەی لە گوندو دێهاتەکان دەهاتنە لامان واتە خزمەکانمان، ماڵی ئێمەش لە نێو چەقی شار بوو لە هەولێر گەڕەکی عارەبان، بە شایەدی دۆستو برادەرو خزمانمان کە میوانی ئێمە بوونە دەستاوی زۆر خۆش بووەو خواردنی هەمە چەشنەی زۆر خۆشی ساز کردووە
منو براکانم قەرزاری ئەو دایکەمانین کە پێمان پڕ نەکرایەوەو پڕیش ناکرێتەوە، بە تایبەتی ئەو دایکە بوو کە کوڕو هەتا کچەکانی گۆش کردووە بۆ کوردو کوردستان، ئێمە بە چوار برایان، یەکێکیان سەقەت بوو

خواڵخۆش بوو (جەبار)لە تەمەنی چڵ ساڵیدا کۆچی ئەبەدی کرد، پاشان برا گەورەکەم خوالیخۆش بوو (جەلال) رۆحی شاد بێت، ئێستایش، من‌و برایەکم (تەحسین) کە هەشت ساڵ لە من بچووکترە بە ژیانەوەین لەگەڵ سێ خوشکم کە شوویان کردووە خاوەن ماڵ‌و منداڵن بە ژیانەوەن، ئەوەی شایانی باسە هەر سێ برا، دەممان لە سیاسەت داوە‌و گیرۆدەی ئاریشە‌و سزادانی رژێمەکان‌و دەربەدەری‌و دابڕان لە وەزیفە‌و چوونە ریزی شۆڕش‌و بوونمان بە پێشمەرگە‌و گرفت‌و ئاستەنگێکی زۆرمان بۆ خاوخێزانەکەمان جێهێشتووە تا بە خەم‌و راڕایی‌و ترس‌و دەست لەسەر دڵ‌و جێگۆرکێ‌و ژیانێکی سەخت‌و ناهەموار بژین، لەوانە هەموویان بە باوك‌و دایك‌و خوشکەکانم باجی خۆیان داوە، بەڵام زیاتر قەرزاری ئەو دایکەمانین تا کۆچی کردووە لە ساڵی ١٩٩٧ دا، هەر لە رۆژی بەرپا بوونی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ وە تا ئەو رۆژەی کۆچی ئەبەدی کردووە، دۆش داماو‌و چاو بە فرمیسك‌و دڵ پڕ لە پەنگری گەش بووە بە یادی چاوپێکەوتی کوڕەکانی، هەر چەندە ئەو رۆحە بەرزە کوردایەتییەی تیا بوو‌و خۆ راگریش بوو، لە دوای کۆچکردنی قەسیدەیەکی خەم ئامێزی پێ دارشتم، کە ئارام بەخشینێکی زۆر کەمە وەك فەرامۆشیەك بە خۆمم بەخشیوە لە ئاست ئەو ئازار‌و شەونخوونی‌و خەبات‌و خۆڕاگرییەی دایکەم کە بە شیری حەلاڵ بە خیوی کردین، رۆژێك لە رۆژان لەو تێکۆشان‌و خەباتی سیاسی‌و کوردایەتییەی کە بەردەوام بووین ساردی نەکردینەوە تا لێی دەستبەردار بین، جا لەو قەسیدەیەی بە ناوی (دایکم کۆچی بە سوێ) لە ژمارە (١٥) ی ساڵی ٢٠٠٠ لە نووسەری نوێ بڵاوم کردۆتەوە هەروا لە دیوانی چاپکراومدا (گوڵنان) دا هەیە، لە چەند دێڕێکی دا گلەییم تیا نیشان داوە چونکە ئەو دایکەم سێ پارچە ئەرزی

گەورەی هەبوو بۆی فرۆشتین کە دەچووینە ریزی شۆڕش وپێشمەرگایەتی یان دابڕان لە وەزیفەو خۆ حەشاردان لێرەو لەوێ تا بیکات بە مەسرەف و ژیانێکی سەربەرزانە، کەچی ئاوڕێکی لێ نەدرایەوە بە پارچە زەوێکیش وەك ئەوەی خۆ فرۆش و هەڵخواستەکان تیایدا سوودمەند بوون، ئەوەش کۆپلەیەکە لەو قەسیدەیەی (دایکم کۆچی بە سویێ)

ئەی دایە، نەمزانی ئەو رێگایە سەختەی من دەیبڕم
لە تەمەنی تۆ کورت دەکاتەوە
نەمزانی ئەو خۆشییەی لە دەمی تۆ دەیگرمەوە
دەڕژێتە کۆشی هەڵپەرستان
هەزار جار مەعزەرەت!!....هتد

هەڵبەتە لە ئەڵقەکانی داهاتوودا باسی زیاتری تێدەکەوێت.

- باوکم

ناوی (رەشید ئەحمەد حەمە شریف حاجی مەحموود) دایك و باوکی هەر لەسیێیەکانەوە کە لە گوندی باشتەپەی دەشتی هەولێر بوونەو هاتوونەتە شارو لە گەڕەکی سەعدوناوە نیشتەجێ بوونەو دواتر لە گەڕەکی عارەبان خانوویان کڕیوەو ماونەتەوە، دایکیشی هی گوندی جاستان بووە کە سەر بە ناحیەی دیبەگەیە، لە هۆزی سیان بوونە، کە دەڵێن (سیان) خۆی (سێیان)ە لەبەرئەوەی ئەم هۆزە سێ براو تیرە بوونە بەڵام هەر بە سیان ناوی دەهێندرێت، باوکم کەم وا دەبوو لە مەڕ ژیانی

خۆی بدویّ، تەنیا ئەگەر میّوانیّکمان هەبووایە جار جار بە سەرهاتو رابردووی خۆی دەگیّڕایەوە زۆر جارانیش لە دەمی دایکمەوە گویّم لیّ دەبوو باسی کەسایەتی باوکمی بۆ دەکرد، هەتا کۆچی ئەبەدی کردووە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ خزمانی گوندو دیّهاتەکانی هۆزەکەی بەردەوام بووە، من کە فامم کردووە بەردەوام خزمانی سیانەتی بە میّوانی لە ماڵی خۆمانمان دیومەو ئیّستایش ئەو ڕیّچکەیەی باوکم بەرنەداوە لە هەمان ئەو پەیوەندیانەدا، باوکم نیشانچیو ئەسپسواریّکی دیارو کارامە بووە، تا شەشی سەرەتایی خویّندوویەتی دواتر لەبەر بارودۆخیّکی خیزانی نەیتوانیوە بەردەوام بیّت، دوو ژنی هیّناوە لە یەکەمیاندا دوو منداڵی لیّ بووە بە ناوی (جەبار)و (جەلال) جا ئەو هاوسەرەی لەسەر منداڵی سیّەمدا کە بووەتە هۆی مردنی و کۆچی کردووە رۆحی شاد بیّت، جا ئەو هاوسەرەیشی لە بنەماڵەیەکی هەولیّریان بووە واتە شارستان کە وەك نەریتیّکی بە جیّماوی تورك لەو شارەدا شارستانییەکان بە تورکی قسەیان دەکرد، دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ کچیّکی خزمی خۆی کردووە کە دوو کوڕو سیّ کچی تری هیّناوەتە دنیاوە کە یەکیّکیان لەو کوڕانە منم (موحسین)و دواتر (تەحسین)و خوشکەکانیشم (خالیدەو فایدەو رافیدە) هەر پیّنجمان بە ژیانەوەین تا نووسینی ئەم بیرەوەرییە خاوەن ماڵو منداڵو خیّزانو نەوەین.

تا باوکم مابوو زۆرم خۆشدەویستو خدووی ئەو بووم، لە گەڕانو سەفەرو گوندو شاران منی لەگەڵ خویدا دەبرد، باوکم کوردیّکی زۆر خاویّن بوو، گیانی کوردایەتی زۆر بە هیّز بوو، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوولەوە ١٩٦١ تا لە ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوایی کرد، ئەوەندی من بینیوومە بەردەوام هەموو شەوان دەبووایە گویّ لە رادیوی دەنگی

کوردستانی عیراق بگریّ، هەواڵی هەر سەرکەوتنێکی پێشمەرگەی گویّ لیّ دەبوو دەگەشایەوەو جحێڵ دەبوّوەو لە خۆشیان دەچووە دەرەوە شیرینی و میوەی خۆش خۆشی بۆ دەهێنایـن، بە پێچەوانەکیشی ئەو رۆژە کەسمان نەدەوێراین قسەی لە گەڵدا بکەین، هەر ئەو پەرۆشییەی باوکم بوو بۆ دۆزی کورد، لە پێشدا برا گەورەکەم (جەلال) پەیوەندی لەگەڵ پارتی هەبووو رۆڵی مەسئولیەتی گرتبووە ئەستۆ چەندین کۆبوونەوەو دانشتن هەتا لێپرسراوانی شار لە ماڵی ئێمە دەکرا بە ئاگاداری باوکم پێی ناخۆش نەبوو، لە ساڵی ١٩٦٥ دا ئاسایشی ئەوسا کە بە خەفیە ناودەبردرا هاتن و بە سەر ماڵی ئێمەیان داداو زۆریان پشکنی هیچیان نەدۆزییەوە، بۆ ماوەی چەند مانگێك براکەم (جەلال) خۆی شاردەوە، دواتر مەسەلەکە هەر گومان کردن بووو دراوسێکانمان ماڵی سەیدەکانی نعێمی و بە رەگەز عەرەب بوون قسەی باشیان بۆ کردبووین، وازیان لیّ هێناین بەڵام لە ساڵی ١٩٦٧ دا ئەو برایەم (جەلال) کە فەرمانبەر بوو لە دادگای هەولێر سزایان دا بە دوورخستنەوەی لە شار بۆ قەزای رواندوز..
خۆ منیش هەر لە ١٩٦٥ وە، دەستم تیکەڵ کردو بوو و ببووم بە ئەندامی یەکێتی قوتابانی کوردستان بە نهێنی و دواتر ١٩٦٧ بووم بە ئەندامی لێژنەی شار لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و ئەندام لە پارتی دیموکراتی کوردستان تا وای لێهات لە ١٩٦٩ فەرمانی گرتنم هەبوو لەگەڵ ئەو باوکە دڵسۆزەمو براکەی لە خۆم بچووکتر منیان گەیاندە رواندوز لای جەلالی برام، ئەو برایەشم لەویّ رۆڵی لێپرسراوەتی هەبوو، منی رەوانەی ناو شۆڕش و ریزی پێشمەرگەی کوردستان کرد، هەروەها براکەشم (تەحسین) لە هەشتاکان چووە ریزی شۆڕش و بوو بە پێشمەرگەو دواتر لە ئەڵقەکانی داهاتوو بە درێژی چیرۆکی ئەو بابەتانە

دەگێڕمــەوە، ئــەوەی دەمــەوێ لێــرەدا بیڵــێم ئــەوە هــەمووی پاشــخانی کاریگــەری کوردبــوون و کوردایــەتی بــاوکم بــووە کــە ئــەو ڕێگایــەمان گرتبووەبــەرو کــوڕانی ئــەو باوکــە دڵســۆزە بووینــە، دەتــوانم بڵــێم بــاوکم و براگەورەگەم کاریگەریان بە سەرمەوە هەبووە کە خولیای شیعرو گورانی و نووسین بم، بـاوکم ئـەو کاتانـەی کـە نـەخۆش دەکـەوت یـان لـە حاڵـەتێکی تایبــەت و غوربەتێکــدا خــەمێك دەســتی لێ وەردەگــرت، هــەڵی دەکــردە حەیران و لاوکان وەك ئەوەی عیشقێکی نهێنی لە دڵدا هەبێ و بەم لاوك و حەیرانانە دایمرکێنێتەوە، جار جار بێدەنگی رامان و هەڵوەستەیەکی دوور ڕۆیشتنی هەبوو بە هەناسەیەکی قووڵەوە دەگەڕایەوەو دواتر ئاسایی دەبۆوە. بە هێمی و هێوری بیری دەکردەوە، زۆر دنیادیدەو ئازاو جەربەزە بوو، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بە هێز بوو، نیوەڕۆیان زۆر حەزی لێبوو بە تەنیا لە ماڵەوە نان نەخوات هەمیشە مێوانمان هەبووە، زۆر جار کە مێوان نەبووایە بە تایبەتی لەو ساڵانەی بەر لە کۆچکردنی کە هەندێك بە ناو ساڵ کەوتبوو، هەر لە گەڕەکی عارەبان لە دەرگەی مزگەوتی پاشا مەردان ئاغا دوای نوێژی نیوەڕۆ دەوەستا، یەکێکی دەست کەوتبا بۆ ئەوەی بیهێنێتەوە ماڵ و نانی لە گەڵیدا بخوات، ئیستایش لە یادم ناچێ دەیگوت پیاوی مێوان گر چووە هەر جێیەك بێ منەت نان و ئاوی خۆی پێیە) ئەمە وەك کورتەیەك و سەرەتایەك بوو لە زنجیرەی بیرەوەریەکانم، دواتر بە دوورو درێژی لە ئەڵقەکانی داهاتوو یەك لە دوای یەك زیاتر دەردەکەون لە هەر ڕووداوو قۆناغ و بەروارێکیاندا بە جیا.

# ئەوسا وابوو

(٢)

*لەو خانووەی کە تیایدا قۆنداخ کراوم‌و لانکیان ڕاژاندووم تا کۆتایی هەفتاکانیش لەو گەڕەکی (عارەبان)ی کۆن، بیری تیژی منداڵیم‌و بیرەوەریەکانم بۆ ئێستام، ئەو بارانە بە خوڕەیە هەمیشە دادەباریٚ بە سەر هەموومانەوە کە یەکانگیری بیرەوەری یەکتر دەبین لە زۆر ڕووەوە، خانووەکەمان، ڕوو لە خۆرئاواو پشتمان کەنسیەی (قلب الاقدس)ی کلدانی مەسیحیەکان بوو، دراوسێکانمان ماڵی مام ئەحمەدی نانەواو سەید غەنی‌و سید غانم‌و سەید نوری سەید خەنجەر بوو، لەبەرامبەریشمان سیٚ (حەسار) شانیان دابووە پاڵ یەك‌و سەربانەکانیان تێکیان دەکردەوە هیچ شوورەیەك لە نێوانیان نەبوو وەك بلێی یەك سەربان بن، هەر حەسارێك پتر لە شەش تا حەت ژووری لە خۆ دەگرت، لە هەر ژوورێکدا خێزانێکی هەژاری تیایدا دەژیا، چیرۆکی ئەم حەسارانە تا بلێی تراژیدی‌و ناوازە بوو، جاری وا ریك دەکەوت بۆ کوڕەکەیان ژنیان دەهێنا لە یەك لەو ژوورانەدا پەردەیەك لەمپەر بوو لە نێوانی بووك‌و زاواو دایك‌و باوك‌و خوشك وبراکانی، خەڵکانێکی هەژارو ناچارو کەم دەرامەت بوون، یەك ژوورو هەر لەو ژوورەشدا، (چێشت لێنان‌و پێشوازی لە مێوان‌و نوستن ودەستشۆرو هەتا منداڵەکانیان لە ناو تەشت دەشۆرد جار جار خۆشیان دەشوشت ئەگەر نەچووبان بۆ حەمامی نێو شار، کاریگەری

ئەوسا لە مێشك و زەینمدا كەلەكە بووەو لەم دوو وێنە شیعرەدا رەنگی داوەتەوەو وەك ئەوەی منیش منداڵێك بوویمە لە یەك لەو ژوورانەی ئەو حەسارانەدا ئەوەتا دەڵێم:

مانگ لە ناو تەشتێكدا
سەری ئەستێرەیەكی دەشووشت
بە دەم شوڕە شوڕی ئاوەوە
دەیگوت: ئەم ژیانەم وا بەڕێ كردووە
ناچارییەو یەك ژوورم لەو حەسارەدا
بە كرێ گرتووە
****
ئێستاش كە سەیری دەریا دەكەم
دەگەڕێمەوە بۆ ئەو رۆژانەی منداڵیم
دەگەڕێمەوە نێو ئەو تەشتە ئاوەی تیایدا دەشۆردرام
ئەو تەشتە ئاوەی، بەلەمێكی كاغەزینم دەخستە نێوی و
بەو بەلەمە، سەفەرێكی دوورو درێژم دەكرد
دنیایەكی بێ سنوورم ڕەنگڕێژ دەكرد

لەو حەسارانەدا یەك بەلوعەی ئاو هەبوو لەگەڵ یەك ئاودەست بۆ ژن و منداڵەكان و پیاوەكانیش دەچوونە مزگەوتەكانی نیو گەڕەك، زۆر جاریش بە تایبەتی لە هاویناندا ئاو لە بەلوعەكان نەدەهات و هەندێك لەو ماڵانە روویان دەكردە ئەم لاو ئەو لا بە تەنەكەو بە پەقرەجان ئاویان دەكێشایەوە، هەروەها هەندێك دەهاتنە ماڵی ئێمەش لەبەرئەوەی

موزەخەیەکی دەستیمان هەبوو بە هێزی دەستو بازوو ئاوی نێو بەلوعەکەیان رادەکێشاو پەقرەجەکانیان پڕ ئاو دەکردو دەیان بردەوە، ژیانیان ئاوا سەخت بوو، بەش بە حاڵی خۆم لە پەنجاکان تا تەمەنم بوو بە هەشت سالأنیش زۆربەی یاریکردنەکانم لە حەوشەی ئەو حەسارانە بوو، کچو کوڕ پێکەوە یاریمان دەکرد، دنیا ساکارو سادەو پاك وبێگەردو بێوەی بوو، وەکو ئێستا نەبوو کاری خەتەرناکی لێ بکەوێتەوە، زۆر شەوانیش لە لای پوورە رابی تا درەنگی شەو دەمامەوەو حەکایەتی خۆش خۆشی بۆ دەکردم، من هەراش بوومە لەگەڵ دایکم چوومەتە حەمامی ژنان، فامی سێکس و ئەو جۆرە مەسەلانەم نەکردووە، یەکێك لەو کوڕانەی گەڕەکەکەی ئێمە تەمەنی چواردە ساڵ بووە کە لەگەڵ دایکی دەچێتە حەمامی ژنان، ئەو ژنەی سەرپەرشتی حەمامەکە دەکات بەو کوڕە دەڵێت تۆ گەورە بووی‌و چیتر لەگەڵ دایکت نەیێیتەوە بۆ حەمام، بۆ جارێکی دی ئەو کوڕە لەگەڵ دایکی دەچێتەوە ئەو حەمامەو خوی لە بن عەباکەی دایکی دەشارێتەوەو دەیەوێت بچێتە ژوورەوە، ژنەی سەرپەرشتکاری حەمامەکە دەیگرێتو پێی دەڵێت (کوڕم ئەگەر ئەو جارە هاتی باوکیشت لەگەڵ خۆت بێنە.)

بەڵێ لەم حەسارەدا ئەوانەی لێی دەژیان وەك خێزانێکی گەورە لە هەموو بۆنەکانیان لە خۆشی‌و ناخۆشی بەشدارو هاوکاری یەکتر بوون، هەر لە ساوەر کوڵین‌و کوتانەوەو هەڕشتە هەڵخستن‌و دابین کردنی ئازووخەی زستان‌و شین‌و شایی‌و ئاهەنگەکانیان، بۆ هاوینانیش لەسەر بانەکانیان کە هیچ شوورەیەك لە نێوانیاندا نەبوو لێکیان جودا کاتەوە تەنیا ئەو ئەو چیغانەی ڕیزاو ڕیز کرابوون لە تەنیشت یەکتر وەك پەرژینێك لە یەکتر جیا کرابوونەوە، ئەگەر کوڕەکیان تازە زاوا بووایە

ئەوە كوللەيان دادەناو تيشكو پڕشنگی مانگ بە سەری دەكردنەوە هەتا دەتوانم بڵێم نهێنییەكی ئەوتۆ نەبوو لە نێوانی ئەو خێزانە گەورەیەی حەسارەكان بە جۆرێك وەك دەگێڕنەوە لە شەوێكی هاویندا لەسەربانی حەساردا لە نێو چیغێكدا دەبێتە كێشەو دەمە دەمێكی زۆر لە نێوانی ژنو مێردێكدا لەسەر ئەوەی پیاوەكە داوای لە ژنەكەی دەكات سەرجێیی لە گەڵدا بكات، ژنەكەش رازی نابێت دەڵێت ماندووومو نانم كردووەو وازم لیٚ بێنە، پیاوەكەش هەر واز ناهێنیٚو دەنگ لە نێوانیاندا بەرز دەبێتەوەو دەبێتە مقۆ مقۆ، لەو سەر لە ناو چیغێكی دی یەكێك لە پیاوە دراوسیەكانی هاوار دەكا (كچم عەیشیٚ بیدیٚو نەجاتمان دە با بخەوین بەیانی دەچینە سەر كار) هەڵبەتە ئەم دیاردەیە بە شیوەی دیو بە بارێكی دی كەوتبێتەوە بۆ نموونە (لەو گوندانەی لای خۆشناوەتی ساڵنێكی زوو، (بەگ)ێك بەرەو نەبوونیو لە بەگایەتی جارانی نەماوە بخوریٚو كەسی پێوە نەماوە تەنیا پیرە خولاٚمێك، بەگ لە ژوورەو لە گەل ژنەكەی، خولاٚمەكەش لە هەیوانەكەی بەر دەم ژوورەكە گوایە خەوتووە، بەگ داوا لە ژنەكەی دەكات سەرجێیی لە گەڵدا بكات، ژنەكەی دەڵێت وازم لیٚ بێنە بەیانی من ئاوم پیٚ نایەٚ بۆ غوسلٚ دەركردن، بەگ دەڵێت كێشە نییە بە حەمەدی برا دەڵێین (مەبەستی خولاٚمەكەیە) دوو تەنەكە ئاومان بۆ بێنیٚ، حەمەدی برا دەڵێت بەگم ئەگەر تەتورت نەنایە نەكەی، دەنا یەك تەنكە ئاویشم پیٚ نایەٚ..بگەڕینەوە سەر باسی حەسارەكە، خۆ جار جاریش لەسەر شەڕی منداڵەكانیان شەڕەكە دەپەڕیەوە بۆ گەورەكان بەلاٚم هەر زوو ردێن سپیو ژنە بەتەمەنەكان دەكەوتنە نێوانیانو ئاشتیان دەكردنەوە.

ئەوەی لێرەدا ماوە بیلێم سەبارەت بە حەسارەكان زۆربەی ئەو چینو توێژانەی لە حەسارەكاندا ژیانیان بە سەر دەبرد لە چینی هەژارو غەریبە

مالْ وگواستراوەی شاران و دیْ و گوندییەکان بوون، یان ئەو پۆلیس و سەربازانەی عەرەب کە لە باشووری عیراقەوە دەگوزرانەوە بۆ کوردستان بەو پێیەی ناوی گەڕەکی عارەبان بوو لە هەمان کاتدا نزیکی بنکەی پۆلیس و متصرفیەو ئۆردووی سەربازی بوو جگە لە دانیشتوانی شار هەر لە کرێکارو حەمبالْ و عارەبانچی و کاسبکار لەو حەسارانە نیشتەجیْ دەبوون..هتد.

**بەشێکی دی لە مێژووی ئەو گەڕەکە:**

(زۆر گرنگە باسی ئەو کەسانە بکەم کە لەو گەڕەکە نیشتەجیْ بوونە ئەگەر بە کرێچیاتی و بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش بوو بیْ یان ساڵەها لەو گەڕەکە ماونەتەوە کە وەکو کەسایەتیەکی کۆمەلایەتی ئەدیب و هونەرمەند وەزیفەدارێکی ناودار پیاوێکی ئاینی سیاسی وەرزشوان پلەداری سەربازی ناودارو دیار بوونە بۆ نموونە لەوانەی زنیاریم وەدەست کەوتووە یان زۆربەی هەرە زۆریان لە نزیکەوە ناسیومە یان هاوڕیْ و دراوسیْ و خزم بوونە بەو پێیەی سیْ بەشی ژیانم لەو گەڕەکە بووە، لەگەلْ ئەوەشدا داوای لێبووردن لەو کەسە دیارانە دەکەم ئەگەر ناوم لە یاد کردبیْ.

**ناوەکان بۆ نموونە:**

**قازی (رەشاد موفتی) کەسایەتیەکی ئاینی و کۆمەلآیەتی و کوردپەروەر هەروها کوڕەکانی (عوسمان موفتی - عدنان مفتی - کەنعان موفتی - ئیحسان موفتی) سیاستمدار وتێکۆشەرو وەزیفەداری بالآ بوون**

**(حاجی نورالدین بەقالْ پیاوێکی کۆمەلآیەتی و خێرخوازو کوردپەروەر) هەروەها کوڕەکانی (حاجی نەجمەدین - عزالدین - بشیر شهاب - هەروا نەوەکەی، جمشید بشیر حاجی نورالدین بەقالْ)**

**عەبدوڵلاْ گۆران شاعیری گەورەی کورد لە سالآنی چلەکان لەو گەڕەکە لە خانووێکی بە کریْ دانیشتووە بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی (ئەو زانیارییەم لە لایەن د. جمشید حەیدەری دەستکەوتووە)**

**ئەو برایانەش ماوەیەك لەو گەڕەکەی عارەبان نیشتەجیْ بوونە کە هەموویان دیارن وەك سیاسی و نشتیمانپەروەرو ئەدیب و رۆژنامەنووس و کەسایەتی (عاصم حەیدەری - سالْح حەیدەری - جمال حەیدەری - مهیب حەیدەری - مومتاز حەیدەری - د. جمشید حەیدەری)**

**(مالْی موسا رەشید ئاغا) و کوڕەکانی حەیدەرو نەوزاد و دکتۆر ئەرسەن و نەژاد)**

**(مالْی مەردان ئاغا) و کوڕەکانی خدرو ئەنوەرو فخرالدین وئەمیرو شامیل)**

**مالْی (موحسین دزەیی) کوردپەروەرو تێکۆشەر هەروەها کوڕەکانی سەفین و بارزان و شێروان، تێکۆشەرو بە وەزیفەی بالآبوون.**

**دکتۆر عبدالرزاق دەباغ.**

**فاروق جمیل سیاسی و ماوەیەك وەزیری دادبوو لە حکومەتی هەرێمی کورستانی عیراق حمدامین جمیل سادق و کوڕەکانی مجید حەمەدەمین**

ماوەیەك وەزیری تەندروستی عیراق بوو هەروا، ئەحمەد حەمەدەمین بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی شارەوانی هەرێمی كوردستانی عیراق بوو

قادر شۆڕش / تێكۆشەرو پێشمەرگەی دێرین و ناودار

ماڵی فاروق حەسەن ئاغاو كورەكەی وەرزشوان سرتیپ فاروق

ماڵی دكتۆر ئەحمەد دزەیی سەرۆكی زانكۆ سلاحەدین

ماڵی شەهید عوسمان حەسەن سەر سۆر دزەیی

ماڵی نورالدین رشید ئاغاو كوڕەكانی (نهاد، ماوەیەك ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی كوردستانی عیراق بوو حاكم قادر - نمیر - فاروق)

ماڵی نورالدین محەمەد ئاغاو كوڕەكانی (دكتۆر تەحسین - سامی)

ماڵی عەتا الله ئاغا

عونی بەزاز ماوەیەك ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی كوردستانی عیراق بوو

رئیس سهێل وادی و نقیب فازل وادی

لوا تەحسین گەردی - مقدم فواد عبدالرحمن جرجیس - عقید عەبدولخالق عومەر - عقید وشیار چیچۆ

مهندس تەحسین چیچۆ ماوەیەك سەرۆكی شارەوانی هەولێر بوو

مهندس اسماعیل سید غنی

برهان ئەحمەد ماوەیەك بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی هەولێر بوو

ئەسعەد چەلەبی نامق چیچۆ قانونی جمیل رشید ئامێدی پیاوێكی سیاسی وسەرەتا لە حزبی هیوا بووە - دكتۆر هاشم دۆغرەمەچی مامۆستا خدر مەولود هەروا، ئەحمەد قەساب ماوەیەك ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی كوردستانی عیراق بوو

ئەبوبەکر حاجی عەزیز خەرابەدراوی / خوی و کوڕەکانی لیوا سردارو سیروان بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی نەوت و کانزاکانی هەرێمی کوردستان... هتد

نەوزاد محەمەد عەلی موختار کوڕەکانی لاوەندو رەوەز نووسەروو رۆژنامەنووس بوون - زیوەر خەتاب - حاکم عبدلباست فەرهادی

حاجی محەمەد خاوەن و متولی مزگەوتی بازاڕی گەورەی هەولێر کە کوڕەکانی ناودار بوون لەو گەڕەکە/ ناوەکان (عبدالقاردر - حاجی نورالدین - عبدالواحید - عبدالرزاق - دکتۆر سادق - حاجی گەیلان- دکتۆر عەبدوڵلا حداد - عبدلئیلا)

عەبدولقادر دۆغرەمەچی.

علی حوسێن کسرە - سامی محی الدین دۆغرەمەچی - (رەفعەت عەبدولڕەحمان جرجیس). ماوەیەك بەڕێوەبەری گشتی بووە لە وەزارەتی پەیوەندیەکان هەرێمی کوردستان - نشأت عەبدولڕەحمان جرجیس ماوەیەك وەکیل وەزیری دارایی بووە لە هەرێمی کوردستان - جەلاڵ رشید ئەحمەد کە بە قاموسی دادگا ناودار بوو - سید غانم و سید غنی

هەروەها چەند ناوداران و کەسایەتی ئاینی ماڵیان لەو گەڕەکەدا بوو وەك:

شێخ محی الدین شێخ ساڵح، تەکیەی هەبوو

سەید نووری سەید خەنجەر، تەکیەی هەبوو، دوای وەفاتی ئەو سەید خەنجەری کوڕی جێگای گرتەوەو تەکیەکەی بەڕێوەدەبرد

خلیفە مەجید، تەکیەی هەبوو

شێخ عارف، تەکیەی هەبوو

مـەلا عـەلی سـەرۆکی یـەکێتیی زانایـانی کوردسـتان بـوو لـە شۆڕشـی ئەیلولدا

مەلا فایز، مەلای مزگەوتی شێخی چۆلـی بوو،

مەلاعەبدوڵلاٚ فەرهادی نووسەری زانستی ئاینیو ڕۆشنبیرێکی ناودار بوو

مەلا جردیس خوتبەخوێن دوانگەی مزگەوتو پێش نوێژ

**نووسەرانو شاعیرانی هەڵکەوتوو لەو گەڕەکەدا نیشتەجێ بوونە وەك:**

عزالدین فەیزی – موحسین ئاوارە – عەبدولڕەحمان فەرهادی – جلال مدحت خۆشناو – تاریق جامباز – حازم باجلان – حەمە ساڵح فەرهادی دکتـور عەبـدوڵلاٚ حـداد – سـیف الـدین ئیسـماعیل محمـود – مومتـاز حەیدەری – دکتۆر جمشید حەیدەری – ساڵح حەیدەری – نازم دڵبەند –سۆران عزالدین فەیزی – صلاح سەلیم سیدۆك – موحسین چینی – د.شێرزاد نجار – موحسین جوامێر – **مەهدی ساڵح.**

**هونەرمەندانی هەڵکەوتوو لەو گەڕەگەدا نیشتەجێ بوونە وەك:**

منعم مەلا مەزهەر، مۆسیقا ژەن / ڕەسوڵ گەردی مشکۆ تەحسین تاها صلاح نجم الدین / جاسم لەتیف /هونەرمەند وەك موسیقیو گۆرانی و حەیرانیبێـژ / هـەروا.. (صـباح عەبـدولڕەحمان – فـەتاح خـەتاب – صلاح حەسەن – جەلال بەیار – چەتۆ حەسەن – علی ئەحمەد / شانۆ نووسو دەرهێنەرو ئەکتەر)/ ئەوەی دی / (محەمەد خەتاب رسام).

**ئەو وەرزشوانانەی ناودار بوون لەو گەڕەکەدا نیشتەجێ بوونە وەك:**

**هاشم مەلا مەحمود /لەش جوانیو وەرزشی قوڕس / هەڵگری ئاسن**

**محەمەد یاسین / لەش جوانیو وەرزشی قوڕس، هەڵگری ئاسن وەك وەرزشوانێکی ناوداری جیهانی دەرکەوتووە. میدیالیای جیهانی وەدەست هێناوە**

**شلیمۆن ئاردەواس / ناودار لە وەرزشی یاری فتبۆڵ تۆپی پێ**

**فخرالدین مردان ئاغا (مندوب) ناودار لە وەرزشی فتبۆڵ تۆپی پێ**

**فاروق تۆفیق سەرەتا ناودار لە وەرزشی فتبۆڵو دواتر بوو بە ڕاهێنەری تیپی وەرزشوانانی تۆپی پێی نێودەوڵەتی.**

**سەرتیپ فاروق ئاغا دزەیی / لە بواری وەرزشی یاری فتبۆڵ تۆپی پێ / شارەزاو بەڕێوەبەر**

**عریف خدر / ناودار لە یاری ماتۆڕ سکلْ لە بۆنەی میهرەجانەکانی وەرزشیدا دەردەکەوت.**

**هەروەها وەرزشوان کاکل عباس – نورالدین اسماعیل هەر هەموویان لە دانیشتوانی گەڕەکی عارەبان بوونە، کە لەسەرەوەدا ناوم هێناون.**

## ئەوە ئەمڕۆیە لە دوێنێ دەدوێ

(٣)

لە هەولێردا لە نێو سەنتەرو چەقی ئەم شارەدا، گەڕەکی (عارەبان) ی کۆن کە ئێستا زۆربەی خانووەکانی داتەپیون وماندوون، یا قفل دراون و چۆل کراون، تاك و تەرا چەند ماڵێك ژیانی لێ بە سەر دەبەن، لەم گەڕەکەدا کە (من)ێك بە قۆنداغەیی و پیڕۆکەیی و هەراشی چاوم تیایدا تروکاوە تا تەمەنم بووە بە چل ساڵ کە لەبەر زروفی سیاسی ئەو کات لە ساڵی ١٩٨٦ لەو گەڕەکە بارم کردو لە گەڕەکی ئەندازیاران خانووێکم بە کرێ گرت و خۆم تیایدا حەشار دا.

ئەوەی دوێنێ لەو گەڕەکەدا بە چاوانی خۆم بینیوومە بەر لەوەی بەر پێچکەی تەکنەلۆژیا و زانستی سەردەم و شارستانیەتی ئەمڕۆ بکەوێ، ئەویش:

*لە ساڵانی پەنجاکان لە هەموو گەڕەکەکانی هەولێر بە گەڕەکەی ئێمەوەش وەك پێویست کارەبا نەبوو، کە دنیا تاریك دادەهات، چرا هەڵکەرانی شارەوانی چرایان دەدەگیرساندو بە ستونگەکانی نێو گەڕەکیان هەڵدەوسی، پاسەوانی شەوانە (حەرەس لیلی) بە ناو گەڕەکدا کولان بە کۆلان دەگەڕاو فیتفیتەی لێدەدا، کۆلانەکان تەنگەبەرو بە پێچ بوون، زۆربەی دەرگاکان دوو دەری و باریکەلە بوون، زۆربەیان بە ڕۆژ

دەرگەیەکیان کراوە بووو لە پشت دەرگاکەش پەردەیەکی هەڵواسراو دەبیندرا، گەڵێ جاریش پەردەکان لەرینەوەیەکی هەبوو کە لە سیلەی لادانی لچکێکی ئەو پەردەوە کچ و ژنەکان تیلەی چاوانیان دەبڕیە رێبواران، ئێوارانیش بە کۆمەڵ لەبەر دەرگا دادەیشتن نیسك و برنج و دانەوێلەی تریان دەبژارد بە دەم قسەو پلارو توانج و بنێشت جووینەوەو کات بەسەربردن، لەم سەرەی گەڕەکەوە تا ئەم سەری گەڕەك هەر هەموو چی خواست و باسی نێو ماڵەکان هەبوو هی یەکتریان دەزانی، خەڵکێکی سادەو بێوەی و پاك بوون، لە وەرزی هاوینانیشدا لەگەڵ دەرکەتنی زەردەی ئێوارەدا دەستیان دەکرد بە نوین و پێخەف گواستنەوە بو سەربانەکان لەگەڵ شەربەی مل درێژو تەدارەکی چاو نان خواردنی دوای بانگی مەغریبان کە زۆربەی ماڵەکانی ئەوسا وا ڕاهاتبوون ئێواران شێویان لێدەنا، هەروەها نەو بووك و ژنە جحێلەکان دەستیان دەکرد بە بەستنی کولەی سیسەم و ژنە بە ساڵاچووەکانیش لەگەڵ کچەکانیان ئاوڕشێنی دەورو بەری چیغەکانیان دەکردو سەربانیان گەسك دەدا، ئەوەتا گۆرانی شاعیر سەبارەت بەکولە پەردە هەڵخراوەکاندا دەڵێت:

دەڕژا لەسەردا کزە بای بەیان
ئەیلەراندەوە کولەو پەردەکان

کە شەویش دادەهات ئێمەی منداڵانی هەراش و مێردمناڵ و هەتا گەورەکانیش کۆلارەکانمان بە ئاسمان دەخست و فەنەری سەوزو سوورمان دادەگیرساندو دەمادایە دەم داوی کۆلارەکان، ئەو سات بە ناوی (قوش کاغەز) ناوی دەهات کە وشەیەکی تورکییە لەسەردەمی

عوسمانیەکانــەوە بۆمـان ماوەتـەوە، ئـەو قوشـکاغەزەی بـە کاغـەزو تەلـە قامیش‌و داو خۆمـان دروسـتمان دەکـرد نـەك وەك ئێسـتا بـە ئامادەکراوی هەیە بۆ کڕین، ئەوسا ساردکەرەوەو سپلیت‌و پانکەو سـەلاجەو عەسـارەو ئەو دەزگایە سەردەمخوازانەی ئەمڕۆ هەیە لە ئارادا نەبوو، خەڵکی سادەو هــەژار، ئــاوی کوپــەو شــەربەیان دەخــواردەوە، دەوڵەمەنــدەکانیش سـەندوقێکی لـە دار دروسـتکراو یـەك مـەتر بـە مـەترو نیوێـك لـە شـێوەی (مجمـده)ی ئێسـتا بـە (بـوز دۆلاب) ناویـان دەبـرد کـە وشـەیەکی تورکییـە، بـەفریان دەخسـتە نـاو ئـەم سـەندووقە سـەر داخـراوە کـە نـاوەوەی بـە تەنکەیـەك یـان پلێتێکـی تـەنك چەسـپێندرا بـوو، بـە دوو بـەش، بەشـێکیان ئاو هەڵگر بوو، ئەوەی تر بەفریان دەخستە پاڵی بۆ ساردکرنەوەی ئاوو پاریزگارکردنی میوەو گۆشت‌و شتی تر.

هەر لە پەنجاکان‌و تا شەستەکانیش و، تـەنیا کۆکـە کـولا هـەبوو لەگـەڵ (سیفۆن‌و عصیر) کە لە دوکانی ساڵح سیفۆن لـە نزیـك چایخانەی مەچکۆ دوو دوکـانی لێکـدراوو دوو دەری هـەبوو، مەکینەیـەکی گـەورەی لێ بـوو، فشـق‌و هـۆڕی شووشـە پـڕ کـردن‌و بـە قـەباغیش سـەرە شووشـەکان دادەخران، دەخرایە نێو سەندوقێك لە دار دروسـت کـراو، قوتـە پیکـابێکی فـۆردی مـام سـاڵح سـیفۆن راوەسـتا بـوو، ئـەو سـیفۆن وعصـیرانەی بـار دەکردن یان شووشە بەتاڵەکانی دادگرت، دیمەنێکی ئەفسووناوی هەبوو بۆ ئێمـەی منـاڵانی ئـەو سـەردەمە کـە دەچـووین بەرامبـەر ئـەو مەکینەیـەو چۆنیەتی کار کردنی دەوەستاین.

لـە پـەنجاکان، سـەبارەت بـە فێنکـەرەوە لـە وەرزی هاوینـدا، ماڵـە هەژارەکان جگە لە باوەشێن هیچی تریان نەبوو، هـەتا لـە دایرەکـان‌و ماڵە دەوڵەمەندەکان درك‌و داڵی حوشترالووکیان لە چوارچێوەی ڕایەڵی داریـان

گرتبـوو، نـاوه نـاوه ئاویـان پێـدا دەکـردو شـنه بـا لێیـدەداو فێنکـی دەکـردەوە، لـه زۆربـەی دایرەکـان بـه تایبـەتی لـه ژووری بەڕێوەبـەرەکان بەتانییـەك هەلواسـرا بـوو سـەرە پـەتکێکی بـه دەسـت بەردەسـتەوە (فـەڕاش)بـوو لـه دەرەوەی ژوورەکـەو ڕادەکیشـاو بەتانیەکـەش دەهـاتو دەچوو تا بەڕێوەبەر فێنکی بێتەوە، ئەگەر بەردەستەکە بوەستا بووایـه بۆ ماوەیەیـەك، بەڕێوەبـەر هـاواری لێ هەڵدەسـتاو (کـوڕە ڕایکێشـا سـووتام) لەسـەرەتای پـایزەوە دانیشـتوانی گـەڕەك بـه هـەرەوەزی هـەر لـه ساوەر کولاندنو کوتانـەوەو دەسـتهاڕینو سـازدانی هەڕشـتەو دانـدۆكو کەشـكو ئـاوە تەماتـەو وشـککردنەوەی مێوەجـاتو دابینکردنـی هـەموو جـۆرە ئازووخەیەك بۆ وەرزی زستان وەك یەك خیزان هاوکاری یەك بوون، هەر لەم وەرزەدا دەست دەکرا به کڕینی داری قەلاشکەریو ڕەژوو که به کـەرو هێسـتـر لـه ناوچـەکانی خۆشـناوەتی دەیـان هێنایـه نێـو شـار، ئێمـەی منـدلانی هـەراش دڵخۆش دەبـووین کـاتێ بارەکانیـان دادەگـرتو سـواری پشـتی ئـەو ولاخانـه دەبـووینو لێمـان دەفڕانـدن، ئیتـر دەبـووە قاوقیـژەی دایکـەکان چونکه زۆر جـاران کـه نەقیزەیـەکمان دەژەنییـه تەنکێشـی ئـەو ئاژەلانه له خۆیان هەڵدەداو وەریان دەگێڕاینو به سەری شـکاوو دەسـتو قاچی بریندارەوە بەرەو ماڵ دەبووینەوە، لـه عێنکـاوەو گونـدە نزیکـەکانی هـەولێریش کـەرو بـاری (کـا) دەهاتـه نیـو گـەڕەکـەکان، (مـام سـلیوە) لـه عێنکاوەوە به بارە (کا)ی سەر پشتی گوێدرێژەکەی که هەچەی لێ دەکردو هـاواری دەکـرد (کـا.. کـاجۆ.. کـاجۆ نـاکرن) منـدالانی لاسـارو شـەڕانگێز دوای دەکەوتن (سلیوە سـلیوە.. ئـەوەمان بپیـوە.. بسـتێكو نیـوە) ئـەویش تـوڕە دەبـوو جنێـوی پـێ دەدان، بـەڵێ بـه دەگمـەن لـه ماڵـەکان ئەگـەر تـەباخێکی بچووك هەبووایـه دەنـا شێولێنانو حـەمام گـەرمکردن بـه داری

قەلاشـــکەری و نـــەوتی ڕەش جێبـــەجێ دەکـــرا، نـــان کـــردن و تـــەنوور داگیرسانیش بە چیلکە دارو (کا)

دیارە بیرەوەری و نۆستولۆژیا و یادە جوانەکانی سەردەمی منداڵی و سیحری ڕۆژگارەکانی بۆ هەموو نووسەرو شاعیرو هونەرپەروەرێك، هەمیشە لە لایاندا هەر تازەو ئێستایەو گەرمە، هەڵمی ئێستایی لێ بەرز دەبێتەوە وەك لە پێشدا باسی چەند وێنەیەکم کرد هی ئەوێ ڕۆژگار ئەوەتا لە قەسیدەیەکم بە ناوی (من و کاتژمێر) کە ڕۆژانی منداڵیمی تیایدا ڕەنگی داوەتەوە لە گۆڤاری بەیان ژمارە (١٠٠) لە کانوونی دووەمی ١٩٨٤ بلاو بۆتەوە، دەبینین کاری لە شاعیرو نووسەرانێکی زۆر کردووە کە گفتوگۆیەکی گەرمی لەسەر بکەن و وەریبگێڕنە سەر زمانانی تر بۆ نموونە شاعیر (عباس عەبدوڵلا یوسف) بۆ سەر زمانی عەرەبی وەریگێڕاوە، دواتر نووسەر (عەبدولرحمان عەبدولقادر) لە ڕۆژنامەی عیراق ژمارە (٣٥٥٥) لە ١/١٠/١٩٨٧ بە زمانی عەرەبی لێکۆلینەوەیەکی لەسەر نوسیووەو قسەی لەسەر وەرگێڕانەکەی عباس عەبدوڵلا یوسف کردووە، هەروەها (یوسف حەیدەری) جارێکی تر ئەم قەسیدەیەی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی لە ڕۆژنامەی عیراق ژمارە (٣٤٤١) لە ١٤ / ئایاری / ١٩٨٧، چەندین شاعیرو نووسەری تر لەوانە جەلال زەنگابادی و دواتر شاعیری گەورەی عەرەب عەبدولوهاب بەیاتی بۆ سەر زمانی ئیسپانی وەریگێڕاوەو گفتوگۆی زۆری بە بەرەوە بووە، دیارە ئەم بیرەوەرییە موچڕکێکی ئەفسوناوی و هەژانێکی قووڵی پێیە بۆ نموونە چەند دێڕێك لەم قەسیدەیە دەخەمە بەر چاو کە یادەوەریەکانی منداڵییەتی ساڵنێکی ئەوسای زۆربەمانی هەڵگرتووە.

**تۆ بە چییەوە دەنازی ئەی کاتژمێر**

**لەوەتەی هەی.. هەر بە گەورەیی تۆم دیوە**

**قەت منداڵ بووی؟**

**هێلکەیەکی دایە پیرەت لە کۆلیتان دزیوە**

**تا چنگت لە کوتکە هەنارێك گیر بووە**

**لقە دارێکت بڕیوە**

**ڕەزەوانێك ڕاوی ناوی**

**لەسەر کەرێکی پشت برینداریش گلاوی**

**خۆت بە پشتی پیرە پەستێك شۆڕ کردۆتەوە**

**لەسەر دیوارێکی رووخاو بەر بوویتەوە**

**شەوێ لە شەوانی هاوین، لەسەر قەمتەرەو بان**

**کۆلارەیەکت بەرەڵلا کردووە بۆ ناو زگی ئاسمان**

**فەنەرێکت داگیرساندووە هەر بە مێوانی**

**بچێتە لای ئەستێران**

**هیچ سەری خۆت لە تاویرە بەردێك داوە**

**قەت لەگەڵ چاو ڕەشێکدا لینکە دەستارێکت باداوە؟**

**هتد...**

هەروەها کە باسی ئەو چوارچێوەیەم کرد کە دڕکە حوشترالووکی لێ دەئاخنراو لە پەنجەرە دەگیراو ئاو ڕشێنیان دەکردو بای دەرەوەی پێ دەکەوت و ژوورەوەی فێنك دەکردەوە لە وەرزی هاویناندا لە جیاتی موبریدە یان بڵێین ساردکەرەوەو ئەرکۆندێشن و سپلیت و شتی ترلەو سەردەمدا، دیارە وێنەی ئەوسا شیعرێکی پێ بەخشیوم لە ژێر

**ناونیشانی (لە سایەی دڕکدا) کە لەبەرگی یەکەمی کۆبەندی دیوانی (کاریزە مەرجان)دا لە ٢٠٠٣ هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە دامڕشتووە:**

**لە سایەی دڕکدا**
**ئێرکۆندێشنی ساڵانی زووم**
**لە پەنجەرەیەکدا بوو**
**بە دڕکە حوشترالووك ئاخنڕا بوو**
**بە وشکە بای هاوین و ئاوو ئاوڕشێن کردنی**
**ئابلوقەی گەرمایی دابوو**
**ئای بۆ خەوی قووڵی ژێر دەسەڵاتی دڕو داڵی حوشترالووك!!**

## باری یادەکان قورسن.. ئەوەتا هەڵیاندەڕێژم

(٤)

کریشنا مۆرتی، بیرمەندی هیندی دەڵێت:

(ئایا هیچ کاتێك تەنیاین، یاخود بەردەوام بارگرانییەکانی ڕابردوو لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین)

(ڕۆمەن ڕۆلان)یش دەڵێت: (هەر کەس ویستی بمینێتەوە پێویستە توێشوی پێ بێ)

بەڵێ یادەکانم ئەو تێشووە هەستەورییانە بوو کە ساڵەهای ساڵە لە ڕۆحمدا ماونەتەوە، لە زەن و زیەن و قووڵایی گیانمدا جێگیر بوونە، هەن زۆر نهێنین و شیاوی درکاندن نین کە داب و نەریت و عەیبەو کۆمەڵ بە بابەتێکی قێزەوەنی دادەنێن، یان ناو درکاندنی تیایە.. هتد، بەڵام ئەو یادو بیرەوەریانەی کە ڕاوەستانی لەسەر دەکرێ و نەوەی ئێستا بە زانیاریەکانی کۆنینەی ئاشنا دەکا و بەراوردێك دەخوڵقێنێ و بنەمایەك دەخاتە ڕووو پێویستە بنووسرێ وبگوترێ، وا لە گۆشە نیگای ئەم بووچوونەدا چەند وێستگەیەکی دی دەخەمە ڕوو کە ژیان لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان و هەفتاکانیش چۆن دەگوزەرا لە هەولێرو سنووری ئەو گەڕەکەی تیایدا ژیاوم گەڕەکی عارەبان لەو ساڵانەی ئاماژەم پێکرد، نیشتەجێ بووانیشی گەڕکی عارەبان وەك مێژوونووسان باسی دەکەن بۆ

زیاتر لە دوو سەد ساڵ لەمەو بەر دەگەڕێتەوە بە جۆرێك لەسەردەمی داگیرکەرانی عوسمانییەکان بە (یەنگی محلە) واتە گەڕەکی نویٚ ناوی هێنراوە دواتر چەند عەرەبێك تیایدا نیشتەجیٚ بوون کە بە ئاژەڵ بە خێو کردن و هەروەها لە ماڵەکانیاندا ئافرەتەکان بەتەنوور نانیان دەکردو پیاوانیان بە سەبەتە دەیانبردە بازاڕو دەیانفرۆشت ئیتر ناوی بە گەڕەکی عارەبان دەر کرد.. جا چەند وێستگەیەك لە بیرەوەریەکانمدا جێگیر بوون وەك:

١- (قشلەی پۆلیسی سوارە)

کە دەڵێین قشلەی پۆلیسی سوارە، واتە ئەو بنکە پۆلیسیانە دەگرێتەوە کە وەك هێزی پیادە کار ناکەن بەڵکو پۆلیسی سوارەن لەسەر ئەسپ و چەکی سووك راهێنانیان پێکراوە، بەر لە دەسەلاٌتداریٚتی عوسمانییەکان پۆلیسی سوارە هەبوو بۆ چاودێریو رێگرتن لە قاچاغچیان و لەسەر رێگاکانی کاروانچییان دەوەستان، دواتر لەسەردەمی دەسەلاتداریٚتی عوسمانیەکان لە زۆربەی شارەکان و شارۆچکەکان قشلە بنیات نراو پۆلیسی سوارەی لیٚ نیشتەجیٚ کران کە بە ئەرك و واجب بەرەو دەرەوەی شار بە سواری ئەسپ دەردەچوون بۆ ڕدونان و شەڕی ئەشقیا و یاخیبووان و سەرپێچیکەران و کارو باری پەیوەست بەو ئیش وکارانەی پێیان دەسپێردرا لە لایەن دەسەلاٌتدارنی حوکمەتەوە، جا لە نێو سەنتەری ئەو گەڕەکەی عارەبان کە سەد مەترێك لە ماڵی ئێمەوە دورتر قشلەی پۆلیسی سوارە هەبوو، کە ئێستاش بەشێکی لە بیناکەی ماوە کە دەکەوێتە نێوان قوتابخانەی شێخی چۆلی بنەڕەتی تێکەلاٌو و مەزاری سولتان مزەفەر، هەر لە پەنجاکان و شەستەکان و تا ساڵی هەفتاکانیش، بیرەوەری زۆرم لە لا گەلاڵە بووە باسی لێوەی بکەم سەبارەت بەم قشلەیە،

ئەم قشلەیە بە مەزەندە پێنج هەزار م ٢ دەبوو، یەکەم دەروازەی روو لە رۆژ ئاوا، دەرگایەکی گەورەی دوو دەری لە نێو دەروازەیەکی بازنەیی بلند، دەرگاکە بە بزماری سەر بە کڵاوە نەخش رێژ کراو، لە دەرەوەی دەرگاو ژوورەوەیدا پۆلیسی پلە نزمو دەرەجەدار دەبینرا، سامو شکۆیکی هەبوو، ئینجا لە دوای دەرگا سەرەکییەکە، گۆڕەپانێك هەبوو کە خۆم بینیوومە چەند جارێك نمایشی پۆلیسە سوار ئەسپەکان بە یاری‌و رمبازی‌و باز بازێن لەسەر رایەیەڵی نزمو بڵند، بازیان دەدا بە ئامادەبووانی خەڵکانێکی زۆری بینەران، مەدالیەو رێزلێنانیش بۆ پۆلیسە ئەسپ سورە سەرکەوتووەکان دابەش دەکرا، جگە لەو گۆڕەپانە لا بەشێکی تری ئەم قشلەیە بریتی بوو لە تەویلەی ئەسپەکان‌و چەند مەیتەرەوان‌و سایزو پاکەرەوەیان هەبوو، هەروەها چەند ژوورێکی تیا بوو بۆ ناڵبەندەکان‌و ناڵکردنی ئەسپەکان لەوێدا کاریان دەکرد جگە لە پینەدۆزو کورتاندرووو چەند درەختێك‌و چایەخانەیەکی بچووکیش، کەچی ئەو بناییەی کە تا ئێستاش بە کەلاوەیی ماوە لە دوای گۆڕەپانەکەوە دەهات، ئەویش دەرگایەکەی لە نێو دەروازیەکا بوو شێوەکەی وەك دەرگا سەرەکییە بوو بەلام تا ئاستێك بچووکتر، لەو بینایەشدا قاوشی تیا بوو بۆ خەوتن‌و پشوودانی پۆلیسەکان لەگەڵ چەندین ژوورێك بۆ بەرێوەبردن کە دەرەجەداران‌و کارمەندانی لە خۆ دەگرت.

دانیشتوانی ئەم گەرەکە بیرەوەریان لەگەڵ ئەم قشلەیە زۆرە، بۆ نموونە:

(أ) لە سالآنی پەنجاکان‌و شەستەکان لەبەردەم ئەم قشلەیە بە تایبەتی لە شەوانی هاویناندا دیوارێکی لاکیشەیی هەڵنراو بە بۆیاخێکی سپی

شاشەیەکی گەورەی ٦م٢ × ٤م٢ دروستکرا بووو سینەمایەکی سەفەری سەر بە رژێمی ئەوسا لەسەر ئۆتۆمبێلێکی شێوەی ئۆتۆبیس دەوەستا، جۆرەها فیلمی نیشانی ئەو خەڵکە دەدا کە چوار مەشقی لەسەر ئەرزی بەردەم شاشە دادنیشتن، بەلاّم سەرەتا وەك ریکلاّم بۆ دەسەلاّتدارانی بابی عالی (مەلەکی) ماوەی پێنج خولەکێك جموجۆڵو پێشوازیو کارە دیبلۆماتو کۆبوونەوەو خوانەکانیان نیشان دەدرا، کە مەلیك فەیسەلو وەصیو سەرۆك وەزیران نوری سەعیدو عبدولئیلاو دەرەجەدارانی سەربازیو وەزیرەکان دەردەکەوتن.

(ب) لەسەردەمی رژێمی بەعسو حەرەسی نا قەومی لە ساڵی (١٩٦٣)دا، رژێم هەڵسا بە دەرکردنی بڕیارێك کە نابێ کەرو بارگینو ئاژەلاّنی بارهەڵگر لە ناوچەکانی شاخاوییو دەرەوەی شار بێنە ناو شار چونکە لە گەڕانەوەیاندا ئازووخەو خۆراك دەبەنەوەو پێشمەرگەکان لێی سوود مەند دەبن، جا بە دەیان گوێدرێژیان بە بارەوە گرتبوو لەم قشلەیەدا بەند کرا بوون بە تایبەتی کە لە ناوچەکانی خۆشناوەتی هاتبوونە نێو شاری هەولێر، وەرزیش هاوین بوو، ئەوسا خەڵکانی دانیشتوانی ئەم گەڕەکە، لەسەر بانەکانیان دەخەوتن، شەو تا بەیانی خەوتن لە چاوانی ئەو خەڵکە حەڕام ببوو لەبەر زەڕەزەڕی گوێدرێژەکان، کە رۆژیش هەڵدەهات لەبەر دەمی قشلەدا خاوەنی ئاژەڵە بارهەڵگرەکان واتە بۆ مواجهەو بینینی کەرەکانیانو ولاّخەکانیان کۆدەبوونەوە، هەر یەکێك لەوانە جۆرکێك (کا)و (جۆ)یان پێبوو چونکە لەوە دەترسان ئاژەڵەکانیان لە برسانا بمرن.

منیش وەك کەسێکی هەستەوەر کە یادو بیرەوەریەکانی ئەم گەڕەكو قشلەیە لە ناخمدا هەمیشە جینگڵ دەدات بەو پێیەی سەردەمی

پێرۆكـــەیی و هـــەرزەكاریو گـــەنجێتیم تـــا هاوسەرگیـــریشم كـــرد منداڵێكیشمان لیێ كەوتەوە هەر لەو گەڕەكەدا ژیانم بە سەر بردووە بۆیە چەند دێڕێك لەو قەسیدەیە دەخەمە روو كە لە كۆبەندی شیعرە بە چاپ گەیندراومدا (كاریزە مەرجان)دا هاتووەو باسی ئەو قشلەییەی تێكەوتووە كاتیێ دەڵێم:

**بمگێڕەوە ئەو گەڕەكە دێرینەی گیانو رۆحمی گلْداوەتەوە**
**با شا دەمارەكانی گیانم**
**وەك بۆڕی ئاوی دابەش بوو بە سەر ماڵانی گەڕەك**
**دابەش بیێو خوێنمی تیایدا بسووڕێتەوە**
**بمگێڕەوە ئەو گەڕەكەی**
**چۆن ئەوێستا و ئێستایش..**
**مەیتەرەوانو سایزو پینەدۆزو نالبەند**
**پۆلیسانی سوارە لە دەرەوەی قشلەی كەلاْوەدا**
**حیلْكەو حیلْەی ئەسپو بۆنی قەرسیلو كا و گیا**
**بۆنی بژو خۆڵە شێی تەویلە**
**لە كەللەو لوتدا نایرەوێتەوە**
**ئاوا بۆ ئامبازی ئەم ناوە، بازەلەمو بالْ دەگرمەوە**
**بمگێڕەوە.. بمگێڕەوە... هتد**

٢- (**قیـرتاو كردن**)

بـــەو چـــاوانەی خـــۆم بینیوومـــە لـــە پـــەنجاكانو شەســـتەكان كـــە شەقامەكانیان قیرتاو دەكرد، كرێكارەكان لە ناو مەنجەڵی گەورە گەورە

قیرەکانیان دەکولاند، دوای ئەوەی ڕێگاکان بەردو چەو ڕێژ دەکران، بە بەرمیلۆکەی قوڵبدار کە دارێك دەخرایە قوڵپەکانی، هەر دوو جەمسەری بە سەر شانی دوو کرێکارەوە پڕ لە قیری کولاو وهەڵمی لێ هەڵدەستاو هەڵیاندەڕژاندە سەر ڕێگاکە، پاشان بە هەمان شێوە ئەمجارەیان قیری کولاوی توند ڕوودەکراو بە (تیرۆگ) پانیان دەکردەوە، جادەکە ڕێكو لووس دەکرا نەك وەك ئێستا بە چەندین ئامێری تەکنەلۆژیای سەردەمو پێشکەوتووی دەستو برد کە ئەمڕۆ لەگەڵ دوێنێدا ئاسمان ڕێسمانی جیایە، بەلام خەڵك بە سادەو ساکاریو ئاسوودەیی دەژیا، دیارە تا زانستو پیشەسازیو تەکنەلۆژیاو دونیای مۆدیرنو مۆدو پۆست مۆدیرنزمو پێشکەوتنەکان لە برەوتر دابێ، ژیانو خواستو ئارەزووەکان زیاتر دەبێو دنیای فراوان لە گیانی مرۆڤەکانیدا تەنگتر دەبێ، د. فازل عزاوی شاعیریش دەڵێت: (ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە ژێر پێچکەی تەکنەلۆژیای سەردەم کە دەتانهاڕێت).

## ئەو ڕۆژو شوێنانەی لە بیـرم ناچنەوە

(٥)

(جبران خلیل جبران دەڵێت: زۆربەی پارچەکانی ڕۆحم لەو کۆلانانەدا بەجێهێشتووەو زۆربەی خواستەکانی منداڵیم بە دەوری ئەم تەپۆڵکەیەدا دەگەڕێن و منیش ناتوانم بێ ئازارو خەمێك لێرە بەجێیان بێڵم)

لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان و تا ناوەڕاستی هەفتاکانیش لە هەولێر چەند شەقامێکی دیارو سەرەکی هەبوون کە بە پەنجە دەژماردران ئەویش لە سنووری (٣٠) مەتری ئێستا کە بە شێوە بازنەییەکەی چەند گەڕەکێکی لە خۆ دەگرت وەك گەڕەکەکانی (تەیراوە تەعجیل خانەقا سەعدوناوە سەیداوە سێتاقان گەڕەکی عارەبان و قەڵات) جا ئەو گەڕەکەی تا ناوەڕاستی هەشتاکان تیایدا ژیاوم بە هەڵگرتنی کۆمەڵێك بیرەوەری خۆش و ناخۆشییەوە، ئەو گەڕەکە، گەڕەکی عارەبان بوو لە چەقی شارو شوێنێکی ستراتیژی بوو، لە نێوەندی دوو شەقامی پڕ لە جۆش و بە جولەو زیندوو، یەکێکیان شەقامی مزەفەرییە بوو کە بە شەقامی باتە ناوی دەهێنن لە خوار دامێنی قەڵاتەوە، ئەوەی دی کە مەبەستمە لەسەری بوەستم و باسی لێوە بکەم بە شەقامی مەحەتە ناودار بوو کە لە فولکەی شێخ مەحموودی نەمر درێژ دەبۆوە بە نێوەندی خەستەخانەو پارێزگای ئێستا و سینەمای سەلاحەدینی ئەوسا و سولتان

موزەفەرەدین و قوتابخانەی سەرەتایی نەهزەو بۆتان تا دەرگای مەحەتە (وێستگەی شەمەندەفەر) کە ئێستا بووە بە پارکی شانەدەرو ماوەیەکیش بەر لە ئێستا بەندیخانەی مەحەتە بوو، بەر لەوەی بگەینە بەر دەرگای مەحەتە هەتا کۆتایی هەشتاکانیش ئەو گۆڕەپانەی ئێستا ناوی دەهێننن بە (فولکەی بە تەمای خوا) بە گۆڕەپانی شێخی چۆلی ناودار بوو، بەشێك لە شوێنی بانقی هەرێم و پارکی شانەدەرو پارکی منارەی ئێستا، بەست و کەندەلان بووو پردێکی بە سەرەوە بوو، لە ژێر ئەم پردەوە ئاوەڕۆێکی پیس بوو دەڕۆیی لە (بەنی سلاوە) وە تا تەعجیل و سەعدوناوەو بەرەو تورەق و دەرەوی شار دەبۆوە، بەو پێیەی ئەوسا باران پتر لە ئێستا دەباری زۆر جاران ئەو بەستە پڕ لە ئاوی شێلوی لافاوو سێلاو دەبوو هەر لە رۆژهەلاتی هەولێرەوە تا رۆژئاوای، چەند لانك و شەقرەو کاریتەو کەرستەی مالّی رووخاو سەر ئاو دەکەوت و زۆر ترسناك بوو، هەندێ جاریش تا سەر ئەو پردەی بەر دەرگای مەحەتە ئاو بەرز دەبۆوەو پەنگاوی دەدایەوە، تاکۆتایی هەفتاکانیش بە تایبەتی لە پەنجاکان و شەستەکان کە خۆم بینیومە بە دەگمەن تاك و تەرا ئۆتۆمبێلێك لەسەر شەقامەکان دەبینرا ئەوەتا ئەو فولکەیەی کە ناویان ناوە فولکەی بە تەمای خوا لەبەر زۆری ئۆتۆمبێل وتیکقژقژاوی و گوێ نەدان بە رێنماییەکانی هاتو چۆ لەو گۆڕەپانەو لەبەر دەرکی مەحەتە، وێنەیەکم لێ گرتووە لەبەرواری (١٩٦٥)و (١٩٦٧) لەسەر پردەکەو لە پالّ کەندەلان و بەستەکە بە دیار دەکەوێ کە چۆن بووە، تاك و تەرا ئۆتۆمبێلێك یان ئارەبانەو کەرو بارێك دەبیندرا بەوێدا تێپەڕ بێت.ئەم وێنەیەش لە دوا لاپەڕەکانی ئەو کتێبەمدا دامناوە بۆ بینینی.

دێمە سەر باسێکی گرنگی ئەم وێستگەیەی شەمەندەفەرو شوێنەکەی‌و پەیوەست بە خەڵکانی دانیشتوانی دەوروبەری وەك گەڕەکی عارەبان‌و تەعجیل‌و سەعدوناوەو تەیراوە تایبەتە.

١- جگە لەوەی ئەم وێستگەیە کە بە دیاردەیەکی پێشکەوتوویی‌و ژیاری ئەم شارە دەژمێردرا بۆ گواستنەوەی هاولاتیان لە هەولێرەوە بۆ کەرکوك‌و بەغداو پێچەوانەکەیشی، هەروەها گواستنەوەی کالاو باری هەمە جۆری بازرگانان‌و حکومەت، من بەش بە حالی خۆم بیرەوەری‌و یادگاری زۆرم لەگەڵ ئەم وێستگەیە هەیە، (مامم) عەسکەر بوو کە لە بەغداوە دەگەڕایەوە دەچووینە پێشوازی، بەر لە هەموو شتێك پرسیارم لێ دەکرد چیت بۆ هێناوم، هەندێك لە شەمەندەفەرەکە دوور دەکەوتینەوە، جەنتاکەی دەکردەوەو دیارییەکەی لعابەیەکی جوانی کوڕان بوو دەیدامێ، بە هەمان شێوە کە هەراش ببووم لە تەمەنی (١٠) ساڵ‌و رووەو سەرەوەتر، دەچوومە ئەم وێستگەیە چاوەڕوانی شەمەندەفەرم دەکردو بەو پێیەی براکەم لە بەغداوە دەهاتەوە هەولێرو تا نێو ماڵەوەمان جەنتاکەم بۆ هەڵدەگرت.

٢- ئەم وێستگەیە چۆن دواتر بوو بە پارکێکی رازاوەو جوان، پارکی شانەدەرو پارکی منارە، پیشتریش ئەم وێستگەیە وەك شوێنێکی گەشتیاری بوو، لە پاڵ ئەم وێستگەیە غاباتێك هەبوو، جا لە وەرزی بەهاران زیاتر خەڵکەکەی ئەم گەڕەکانەی دەوروبەر بە خاوخێزانەوە سەماوەری چایەو خواردەمەنیان لە ناو گیا وگوڵی ئەم وێستگەیە یان دارستانەکە دادەنا تا ئیوارەیەکی درەنگ بە خۆشی رایاندەبوارد، جاری وا هەبوو لە گەڕانەوەیاندا بۆ ماڵەکانیان ئەو خەڵکە وا رێچکەیان دەبەست لەبەر دەرگای ئەم مەحەتەیە چوونە دەرەوەیان زۆر بە زەحمەت بوو.

٣- هەر لە نێو ئەو مەحەتەیەی ئەوسا و بەرامبەر بە پارکی شانەدەرو بە لای پارکی منارەی ئێستا گلکۆیەك هەبوو و ئێستاش هەر ماوە، گۆڕی کچە بە شەڕەفی هەولێر (یەزداندۆخت)، (ستی ئیمام) کە کاتی خۆی ئەو کچە مەسیحی بووەو کارو باری دیریێی هەڵسوڕاندووە، نەك هەر ئەو کات کە هێشتا مەحەتەو شەمەندەفەر هەر مابوو، ژنان دەچوونە سەر ئەم مەزارگەیەو نزایان دەکرد بۆ مرازو داخوازیو حەسرەتمەندیان، کە پیرۆزمەند بوو لە لایان، ئێستاش لەگەڵ دابیٚ، ژنان هامشۆی ئەو مەزارگەیە دەکەن، جگە لەوەش گۆڕێکی دی هەبوو بە ناوی بابە گوڕ گوڕ، ژنان دەچوونە سەر ئەم گلکۆیە ئەم دێڕەیان دەگوتەوە (بابە گوڕ گوڕ.. هاتین بە گوڕ.. بۆ کوڕ) هەندێکیش لە ژنەکان خۆیان گلۆر دەکردەوە، ئەگەر گلۆربونەوەکەیان بە بیٚ تەکانی خۆیان ببوایە ئەوە دیارە مرازو خواستەکەیان جێبەجیٚ دەبیٚ، هەروەها بەردیان بە کێڵەکەوە دەنووسان، ئەگەر پێوەی نووسا با ئەوە مرازەکە جێیی خۆی گرت بە پێچەوانەوەش بە هەناسە ساردیو نا ئومیدیەوە دەکشانەوە، ئەم هەڵسو کەوتەش نەك ژنان بگرە زۆربەی قوتابیان لە هەر دوو ڕەگەز کچ و کوڕان ئەنجامیان دەدا بزانن لە ئەزموونەکان سەردەکەون یان نا؟

٤- لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەو گەڕەکانەی ناومان هێنان خەڵکی هەژارو کەم دەرامەت بوون، خانووەکانیان پێك هاتبوو لە دوو ژوور یان ئەوپەڕەکەی سیٚ، یان لە حەسارەکان کرێچی بوون یەك ژووریان هەبووە، واتە هیچ قوتابیەك نەبووە ژووری تایبەتی خۆی هەبێت بە دەگمەن، بۆیە قوتابیان بۆ سەعیو خوێندن دەچوونە مەحەتەو غاباتەکەی، ئەگەر بارانیش بووایە سالۆنو لەودە گەورەکەی کە ئەو کاتەی شەمەندەفەرەی لیٚ نەدەبوو دەچوونە ژوورەوەو لەوێدا دەیانخوێند، هەروەها قوتابییەکان

بۆ پرسیار له یەکتر کردنیش ئەگەر وانەیەکیان لیٚ روون نەبووایە سوودیان لەو شوێنە دەدی، قسەی خۆمان بیٚ جار جاریش چاوبازیو دڵداریو کۆبوونەوەی نهێنی حزبایەتیو کوردایەتی لیٚ دەکرا بە تایبەتی دیدارو کۆبوونەوەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لەو شوێنەدا.

گەلۆ ئەزیش یەکێك بووم لەو قوتابیانەی بە گشتی باسم کرد لەو بازنەیەدا.

(واین دایەر) ی زاناو نووسەر دەڵێت: (لاشەی تۆ گەراجێکە، رۆحتی تیا وەستێنراوە) بەڵیٚ راستی فەرمووە... ئەوەتا شکسپیریش دەڵێت: (چاومان هەیە بۆ سەرسام بوون، بەلاٚم پێویستمان بە زمانە بۆ ستایش کردن)

هەڵبەتە ئەو وێستگەیەی شەمەندەفەر لە هەولێر هێندە یادگارییەکانی بە لامەوە کاریگەر بووە ئەگەر زیاتر لەسەری بوەستمو باسی بکەم زیاتر ئۆخەژنم دەکات:

مأموری ئەم وێستگەیە ناوی (جۆرج) بووو مەسیحی بوو کە دەکاتە باپیری (حەمکۆ) ی هونەرمەند، ئەم وێستگەیە رێستهاوسی هەبوو بۆ میوانو کاربەدەستانی حوکمەت کە لەو شوێنە دەنووستنو دەمانەوە وەکو ئوتێل وا بوو، ئەو شەمەندەفەرە بە هەڵمی خەڵوز کاری دەکرد، بەم شوێنانەوە تاکو بەغدا دەرۆیشت هەر لە رێگاش نەفەر دادەبەزیو یان نەفەر سوار دەبوو هەمزە کۆر پردیٚ / ئاڵتون کۆپری کەرکوك گوندی بەشیر دوزخورماتوو سلمان بەگ کفری قەرە تەپە جەلەولا سەعدیە مقدادیە شەهرەبان خان بن سەعد تا وێستگەی بەغدا.

لە دیوانی (چۆڕاوگە) مدا کە لە ١٩٨٣ بە چاپم گەیاندووە شیعرێکم تیایدا هەیە بە ناوی (پەسارگە) کە چۆلەکەیەك تا دەچێت پوشو پەلاشو

انەوێڵە بۆ بێچوەکانی بباتەوە نێو ئەو فارگۆنە تەریك کراوە کە هێلانەی داناوە، کە دەگەڕێتەوە فارگۆن نەماوە وشەمەندەفەر بە دوای خۆی یکیشاوەو بردوویەتی کە بەم شێوەیە:

پەسارگە

پەردە، ئەو پەردەیە جاڵجالوکە چنیویەتی

پەردەیەکی تەنكو نهێنیەکی ئەستوورە

ئەوەی خۆی لە پشت ئەم پەردەیەو پەسارگەیەدا حەشارداوە

گەلێ مەستوورە

ئەی جاڵجالۆك.. ئەی لاوازۆکە

ئەی وردیلەی ئازار کێشو شەکەت

ئەی پاسەوانە بە هێزەکەی بەر دەرگای ئەشکەوت

ئەم پرسیارەم بگەینە ژوورەوە

بڵێ کۆترە کێویلکەیێ هاتووە لە دوورەوە

ئەڵێ.. لە کۆنە فارگۆنێکی راگیراودا، هێڵلانەم چێ کرد بوو

بێچووی زیتەڵەو جوانم هەبوون

لە شەواندا من هەڵدەکوڕمام،

ئەوانیش وەکو گلۆپەکانی شەقام هەڵدەبوون

بەیانییەك، لە شەقەی باڵم داو کەوتمە گەڕان

تا پووشو دانەوێڵە پەیدا کەم بۆ بێچووەکان

بەلام وەختێ گەڕامەوە، چۆلەکەیەك ئاگاداری کردمەوە

رابوو.. رابوو، شەمەندەفەر فارگۆنی بردوو رۆیشت

منیش تا پێم کرا.. لە هەواری چۆڵو هۆڵدا

**باڵی گریانم پێك دادا**

**هاتووم پێیان بڵێیت، ئەبێ بێچووەکانم لە کوێ بن؟**

**ئەمێنن.. ئەمرن؟**

**(با) ی ئەم کەژانە، لەسەر لاپەڕە ی سییەکانمدا نووسیویانە**

**سیەکانت تەنگن و، پشووی ئەشکەوتیش فراوانە!!**

## ئەو ئامێرانەی ڕۆژانێ کارا بوون، ئەمڕۆ پیرێکی جوانن

(٦)

میلی کاتژمێر لە سووڕانی خۆی ناکەوێ، ڕووباری زەمەن هەر دەڕواو ئاوڕیش ناداتەوە، گوند دەبیتە شارۆچکەو شارۆچکەیش دەبیتە شار، مرۆڤـ وەك نەمام هەڵدەچێو پیریش دەبێو دەبێتەوە بە خۆڵ، شێوەو قەبارەو قەوارەکان گۆڕانکارییان بە سەر دادێ، خونچە دەبێتە گوڵو گوڵیش هەڵدەوەرێ، ئەو ئامێرانەی ڕۆژانێ بکەرو کاراو جحێڵ بوون، کە بەش بە حاڵی خۆم بینیوومە هەر لە پەنجاکانو شەستەکانو هەتا هەفتاکانیش کەچی ئێستا دەستێك وەلاوەی ناوەو لا تەریکی کردوون ئەویش پێشکەوتنو هەژموونی زانستو شارستانیەتو تەکنەلۆژیاو پیشەسازی سەردەمە کە بەرایی لە ڕووبارەی زەمەن ناگیرێو بەردەوامەو بەردەوام، لە دیمانەیەکدا پرسیارێکیان لێ کردم (پ: دەڵێن تۆ هەموو ڕۆژ خۆت دەشۆیو ردینت دەتراشی ئەمە ڕاستە، جلەکانت ئوتو کراوو خاوینن؟

وەلامم ئەوەبوو، بەڵی چونکە کە خۆم دەشۆمو ردێنم دەتراشم واتە کوڕی ئەمڕۆمە نەك هی دوێنێ) بەڵام بڕوام وایە بیرەوەرییو وینەکانی دوێنێو ئامێراکانی بە کار هاتووی، هەتا مرۆڤەکانی کە پیرێکی جوانن شوێنو ناوو بایەخی تایبەتیان لەبەر چاوو لە ناو زەینو لەسەر زارن،

ئـەوەتا دەڵـێین پێشـمەرگەی دێـرین، ئـەو کـەل‌و پـەل‌و ئامێرانـەی کـۆن‌و بەکار ناهێندرێن دەبن بە کەلەپوورو لە مۆزەخانـەو گەلـەری‌و پێشـانگاکان دادەنرێن‌و بە نرخن، دەبینین ئەو ئۆتۆمبیلە مۆدیل کۆنانەی کە کاریشیان پـێ نـاکرێ تـا چ نرخێکـی بـەهادار لـە پێشـانگاکانی تایبەتـدا لـە ولأتـە ئەوروپیە پێشکەوتووەکاندا دەخرینە مـەزات بـۆ دەوڵەمەنـدە کۆمبـرادۆرو ملیادیرەکـان بــە نرخێکــی خــەیاڵی دەفرۆشــرێن، چــەند جوانــە کــاتێ پـەیتونێك بـە جـووت ئەسپێکەوە دەبیـنین، بـەلأم شـتە کۆنـەکان زیـاتر بـۆ کەسە کونینەکان جوان‌و بە نرخن چونکە لە گەڵی ژیاون‌و بیرەوەرییان بۆی هەیە، ئەوەتا شـاعیرو نووسـەری نـاودار (ئۆکتـاڤیو بـاز) دەڵێـت: (رابـردوو مەزنـە بـۆ کەسـانی کۆنینـەو بـە سـەردەمی زێرینـی دادەنـێن چـونکە ئـەو بەهەشتە بووە کە لێی دەرچوونە، بەلأم بۆ نەوەی تازەو داهـاتوو خـاکێکی ئایندەیی چاوەڕوانکراوە، مەرج نییە ڕابردوو باشتر بوو بێ لەوەی ئێستا، هەڵکـەوتوویی لـە پشـتمانەوە بـوو بـێ، بـەڵکو لـە پێشـماندایە) بـەڵێ وەك نموونـە کەسێکی زەمـانی ئەسـا لـەو هـەولێرە لـە (گۆمـە پـیس) کـە ئـاوی بـارانی زســتانی لــێ کــۆ دەبــۆوە مەلــەوانی لــێ کــردووەو ئێســتایش مەلەوانگەیـەکی سـەردەم‌و خـاوێن‌و جـوان‌و تەندروسـت دەبینـێ، کەچـی ئاهێـك بـۆ گۆمـە پـیس هەڵدەکێشـێ‌و لـە یـادی ناکـات، هەڵبەتـە سـەردەمی منداڵی لە ڕۆژانی جەژن‌و بن لـەیلووك‌و یـاری‌و ڕۆژە خۆشـەکانی بـەراورد لەگـەڵ شـاری یـاری ئێسـتا، جیاوازییەکـەیان هێنـدەی ئـەرزو ئاسمانـە (ویلیـام ئینـج) ی زانـا دەڵێـت: (دوو جـۆر گـەوج لـە دنیـادا بوونیـان هەیـە یـەکێ ئەوانـەی دەڵـێن ئەمـە هـی کۆنـەو زۆر چـاکە دەسـتەکەی تـر دەڵـێن ئەمە تازەیەو باشترە) گۆڕانارییە تازەو تیژڕەوەکان نـەك هـەر لـە ئامێرەکـان بگرە لە لانی ئەدەب‌و هونەرو وەرزش‌و زانست‌و کۆمەلایـەتی‌و ئـابووری‌و

رامیاریو بازرگانیو گەشت وگوزارو دابو نەریتو مۆدو دامو دەزگاو بیناو باڵەخانەکانو ڕێگاو بانو هاتوو چووو کاری هەندەسیو کەرستەو ئامێرەکانی کشتوکاڵیو گشت بوارەکانی ژیانو ژینگەو بژیویو بۆنەکانو رەفتارو ئیتیکێت بەر گۆڕانکاری کەوتوون... هتد لێرەدا وەك نموونەیەکی زیندوو دوو جۆرە ئامێری کارا دەخەمە بەر چاو کە ئەوسا چۆن بکەرو کارا بوون لە پاڵ بیرەوەرییەکانی کەسانی ئەوانی ئەوسای لە رۆژو ساڵەکانیاندا:

**١- قەوان واتە (گرامافۆن) جۆرێك لە ئامێرە دێرینەکان**

*عەبدوالوەهاب بەیاتی شاعیر دەڵێت:

(منو تۆ، ڕۆژانێك لەسەر ئیستوانەیەکدا دەسووڕاین)

*بەر لە ساڵانی پەنجاکان قەوان هەبووە، بە شێوە عامییە سەر زارەکییە راهاتنەکان هەر بە (قەوان) ناوی هێنراوە کەچی قەوان ئەو دیسکەیە یان ئەو ئیستوانە رەنگ رەشە بازنەییە دەخرێتە سەر دەزگاکە، واتە ناوی جیهازەکە (گرامافۆنە یا بە گرام ناوی دێت) بە شایەدی هەندێك لە پیاوە بە ساڵاچووەکان کە خەڵکی سادەو ساکارو هەژار بوون، پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییان فراوان نەبووە، کاتێ قەوانیان بینیووە گوتوویانە ئەمە سندوقێکە جنی تیایە، هەندێکیان پێی سەرسام بوونە یان لێی ترساون گوتوویانە چۆن ئەو چاوەشە واتە ئەو گۆرانیبێژە چووتە نێو ئەم سندووقە، ئەمە سیحرە، خۆم کە قەوانم بینی لە ساڵی ١٩٥٩ ئەویش کە هاو گەڕەكو هاوڕێ بووم لەگەڵ (شامل مەردان ئاغا) هەر لەو گەڕەکەی عارەبان، لە ماڵی ئەوانو گوێم لێ گرت، زۆر بەو قەوانە

دڵخۆش و سەرسام بووم و گوێم لە گورانی نەسرین شێروان و ئەگەر بە هەڵە نەچووبم (شەمال سائب)و ئیتریش بوو.

* گرامافۆن سندوقێك بوو بە قەوارە تا ئاستی (١٦٠ سم چوار گۆشە یان لاكێشەیی) بنكەكەی لە دار دروستكراو، بەردە بازنەییەكی بە سەروەوە بوو كە لە نێوەندیدا گۆیەك هەبوو بۆ ئەوەی قاوانە ڕەشە بازنەییەكە لەسەری گیر بكرێت و لە تەنیشتەوەیش (هاندل)ێك یان بە وتە عامییەكە هەندرێكی هەبوو، كە قەوانەكە دەخرایە سەر، هاندلەكە باو دەدرا تا ئاستی (كۆك) بوون، واتە پڕ بوونی وزەو توانای هاندلەكە چەشنی قورمیشی سەعات كە بادەدرا تا بە تەواوی گیر دەبوو یان بڵێین پڕ دەبوو، دواتر وەك باسكێك درزیەكی بە سەرەوە بوو باسكەكە دادەگیرایە سەر قەوانە بازنەیە ڕەشەكەو دەرزیەكە دەكەوتە سەری، هەروەها (مكبرە)یەكیش بۆ گەورە كردنی دەنگەكەی بە سندووقەكەوە چەسپا بوو ئیتر یەكەم دەنگ كە بیستم و دواتریش بە زۆری دەمبیست سەرەتا بە بە زمانی عەرەبی (من تسجیلات چخماخچي).

* لە شاعیر (مەدحەت بیخەو)م بیستووە دەیگووت لە ساڵانی پەنجاكان لە دیبەگە یەكێك كە نامەوێ ناوی بهێنم قەوانێكی هەبوو ئێمەی منداڵانی هەراش لەو سەردەمدا دەچووینە ماڵی ئەو پیاوەو گوێمان لە گۆرانیە تۆماركراوەكانی نێو قەوانەكە دەگرت بەو مەرجەی هەر یەكێك لە ئێمە هێلكەیەك لەگەڵ خۆمان ببەین و دەمادایە كەسەكەی خاوان قەوانەكەو زۆر سەرسام دەبووین لەگەڵ گۆرانی و مۆسیقا و ئاوازەكان.

بەڵێ قەوان یان گرام ئێستایش چ وەك قەوانە كۆنیینەكان لە ماڵان و مۆزەخانەو گەلەری و پێشانگاكان دانراون بۆ جوانی و یادگاری یان بۆ

فرۆشتن کە هەمیشە بە نرخ و بایەخەوە سەیر دەکریٚ و بە کاریش دەهیٚندریٚ.

هەڵبەتە قەوانیش جۆرەیٚك بوو وەك تسجیلەکان کە دواتر لە پەنجاکان ڕادیۆو ئیتر تسجیلی بەکرەی بازنەیی شریت پەیدا بوو ئینجا لە هەفتاکان بەرەو سەرەوەتر تسجیلی هەمە چەشنی گەورەو بچووك بە جوانکاری زۆرەوەو مۆدیرن بەر چاو دەکەوت، ئەوە بوو لە هەفتاکان لە عیراق بە گشتی و لەو کوردستانەی ئیٚمەشدا تەلەفزیۆنی رەش و سپی پەیدا بوو، لەگەڵ بەرەو پیٚشەوە چوونی زەمەن و گۆڕانکارییەکان دواتر تەلەفزیونی رەنگاو رەنگ و مۆدیرن بە جۆرەها شیٚوەو قەوارەی جیا جیا.

## ٢- ڕادیۆو کاریگەرییەکانی و ڕۆژانیٚ

*لە ساڵی (١٩٥٧) تەمەنم شەش ساڵان بووە لە ماڵی خۆماندا ڕادیٚۆم بینیووە، لە دەڵاقەیەك دانرا بوو، دایکم بەرگیٚك لە قوماشیٚکی بریقەداری گوڵ گوڵی لە ڕادیۆکە هەڵکیٚشا بووو لەپکەیەکی شینی چاو وزار لە نیٚوچەوانی ڕادیۆکە قایم کرد بوو نەوەك بە چاو بچیٚ، لە تەنیشت ڕادیۆکە پاتریٚکی گەورە هەندیٚك لە ڕادیۆکە گچکەتر بوو دانرا بوو، ئاریەلیٚکی هەوایی رەنگ شین لەسەربانەوە بۆ نیٚو ڕادیٚۆکە شۆڕ کرا بۆوە تا دەنگی ڕادیۆکە سافتر وەرگریٚ، جار جار ئەم پاتریەش بارگاوی (شحن) دەکرا، هەروەها ئاریەلیٚکی ئەرزیشی بۆ دانرا بوو نەوەك برۆسکەی هەورو باران لیٚی بدات، لە یادمە مارکەی ڕادیۆکە (سیرە) بوو، ئەوەبوو لە شەستەکانیش ئەو ڕادیۆییەمان گۆڕی بە ڕادیۆیٚکی پیٚشکەوتووتر مارکەی (فلیبس) بوو بە هەمان شیٚوە پاتریٚك بە ناوی پاتری (بیٚرگ) قەبارەکەی بە قەد چواریەگی ڕادیۆکە بوو لە تەنیشتی ڕادیۆکە دادەنرا بە

وایـەری گەیَنـەر بـە ڕادیۆکـە پەیوەسـت دەکـرا بـەڵام بارگـاوی کردنـی (شـحن)ی پێویسـت نـەبوو، کـە لـە کـار دەکـەوت پـاترێکی تازەترمـان بـۆ دەکڕی، ڕادیۆکە ئاریەلی هەوایی و ئەرزیشی پێوەوەی قایم دەکرا.

* رادیۆ تا ئێستایش لە گەڵدا بێ کاریگەری خۆی هەیە، جگە لەوەی ڕادیۆ نەوەی بەر لە پەنجاکان و دواتریش بە گۆرانی کوردی و عارەبی و فارسـی ئاشـنای کـردووین هـەر لـە گـورانی و مۆسـیقای سـەردەمانێك (حەسەن جەزراوی و کاوێس ئاغا و عەلی ئەسغەرو سێوەو مریەم خان و نەسرین شیروان و گوڵبـەهارو عـەلی مـەردان و رەسـوول گـەردی و شـەماڵ سـائیب و تـاهیر تۆفیـق و.. هتـد، هـەروەها لـە گۆرانبێـژە عەرەبـەکان وەك محەمەد عبدالوهاب و فرید ئەترەش و عبدالحلیم و نازم غەزالی و صباح و فـەیرۆزو زوهـیرە حوسـێن و ئیسـمهان... هتـد، هـەروەها لەگـەڵ چیرۆکی شەوانی بە سەر بردوو بە گوێگرتن لە ڕادیۆی کرماشان و نواندنەکانی بە دەنگ، ڕادیۆی بەغدای بەشی کوردی و بەرنامەکانی کە هەر بە دەنگ بوو نەك وەك زنجیرە ئەلقە دۆبلاژ کراوەکانی ئیستا کە لە کەناڵەکانی چەندین تەلەفزیۆنـدا بـە وێنـە و دەنـگ و رەنـگ پـەخش دەکـرێ، بـۆ بزەیـەکی سـەر لێوانیش لەم ساڵانەی دوو هەزارو هەندێکدا شەوێك لە شارۆچکەیەکدا نامەوێ ناوی بهێنم دەبێ بە تەقەو هەرایەك تا ئاستی تەقاندنی ئاربیجی، خەڵکێك بێ ئاگا ترسێکی زۆر دایاندەگرێ نازانن مەسەلە چییە؟ دواتر کە شار ئارام دەبێتەوە پرسیار دەکەن؟! دەرکەوتووە یەك لەو ئەلقانەی دۆبلاژ کراو (گۆدەلۆپی) دەرکەوتووە کە گۆدەلۆپی منداڵەکەی دۆزیوەتەوە لە خۆشیان لە لایەن چەند کەسانێکەوە ئەو تەقەو فرتەنەیە بەرپا کراوە، دەگەڕێینەوە سەر ڕادیۆی رۆژانێ، بەڵێ جگە لە لانی هونەری کاریگەری ڕادیـۆ بـۆ نموونـە لـە دوای بـەرپا بـوونی شۆڕشـی ئـەیلوولی مـەزن لـە

(١٩٦١)وە ڕادیۆ کاریگەرییەکەی هێندە زۆر بوو لە هەژمار نایێ لە هاندانی پێشمەرگەو جەماوەرو بەردەوامی شۆڕش و کوردایەتی و بەرخودان و بەهێز کردنی رۆحی نەتەوایەتی، لە ساڵی (١٩٦٣)وە ئەمدی شەوانە لەگەڵ یەکەم سەدای (ئێرە دەنگی کوردستانی عیراقە) باوکم خەریکی میلی ڕادیۆکەمان دەبوو و دەبووایە کەس نوقەی لێوە نەیێ گۆیی خۆی دەدایە ڕادیۆکەو جار جار کەیف خۆش دەبوو بە هەواڵی سەرکەتن و چالاکییەکانی پێشمەرگەو دەستەکانی ڕادەوەشاند جار جاریش نێوچەوانی گرژ دەبوو لەبەرئەوەی مۆسیقای (هانی هانی) دەنگوباسەکانی لێ تێکەڵ دەکرد، خاوخێزان هەناسەمان لە خۆ بڕیبوو نەدەوێراین جولانەوەیەك و تەقەو ڕەقەیەك بکەین تا هەواڵەکان تەواو دەبوون، جار وا بوو برادەرەکانی دەهاتن ئەوانیش بەشداریان دەکرد ئەمدی باسکەکانیان لەسەر کومبارو دۆشەکەکان گیر دەکردو سەریان لێك نزیك و هەناسەیان لە خۆ بڕیبوو هەر ئەوەتا نەدەچوونە نیو ڕادیۆکەوەو گوییان قولاغ و تا دەنگوباسی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق تەواو دەبوو... جا بیرەوەری ئەوێ رۆژان، ئەو شیعرەی پێ دارشتم (بۆ ڕەوانشادی باوکم):

لە حەوشەی ماڵەکەماندا باوکم،
بالیفێکی خڕکەلەی لە سەرینگانی
لبادێکی نەخشداری دادەنا
دەیخستە بن باڵی و لێی ڕادەکشا
میلی رادێویە سندوقیەکەی دەسوڕاند
لە تەك رادیۆکەدا، پاترییێکی بێرك

ئاقلآنه دانیشتبوو خوی نەدەجولاند
(هانی هانی) وازی لیٚ نەدەهێنا
هەتا (ئێرە دەنگی کوردستانی عیراقە)
بە روونی تێیی بگا
ئەی باوکە گیان
چ رێکەوتو خەونێك بوو گەڕایتەوە نێومان
نیو حەوشەکەی شیعرو خەیاڵی ئەوسامان

*بەڵی منیش وەك خۆم زۆر عیشقی ڕادیۆ بووم بە تایبەتی (ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق) بۆ؟

چونکە بە پەروەردەو بیرەوەرییەکانی خێزانو باوکمو کوردایەتیو شۆڕشو بەرخودان ڕاهاتبووم، هەروەها لە ساڵی (١٩٦٩) کە تەمەنم هەڤدە ساڵان بوو پێشمەرگە بوومو لە پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕشی ئەیلوول لە چۆمان لە قوتابخانەیەك لە دامێنی مەمی خەلان کە ئێزگەی دەنگی کوردستانی لیٚ بوو، لەو پەیمانگەیە دەمخوێند جا بەو پێیەی لەگەڵ زۆربەی کارمەندو بێژەرەکانی ئێزگە ئاشنایەتیو دۆستایەتییەکم لە گەڵیاندا هەبوو کە لە مەمی خەلان دادەبەزینو لە چایخانەکەی (فاتح ئالتونچی) نزیك پردی چۆمان دادەنیشتن، ئیتر دوای تەواو بوونی پەیمانگەی مامۆستایانی شۆڕش، فەرمانم بۆ دەرچوو لە هیران لە ناوچەی خۆشناوەتی دەستبەکار بم، لە هیرانیش لەگەڵ دەستەو ستاڤی ناوچەی هیزی سەفین لە یەك بنایەدا بووین، بگەڕێمەوە سەر ڕادیۆکە، خوا خوام بوو ئێوارە دابیٚ لەگەڵ هاوڕێکانم کە پێکەوە بووین بە بیٚ ترس دەنگی ڕادیۆکەمان بەرز

دەکردەوە ئۆخەی ناوچەی ئازادو دەنگی ئازاد (ئێرە دەنگی کوردستانی عیراقە، بە سروودی ئێمە پێشمەرگەین هەتا ماوین لە ژین... نیشتمان رزگار دەکەین لە خوێن مژین.. هتد) دەنگە زولاڵەکانی بێژەرە دۆستو بە ئاشنا بووەکانم دەناسییەوە، بەڵێ ئەوە دەنگی بارزان مەلا خالیدە، ئەوە دەنگی رەفیق چالاکە.. ئەوە دەنگی عوسمان سەعیدە، ئەوە سەعید یحیی یە لە بەشی عەربیەکەی.. هتد، ئەوەندە هەبوو لەو سەردەمدا قەوارەو شێوەی ڕادیۆکان پیشکەوتنو گۆڕانکاری بە سەردا هاتبوو، کە چەند پاتریەکی بچوك هەڵگر بوون لە نێو خودی ڕادیۆکەو ئاریەڵی نەدەویست بۆ سەربانەکان ببەین بەڵکو بۆ سافکردنی دەنگ ئاریەلی لە نێو رادیۆکە بوو بە مەتریك دریژو بەرز دەکرایەوە.

*لە هەفتاکانیش ڕادیۆ ئەو رۆڵە گرینگو بایەخەی خۆی هەبوو بە تایبەتی کە لە ساڵی (١٩٧٤)وە جارێکی تر شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێکردەوە بە ڕەوەی ملیۆنی کوردانی باشوور روویان لە شۆڕش کردو ماڵو بەرژەوەندیو کارەکانیان وەلا ناو بوون بە پێشمەرگە ئیتر تاقە دەنگو ئاوەدانیو گڕی هاندانی پێشمەرگەو جەماوەرو بەرخودانو خۆ ڕاگریو وشیار کردنەوە هەر ڕادیۆ بوو، منیش لەو ساڵدا کە پێشمەرگە بووم بە هەمان خولیاو ئالودە بوونەوە بۆ ڕادیۆی دەنگی کوردستانی عیراق، کەی ئێوارە دادێ هەواڵەکانی بەرەکانی جەنگو شۆڕش گوێ بیست بین، جگە لەم ئێزگەیە لە ناو شۆڕش (شەهید عەبدولخالق مەعروف ئێزگەیەکی ناوخۆیی (محلی) درۆست کردبوو کە بە گورانی خۆش خۆش هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە چەند کاتێکی لێ دەستانین.

* لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لە (١٩٧٥)دا کە بە پیلانگێڕیو ڕێکەوتنێکی خیانتکاری نێو دەولەتی لە جەزایر بە سەر کوردو

شۆڕشـەكەی سـەپێندرا، شـۆڕش توایـەوە، بـەڵام لـە شۆڕشـی نوێـدا كـە لـە (١٩٧٧)وە رووەو سـەرەوەتر بـەردەوام بـوو تـا بـەهاری (١٩٩١) ڕاپەڕینـە مەزنەكـەی كوردسـتانی باشـوور، ڕادیـۆ دیسـانەوە تاقـە ئومێـدو هانـدەرو داینەمۆی شۆڕش‌و بەرخودان‌و وشیار كردنەوەی جەماوەرو بەهێز كردنی رۆحـی كوردایـەتی‌و بـەرەنگاری‌و خـۆ ڕاگـری‌و پێشـمەرگایەتی بـوو، بـە تایبەتی (ئێزگەی گەلی كوردستان) هـەروەها (ئێزگـەی دەنگـی كوردسـتان) چـەندین ئیزگـەی تـری حزبـە سیاسـییەكانی نێـو كوردسـتانی عـیراق، بـە تایبەتی‌و تایبەتی لە ڕاپەڕینە شكۆدارەكەی بەهاری (١٩٩١)ی كوردسـتان كە هەر ڕادیۆ بوو ساتەو سـاتو هـەواڵ لـە دوای هـەواڵ شـوێنە ڕاپـەڕیوە ئازادكراوەكانی ڕادەگەیاندو وزەی وڕوژاندن‌و گڕی شۆڕگێڕانەی دەخستە دڵی جەماوەرو پێشمەرگەكان تا بە ئەمڕۆی گەیاندین.

# ئەو كاتەی وێستگەیەك دەمانداتە دەست وێستگەیەكی تر

(٧)

ژیان بەردەوامەو لە سوورِو سەیرورەی خۆی ناكەوێت، مرۆڤ هەر لەو رۆژەوەی چاوی هەڵدێنیٚ، قۆناغی بۆ دیاری كراوە، لە قۆناغی قۆنداغەیی تا پێرۆكەیی و هەراش بوون و هەرزەكاری و دواتر هەڵكەوتوویی و جحێلی و پاشانیش پیر بوون و هەڵوەرین و نەمان، ئیتر مرۆڤەو بە چەندین وێستگەی هەمە چەشن تێپەڕ دەبێت و وێستگەیەگ دەیداتە دەست وێستگەیەكی تر، بەڵام بیرەوەری و یادەكان ئەوەی بۆی دەمێنێتەوە بە تایبەتی لە دواین وێستگەدا كاتیٚ ئەو مرۆڤە بە ڕابردووی خۆی دادەچێتەوە، ئەگەر ڕابردووەكەی پڕ لە كاری خێرو خەبات و خۆشەویستی و متمانەو شانازی بە خۆ كردن بێت و شەرمەزاری تیا نەبێت كاری وای كردبێت كە بە نێو خویدا شۆڕ بێتەوە ئارەقەی پەشیمانی دەر نەدات و لە نێو كۆمەڵ و لەبەرامبەرەكان چاو بەرەو ژێر نەبێت كە نەفسیەت و كەسایەتی بڕۆشیٚ، ئەمە بۆ ئەو مرۆڤە دۆخێكە، باكی بە مردن و ئاكامەكانی خۆی نییە چونكە خۆی خۆیەتی، خۆیەكی سەر بەرز بەجیٚ دەهێڵیٚ و نەوەو كەس و كاریشی شانازی پێوە دەكەن و ناوەكەی و وێنەكانی هەمیشە لەبەر چاوان و لەسەر زاران دەبێت، دیارە ژیانیش خەون نییەو حەقیقەتە مرۆڤ چەند وێستگە ببڕێت ئیتر چۆن

هاتۆتە سەر زەوی ئاواش دەبێ بچێتە ژێر زەوی، ئەوەتا هەژار موکریانی لەم دوو دێڕەدا دەڵێت:

زۆر هاتنو مانەوەو رابردن
دەستاڕی مەرگ بە نۆرە وردی کردن

مرۆڤ هەمیشە لە ململانێو هەڵو کۆشش دایە، هەن دەوڵەمەند دەبن لەسەر حیسابی فەقیر کردنی ئەوی دی.. هەن دەبن بە زۆردارو خوێنمژو جەلاد لەسەر حیسابی چەوساندنەوەو بە کوشتدانی ئەوی دی.. هەن هەتا وێستگەکانیش شایەدی بۆ دەدەن کە چەند شەڕەفمەندو خۆ ڕاگرو مرۆڤدۆستو تێکۆشەرو نشتمانپەروەر بوونە، هەڵبەتە ئەو جۆرە مرۆڤانە نەمرن هەر وەك (پۆل ڤالیری) دەڵێت:

(پیاوانی مەزن دوو جار دەمرن، جارێکیان وەکو پیاو، جارەکەی تریش وەکو پیاوێکی مەزن.)..

هەن ژیان بە شتێکی هیچو پوچ دەزانن و لا تەریك دەژینو ملیان داوەتە بێ پاکیو تەوەزەلیو خۆ بە دوور گرتن لە دەوروبەرو بە بەشداری کردن لە هەر چالاکییەکی مرۆڤ دۆستی (مەکسیم گۆرکی) ڕاستی فەرمووە: (ئەوەی بۆ ئەوە لە دایك بووە لەسەر زگ بخشێ هەر گیز ناتوانێ بفرێ)..

بەڵێ مرۆڤی بە هێز کار دەکات، مرۆڤی بێ هێزیش دەپاڕێتەوە، هەن مەندو عاقڵو زیرەك کە خۆیان چران، دەوروبەریش رووناك دەکەنەوە وەك گوتراوە (پیاوی عاقڵ وەکو نێرگەلە قسە دەکات، لەسەرییەوە دەچێتەوە زگی ئینجا لە دەمییەوە دێتە دەر) پێچەوانەکەیشی ئەو دەبەنگەیە قسە هەڵداویو دەپرۆکێنێ بە جەفەنگو مەزاقو سەرەڕۆییانەو بریندار کردنی

بەرامبەرەکانی.. هەن متمانەیان بە خۆیان هەیەو کەسایەتیان بە هێزەو سەر دانانوێنو ماستاو سارد کردنەوەیان نییە، نکوڵی لە ژیانی پڕ لە درۆو فرو فێڵو کەڵەکە بازی دەکەنو بڕوایان بەم دوو دێڕە نییە کە ئەمڕۆ وا باوە:

**ڕەشم پۆشیوە، ڕەشتر لە بانی**
**قەت ئیشت ناڕوا ماستاو نەزانی**

*ئەگەرچی رۆژگاری ئەمڕۆو ئەو پێشکەوتنو بەرەو پێشەوە چوونەی دنیای دیجتاڵو مۆدو فەیسبووكو بکەرەکانی ئەلیکترۆنیو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانو کەرستە تەکنۆلۆژیەکانی سەردەمو خواستو ئارەزووە زۆرەکان وا لە مرۆڤەکان دەکات قەناعەتو متمانەیان لەڕو لاواز بێت، ئارامی کەمو ڕاڕایی زۆر بێت، وای لێ هاتووە تەلای زۆربەی مرۆڤەکان ژەنگ بگرێتو ئەوەندەی سامانو پارە مەبەست بێت، ڕەوشتی بەرز کەمتر، کە ئەو قەناعەتەی لە لای (ڤۆلتێر)یش پەیدا بووە لە کاتی خۆیدا کە بڵێت: (هەموو بەرامبەر بە سامان لەسەر یەك ئاینین.) ئیتر ئەو حاڵەتەی باسمان لێوە کرد هۆکارە بۆ لە دەستدانی متمانەو کەم بوونی وەفاو دڵسۆزیو پەیمانو خۆشەویستی ڕاستەقینەو رۆحی نەتەوایەتیو نشتماپەروەری.. هتد کە ئەو پەندە خۆی بدات بە دەستەوە (هەتا دەستت بە هەنگوینە دەیمژێ.. کە نەما دەیگەزێ.)... هەن دنیا خوازن، حازری بە قەرز نادەن، حەز بە ژیانی ئەمڕۆ دەکەنو بۆ سبەی نامرن، مرۆڤەو مافی خۆیەتی وای تەرخان کردووە بۆ ئایندەو ئاسمانەکان ناژی، دیارە ئەم جۆرە مرۆڤانەیش خواستیان زۆرە بۆ ئەوەی بەهەشتێکی بچکۆلانە لە

ناخی خۆیاندا دروست بکەن، زۆر عەودالْن و بە هەڵمەقۆن و پەلەش دەکەن بگەنە ئەو خاڵانەی لەبەر دەمیاند قیت دەبێتەوە، دیارە (أ بن المقفع) پێی وایە: (دنیا خواز وەك ئاو خۆری دەریایە، هەر چەندەی لێی بخواتەوە، هەندەی تر تێنووتر دەبێت).. سیاسەت و سیاسییەکانیش بە وێستگەکاندا تێپەر دەبن، هەڵبەتە سیاسەت دوو سەرەیە، یان لە خزمەت زۆرینەو میللەت و نشتماندا بەرهەمدارە، یان پێچەوانەکەی کە وێرانکەرەو درۆو فیشاڵی لە کارەکانی زیاترە، جاری وا هەیە سیاسەت بە جۆرێك ناوی دەهێندرێ وەك ئەوەی بە سەر زمانی ئەو دوو ژنەی لە نێو کولاندا بە شەر هاتبوون کە ماڵەکانیان بەرامبەر بە یەك بوو، ئەمیان بەوەی تری دەگوت (کچێ بڕۆ ژوورەوە با سیاسەتت نەکەم) ئەوەتا (خرۆشۆف)یش گوتوویەتی: (سیاسیەکان لە هەموو شوێنێکدا وەکو یەکن، بەڵێن دەدەن بە دروستکردنی پردێك، ئەگەرچی لەو شوێنە هیچ رووبارێکی لێ نیە.)

*وشەی وێستگە زۆر لە وشەی هەڵوێست.. موقف نزیکە، پیاوی بە هەڵوێست و پاك و نشتمانپەروەر هەمیشە لە یاد ناکرێ و لەبەر چاوانە، لە ساڵانی هەشتاکان، لە کۆشکی کۆماری عیراق (سەدام حوسێن) چەندین هونەرمەندو نووسەرانی پاداشت کرد بە پێدانی ترومبێلێك، لە نێو پاداشکراوەکاندا چەند هونەرمەندو نووسەرێکی کوردیش هەبوون کە ئەم پاداشتەیان وەرگرت، کەچی (تایەر تۆفیق)ی هونەرمەند رەتی کردەوە ئەم پاداشتە وەرگرێت، لەگەڵ ئەوەی ترومبێلی نەبوو بە پاس و بە پێ هاتوو چووی دەکرد، لە گەڕەکی سەیداوە لە خانووچکەیەکی بەردینی دوو ژوور تیا دەژیا بە کەم دەرامەت و بە زۆرکەڕامەت، لە دیمانیەکا کە لەگەڵ بەندە ساز درا، لێیان پرسیم ڕات بەرامبەر بە هونەرمەند تایەر تۆفیق بە یەك دێڕ

وەلأممان بدەرەوە؟ گوتم (تایەر تۆفیق لە موقفی پاس وەستا بوو دەیگوت (هەتا پاس موقفی هەیە، من چۆن مەوقفم نەبیٚ؟)

*بەڵیٚ دەرفەتەکان بە تیژی بە ویٚستگەکاندا تیٚدەپەڕن، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ئەو دەرفەتانە بۆ لایەنی ڕازی کردنی رۆحی خۆی کارو کردەوەکانی گیانی ڕۆشەن کەن تا گیانو ویژدانی هەمیشە ئاسوودە بیٚت، جوانترین نموونە وتەیەکی (کازانتزاکی) یە کە دەڵیٚت: (ئیٚمە لە بۆشاییەکی تاریکیەوە دیٚینو بەرەو بۆشاییەکی تاریکتر دەچین، ژیان بریتییە لەو مەودا ڕووناکەی دەکەویٚتە نیٚوان ئەو دوو تاریکییەوە.) واتە مرۆڤ کە لە دایك دبیٚت لە ناو زگیٚکی تاریکەوە دەردەچیٚتو کە مردیش بۆ نیٚو گۆڕیٚکی تاریك دەڕوا، لە نیٚوەندی ئەو دوو تاریکیەدا ڕووناکیەك هەیە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ئەو ڕووناکیەش وەکو ڕووناکی مامەلەی لە گەڵدا بکات نەك ئەو ڕووناکیەیش لە خۆی تاریك کاتو لە دەستی بدات.

دەگەڕیٚمەوە سەر چەند ویٚستگەیەکی دی کە بەرەو رووم بوەتەوە

*لە پەنجاکان تا کۆتایی شەستەکانیش لە نیٚو شاری هەولیٚرو دەوروبەرەکەی بە گوندو شارۆچکەکانییەوە بە تایبەتی لە شەوانی زستاناندا هیچ شتیٚکی ئەوتۆ نەبوو بۆ شەو بەسەربردنو بەڕیٚ کردن وەکو ئیٚستا، واتە خەریك بوون لەگەڵ چەندین ئامیٚری پیٚشکەوتوو، چ وەك تەلەفزیۆنو ئەنترنیٚتو مۆبایلو تۆڕە ئەلیکترۆنییەکانو گۆڤارو رۆژنامەو کتیٚبی هەمە جۆری زۆرو زەبەن هەروا دەیەها بووکە شووشەو ئامیٚرە یارییە پیٚکردنەکانی منداڵانو سەدان فیلمی کارتۆنیو ئای پاتو تاپ.. هتد، بۆ گەرمکردنەوەی ماڵیش نەك وەك ئیٚستا سپلیتو هیتەرو مەنقەڵەی کارەباییو جۆرەها سۆبە هەبیٚت.. هتد، بەڵکو خاو خیٚزانو میٚوان لە دەورەی مەنقەڵەیەکی پۆڵوە گەشەکانی ڕەژووی داگیرساو

ئەڵقەیان دەبەست، یان ئاگردانێکی دەستکرد لە قوڕ دروستکراو، یان سۆبەیەکی لە تەنەکەو لوولەیەکی دوکەڵکێشی پێوە پەیوەست بوو تا کولانکەی ژوور لەوێوە دوکەڵی ئەو سۆبەیە لەسەربان دەردەچوو، ئەم سۆبەیەش بە دار یان نەفت دایاندەگیرساند، لە کۆتایی شەستەکانیش سۆبەیەك بە ناوی (علاء الدین) پەیدا بوو ئەویش لەبەر بۆنی نەفتی تێکراوی ئارامی لە ماڵ هەڵدەگرت، هەندێك لەو ماڵانەی دەوڵەمەند بوون یان ماڵە ئاغاو پاشا و میرەکان لە نێو ماڵەکانیاندا لە سیلەی گۆشەیەکی هۆڵی دیوەخانەکانیاندا (ئۆجاغ) هەبوو، دیارە ئەم وشەیە تورکییە بە واتای ئاگردان دێت، کە داری تیا دەسوتێندرا بۆ گەرمکردنەوەی دیوەخان و ڕوخسارەکەیشی جوانیەکی هەبوو، ئەوەتا لەم سەردەمانەیش زۆربەی ئەوانەی خانوو دروست دەکەن ئەم ئۆجاغە دروست دەکەن زیاتر بۆ جوانکاری لە هۆڵی مێوانان، لەو سەردەمدا پیاوان و گەنجەکان ئەگەر بچووبوونایە چایخانەکان ئەویش لەبەر بەردەوامبوونی شەڕو شۆڕی هەڵگیرساوی شۆڕش لەگەڵ ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عیراق لەو سەردەماندا، زوو زوو لە ناو شاردا چالاکی تێکۆشەران و کوشتارو تەقەو پشێوی بەرپا دەبوو، وا دەکەوتەوە بە ڕاکردن و هانکە بڕی بگەڕێنەوە ماڵ، یان جار جار چوونە سینەما هەبوو بە تایبەتی لە شەوانی جەژنەکاندا، ژن و منداڵ و گەورەو گچکە ڕوویان لە سینەمەکان دەکرد، ئەو کات سینەمای (حەمرا)و (سەلاح الدین) هەبوو دواتر سینەمای (سیروان) پەیدا بوو، بەڵام هەموو چوونە دەرەوەیەك لە ماڵەوە بە دەستەو نەزەرو ترسەوە بوو، خەڵکی لەو سەردەمانەی ئاماژەم پێکردووە بە سادەیی و ساکاری دەژیان، نەك وەك ئێستا مێوانداری بە ئەتیکێت و یان سەفەرو چوونە وڵاتان بە تاك و گرووپ، تەنیا دەوڵەمەندە خواپێداوەکان و

ئاغاو میرو پاشاکان نەبێ، یان وەك ئێستا پەیڕەوی بۆنەکانو دەرچوون بۆ مۆڵو سوپەرمارکێتو چێشتخانەو کافتریاو ساڵۆنو ئاریشگاکانو هەوارەگەکانی گەشتیاری هەروەها ئاهەنگی داگیرساندنی مۆمی ڕۆژو مانگو ساڵی لە دایکبوون، تەنانەت لەسەر ژمێری گشتی ساڵی (١٩٥٧)دا کە لەسەرانسەری عیراق ئەنجام درا، بۆ ملیۆنان عیراقیو گەلی کورد بە تایبەتی خانەی (ڕۆژو مانگ)ی لە دایکبوون بە بەتاڵی جێهێشترا دواتر لە فەرمانگەکانی باری شارستانی پڕ کرایەوە، ڕۆژو مانگ (١ / ٧)ی بۆ دانرا، لە نێو گەلی کوردەواری خۆمانیشدا بۆ ئەوەی کوڕەکانیان دوا بخرێن لە خزمەتی سەربازی بە هەڵە ڕۆژو مانگو ساڵەکانیان تۆمار دەکرد، لەبەرواری (١٧ /٨ /٢٠٠٨) ئێمە وەك گرۆپێك لە نووسەرو ڕۆشنبیرانی کوردستانی باشوور کە ژمارەمان (٢٢) کەس بووین هاونەوەیەك بووین هی ساڵانی پەنجاکانو تەمەنەکانمان لێك نزیك بوو بە ناوی دەزگای بەدرخان سەفەرمان کرد بۆ ئوردن (عەمان) تا لەوێ ڤیزەی بەریتانیا لە سەفارەتی بەریتانی لە ئوردن (عەمان) وەرگرینو لەوێوە بۆ بەریتانیا بەڕێ کەوین، ئەوەی شایانی وتنە پاسپۆرتەکانمان بەر لەوەی بە ڤیزە لێدراوی بماندەنەوە دەست، سەفیری بەریتانی بە زەردەخەنەوە بەخێر هاتنی کردنین دواتر زۆر پێکەنیو گوتی (ئێوە هەمووتان لە یەك شەو ڕۆژ لە دایك بوونە (١ / ٧؟!) من بەش بە حاڵی خۆم کە لە ناسنامەی باری شارستانیم نووسراوە ١ /٧ / ١٩٥١ هەتا ئێستا جارێك فووم لە مۆمێکی ڕۆژی لە دایکبوونم نەکردووە.

* (جۆل ڕۆمان)ی زانا دەڵێت: (هەر مرۆڤێك سێ جۆر لاوێتی هەیە، لاوێتی لەشو لاوێتی دڵو لاوێتی عەقڵ، بەڵام جێی داخە کە زۆر کەم ئەم سێیانە پێکەوە دەبن.)

هەر لە پەنجاکانەوە کە تەمەنم بووە بە حەوت ساڵان تا ناوەڕاستی شەستەکانیش، بەردەوام لەگەڵ برای لە خۆم گەورەتر (جەلال) کە نۆ ساڵان لە من گەورەتر بوو، بۆ هەموو نمایشە وەرزیشیەکان و ئاهەنگ و سەیران و سەفەرەکان هاودەمی بووم و بە تەنیا جێی نەهێشتووم بۆ ئەوەی چاوم بکرێتەوە و لە هاوڕێی خراپ و گەڕەك بە دوور بم، ئەو برایەم لەگەڵ تیپێکی فتبۆڵ بەشدار بوو کە ئەم تیپە چەندیك لە خۆی و هاوڕێکانی لە خۆ دەگرت، منیش زۆر خولیای وەرزش بووم بە هەموو جۆرەکانییەوە، لە نێو ئەم تیپەدا لەو گەڕەکەی عارەبان سێ ناو بوون بە یاریزانێکی دیاری فتبۆڵ لە تیپی هەولێرو لە یارییەکانی فتبۆڵی شارو شاران و گوڕەپان یەکێکیان ناوی (شلیمۆن ئاردەواس) بە ڕەچەڵەك ئەرمەنی بوو، دووەمیان رەوانشاد (فاروق تۆفیق) بوو، ئەوەتریان بە ناوی (فخرالدین مەردان ئاغا) نازناوی (مندوب) کە بە داخەوە مندوب هەر وەکو (جۆل ڕۆمان) ئاماژەی پێکردووە کەوتە قۆناغی (لاوێتی دڵ) لە ڕێگای عیشقێکی ڕاستەقینەوە کە کچێکی هەڵگرت بە ڕەزامەندی کچەکەیش کە یەکتریان خۆش دەویست، بە نا ڕزامەندی خاو خیزانی کچەکە، لە نیوەڕۆیکدا کە ناوبراو فەرمانبەر بوو لە دایرەی (ئیشغال)ی هەولێر دەگەڕایەوە بەرەو ماڵ، خوێنیان ڕشت، ئەو کات لە ماڵەوە بووم گوێم لە ڕێژنەی تەقەی کلاشنکۆف بوو، کە هاتمە دەر گوتیان مەندوب گوژرا، هەر لە نیو ئەو گەڕەکەدا بینیم لاوێکی جوان و ئازاو ڕۆح سووك لە نێو خوێن و خۆڵ ڕاکشاوە و دایکی سەری لەسەر کۆشی خۆی دانا بوو فرمێسکی دادەباراند، ئەو لاوە زۆر هاوڕێی برا گەورەکەم بوو جەلال منیشی زۆر خۆش دەویست و قەت لە دڵ و یادمدا ناسڕێتەوە، هەروا زۆر هاوڕێیی وەرزشوانی گۆڵچی ناودار (حوسین عەلی) بوو کە ناوبراو ماڵیان لە

خانووەکانی مەحەتە بوو بەلاّم بەردەوام لەو گەڕەکەکەی ئێمەدا دەبیندرا لەگەلّ (مندوب)ی ڕەوانشادو ئەو برادەرانەی تر کە ئامارژەم پێکرد.. ئیتر وەرزش لە گیانماندا چەکەرەی کرد بوو ئەوسا بە تایبەتی یاری فتبۆلّ لەگەلّ هاو تەمەنەکانی خۆم لە نێو گەڕەکدا یاریمان دەکرد، هەروا بەشدار بوونم لە نمایشەکانی سالاّنەی قوتابخانەکانو دیدەوانی (کشافە)و هەتا بۆ دیدەنی نمایشە سەربازییەکان دەڕۆیشتین، ئەوەی لە نمایشەکاندا سەرنجی ڕادەکێشام ئەو یاریانە بوو کە بە ماتۆڕسیکلّ (عەریف خدر) ئەنجامی دەدا بەو پێیەی کە ناوبراو مالّیان لە گەڕەکی ئێمەو ڕۆژانە ئەمدی پیاوێکی تێکسمراوی خورت بوو، دواتر هەر لە شەستەکاندا کاتیّ خانەنیشن بوو لەو گەڕەکەی عارەباندا لەسەر ئەو جادەییەی ئێستا لە پاریزگادا بۆ فولکەی بە تەمای خوا درێژ بۆتەوە ستۆدیوی دانا بە ناو ستۆدیوی جیهانو بە کامێرای خۆی زۆربەی نمایشە وەرزشیەکانی وێنە دەگرتو لە نیو جامخانەی ستۆدیۆکەی هەلّیدەواسی، نەك هەر منو بەس بگرە زۆربەی هەوادارانی وەرزش عیشقی دیدەنی ئەو وێنانەی نیو جامخانەکەی بوون بە تایبەتی کە وێنەی پالّەوانانی لەش جوانان (کمال الاجسام)و پالّەوانانی وەرزشی قوڕسو وەرزشوانانی دی کە مەدالیایان بە ملو یان کاسی سەرکەوتنیان بە دەستەوەو بەرزیان کردۆتەوە لە وێنەکاندا بۆ نموونە یەکێك لە پالّەوانانی لەش جوانو وەرزشوانی هەلّگرانی کێشی قوڕس کە لە دانیشتوانی گەڕەکەکەی عارەبان بووو ناودارو ئەستێرەیەك بوو ڕەوانشاد (هاشم مەلا مەحمود) بوو کە وێنەکەی هەلّواسرا بوو سەرنج ڕاکیش بوو، ئەوەتا (عەبدولرحمان فەرهادی) شاعیرو نووسەر لە ڕۆژنامەی هەولێر ژمارە (٢٠٧٥) لە ٨ / ٢ / ٢٠١٥،

شیعرێكی بڵاو كردۆتەوە بە ناوی (بیری كۆڵانی عارەبان دەكەم) لەم چەند دێڕەدا باس لە ستۆدیۆكەی (عەریف خدر) دەكات و دەڵێت:

بیری ستۆدیۆكەی عەریف خدر دەكەم
چەند حەزم دەكرد وێنەی منیش
لە نێو جامخانەكەی هەبا.. هتد

*لەو سەردەمانەی ئاماژەم پێكرد تا ساڵانی هەشتاكانیش وەرزش بە گشتی بۆ خۆشەویستی و تەبایی و لەش ساغی و كات بەرێ كردن و پەیوەندییەكانی نێو خۆیی و وڵاتان بووە، لە عیراق بە گشتی لە كوردستان بە تایبەتی، وەرزش تا ناوەڕاستی هەفتاكانیش بە سادەیی و ساكاری بەڕێوە دەچوو، دواتر لە تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییەكەدا بەرنامەیەكی وەرزشی هەبوو لە لایەن (موئەید بەدری) پێشكەش دەكرا و زیاتر بایەخ بە دەنگوباسەكانی وەرزشی دەدرا، ژیان هێندە ئاڵۆز و جەنجاڵ نەبوو وەك ئێستا، كەچی لە دوای هەشتاكانەوە و ئێستایشی لەگەڵ دابێ، وەرزش بووە بە ڕكابەری و ململانێی نێو دەوڵەتی و نشتمانچیەتی و سیاسەت و دیاردەیەكی جیهانی هەروەها گرەوی قوماری ملیۆنی لەسەر دەكرێ و بە دەیان قەنات و ڕاگەیاندن و دەزگا و ریكلام و كۆمپانییە و گۆڕەپانی سەر سوڕهێنەری لە خزمەت دایە، بۆ ئەو مەسەلەییەی باسمان لێوە كرد دەبینین، زانا و فەیلەسوفێكی وەك (خۆرخی لویس بۆرخیس) دەڵێت: (سەیرە كە سەرۆكی وڵاتێك لە جێی خۆی هەڵبەزێتەوە و هاوار بكات (گۆڵ) چۆن دەكرێ بەو ئەندازەیە گاڵتەجاڕ بێت، خەڵك و ڕۆژنامەكان هاوار دەكەن، ئێمە فلان وڵاتمان

تێکشکاندووه، دەڵێی تەنها بۆ تێکشکاندنی ولاتێك ئەوەندە بەس بێت کە (١١) کوڕی شۆڕت لەبەری ئەرژەنتینی لە (١١) لاوی ولاتێک ببەنەوە، دوایی بڵێن ئێمە فلان میللەتمان تێکشکاندو بە سەریدا سەرکەوتین.)

## ئاشی گەردوون، زەمەن دەیسوڕێنیٚ و فڕفڕۆکەکەیشم ( با )

(٨)

کە زەمەن بە ڕەوتە ڕەهاگەرییەکەی میلی کاتژمێرو ڕەوڕەوەی مێژووو چەرخی دەورانی منو هی گشت مرۆڤێکی سەر ئەم گێتییە دەسوڕێنیٚ و وەستانی بۆ نییە، خێرایی خاوو بێئاگایی تێپەڕ بوون نغرۆ دەکاتو ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنیٚ و هەڵیدەداتو تێکیدەشکێنیٚ و دەیکاتە ڕابردووو خانەی لاپەڕگە، بەرەو زەمەنێکی نویمان دەباتو ئایندەی نوێترمان دەخاتە بەر دەم، ئەگەرچی لە نوێبوونەوەو تفر هەڵدانو بەرگ گۆڕینو خۆ گۆڕین لە خولی خولیای خۆی بەردەوامە لە پاڵ ئەوەشدا دابڕانو مەرگی ئازیزانو تێکشکاندنو هەڵوەشاندنەوە هەروا ئەفراندنو بەرەو پێشەوەچوونو تێپەڕاندنو جێهێشتن بە دابڕانێکی ئەبستمۆلۆژییەوە کە لە دەسەلاتو توانای مرۆڤ بە دەرە ڕاوەستانی ئەم مزراحە لە سوڕدانی خۆی ناکەویٚ، یان بڵێین میلی کاتژمێرو ئاشی گەردوون، وەك ئەوە نییە کە فڕفڕۆکێك بە دەستەوە بگریتو بیدەیتە دەم (با) بە ئارەزووی خۆتو ئارەزووی با خولٚ بخوات، لیٚ ئەوەی بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە ئاوڕ دانەوەیە بۆ ڕابردوو پەندو حیکمەت وەرگرتن لە شتە بە سوودەکانو بیرەوەرییە خۆشو ناخۆشەکانیو فەرامۆش کردنی شتە زڕو بیٚ کەلكو ناجۆرەکانی، لێرەدا جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ ساڵە لە

دەست چووەکانم بۆ ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان تا ناوەڕاستی هەفتاکانیش هەر لەو گەڕەکەی عارەبانی کۆن کە لەو ساڵانەداو تا ناوەڕاستی هەشتاکانیش تیایدا ژیاوم، سەبارەت بە چۆنیەتی ژیان و بژیوی و گوزەران و داب نەریت و هەڵس و کەوتی خەڵکانی ئەوسا، هەڵبەتە بە قەد گەورەیی دەریایەك و ئاوە زۆرەکەی، ژیان و سەردەمی ئەوسا بەراورد لەگەڵ سەردەمی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیای ئێستا جیاوازییەکەی لە ژمارە نایەت، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ ئاشنا بن بەو سەردەم و ساڵانەی ئاماژەم پێکرد چۆنمان بینیوە و چۆن ژیاوین تا قەناعەتیان هەبێ زۆر ناڕازی نەبن بەو گوزەران و ژیانەی ئێستایان، بۆ نموونە:

١- لەو گەڕەگەدا کە لە چەقی شاریش بوو لەو ساڵانەی ئاماژەم پێکرد، شەوانە ترس و تاریکی و کۆڵانەکانی بە پێچ و تەنگەبەرو دزو جەردە و شەولەبان و جنۆکە و دێوو درنجی حیکایتخوانانی شەوانی بەر ئاگردان و بەجێمانی خەیاڵ و وەهمی تۆقێنەرانە لە مێشکی منداڵان و مانەوەی کاریگەری بە سەر گەورەکانیش جگە لەمەیش بێکاری و هەژاری و سافیلکەیی و کەمزانی خەڵکانی ئەوسا وای کرد بوو مرۆڤ لە مرۆڤ بترسێ، لە ساڵی (١٩٦٠)دا پیاوێکی دراوسێمان کە ناوی نامیق بوو شەوێك جل و بەرگێکی گرمۆڵە کراوی لە بن هەنگڵ دەبێ و لە حەمامی عەسری هاتۆتە دەر بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە کە ئەو حەمامەیش ئێستایش هەر ماوە لەو گەڕەکە، ڕێکەوتیش شەوی جەژن بووە، درەنگانی شەو، لە سێوکانی گەڕەگ لە شوێنێکی تاریك، سێ گەنجی لات ڕێی پێ دەگرن، یەکێکیان لەو ڕێگرانە چەکی پێ بووە، پێی دەڵێن بێنە چیت پێیە (پارە.. سەعات.. ئەلقەو ئەنگوستیلەی زێڕو هەر چییەك بێت) کاکە نامیق دەڵێت (تەنیا پارەی حەمامم لەگەڵ خۆم برد بوو هیچم هەڵنەگرتووە)

ڕێگرەکـان دوای پشـکنینی گیرفانـەکانی نـامیق هیچـی لێ هـەڵناکرێنن و چینێکی خۆشی لێ دەدەن و تێدەسروێنن و پێی دەڵێن (سەگباوك جارێکی دی بێ پارەو سەعات نەیێتە دەرەوە) یەکێکیان لە ڕێگرەکان دەڵێت (تۆو خوا ئەمەش ڕزقە، یانەسیبمان بۆ دەرچووە بەم شەوی جەژنە) ئەویتـریان ڕوو لـە نـاوبراو دەکـات و دەڵێـت (قەیناکـە لـە حـەمام دەرچـووی وا زیـاتر نـەرممان کردییـەوە ئەفەنـدی بـڕۆ بـۆ لای ژنەکـەت بـە دەم و چـاوی خوێنینەوە، پارە هەڵناگری؟

٢- کاتی پشووی هاوینە دادەهات قوتابیان ئەوانەی کوڕە دوڵەمەنـدو خواپێداوەکان بوون کە ژمارەشیان کەم بوو یان لەگەڵ خاوخێزانـەکانیان سـەفەریان دەکـرد یـان لـە مزگەوتەکانـدا لـە لای مـەلاکان سـیپارەو جـزوو عەممـەو قورعانیـان دەخوێنـد بـۆ ئـەوەی فێـرە زمـانی عـەرەبی و ڕەوشـتی جـوانی کۆمەڵایـەتیان بکـەن، نـەك وەکـو هەنـدێك لـە مەلایە مزەوەرەکـانی ئێسـتا فێـرە کـاری تیرۆرو ڕەوشـتی نامرۆڤـانەیان بکـەن، بەڵام قوتابیـانی کوڕانی هەژار، دەبووایە بچنە مەیدانی کار بۆ ئەوەی وەستاکان بیانبەن بۆ کـاری کرێکـاری یـان دەبوونـە شـاگرد لای پیشـەکاران و زۆر جـاریش دارکاری دەکران ئەگەر هەڵەیەکیان ئەنجام دابا، یان کاری دەستگێڕی و شت فرۆشتن، بەشێکیش لەو قوتابیانەی قۆناخی ئامادەیی و کۆلێژەکان، لـە نێـو شـارو بـۆ گونـدەکانیش دەردەچـوون بـۆ ڕشـاندنی (دی دی تـی) دەرمـانی قەلاچـۆکردنی مێشـوولەو مـێش و مەگـەزەکان، بەشـێکیش لـە قوتابیان لە لایەن بەڕێوەبردنی چالاکییەکانی وەرزشی پەروەردە دەبردران بۆ دەرەوەی شارەکان و نیو خێوەتە هەڵدراوەکانی دێدەوانی (کشـافە) بـۆ مـاوەی چـەند هەفتەیـەك بـە جموجـۆڵی وەرزشـی بـەیانیان و ئاهـەنگی شـەوانەو ڕاهێنـان و هانـدانیان بـە گوتنـەوەی سـروودی نیشـتمانی و

گـۆرانیو شـیعرو (ئـەدەبو هونـەرو وەرزش) بەگشـتیو پێگەیانـدنو ئامادەکردنیـان بـۆ دوا ڕۆژو خزمـەتکردنی گـەلو وڵاتەکـەی، مـن بـۆ خـۆم یـەکێك بووم لـەو قوتابیانـەی لـە سـاڵی (١٩٦٨)دا بەشداریم پێکـراوە لـە خێوەتگەلـی دێـدەوانی هاوینـەی چالاکیە وەرزشییە پەروەردەییـەکان کـە چووین بـۆ شـاری موسـڵو لـە (غابـاتی حـدبات) مـاوەی مانگێکمـان لێ بـە سەربرد.

وەك لە پێشدا ئاماژەم پێکرد هەندێك لەو قوتابیانەی دەچوونە مەیدانی کار بۆ ئەوەی کرێکاری بکەن، ئەوسا بە تایبەتی لەو شارەی ئێمەدا لە هـەولێر کارەکـان زیـاتر ئیشـی خشـت (کـەرپوچ)و قوڕکـاری بـوو، هـەر ڕاگوزارێ کە بە نێو گەڕەکدا تێپەڕ دەبوو بە تایبەتی لە وەرزی پاییزاندا کە بۆ وەرزی زستان سەربانەکان سواخ دەدران بە قوڕە سوورەی گیراوە کە تێکەڵ بە (کا) دەکرا، بۆنو بەرامی ئەو قوڕە سوورەیە سەرانی مەست دەکرد ئای بۆنی خۆڵ وخاك چەند خۆشە، ئەوەتا باکگڕاوندی ئەو بۆنو بەرامە لە قەسیدەی (جۆخینەی هەورو هەتاوی سپی)دا کە لە ژمارە (١٣) ١٩٩٥ی گۆڤاری کاروان بلاوم کردۆتەوە لەم چەند دێڕەدا دەڵێم:

بەهار دارستانی ئاوەدان کردەوە
سا تۆش وەرە پڕ بە زەنگی دەرگەی
گیانی وێرانبووم وەنێ قوربان
یادەوەری تۆش وەك شلیفی (کا)
هەڵڕژانە سەر قوڕە سوورە گیراوەی وەرزی خەزان
بە بۆنی مەست بووم
هەستی سواخ دام قوربان

٣- ترس له مندالّ دەرکردن بە پێی عەقڵیەتی ئەوسا دەیانگووت ئەوە ترساوەو ترسی لیّ دەرکەن، بە دوو شێوە ئەنجامیان دەدا.

أ- چەند پۆلووە ڕەژووی گەشاوەیان ئامادە دەکرد، جامە ئاوێکیان لەسەر سەری منداڵەکە ڕادەگرت بە ماشەیەك یەك یەك پشکۆیە گەشاوەکانیان دەخستە ناو ئاوەکەو پشکۆکان دەچزانەوەو دواتر دوعای چاکبوونەوەیان لەسەر ئاوەکە دەخوێندو هەڵیاندەڕشت.

ب- مادەی قوڕقوشم رساس (مس)یان لە ناو تاوەیەکدا دەتواندەوەو جامە ئاوێکی ساردیان دەهێنا لەسەر سەری منداڵە ترساوەکەیان ڕادەگرت‌و پاشان (قورقوشم)ە تواوەکەیان دەڕژاند ناو جامە ئاوەکەو چ شکل‌و وێنەیەك دەرچوو بووایە (مرۆڤ - ئاژەڵ - پەلەوەر - زیندەوەر.. هتد) واتە لەو شتە ترساوە،

*مام عەولا پیرەمێردێکی لە خۆ بێزارو تووڕەو توند بوو، لە پەنای دیوارو بەر سێبەری خانووەکانی نێو گەڕەگ چوار مەشقی لێی دادەنیشت، گۆپاڵەکەی لەبەر دەمی خۆی دادەنا، ناوە ناوە لە منداڵی لاسارو مێش‌و مەگەزو هەتا لە سێبەری خۆی تووڕە دەبوو گۆپاڵەکەی بەرز دەکردەوەو شەقەی لەبەردەمی خۆی هەڵدەستاند، ڕۆژێکیان بە سەر کێشمە کێش‌و چەندو چوونی مام عەولا و ژنێکی دراوسێمان داچووم، ژنە جوێنی بە مام عەولا دەداو دەیگوت، ئەوەتا ژنانی گەڕەك دەزانن من قوڕقوشمی تواوەم بە سەر جامە ئاوی سەر منداڵەکەم ڕۆ کردووە (شکل‌و وێنە)ی تۆی لیّ دەرچووە کە گۆپاڵەکەت لێی بەرز کردۆتەوە لە تۆ ترساوە هەی پیری ئاخر شەڕ جارێکی دی منداڵەکەم بترسێنی بزانە چیت بە سەر دێنم، مام (عەولا)یش گۆپاڵەکەی ڕادەشەقاندو دەیگووت بڕۆ دەنا هەڵسمەوە وردت دەکەم هەی هەی هەی.. دواتر ژنان هاتن‌و ژنەکەیان لەو ناوە دوورخستەوە.

## قەرزاری رۆژگاریکین کە ئەمرۆ سوپاسمەندی بین

(٩)

* ستانیسلاو جیری لیك دەڵێت:

(دنیا پڕ بووە لە وشە، لێمانگەڕێن با بە دوو دێڕێك لە یەکتری بگەین)

عەزەی عەولا کە بە لوژە لوژی کەرو بارەوە بە دوانزە کاتژمێران دەگەیشتە شار، ئێستا بە ئۆتۆمبێلە مۆدیل تازە فول مواسەفاتەکەی بە نیو کاتژمێر دەگاتە نێو شار، کە سوکانەکەی دەگرێت وەك ئەوەی لینگە دەستارێك بابدا.. کە باسی لینگە دەستاڕ وسوکانم کرد با ئەو قسە خۆشەشتان بۆ بگێڕمەوە، یەکێك تازە فێری چۆنیەتی لێخوڕینی ترومبێلیان دەکرد لێزان و ڕاهێنەر بەوەی تەنیشت خۆی دەگوت دەبێ بزانی ئەوە گێڕەو وا دەیگۆڕدرێت و ئەمە برێکە ئەمە فول لایتە ئەمەو ئەمە ئاوا بە کار دەهێنی.. هتد، جا ئەو کابرایەی دەیویست فێر بێت، پرسیاری لە ڕاهێنەر کرد گوتی ئەو هەموو کارانە یەك کەس دەیکات؟ ڕاهێنەر گوتی بەڵێ، کابرا گوتی ئەوە بەمن نەکرا، یەکێکی فول عەشایری گوتی (ما برا چ عەوجەیە شتێکی ئیوها دە کونە ڕەشەی دەنێیی.. پێ دەناڵە کەرێ دەنێیی و سەرە بزۆتکە لێ ڕەپێش دەکەی و لینگە دەستاڕە لێ با دەدەی) ئاوا فیرە ئاژوانە ترومبێلەکەی لێ ئاسان کرد، دەگەڕێمەوە سەر عەزەی عەولا هەر زوو زوو ڕۆژان و ساڵانێکی زووی وەبیر دەهاتەوە،

دیاره پیاوێکی به وەفایه بۆ ڕابردووی هەر چەنده وشەی (نۆستالۆژیا)ی نەبیستووە، ڕەنگە پێی وا بێ واتە (تەنکە لۆبیا)، زۆر جاران لەبەر خۆیەوە دەڵێت: چاکە هەر هار نابین کە دوێنێمان بیر دەکەوێتەوە، پێویستە خۆمان بە قەرزاری دابنێین، جار جاریش هەست بە مەغدوری خۆی دەکات، لەو خواردنەی دەیخوارد، لەو جلەی لەبەری دەکرد، لەو ڕێگاو بانەی پێیدا دەهاتو دەچوو، لە یادی نەکردووە ئەو دانیشتنەی لە پەنای دیواری مزگەوتو مالأن چوار مەشقی لێی دادەنیشتو دامەی دەکرد، کەچی ئێستا لەسەر قەنەفەیەکی توکمەو نایابو لەسەر مێزو تەپلەی جوانی لەبەر دەمدایەو جۆرها میوەی لەسەرە.

بەڵێ (سۆڤاج)یش وتویەتی: (لەوانەیە مێروولەیەك گاز لە ئەسپێکی ڕەسەن بگرێت، بەلأم مێرووەکە هەر مێرووەو ئەسپەکەش هەر ئەسپە)

(سۆفی کەریم)یش ساڵأنێك لە بناری هەڵگورد دەژیا، مێرکوڕ بوو، ئێستا لای کوڕە دەوڵەمەندە دەستڕۆیشتووەکەیە لە هەولێر، بە هۆی تەقینەوەی مینێك قاچێکی لە دەستداوە، ئێستا لەسەر سیسەمێکی نەرمو نۆڵو لەبەرامبەر تەلەفزیونی ڕەنگاو ڕەنگو لە ژێر چراخانێکی ڕۆشەنو لە باڵەخانەیەکی سێ نهۆمیو ژنێکی نیپالی لە خزمەتی دایە، بەلأم خۆزگە بۆ ڕۆژانی زوو دەخوازیو بە ناچاری دیلو بەندی ژیانی نێو شارە، زۆر جار لەبەر خۆیەوە ئەو چەند دێرانە دوو پات دەکاتەوە وەی لەو ڕۆژانەی...

زستانان ئاگرو ئەز
بەهاران ئەزو پەز
هاوینان ئەزو ڕەز

ئێستایش (سۆفی کەریم) بە قاچێکی بڕاوییەوە بە خەیاڵ بە سەر شاخ دەکەوێ بەڵام کاتێ دەگەڕێتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی و سەیری خۆی دەکات، ئەو نا بەڵام بۆ منێك، ئەو چەند دێڕە شیعرەی (شێخ نووری شێخ ساڵح)ی بیر هێنامەوە...

لە ناو شەپۆلی خەما سەرنگونو بێ ئارام
بە کێوی سەختی ژیانا بە پێ بە چنگە ڕنێ
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە بگاتە سەرێ
لە پڕ نشێوی کلۆڵی بواری لێ ئەتەنێ
بە دوای یەئس و ئەلەم، تان و پۆی لە ئاخ و زام

*ئێ منیش دەگەڕێمەوە هەوارگەی دێرینم، گەڕەکی عارەبان ئەوەی بینیوومە لە گەڵیدا ژیاوم بە (داب و نەریت و بۆنەکان کە چۆن دەگوزراو ئێستاش چۆنە) هەر لە پەنجاکانەوە تا نێوە ڕاستی هەفتاکانیش، بۆ نموونە:

### هاوسەرگیری بە نەریت و ڕێوڕەسمەکانییەوە

*لەو ساڵانەی لەسەرەوەدا ئاماژەم پێکرد لەو گەڕەکەی ئێمەو زۆربەی گەڕەکەکانی نێو شاری هەولێر چەند جۆرێك ڕێوڕەسمی هاوسەرگیری پەیڕەو دەکرا بە پێی داب و نەریتی ئەوسا بۆ نموونە

* شارستانەکان کە لە بنەچەوە نیشتەجێیی نیو شار بوون بە خەڵکانی عام و چینی نێوەندەوە بە دەگمەن بە عیشق و لێکتێگەیشتن هاوسەرگیری دەکرا، هەر چەندە جار جار رووی دەدا کە خوشەویستیەك و پەیوەندیەك

له نێوان کوڕو کچ زۆر به دەستەو نەزەر نهێنی هەبووە بە تایبەتی کوڕو کچانی دوڵەمەندانو ئاغاو خوا پێداوەکان بەم قۆناخە تێپەڕ دەبوون، ئەگەر نا زیاتر خوازبینی هەبووە رەنگە تا رۆژی مارە بڕینیش کوڕو کچ یەکتریان نەدیوە، ئیتر پرۆسەکە بەم شێوەیە بەڕێوە دەچوو ((دوای خوازبینیو ڕازیبونی ماڵی باوانی کچە، هەنگاوی یەکەم دەستی پێدەکرد ئەویش بە بنەپیاڵەی پڕ بەداملیو شەکرۆکەو چوکلاتو نەعناع ونوقلو ئەو جۆرە شیرنیاتەی لەسەر سینی دادەندراو بە مێرد منداڵو کەسەکانی ماڵی کچی خوازراوو هەروەها ماڵی زاوایش لە لای خۆیانەوە هەڵدەستان بە دابەش کردنی ئەو شیرناتییە بە سەر دەرو دراوسێو ناسیاوو گەڕەك، ئیترهەر لەو کاتەوە ئیشێك بۆ بێ ئیشانو ژنان پەیدا دەبوو بۆ باس کردنو بە دوا داچوونی ئەو بابەتەو سوور کردنەوەیو چۆنەو چییە، دواتر حاڵەتی سەیرو سەمەرەی بەدواوە بوو، لە ماڵی بووکی تازە، شیرناێتیی دەخورایەوەو ئەلقە لە پەنجەی بووك دەکراو زیڕی پێوە دەکرا بە بێ ئامادە بوونی زاواو پیاوان، تەنیا پەیوەست بوو بە ژنان، نە زوومی کامیڕاو ڤیدیۆو تیپی گۆرانیبێژانو موسیقاو کێك شکاندنو پەرداغی شەربەتی ئاڵ بە دەم یەکتر وەکردن لە نیوان بووكو زاوادا، تەنیا ژنان لە نیو خۆیاندا بە سەماو چەپڵە ڕێزانو هەلهەلەوە کۆتاییان بەم قۆناخە دەهێنا، پاشانیش رۆژی پێش گواستنەوە، دوای نیوەڕۆ کەس وکارو خزمو برادەرانی زاوا بە ئۆتۆمبیلو قەمەرەکان جەهازی بوکێنیان لە ماڵی بووك بار دەکرد، وا رێك دەکەوت لەسەر چەنچەی هەر قەمەرەیەك یەك دۆشەکی سیرە یان یەك لێفو سەرینی رەنگاو رەنگی بریقەدار دەبەستـرا لەگەڵ چەند کەل وپەلی تر، ئیتر دەبووایە ئەم قەتارەی قەمەرەو ئۆتۆمبێلانە بە نیو شەقامەکان بسووڕابوونایەوەو بە دەنگی هۆڕنو

هەڵهەلـەو چـەپڵەڕێزان تـا دەگەڕانـەوەو لـە مـاڵی زاوادا جەهازەکـەیان دادەگرت، ئینجا دەستە دەستەو تاك تاك ژنان دەچوونە ماڵی زاوا سەیری جەهازەکەیان دەکردو ئیتر لە بەینی خۆیاندا خەریکی دەنگوباسی ئەو مەسەلەیە دەبوون، بۆ شەویش ژنان خەنەبەندانیان دەکرد، ڕۆژی دوای ئەم قۆناخە لە شەوی بووك گواستنەوە بە تایبەتی ئەگەر هاوین بووایە ئەوە لەسەربانی ماڵی زاوا گلۆپی ڕەنگاو ڕەنگ بە ڕستان وەدەکراو دوای نوێـژی عیشـا، مـەولوود دەخوێندرایـەوە، هێشـتا مـەولوود کۆتـایی پێنەهاتبوو ئەوە لە خوارەوەشدا عاشقانی مەیو مەیخۆرە دنیاییەکان خەریکی ئامادەکردنی مەزەو مەیو تەدارەکی ئەگلەنجە دەبوون، ئاهەنگی مولوود خویندنەوە تەواو دەبوو، مەی خوران دادەنیشتنو مەزەو مەی دادەندرا، ئەگلەنجە دەستی پێدەکرد، دیارە ئەو وشەیە (ئەگلەنجە) وشەیەکی تورکییە واتە ئاهەنگ، بەڵێ چەند گۆرانیبێژێك سەرەنگانیان لـێ دەگـرت لەوانـە بـۆ نموونـە (مشـکۆ پیرداودە کـوێر محەمـەد ئەحمـەد ئەربیلیو جبار ئەربیلیو یونس خەتات، هەندێك جار حەیدەر... هتد) کە بە تـەپلو دمبكو جارجار عودو کەمانی لە گەڵدا بە قۆریاتو گـۆرانیو بەستەو چەقەنە لێدان دەستی پێدەکرد، لەسەربانەکانی دەوروبەری ئەم ئەگلەنجەیـەش کـە ئـەو کـات خانووەکـان شـەرقی بـوون سـەربانەکانیان تێکیان دەکردەوەو دیوارەکان نەوی بوون، ژنانو کچو مێردمندالآن قوڵڵو باسـکیان بـە سـەر شـوورەکانەوە بـوو، نـاوە نـاوە بـۆ گۆرانیبێـژەکان هەلهەلەیان لێدەداو گرو تینیان دەخستە دڵیانو زیاتر دەیان وروژاندن، زۆر جـارانیش مەستو سەرخۆشـەکان دوای تـەواو بـوونی ئەگلەنجـە بـە ماڵی خۆیان نەدەکەوتنەوە، یان شەڕو گێچەڵێك رووی دەدا، ئیتر هـەر لـەو شـەوەیش دیـاری دەکـرا لـە کاتـژمێر چـەند پـاش نـان خـواردنی نیـوەڕۆ

قەمەرەکان ئامادە بن بۆ هێنانی بووك بۆ ماڵی زاوا، دوو حاڵەتی تێدەکەوت ئەویش ئەگەر ماڵی بووك و زاوا دراوسێ و لێك نزیك بووایە ماڵەکانیان ئەوە دوای نان خوارد لە ماڵی زاواوە بە دەستە جەمعی کەس و کارو داوات بووان بە ژن و پیاوەوە بەرەو ماڵی بووکێ بەرێ دەکەوتن بە چەپڵە ڕێزان و گورانی گوتن و بەربووکیش ئاوینەیەکی چوارچێوەداری گەورەی بە دەستەوە بوو روو لە بووك تا دەگەیشتنەوە بەر دەرگای ماڵی زاوا، زاوایش لەسەربان و قەمتەرە لەگەڵ چەند برادەرێکی وەستاوەو چاوەڕوانن، کە بووك پێی دەنایە حەوشە، زاوا دەستەسڕی پڕ لە شەکرۆکەو بەداملی و چوکلات و عانە یان بڵێین پارەی ئاسن کە پێك هاتبوو لە فلس و دووفلسی و پێنج فلسی و دەفلسی و درهەم هەڵیدەڕشتە سەر بووك، منداڵان هەڵیان دەگرتەوە، بەڵام کە ماڵی زاواو بووك لیك دووربوونێکیان بووایە ئەوە دوای زیافەت و نانخواردنی نیوەڕۆ خزم و برادەرو کەسوکاری زاوا یەك لە قەمەرەکانیان دەڕزاندەوە لەگەڵ چەندین قەمەرەی تر بەڕێ دەکەوتن بەربووکیان لە گەڵ، کە بووکیان دەهێنایە دەر ئیتر بە هۆڕن لێدان و پێشرکێی قەمەرەکان و دوای گەڕاندنی بە نێو شەقامەکانی شارو بووکیان دەهێنایەوە بەر دەرکی ماڵی زاوا بە هەمان شێوە زاواو چەند هاوریەکی لە گەڵیدا لەسەربان لە چاوەڕوانی دابوون کە بووك دەگەیشتە حەوشە زاوا دەستەسڕە پڕەکەی بەرەڵلاً دەکرد، بووکی وا هەبووە نازی بە سەر زاوادا کردووە پێی گوتووە هیچ نەمابوو هەموو سەرم بقنجێ لەگەڵ تێهەڵدانی ئەو عانانەی ناو دەسەسڕەکەت، زۆر سەیر بوو رۆژی دواتر ماڵی بووکەکە بە مێردمنداڵێك یان حەمباڵێك چەند سینییەك لە پاقلاوەو غورابیەو کولێچە بە عارەبانەیەك دەبووایە بنێرنە ماڵی زاوا بۆ مێوان و سێیانەو هەفتیانەو.. هتد، بە چاوی خۆم بینیوومە

ئارەبانە سینی پاقلاوەو کولێچەو غورابیەی لەسەر، تولێکی سپی بە سەریا هەڵکێشراو لە قەڵاتەوە بەرەو گەڕەکی عارەبان دەبردرا، قسەی خۆمان بێ ئەو کات منیش مێرد منداڵێك بووم دەمم پڕ ئاو ببوو کەچی ئێستایش وێنەو چێژەکەی لە یادم ناچێ، لەوەش سەیر تر تا کۆتایی شەستەکانیش نەریتێك پەیڕەو دەکرا، لە لادێو گوندەکان کە زاوا دەچووە پەردە ئەوە لەگەڵ بە زاوا بوونی تەقە دەکرا، واتە زاوا قەڵا سەختەکەی داگیر کردو ئالای سەرکەوتنی هەڵکرد، بەلام لە نێو شاردا لە جیاتی تەقە کردن و فیشەك تەقاندن هەلهەلە لێدەدرا هەموو گەڕەك دەیزانی ئەوە پرۆسەکە سەری گرت، چونکە ئەوانیش گوێ قولاغ و لە چاوەڕوانی بوون، کارێکی چەند قێزەوەن بوو، زۆر جاران زاوا لەو حاڵەتە دەروونییە ڕاڕایەو لە شەرمی خۆی حالەتە دەروونییەکەی بە زاوا نەدەبوو، دەیانبردە لای شێخ و سەیدو مەلاکان گوایە بەسترایەو گرێیەکەی بۆ بکەنەوە، دەمێنێتەوە ئەوەی باسی لێوە بکەین مەسەلەی پەردەی کچێنی و سەلامەتییەکەی، خۆ ئەگەر ئەو کچەی بەر لە مێرد کردنی بە هەموو ئەندامە چێژ وەرگرەکانی جەستەکەی لەگەڵ هەر پیاوێکا رایبواردنی کرد بێت، هیچ ئاساوەرێك دیار نییەو ئاساییە چونکە بابەتەکە شاراوەیەو ناوپۆشراوە کەچی تەنیا ئەم پەردەیە شەڕەفەو خوێنی لەسەر درێژی‌و کوشتاری لێ دەکەوێتەوە وەك ئەوەی تەنیا ئەو ئەندامەی شەرەف بێ‌و ئەندامە چێژ وەرگرەکانی تر شەرەف نەبن!! جێی داخە زۆر جاران لە کەمزانی زاوا تۆمەتی خستۆتە سەر بووك گوایە پەردەی کچێنی نەمایە ڕەوانەی ماڵی باوانی کراوەتەوە ماڵی قەڵب سەر بە ساحێبیەتی، خۆ لەو گەڕەکی تەیراوەیە بیستمان کە بووکێك بۆ هەمان مەبەست بە سەر ماڵی باوکی دادراوەتەوەو باوکی و برای کچە، بێ سێ‌و

دوو کچـەکیان کوشـتووە کەچـی دوای لێکۆڵینـەوەی لـە لایـەن پـۆلیس و نۆرینگـەی تەندروستی دەرکەوتووە ئەم کچە پەردەی کچێنی و شەرەفی ساغ و سـەلامەت بـووە لـە کەمزانییـەوە ئـەو تۆمەتـەی خراوەتـە پـاڵی، بکوژانی بەند کراون و ئەو هاوسەرگیرییە بووە بە ژەهری خنکێنەر، دیارە منیش هەستی خرۆشاوم پاش ساڵانێك بە شیعرێك داکەوتۆتەوە کە لە کۆمەڵە شیعری (گوڵە یاقووتییەکان)ی چاپکراومدا هاتووە و تیایدا دەڵێم:

**خۆێنڕۆی گوناه**

**تۆمەتی سۆزانی و داوێنتەڕی خرایە سەر**

**وەك ئەو گوللە چاو کوێرو دڵڕەقەی نرایە سەر**

**لە گەواهی دۆسیەی پزیشك و نۆڕینگەدا**

**پەڕەی گوڵی نەکەچراوو سپی و بێ گوناه بووە**

**جزووی زەرگەتەی زەنەکی فیشاڵی شکاندووە**

**ئای لەو نوژدارە شاعیرەی کە نووسیبووی**

**ئەگەر ویستتان بەم شەوە بینێژن**

**پێی ناوێ کەس چرا داگیرسێنێ**

**وەرن ئەم چرایە گەورەیە هەڵگرن و بیبەن!!**

*ئەوە ماوە بڵێم هاوسەرگیری لەو سەردەمانەی ئامارژەمان پێکرد وەك ئێستا باری کوڕەکان قورس نەدەکرا کە داواکارییەکان هێندە زۆر بن کە هەموو گەنجێك نەتوانێ شانی بداتە بەر، ئەوسا ژیان سادەو ساکار بوو، نەك یەك کوڕ بگرە زیاتریش کە هاوسەرگیریان دەکرد لە یەك ژوورو لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و براکانی لە یەك خانوودا ژیانیان بە سەر

دەبرد، زێڕ نرخی وەك ئێستا هێندە بەرز نەبوو کچ بڕیاری لە دەست خۆی نەبوو، ماخۆ واتە دایك وباوكو برا گەورە بڕیاریان دەداو زێڕێکی کەمیش بۆ نیشان داوا دەکرا، ئەوەتا (شکسپیر) دەڵێت: (ئەگەر زێڕ هەموو نامومکین بکاتە مومکینو رۆژ بکاتە شەو، جەوهەری مرۆڤایەتی بەرەو لە ناوچوون دەچێتو هەرەس دەهێنێ) بەڵێ.. ژووری ئامادەکراو بۆ زاوای تازە، تەنیا ژوورێك بوو، سندوقێکی نوێنان لە دار درستکراو جامخانەکەی بە وێنەی (بۆراق) ئەسپی باڵدارو باڵندەی رەنگاو رەنگ کە زیاتر دەستکردی (محەمەد عەلی کامەلا) بوو باوکی هونەرمەند دارا محەمە عەلی، کە دواتر لە ساڵانی هەفتاکان بوو بە (فۆرمیلە)ی بە جامخانە، لەگەڵ چەند ڕایەخێکی ساکار، ئیتر کە ڕێوڕەسمو ئیتیکێتو مەسرەفو داواکارییەکان لە هاوسەرگیری کردنی ئەو سەردەمە لەگەڵ سەردەمی دوێنێی باسم لێوە کرد ئاسمانو ڕێسمانی جیا بوو.

# كە كەوتمە باوەش تەكنەلۆژیا، ئاوڕێكم لە دوێنێ دایەوە

(١٠)

لە شەودا، لە نێوان قوتیلەیەكی داگیرساوو گلۆپێكی هەزار واتی چەندە ڕێژی رووناكی لە نێوەنیاندا جیاوازیەكەی زۆرو زەوەندە، وەك ئەمڕۆی دنیای پیشەسازیو تەكنەلۆژیاو ئەندازیاریو ئاسان بوونی پەیوەندیەكانو بچووكبوونەوەی جیهانو ئاشنا بوون بە كولتوورو وەرگرتنی سیستەمی مۆدو ئالیەتی ژیاریو شارستانیەتی ئەوانی دیو پێشكەوتنە خێراكانی سەردەمو مۆدێرنێتە بەراورد لەگەڵ ئەو جیهانەی دوێنی لە پەنجاكانو شەستەكانو تا كۆتایی هەفتاكانیش لە هەولێرو لە سۆنگەی ئەو گەڕەكەی لێوەی لە دایك بوومەو ناوی گەڕەكی عارەبان بووە تا ئەو سالأنەی ئاماژەم پیكردووە تیایدا ژیاومو بینیوومە، بەڵێ ژیانو گوزەرانو ئامێرو كەرستەی بەكار هاتووو ڕێگاو بانو هات وچۆو بیناو بۆنەكانو بیرو ڕۆشنبیریو نەریتو مۆدو ئاین پەرستیو هەڵوێستو ئینتمای نیشتمانیو گیانی نەتەوایەتیو شارستانیەتو كولتوورو سەیروورەتو دیموومەتی، پاكیو پاكیزەییو ڕێزو سۆزو وەفاو ڕاستگۆییو نەجیبزادەییو ڕەسەنایەتی... هتد، جیاوازیو دووریيەكەی بە قەد نێوانی ڕێژەی ئەو دوو رووناكییە بووە، كە ئەو دوو جۆرە رووناكییە چەند لێك دوورن، ئاوا ئەوسای دوێنێو ئەمڕۆ دەبینم (ابن قوتیبە) دەڵێت (ئەوەی ئەمڕۆ نوێیە، بەیانی كۆن دەبێت، ئەوەی ئەمڕۆش بە لاتەوە كۆنە دوێنێ نوێ بوو) ئەوسا لەو گەڕەكەی ئێمەدا هەمیشە

شەوو ڕۆژی پڕ لە جموجۆڵ‌و قاوقیژەو هات‌و چۆو مقۆ مقۆو ئەم بەرو ئەو بەر بوو، خانووەکان لە خشت‌و کەرپوچ‌و گەچ‌و کاریتەو ئاڵدارو ڕایەڵی بە شەقڵەو حەسیری بە سەرداو بە تێکەڵەی (کا)و قوڕە سوورەی گیراوە سواخ دەدرا لە زستانانیش باگردێنی بە سەر دادەهێندرا، زۆر جاران لە زستاناندا کە باران دەباری خانووەکان دڵۆپەیان دەکرد لە ناو ماڵدا تەشت‌و قاپ دادەندرا بۆ گڵدانەوەی دلۆپەکان جگە لەوەی قەڵش‌و داتەپین‌و مۆرانەو ڕتوبەت لەوێوە بوەستێ، ئاوا ژیان ناخۆش‌و قوڕس بوو لە پاڵ ئەوەی خانووەکان بچووک‌و دیوار بە دیوارو سەربان بە سەربان وەك ئەوەی هەموو گەڕەکەکە یەك خانووی گەورە بێ، یەك خیزانی گەورەی لێ نیشتەجێ بوو بێت، هەموو لایەك ئاگاداری یەکترو لە هەموو بۆنەو خۆشی‌و ناخۆشییەکانیان بە دەنگەوەی یەکتر دەهاتن، بە دەگمەن لە هەولێر چەند خانووێکی ڕێك‌و پێك‌و گەورە هەبوون کە ناویان دەهێنا بە (قەسر) وەك (قەسری مەلا فەندی – قەسری قادر ئاغا – قەسری یەعقووبییەکان – قەسری عەتاولا ئاغا – قەسری نورالدین ئاغاو موسا ئاغاو مەردان ئاغا) هەر لە پەنجاکان‌و شەستەکان تا کۆتایی هەفتاکانیش (پەست) هەبوو وەك پاسێکی گەورەی نەفەر هەڵگر کە شانسیەکەی ئاسن بوو هەموو بەدەنیشی لە دار پێك هاتبوو، شوفیرێك لەگەڵ سەکنێکی مێرد منداڵ‌و بە هەندر بە گەڕ دەخرا، لە وەرزی هاویندا چەند خیزانێك بە یەکەوە بە (پەستێك)و زیاتر بەرەو موسل دەچوون بۆ سەر نەبی یونس‌و عین کبریت‌و حەمام عەلی، وا ڕیك دەکەوتن خیزانەکان هەموو بە یەکەوە لەسەربانی خانەی (حەمەد قەدۆ) شەوان بە یەکەوە ژن‌و پیاوو گەورەو بچووك جێگایان ڕادەخست‌و لێی دەخەوتن وەك ئەوەی خوشك‌و برای یەکتر بن چونکە ئەو متمانەو پاکییە هەبوو، یان لە حەوشە گەورەکەی نبی یونس دەخەوتن، خەڵکی وا بە سادەیی ژیانیان بەسەردەبردو

کارکانیان سەختو بە شان پیل ئەنجام دەدرا، شارو دەوروبەری لە مامەلە کردنو بەرژەوەندییەکانیان بە یەکەوە بەسترا بوون، ئەو گەڕەکەی ئێمە پڕ لە جولەو گرمەو لرمە بوو، ئەسپو عارەبانچیو نەفت فرۆشو کەرو باری داری قەلأشکەریو رەژوو فرۆشانو دەنگە دەنگو قاو قیژەی مندالأنو یەکێك هاواری دەکرد (کرێمەستی، ئەوەی تر لەگلەگو عەسەلیەو لەوزینەو شەکەراتو چەقۆ تیژکەرەوەو مەکینەی هەڕشتەو ساوەر لێکردنو بۆربەرینو زرینگە زیرنگی زەنگی پاسکیلی مێرد منداڵو گەنجانو دوکەڵی ساوەر کولأندنو دوکەڵی د. دی. تی ئێوارانو بۆنی هەڕشتە سوورکردنەوەو چای کولێوی ئێواران، شەوانیش دەنگی کولأیە کێشکەو کێشکەی کولأو، تورتورەی پاسەوانو حەسحەسەکان، ئەو ئامێرو دەزگاو کەرستانەی لەو گەڕەکە بەر چاو دەکەتن وەك (ئاش دینگ مەکینەی بە ڕەوڕەوی گەڕۆکی هەڕشتە دروستکەر دەزگای بە چەرخە بۆچەقۆو مەقەس تیژ کردنو - دەستاڕ - جۆنی - هاون - خەرەك جۆلأ خمچی - پەڕەچی - لێف درو - ئوتوچی - حەمام - سەرتاش.. هتد) ژیانێکی سادەو ساکارو کەم ڕاراییو ئاخو ئۆف هەبوو، هەڵبەتە هەموو بەرەو پیشەوە چوونێك باری مرۆڤ قورستر دەکات، ئەوەتا (کلود لیڤی شتراوس) دەڵێت: (دەبێ ئاگاداری ئەو ڕاستییە بین کە هەموو بەرەو پێشەوە چوونێك کێشەو گرفتی نوێ بەرهەم دێنێو ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەركو فەرمانی سەر شانمان هەرگیز کۆتایی نایەت) هەروەها (بەختیار عەلی)یش هەمان ئاماژەی هەیەو دەڵێت (تەکنۆلۆژیا تا دێت مرۆڤ پتر دەکات بە کۆیلەی خۆی، تا دێت مرۆڤ شتەکان نرخێکی بالأتر وەردەگرێت لە پەیوەندی مرۆڤو مرۆڤ، تەکنەلۆژیا هەم ئینسان لە خۆی دوور دەخاتەوە، هەم لە ئەوانیدی) وشەیەکمان ناوهێنا (هەندر) لەو سەردەمەی لێی ژیاوم بە تایبەتی لە پەنجاکانو شەستەکان زۆربەی

ترومبێڵ و مەکینەو دەزگاو ئامێرەکان بە وردو درشتییەوە بە هەندرو قورمیش بە گەڕ دەکەوتن و وزەیان بە بەر دەخرا بە تایبەتی (لۆری) کە بە (عەنتەرناش)یش ناومان دەبرد، هەروەها قەلاب جێب پیکاب هەندێك لە قەمەرەی مۆدیل کۆنیش، دەبووایە سەکن یان سایق (ئاژوەر) هەندر لەو ئۆتۆمبێلانە بدات و بە چەند سووڕدانێکی هەندرەکە کە لە مەکینەی ترۆمبێلەکەی گیر دەکرد، وزەی دەدایێ بە گەڕی دەخست، نەك وەك ئێستای دنیای تەکنۆلۆژیا و زانست و پیشەسازی پێشکەوتوو کە وا کەوتۆتەوە لە سلف لێدانی بە کلیلە سویچ تێپەڕی کردووە ئێستا بە دوگمەیەك لە نێو ترومبێلدا یان دووراو دوور بە دوگمەیەکی کۆنترۆڵ ترومبێلەکان بە گڕ دەخرێن، هەروەها بە دوگمەیێەکی کۆنترۆڵیش دەرگاکانی ترومبێل قوفڵەکانی والاّ دەکات، بەڵێ.. لەو سالأنەی ئاماژەم پێکرد هەتا تەلەفۆن ئەو دەزگایە بوو بە هەندریکی بچووکی لێوەی چەسپکراو کاری دەکرد، سەعاتەکانیش بە قورمیش کردن، ڕادیۆکانیش دەبووایە پاتری تەڕی قەوارە گەورە لە تەنیشتی بە وایرێك بە یەکەوە بچەسپێندرێ ئینجا بە دەنگەوە دەهات، ئێستاش لە یادم ماوە ئەو پاترییەی بۆ ڕادیۆکەمان دەکڕی ناوی (پاتری بێرگ) بوو، قەوارەی پاتریەکە بە قەد سێ هەندەی ڕادیۆیەکی ئێستا بوو، ئیتر نازانم وشەی (هەندر) لەگەڵ وشەی (هاندەر) یان (پاڵنەر) خزمایەتیەکیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە یان نا، (هەندر) کە مەکینەی ترومبیلان و ئامێرو چەند دەزگایەکی بە گەڕو گڕ دەخست، (هاندەر)و (پاڵنەر)یش فاکتەرێکن بۆ وڕوژاندن و بە گەڕو گڕخستنی جەماوەرو وەرزشوان و هونەرمەندان و ئەدیب و گشت تواناسازێك.. هتد

## گۆزەکانیان پڕ لە ئارامیو دڵەکانیان ڕاڕا

(١١)

کە باس لە گوندو دیهاتو دەستڕۆیەکانو ژێردەستەکانیان دەکەین، کاتێ بە مێژووی هەموو جیهان دادەچینەوەو لێکدانەوەیەك بۆ غەریزەو ویستو ناخی مرۆڤ دەکەین، بەدەر نییە لە گیانی خۆ سەپاندنو داگیرکاریو دەستڕۆیی، ئەم دیاردەیەش لە دەرەوەی شارەکانەوە دەستی پێکردووە، چونکە سەری گەورەو دەستڕۆو داگیرکەر لە دەرەوەی شار پەیدا دەبێت بە ناوی برا گەورە، دانیشتوانی دەکاتە کۆیلەو ڕەعیە مسکێن – گزیر – داردەست – سەرکار – خزمەتچیو مەسینە هەڵگر مشەخۆر گەندەڵ..هتد، ئیتر بە فیئودالْ ناوی ببەین، یان (ئاغا پاشا شێخی عەشیرەت – چەلەبی – میر – بەگ – خان – کێخوا) هەر چەندە بە تێپەڕ بوونی زەمەنو بەرەو پێشەوە چوونی دنیای تەکنەلۆژیاو دیجیتالو ئەلکترۆنیاتو پەرە سەندنی رۆشنبیریو کەلتوور بە گشتیو ئاسنکاریە پەیوەندیەکان لە نێوانی دەرەشارو شارە شارستانییەکانو گۆڕنکارییە خێراکان وپەیڕەوی سیستەمو یاسای پاراستنی مرۆڤو مافەکانیان ئەم دیاردەو حاڵەتو پەیڕەوییەی کەمتر کردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئاستێك داگیرکار تاك دەسەڵاترەوو قۆرخکردن هەر ماوە بە تایبەتی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتو وڵاتە هەژارو دواکەوتووکاندا، بەڵام بەرەو نەمان دەچێت، نا داد پەروەریو گریێو وتەی بە تویکڵو کێشەو ململانیێ

هەمیشە هەبووە، لە لایەك ڕۆڵی دەسەلاًتو دەسترۆیی ئاغا كە ستەمكاریو قۆرخكاری هەبووە، خۆیان پۆشتەو هەبوونو تێرو تەسەلْ، جوتیارو پاڵەو ڕەعیەو مسكێنو كزیریش ماندووو هەژارو داردەست، هەر چەندە، ئاغای وا هەبووە پێشبینی ئەوەی كردووە ئەم وەزعانە بۆ كەس تا سەر نابیٚ ژیرانەو دادپەروەرانە مامەلەی لەگەلْ خەلْكی گوندو دەورووبەرەكەی كردووە بۆ نموونە.. هەر لە چلەكانەوە لە گوندی عوێنە كە ئاغاكەی (حەسەن ئاغا) بووە بە (حەسەن شێتە) ناودارە كە دەكاتە باوكی شەهید (عوسمان سەرسۆر) كە شەهیدی ناوبراو ئەندامی پەرلەمانی هەرێمی كوردستان بووو كەسێكی تیكۆشەرو كورد پەروەرو یەكێك بوو لە زیندانیانی سیاسیو خۆش مەشرەب بوو، بیٚ گوناه بە دەستێكی نادیار شەهید كرا، بەڵیٚ ئەو گوندەی عوێنە چەندین تێكۆشەرو كەسانی سیاسی كورد پەروەرو نووسەرو هونەرمەندی لیٚ كەوتۆتەوە، ئەوەش بەشێكی دەگەڕێتەوە بۆ كارە چاكەكانی ئاغاكەیان حەسەن شێتە كە بە خۆی ڕوڵی هەبووە، یەكەم ئاغا بووە بە هەولی خۆی لە چلەكان قوتابخانەی هێناوەتە گوندو هانی مندالانی داوە خوێندن تەواو كەن، . لە پەنجاكان سینەمای سەفەری هەبووە بە قسەی شایەدمەندە زیندووەكان ئەو ئاغایە سینەما سەفەری داوەت كردووە گوندنشین لە گوندەكەیان فیلم ببینن..وەك باسی دەكەن بەردەوام لە دیوخانەكەی ڕۆژنامەو گۆڤارو كتێب هەبووەو خویشی زمانی ئینگلیزی وعەرەبیو توركی جگە لە زمانی دایك كوردی زنیویەتی، هەمیشە هانی گەنجەكانی داوە بۆ خۆ ڕۆشنبیر كردن، مامۆستا چەتۆ حەسەنی هونەرمەند، كە لە دایكبووی ئەو گوندەیە دەلێت ئەو ئاغایە كە لە گوند سیٚ جۆرە ترومبێلی هەبووە، قەمەرە جێب لۆری..لە بەهاران هەموو خەلْكی سواری ترومبێلەكانی دەكرد بۆ بەرەو

زورگەکان بۆ سەیران و گەشت و گوزار.. هتد، هەروەها لە گوندی (عاللاّ) عەزیز پاشا، ئەویش قوتابخانەی لە گوندە کردۆتەوە، دەنا زۆربەی ئاغاکان نەیانویستووە خەڵکە سادەکە خوێنەوار بن و رۆشنبیریان هەبێت و چاو کراوە بن نەوەك هەڵگەڕێنەوە لە ئاغاکانیان، کواتە مەسەلەکە رێژەییە نەك شێوەی رەها وەرگرێت، ئاغای وا هەبووە زۆر باش و دووربین، هەبووە تێکۆشەرو خەباتگێر، هەش بووە ستەمارو چەوسێنەرو خراپ، . هەر لەبەر ئەوەش هەڵگەڕانەوە و بە گژ داچوونی ئاغاکان هەبووە، بۆ نموونە: (حاجی سمایل قادر سوراحی) لە بەهاری ۱۹۵۳و لەسەر گردی گوندی قازیخانە لە دەشتی هەولێر، بڕیاری دا راپەڕین بەرپا بکا دژی ئاغاکان، بە گەورەترین ڕوداو ئەژمار دەکرێت لە مێژووی خەباتی چینایەتی لە کوردستان لە ناو خەڵك بە (هەرای فەلاّح)و (ساڵی سوێند خواردن) ناسراوە، ئەو پیاوەو هاوەڵەکانی بڕیارەکەی وەك ئاگری نێو پوش تەواوی گوندەکانی گرتەوە، هەژموونی ئاغاکانی شکاند، بە جۆرێك دەنگی دایەوە کە ڕۆژنامەکانی ئەوسای بەغدا وەك مانشێت و لە لاپەڕەکانی یەکەمیان باسیان کردووە، ئەو کات ئاغاکان هانایان بۆ نوری سەعید بردووەو بە فەرمانێکی پادشایی حاجی سمایل دەستگیر کرایەو ڕەوانەی زیندانی موسل کراوە.

ئەوەتا (هێمن موکریانی) شاعیریش لە (کوێوە بۆ کوێ)ی دیوانی تاریك و روون باس لە ڕاپەڕینێکی جوتیارانی ئێران دەکات دژ بە ئاغاکان بەم شێوەیە نووسیویەتی (جوتیارەکانی کوردستانی ئێران لە ۱۳۳۱-۱۹۵۲ لە دژی زوڵم و زۆرو چەوساندنەوەی دەرەبەگەکان ڕاپەڕین و بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردستانی ئێراندا، ناتەبایی چینایەتی گەیشتە ڕادەی تەقینەوەو چینی چەوساوەی وڵاتەکەمان بۆ ماوەیەکی کورت لە

بەشـێکی کوردسـتاندا تـوانی بـە سـەر چـینی دەسـەڵاتداردا زاڵ بـێ، جوتیارەکـان هـەر بـە هێـزی خۆیـان توانیـان لەبـەری (فـەیزوڵڵا بـەگیان‌و چۆمی بۆکان‌و چۆمی مەجیدخان‌و شامات)و بەشێکی محاڵ بێ خوێن ڕێـژیو ئازاردان‌و خراپـە کـردن لەگـەڵ ئاغاکـان لـە گونـدان دەربکـەن‌و بـە خاوخێزانەوە لە شاری بۆکانیان پەستیون‌و لەوێشدا گەمارۆیان بدەن‌و بە پەلە خەریکی چەکدار بوون بن.)

(پیلیوت) ی زانا دەڵێت (پیـاوی لـە خـۆ بـایی لـەو کەڵەشێرە دەچێ وا دەزانێ سبەینان کە ڕۆژ هەڵدێ بۆیە هەڵدێ گوێ لە خوێندنی ئەو بگرێ.

(پیرەمێرد)ی شاعیریش دەڵێت:

**هەندێ لە خۆیدا دەست بە تێلایە**
**هیچ نالێ ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە**

دەمـەوێ ئـەوەش بڵـێم هەنـدێك لـە مەلایـەکان لـە گونـدەکان دەسـەڵاتدار بـوون لەبەرئـەوەی لەبـەرەی ئاغـا و دیوخانـەکان بـوون، وانـەی ئاینیـان دەدایەوەو فەقێشان هەبوو، فەقێکان کاتی نان خواردنی نیوەڕۆو ئێواران، ماڵ بە ماڵ دەگەڕان (راتبـەی فـەقیان ڕەحمـەتی خواتـان لێ بێ) فەقییـەکان زیـاتر لـە ماڵـە هەبووەکانـەوە دەسـتیان پێـدەکرد، زۆر جـاریش دڵیـان دەڕەنجا شێوێکیان بەر چاو دەکەوت‌و شێوێکی تریـان وەردەگـرت، بۆیە فەقێیەکیان کە لە راتبە وەرگرتن هاتبۆوە گوتبـووی (برنجیـان نیشـان دام، ماشیان دەرخوارد دام)

دیاردەیەکی دی لە گوندان هەبوو کە خۆم دیومە ئـەویش (دێـوەرە) کـە بـەقاڵێکی سـەفەری بـوو شـەکرۆکەو شـیرینیاتی منـداڵان‌و کـەڵ‌و پـەڵی

پێویستمەندی ماڵانی پێ بوو سەرەتا بە تێرگو سەر پشتی گوێدرێژو دواتر بە ئارەبانە، کە لە گوند دەردەکەوت وهاواری دەکرد (دێوەرە) لێی کۆ دەبوونەوە جۆرە چێژو تام بۆنێکی خۆی هەبوو.

## ئەی لە كوێیە هێلّی ئارام؟!

(١٢)

خاك دایكێكی میهرەبانە، بە هۆی كورد بوونمان، بە هۆی نەبوونی قەوارەیەكی سیاسیو دەوڵەتێكی سەربەخۆ، بە هۆی ژیان بەسەربردن لە كوردستانێكی خاوەن قەواڵەو نەخشەی بێ تاپۆ بوون، بە هۆی هەژموونی ئەقلیمیو دوژمنایەتی كردنمانو داگیر كردنو گوشاری سیاسیو ئابووریو هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەك لە لایەن ڕژێمە ڕەگەزپەرستە یەك لە دوای یەكەكانو دان پیانەنانیان بە مافە ڕەواكانمانو زەوت كردنی ئازادیو سامانەكانمان لە هەموو ڕوێكەوە، منیش لە پاڵ بیرەوەرییەكانمدا چەند وتەیەكم هەیە:

* وەك پانۆرامەیەك دەكرێ بڵێم...

١- كە ساواو نەفام بوومە، دەستم بۆ هەر شتێك بردبێت، پێیان گوتوومە نەكەی (بڤەیە).

٢- كە هەراش بوومەو دوای بڕینی قۆناغی قوتابخانەی سەرەتایی دواتر هەر لە تەمەنی (١٣)ساڵیدا كە لە قەتابخانەی ناوەندی زازا خوێندوومە، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا كە چاوم كردۆتەوە كەوتوومەتە نێو بینینو هەست پێكردن بە شۆڕشە مەزنەكەی ئەیلوول كە لە (١٩٦١)دا گڵپەی سەندووە، لەو ڕۆژەوە تا ئێستایش وەك ئەوەی جگەرە بە جگەرە داگیرسێنن ئاوا شەڕێك ئێمەی داوەتەوە دەست شەڕێكی تر، ئیتر دوای

ئەو تەمەنە بە سەر چووە بۆ نەڵێم کوانێ سەربردەی ڕۆژانی گەنجیەتی بە تایبەتی نەوەی منو منەکان، ئەوە نییە ژیانمان بە سەر برد بە وەرگرتنی هەواڵی جگەر بڕو تاساوی لە ڕۆژگارەکانی پڕ لە گومانو ترسو دڵەڕاوکێو ڕاڕاییو تۆقاندنو ڕاوەدوو نانو خۆ حەشاردانو کوشتار وئاوڕدانەوەی بە شكو سڵمینەوەو کەوتن بە سەر ساتمەی قەدەغەیەو هێڵی سوورە، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی بێوەژنو جلی ڕەشو نوزەو ئاهی دایکانو زۆر بوونی کەم ئەندامو قەیرە کچو پیاو لە دەستدانو وێرانیو سەر هەڵگرتنو غوربەتو ئاوارەییو هەست نەکردن بە ئارامیو نیشتەجێیی هەمیشەیی... هەڵبەتە پەڕە پەڕە کردنی گوڵێك زوڵمێکە لە سروشت دەکرێت، کەچی هەڵوەرینی گوڵو درەختو مرۆڤی کورد بەردەوامی هەبووە.

* (داستایۆڤیسکی) دەڵێت: (مرۆڤ بەردەوامو زۆرترین شکاتێك کە دەیکات لە ڕۆژگارە)

–چی بکەین ڕۆژگارو چارەنووس لە گەڵمان هەڵناکات.

* (راسین) دەڵێت: (بەهار بە خۆشی بە ڕێ بکە، چونکە بتەوێو نەتەوێ لە دەستت دەچێ.)

–چی بکەم بەهار ئاوا تەمەن کورتەو... لەو ڕاکردنو لە من بە دوایداو نایگەمێ؟

* (ئەلبێر کامۆ دەڵێت: (مرۆڤ تەنها دروستکراوێکە، نایەوێت ئەوەبێت کە هەیە.)

– من چیم لە دەستدێ، ئەوە بەو شێوەیە هەبوومو هەم.

٣– ئەگەر وێستگەیێکی ترمان ساڵی (١٩٦٣) بێت بەو پێیەی هەستی نیشتمانیو کوردایەتی بە تەواوی لە مێشکمدا چەکەرەی کرد بوو بەو

پێیــەی کاریگــەری ماڵــەوەو بــاوکمو برایــە گەورەکــەم کــە خــەریکی کوردایەتیو حزبایەتی بوون، دیارە لەو گەڕەکەی عارەبان کە سێ بەشی ژیانم لەوێ بە سەر بردووە، دانیشتوانی بریتی بوون لە کوردو عەرەبو تورکمــانو ئاشــوریو کلــدانیو ئەرمــەنو ســوبیو جۆرەهــا تایفــەو کەمایەتییەکان واتە دەبێت هەستی کوردایەتیم لەو پەڕی بەهێزیو تیندا بێ، لەو بەروارەیشدا گڕو گڵپەی شۆڕشو شەڕەکان لەگەڵ رژێمی بەعسی ئەوسا لە دەرەوەی شارەکانو هەتا چالاکی ناو شارەکانیش بە جۆش بوون، ژمارەی جاشەکان لە زۆر بوون بوو بە ناوی فرسان صلاح الدین واتە جاشە کوردەکان کە هەندێکیان تازە بە فرسان قەید کرابوون هاتبوونە نێو شار بە خریتەو فیشەکدانو تفەنگەوە نابەلەدو غەریب بوون وەك فڕفڕۆك سەریان دەسووڕاند بە هەموو لایەکدا، لێکچوون نەبیت حاشا دەتگوت ماکسیم ملیانۆسن دوای سەد ساڵ خەوتن تازە لە خەو هەڵساون هێندە بە نامۆییو غەریبی سەیری ئەم لا وئەو لایان دەکرد لە نێو شاردا، فرسان خالید وەلیدیش کە لە عەرەبو عەشایری بەدو پێك هاتبوون لەوان خراپتر بە دیشداشەوە لێرەو لەوێ دەبیندران ها هایان هەبوو بە دەم دروشمی (أحنا بدو.... وین العدو) واتە ئێمە خێڵی بدوین، لە کوێن دوژمن، دیارە مەبەستیان لە دوژمنەکان، پێشمەرگەو تێکۆشەرانی کورد بوو، هەروەها لە ناو شاریشدا بە ناوی (حەرس قومی) بە جلی رەنگ خاکیو چەکیان بە دەستەوە بوو جۆری چەکەکان غەدارەو کلانشیکۆفو سەمینۆف بوو، لە نێو بارەگاکانیان تێکۆشەرە بەند کراوەکانیان ئەشکەنجە دەدا لەوانەی دەستگیر کرا بوون بە تایبەتی حزبی شیوعی لەو سەردەمدا، سیخوڕەکانیان لە نێو شاردا رۆڵی دەستنیشان کردنیان هەبوو، جگە لە پیاوانی پۆلیس کە بە موسلەحە دەسووڕانەوە، بەڵام

شایەدیەك بۆ پۆلیسەكان بە ویژدانەوە بدەین تا پێیان كرا بێ خراپەیان نەدەكرد بەڵكو لە نێویاندا هەبوو پیاوی كورد پەروەرو لە خزمەتی شۆڕش و پێشمەرگە دا بوون، بەلاّم ئینزباتی عەسكەری و هەواڵگری لە نێو شاردا دابەش دەكران لەسەر شۆستەكاندا وەستا بوون هەر گەنجێك بە بەر دەمیاندا تێپەڕ بووایە ڕایان دەگرت و پێیان دەگوت (هویتك) واتە پێناسەكەت، زۆر جار وا ڕێك دەكەوت بە تایبەتی لە شەقامی موزەفەرییە كە لە تەنیشت گەڕەكەكەی ئێمەوە بوو ئەگەر سیخوڕێك یان خۆفرۆشێك بە سزای گەل ومەرگیان سپاردابا لە لایەن پێشمەرگانی ناوخۆوە، یان سەربازێك، كەسێك لە دەست ئینزباتەكان ڕای كردبا، رووی دەكردە نێو كولاّنە تەنگەبەرە پێچاو پێچەكانی ئەو گەڕەكەی ئێمەوە ئیتر ئەو چەكدارانەی بە دواوەی بوون دەست غەڵەت دەدران كەسەكان حەشار دەدران و رزگاریان دەبوو لەبەرئەوەی خەڵكەكە دڵسۆزو كوردپەروەر بوون، ئەوەتا لە شیعرێكی بەندەدا ئەم واقعە ڕەنگی داوەتەوە كە لە دیوانی (لە خونچەی دەم تەنگەوە تا گوڵێكی لێو پەڕ) لە لاپەڕە (٦٨)دا لە ژێر ناونیشانی بەشێكی دی لە نۆستالۆژیای لە هەر ئاوڕێ.. ئاگرێ، كە تیایدا دەڵێم:

بە ڕۆژی رووناك، تاریكی بەزاندووە
بە ڕەپە ڕەپ، بە كۆلاّنە تەنگەبەرە قاوەییەكە ڕادەكات
چەك بە دەستان بە هانكە هانك و شپرزەییەوە
لێم دەپرسنەوە
كوڕیژگە بە كوێدا ڕۆیشتن؟
پەنجەی وەلاّمی ئاماژەم بە هەڵەیان دەبات

ڕێگایەکی تریان پێ نیشان دەدات
ئای گەڕەکە دێرینەکەی چوزاندنەوەی هەستم
گەڕەکی بە سۆزو ئازار
ئای کوڕەکان، کوڕانی یاخیو فیرار

*لە بازگەکانی دەرەوەی شاریش لە هەرێمی کوردستاندا کاربەدەستانی ڕژێم زۆر توندو تیژ بوون لەگەڵ ئەوانەی سەفەریان دەکرد لە هاتنو چوونیاندا لە وەرگرتنی پێناسو پشکنینی کەلو پەلو لەپاڵ قسەی ناخۆشو ئیهانە کردن، بۆیە سەبارەت بەم بابەتەیش ئەم چەند دێڕە شیعرم لە ژێر ناوی (بۆ پشکنین) نووسیبوو لە ساڵی (١٩٧١)دا کە لە دیوانی (کارێزە مەرجان)دا بلاوم کردۆتەوە کە دەڵێم:

لە بری جێ شوونی پەتی ملی قازی شەهید
لە بازاڕی گلێپەداری نەوەی خوێنین
لە مەترسی پەیامی مەم بۆ خاتوو زین
لەسەر دەرگای شارەکەماندا نووسراوە
بوەستن بۆ پشکنین
***
گردو بلندایيە سەوزەکان
شاخە قا سپە قاسپەدارە بەفرینەکان
لووتکە بەرزە سەر بە تەمەکان
جوانن، جوانتر لە قیژەونی داری سەیتەڕەو بنکەکان
شیرینن، شیرنتر لە زەرەخەنەی ڕەبیەو کەمینو گومان

*هەر وەك (ئەدۆنیس)ی شاعیر دەڵێت: (هیچ قوڵپ نادا ئەو خوێنە نەبێ کە دوێنێ‌و ئەمڕۆ ڕژاندیان تا سبەینێی تیا بگەوزێ.)... قەت لە بیرم ناچێ، ئێوارە بوو، ساڵی ١٩٦٣ شەڕ لەو پەڕی گەرمیدا بوو لە چیاکانی بەنی هەریرو هەندرێن‌و زۆر لە ناوچەکانی دی کوردستان، لە بن دیواری مزگەوتی پاشا لەو گەڕەکەی خۆماندا لەگەڵ چەند برادەرێك وەستا بووین، چەند منداڵێك بە هەڵەداوان‌و هەناسە سوارییەوە هەواڵیان بە دەمەوە بوو، گوتیان خەبەرمان دایە دایکی (عدویە) کە زیلێکی عەسکەری لە نزیك چاپخانەی باین، بە ناو ئەو قوتابیانە کەوت کە تازە لە قوتابخانە هاتبوونە دەر، زۆرێکیان لەو فەریکە گوڵانە، لەو کچە جوانکیلانە، مردن یا بریندار بوون لە نێویاندا (عدویە) بوو کە تەمەنی دوانزە ساڵان بوو کچی وەستا (محەمەد)ی بەنا لە نێو مردووەکاندا بووە، ئەوەی لێرەدا کە دەمەوێ بیڵێم کاتێ (ئیفادەیان لە سائقی زیلی عەسکەری تاوانبار وەرگرت، گوتبووی من بە ئەنقەست ئەم تاوانەم ئەنجام داوە بۆ ئەوەی بچمە بەندیخانە باشترە لەوەی بمنێرنە نێو چیاکان‌و لەوێ بکوژرێم.)

*ڕاستە جوانی کوردستان بە خێرو بیرو خاك‌و کانزاکانی دۆزەخێکی بۆ ئێمە ڕەخساندوە بەڵام بۆ دوژمنانمان زیاتر، خۆ دوژمنانمان ئارامیان لێ هەڵگیراوەو ئەوانیش ژیانیان نەبووە، هەمیشە خەرکی ناشتنی عەسکەرو بەکرەگیراوەکانیان بوون کە بە گوللەی پێشمەرگەو تێکۆشەرانمان دەگوژران یان بریندار دەکران، هەمیشە هەڕەشەکان بە مەرگی ناوەختیان دیتۆقاندن، چونکە کورد هەڵۆکانی بەرامبەر بەو قەلەمونانە باڵا دەست بووە هەر وەك ئەم وتەییەی (پەرمودا بەترا) کە دەڵێت: (کاتێ لەگەڵ قەلەمون سەرو کارت هەیە، فڕین لەگەڵ هەڵۆدا زۆر

دژواره.) تاکی کورد لەسەر ماڵو جێنزرگەی خۆی بە مێوان دەزانیٚ، چونکە پێشبینی دەربەدەر بوونی کردووە نەك ئارامیو نیشتەجێیی هەمیشەیی، ئەو گەنجە کوردەی نەیویست لە ناوەوەی خۆیدا بڕمیٚو ببێتە بەندەی دەسەڵاتو دیکتاتۆریەت، ئەوە هەڵبژاردەی خۆی بوو ئەگەرچی دەزانیٚ بە کێڵگەیەکا گوزەر دەکات مینی لیٚ چێندراوە، بەڵام چی بکات ئەمە قەدەری نەتەوەیەکە کە گریانی زۆرو پێکەنینی کەمە هەر وەك خیام دەڵێت:

بولبول وتی بە زمانی حاڵ
ڕۆژیٚ پێکەنین، ساڵیٚ گریان

بەڵام ڕۆلەی کورد ڕاهاتووە هەر وەك (ئابە بەدریۆ) دەڵێت: (چرکەیەك دەرکەوتنی خۆر، هەفتەیەك یادەوەری باران لە نێو دەبات.)

*بەڵیٚ وایە کە بەهاری گەنجیەتیت لە دەست چوو، ئەستەمە لە پایزە تەمەندا ئەو ئاستە تەمەنەت بۆ بگەڕێتەوە مەگەر وەك بیرەوەری باسی لێوە بکەیت، خۆ پێشمەرگەیەکیش دەڵێت، بەو تفەنگەی بە شانمەوەیە تەقەیەکی زۆرم لە (کات) کردووە، (کات)ێکی زۆرم کوشتووە، بەڵام ناچار کراوم دەنا کەس نییە (کات)ی خۆش نەویٚ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێکۆشانو خەباتی ڕەوا، عیشقو خۆشەویستی نیشتمانو ئازادیو جوانییەکانو بەرگری کردن لە خاكو نەتەوەو شەرەفو کەرامەتو بەها بەرزەکان ئەوە ناکات تەمەن بە فیڕۆ ڕۆیشتن چونکە تامو چێژو لەزەتی تێکۆشانو خۆ بەختکردنو بیرەوەرییەکان واتە تا مردن تەمەنێکی جحێڵو جوان، هەتا جەلادەکانی بەندیخانەکانیش شایەدن بۆ نموونە لە

بەندیخانەی ئەبو غرێب بە تاك و گرۆپ كە دەیانبردن بۆ لە سێدارە دان لە پۆپەی لەزەتی مردنەوە سروودی (ئەی ڕەقیب ماوە قەومی كورد)یا دەگوت، ئەوەتا كە ویستیان (قازی محەمەد) لە سێدارە بدەن، دوژمنانی پیان گوت ئێستا بەرزت دەكەینەوەو پەتت لە مل دەشەتێنین، وەلامی شەهید قازی ئەوە بوو (بەڵێ ئێستا بەرزم دەكەنەوەو من لەسەرووی ئێوەو لە ژێر پێلاوەكانی من دەبن) لە پۆپەی لەزەتی مەرگێكی سەر بەرزانەوە مێژوو تۆماری كرد.

*نموونەیەكی دی كە مێژوو تۆماری كردووە كە مرۆڤی تێكۆشەر لەسەر داوای ڕوای خۆی بێدەنگ نابێ ئەگەر سەریشی لەسەر دانا بێ (لە ١٨٢٥ لە ڕوسیا ڕاپەڕینێكی سەربازی لە لایەن لیبراڵەكان دژی تزاری نوێی روسیا نیكۆلای یەكەم رووی دا، حوكمی خنكاندن بە سەر پێنج سەركردەی لیبراڵەكانی سەپاند.. یەكێك لەوانە شاعیر (ڕیلایف) كە چووە سەر سێدارە، قەڵەو بووو پەتەكە پساو بە پێی عورف و عادەت دەبێ لێی ببوردرێ، ڕیلایف كە بینی سەرو ملی سەلامەتە، رووی لە جەماوەرەكە كردو وتی، سەیر كەن لە ڕوسیا هەتا ناتوانن شتێكی باش و ڕێكو پێك دروست بكەن تەنانەت پەتی سێدارەش، ئەوجا پەتێكی ئەستووریان هێنا لە ڕقان نیكۆلای گوتی: ئێ باشە با پێچەوانەكەی بسەلمێنن.

## چاوانم ئاودێوی دەکاتو زەینیش داکردن

(١٣)

ئەوەی بەو چاوانەوە بینیوومەو دەیبینم، وێنەکان، رووداوە سپیو ڕەشەکان، ژیانی پڕ لە ڕەنگو دیمەنە دلڕفێنو قێزەوەنەکانیش هەتا سێبەرو وەهمو مۆتەکەو تارمای.. هتد، کە چاو ئاودیوی دەکاتو زینو ناخ دایدەکات بە تۆمار کردنەوەو چێژو تامە شیرینو تامە تاڵەکانیشیەوە، دەنگو ئاوازی چریکەدارو دەنگە نەشازەکانیش بە دەهالیزەکانی گوێچکەوە ڕەت دەبن، بۆنی عەترو گوڵەکانی باخو دارستانەکانیش کە وەزیفەی لووتەو هەڵیادەکیشێ جگە لە هەستەکانی زیندوو بە هەستی شەشەمەوە (پاڕاسایکۆلۆژی) کە لەسەر زەویو لە ئاسماندا، بە بینینو بیستنو بۆنو هەست جێگیر دەبن، هەمووی دەچنە خانەی بیرەوەریو یادگارییەکان، کاتێ دەگەڕێمەوە سەریان، دەستیان بۆ دەبەمو فوو لە خۆڵەمێشی سەر پشکۆیە داگیرساوەکان دەکەم، ئاگرێك لە ناخی خۆمدا بەرپا دەکەم، بەڵێ ئازارم دەدا تەمەنی هەڵفڕیو گلۆپە سوورەکان دادەگیرسێنن، چیرۆکەکان خۆ دەدەن بە دەستەوە، منیش بۆ خۆمو بۆ تۆو بۆ هەمووان دەنووسمەوە، بۆیە سەیر دەکەین (بوون – کات– گێڕانەوە) لای (پۆل ریکۆر)ی زانای مەزن وا دەکەوێتەوە (کاتێك، چاوێك رووداوێك دەبینێت یان ئاشنای دەبێت دەبێتە نمایندەو هەڵدەرەوەی پەردە لەسەر ئەو رووداوانە بۆ ئەوەی چاوە بێئاگاکانی

دیکەی لێ بەئاگا بهێنێتەوە، هەروەها فیکرەی هەنووکەیی لای (هایدگەر) لەسەر تێگەیشتنی خود دامەزراوەو لای (پۆل ریکۆریش بەرەو دەستەجەمعی دەبردرێت) ئیتر وا منیش دەگەڕێمەوە بۆ (ڕۆژانێ بوو) دوا بە دوای ئەلقە بڵاوکراوەکانی پیشوومو درێژە پێدان و باسکردن سەبارەت بە ژیان و داب و نەریت و گوزەرانی خەڵکانی ئەو سەردەمانەی ساڵانی زوو چۆن دەژیان بە تایبەتی لە نێوانی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان و تا ناوەڕاستی هەفتاکانیش بۆ نموونە:

١ - یەك لەو بابەتانەی ڕامدەگرێ و لەسەریدا بوەستم مەسەلەی (سەکوژە) واتە سەگ کوژتن، ئێستایش ئەگەر پیاوێك شۆرتێکی دەلینگ کورت و کراسێکی نیو قۆڵ لەبەر بکات و شەبقەدار بێ پێی دەڵێن دەڵێی سەکوژە، چونکە هەر لە ساڵانی پەنجاکان و تا سەرەتای هەفتاکان بەو چاوانەوە بینیوومە پیاوانی کارمەندی ئەو کارەو بەو جۆرە دیمەن و جل و بەرگانەوە بە قرمەو تاپڕی دەستیانەوە لێرەو لەوێ و بە تایبەتی لە دامێنی قەڵا سەربەرزەکەمانەوە بە دوای سەگەکان دەکەوتن و دەیانکوشتن، ئەو کاتانەو لەو سەردەمدا هێشتا زۆر فامم نەدەکردو سۆزو ویژدانم سەرەڕۆیانە بوو بەزەیم بەو سەگانە نەدەهاتەوە کە کەلەواژ دەبوونەوەو نوزەیان لەبەر دەبڕا، پاش ئەوەی تێکەڵی دنیای شیعرو ڕۆمانسیەت و ویژدانی زیندوو بووم، ئێستایش گەڕانەوەی دیمەنەکان وەك فلاش باك دێتەوە بەر چاوم و ئازارم دەدا، کە شیعرێکی شاعیری رووسی (یفتۆ شینکۆ)م خوێندەوە تیایدا دەڵێت:

**چوومە بەر دەرگای ماڵی یارەکەم و لە دەرگەم دا**
**لە جیاتی پێشوازی لێکردنم کە کێشەیەکی بچووك لە نێوانمدا هەبوو**

**دەرگاکەی بە روومدا داخست**

**بە دڵێکی بریندارەوە گەڕامەوە**

**وەك (سەگێك) ئاسا کە قاچی بەر پێچکەی**

**شەمەندەفەرێك کەوتبێ**

**بە شەلە شەل بڕواو دڵۆپ دڵۆپ خوێنی لێ بچۆڕێت،**

**سەگەکە لە من بەختەوەر ترە**

**کە شوێنەواری خوێنەکەی دیارە**

**کەچی خوێنی من لە ژوورەوەیەو تك تك لە دڵمەوە دەتکێ و**

**کەسێك نابینێ**

لەم چەند دێڕەی سەرەوەدا شاعیر خوێنی سەگێگ وەك ئاژەڵێکی بە سوودو بە وەفا لەگەڵ خوێنی خۆیدا جیای نەکردۆتەوە، بە هەمان شێوە سەیر دەکەین سەبارەت بە خوێنی پەلەوەرێك هەستی شاعیری ناودار (جاك برێڤیر) وا دەکەوێتەوە کاتێ دەڵێت:

**هەموو بەیانیان بە دەم قوورقەی کەڵەشێرێکی دراوسێکەمان**

**لە خەو هەڵدەستام**

**بەیانییەك کە چاوەکانم هەڵگلۆفی و**

**سەیرم کرد رۆژ لە ناوەندی ئاسمان و کات زۆر درەنگە**

**من لە خەودا ماوم و**

**ئەو بەیانییە گوێم لە قوورقەی کەڵەشێرەکە نەبووە**

**کاتێ سەیری بەر دەرگای ماڵی دراوسێیەکەم کرد**

**بینیم لەبەر دەرگەدا خوێن ڕژاوە**

**زانیم نەك كەڵەشێرەكە سەر بڕاوە**
**بەڵكو سەعاتەكەی منەو شكاوە!!**

پێموایە مرۆڤ تا بە تەمەن دابچێ و تەجرەبە وەرگرێ و بە هەڵەكانی خویدا بچێتەوە زیاتر هەستی مرۆڤایەتی دەرسكێ و هەردەم رووی لە ئاشتی و خۆشەویستی و تەبایی و كاری مرۆڤانەیە، خۆشگوزەرانی بۆ خۆی و بەرامبەرەكەی دەخوازێ، هەر چەندە هەن دەروونییان نەخۆشەو ناتوانن لە كانیاوی خۆشەویستیدا گۆڵمێك ئاو بخۆنەوە، لێ ئەو كەسانە ژمارەیان كەمەو ناوازەن، ئەوەتا منیش بەش بە حاڵی خۆم لە كۆمەڵە هۆنراوەی (دەچنە ڕێواسان)چاپی / ١٩٨٥ / لە هۆنراوەیەكدا بە ناوی (هەستی شاعیر)دا.. نەك بەرامبەر بە ئاژەڵ و پەلەوەر بگرە بەرامبەر بە مێشوولەیەك قسەی خۆم هەبووە كاتێ دەڵێم:

**ئەی مێشوولە نەفامەكە**
**تۆش بە نەفامی خۆتەوە**
**لەسەر ئەم ئوتوە هەڵایساوە هەڵنیشتی**
**خۆزیا پزیشكی مێشوولانیش دەبوو**
**دەمگەیاندە نەخۆشخانە،**
**یان قاچیم تیمار دەكردو دەمبەستاوە**
**دەنا بۆچی بكەوێتە ناو هۆنراوە؟!!**

٢- بەر لە رۆژ ئاوا بوون لە زۆربەی گەڕەكەكانی هەولێر بە تایبەتی لەو گەڕەكەی ئێمەدا گەڕەكی عارەبانی كۆن كە چەقی نێو شار بوو،

ڕەوانشـــاد (حـــاجی بـــابکر نجـــم) بـــاوکی هونەرمەنـــدی کەمانجـــە ژەن (نەجمەدین) بە قوتە جێبیکی لاندگلۆڤەر دوکەڵی (دی. دی. تـی) بە چڕی بـە نـاو کـۆلانی گـەڕەك ئـەو دوکەڵـە سپییەی بـڵاو دەکـردەوە بـۆ قەلاّچـۆ کردنـی مـێش و مەگـەزو مێشوولان، گـەڕەکی قـانگ دەدا، پیـاوم دەویسـت لەو کاتەدا لە نێو سیخناخی دوکەڵەکەدا بە پەلە خۆی دەربـاز نـەکات دەنـا نەك هەر بە بەردی دەست منداڵە لاسارەکان سەری دەشکا، بگرە بـە پەلکـە شـووتی و کەسـتەکان تۆزیـان لەسـەر شـان ملانیـان هەڵدەسـتاندو مـۆری منداڵـە هـارو هاجـەکانی ئـەو گـەڕەکـەی پێـدەبڕا، وا ڕێك دەکـەوت ڕۆژانـی یەکشەممە کە کچ و ژنـە شـان و مل رووتـە مەسـیحییەکانی دەردەچوون لـە (کلێسـەی کلـدانی روح الاقـدس) کـە لـە نیـو گەڕەکەکـەمان بـوو کـە ئێسـتاکەیش بیناکـەی وەك خـۆی مـاوە، دەکەوتنـە نێـو تەڵـەی ئـەو چـرکە سـاتانەی چـێژو خۆشـنوودی بەخشـین بـە گـەنجانی هـەرزەکار کـە تـا ئێسـتـایش هـەن لەوانـەی بـە تەمـەن داچـوونە بـە شـاراوەیی ئـەو بیرەوەریانەیان شاردۆتەوەو هەندێ جار ئارەقەی شەرمەزاری دەردەکەن کـە بـە یادیـان دێتـەوە چـەند هەڵـەی قێزەوەنیـان کـردووە ئـەوەتا (مـارتن هایدگـەر) دەڵێـت:((لـە کوێـدا ئاشـکرا بـوون هـەبێ، شـاردنەوەش هەیـە)) منداڵی و یارییەکان و هەڵەکانیش، ئەو هەتاوەیە لە ئاسۆی زاکیـرەی هـیچ مرۆڤـێ ئاوا نابێ، ئێستایش لە گەڵدا بێ خەت خەتەکانی سـاپ سـاپانێ و یاری تۆپ تۆپێن و پەلیکانێ و چاوشلکانێ و سیفۆن سیفۆنانێ و قەرە قەرە یـەك، قـەرە قـەرە دوو، خۆتـان بکەنـە دارو دەرزی، خـانوو چۆڵەی منـداڵی هەموو یارییەکان قوڵپ دەدەن و هەڵدەچن وەك سیفۆن و کۆکا کۆلاکـان کـە ڕاماندەشەقاندن و گرەوی بردنەوەو دۆڕاندمان لەسەر دەکردن لـە هەسـت و بیرماندا ناسڕێنەوە، لۆری و ترۆمبێلی یاریکردنی ئێمە لە تێل و سوفەیف

درووست دەكرا نەك وەك جۆرەها لەعابەی ئێستای مندالانی ئەو سەردەمە كە بە پیلو كۆنترۆڵ كار دەكەن، ئەگەر باوكان یا كەسی نزیك لە قوتابی تا ئاستێك هەبوون بووایە بەڵێنیان بە قوتابییەكە دەدا ئەگەر لە ئەزموونەكەی سەركەوتوو بێت ئەوە پاسكیلێكی بۆ دەكڕن، كەچی بەڵێنی ئێستای باوكو دایكان ئەوەیە ئەگەر قوتابیەكەیان پلەی باش وەدەست بهێنی و سەركەوتوو بێت لە ئەزموونەكانی ئەوە ئۆتۆمبێلێكی مۆدیل فول مواسەفاتی بۆ دەكرێ، ئیتر ئەمە ژیانی ئەوساو ئێستایە قوربان.

## گەڕەکی عارەبان و مەسیحییەکان و (من)ێك وەك شایەد حاڵ

(١٤)

بیرەوەرییەکانم لەگەڵ مەسیحییەکانی دانیشتوانی گەڕەکی عارەبان لە هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی ١٩٥٧ ١٩٨٦ بەو پێیەی لە ١٩٥٧ تەمەنم شەش سالآن بووە هاو پۆلّو قوتابخانە بووم لەگەڵ مەسیحیەکانی خوێندنگەو دواتر ناو گەڕەك، هەر لەو گەڕەکەش لە دایك بوومە لە ١٩٥١ دا بەلاّم لە ساڵی ١٩٨٦ دا لەبەر زروفی سیاسی تایبەت پەیوەست بە خۆم، جێگۆڕکیم کرد ماڵمان لەو گەڕەکە گواستەوە.

دەبێ ئەوەش بلێم کە هەولێر لە نێوەندی ئەو دوو بەرواره هێندە گەورە نەبووە تەنیا چەند گەڕکێکی لە خۆ دەگرت یەکێك لەو گەڕەکانەش گەڕەکی عارەبان بوو کە گەڕەکێکی زۆر کۆنەو دەکەوتە رۆژئاوای قەلاّت و سەنتەری شار.

ئەگەر ئاماژەیەك بۆ ناوی هەولێر بکەم هەر وەك د. مەولود ئیبراهیم باسی لێوە دەکات و دەڵێت " (هەن بە خۆرلێر ناوی دەبەن چونکە پەرستگای خۆرو ئاگر پەرستان تێیدا دروست کراوە (٢٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زاینیش لەسەردەمی (شاشولکی) و (ئاڕماسین) ناوی بە (ئۆربیلیم) هاتووە لە نووسینی ئاشوری و بابلیەکانیشە ئەربائیلۆ (چوار خواوەند)

بەڵێ.. گەڕەکی عارەبان لەسەرەتای بونییەوە هەموو چین وتوێژ ومیللەت و کەمایەتێکی لە خۆ گرتووە بۆیە بە گەڕەکی عارەبان ناوی

دەرکـردووە چـەند مـاڵێکی عـەرەب کـە بـە گامێشـەوان بـە خێـو کـردن نیشـتەجێ بوونـەو بـەروبوومی ئـەو ئاژەڵـەیان دەفرۆشـتو پێـی دەژیـان هەنـدێکی تـریش تـەنووری نانیـان لـە ماڵـەکانیان هـەبووە کـە ژنـەکانیان نانیـان سـاز دەکـردو پیاوەکانیـان بـە سـەبەتە بـۆ بازاڕیـان دەبـردو دەیانفرۆشـتو ئـاوا دەژیـان وورده وورده موسـڵمانەکان لـە ئـەنجامی خزمایەتی کردن کچ بە مێردانو ژن لە یەکتر هێنانو تێکەڵبوونیان لەگەڵ کـوردانی دانیشـتوانی ئـەو گەڕەکـە هەسـتمان بـەوە نـەدەکرد کـە ئەوانـە عەرەب بوونە چونکە هەتا منداڵەکانیان بە زمـانی کـوردی گـۆش کرابـوون هەنـدێکیش بــە تــورکی قســەیان دەکــرد، ئێمــە کــە لێــرەدا بابەتــە سـەرەکییەکەمان مەسـیحییەکانە کـە لـەو گەڕەکـە نیشـتەجێ بوون لـە پـاڵ کوردو عەرەبو تورکو یزیدیو سائبەو ئەرمەنیەکانو بیانیەکانی تر.

ئەو گەڕەکە شوێنو شوێنگەکەی نێوەنـدی شـار بـوو لـە بازاڕو پارێزگا وشارەوانی وبرید وویستگەی شەمەندەفەرو قشڵەی سواریو کتێبخانـەی گشـتی وگـەرماوەکانو خـانو کاروانسـەراکان وبـازاڕو قەیسـەری وهـەموو شوێنە بنەڕەتیەکانی بژێویو ژیاریو شارستانی نێوەند نزیك بـوون بۆیـە ژیان لەو گەڕەکەدا بۆ هـەموو لایـەك بـە سـانایيو سـادەیيو ئاسـوودەییو خۆشەویستیو تەباییو برایانە بە سـەر دەبـردرا بـە بـێ جیـاوازیو ڕەگـەز پەرسـتی، لـەو گەڕەکـە مزگـەوتو تەکییـەو مەزارگـەو گۆڕسـتانی ئیمـام محەمـەدو کەنیسـەی کلـدانی لـێ بـوو هـەر تاکێـك بـە ئاینپەرسـتی خـۆی ریزیان لەبەرامبەریان دەگرت، ماڵی ئێمـە کـەوتبووە نیـوان مزگـەوتی سـید مەحموود پاشاو کەنیسەی قلب الاقدسی کلـدانی، ڕۆژانـە گـوێم لـە زەنگـی ناقوسی کەنیسـە بـە تایبـەتی لـە ڕۆژانـی یەکشـەممەو لەگەڵ بـانگی (اللە

اکبر) ی مزگەوت دەبوو بۆیە نا حەقم نەبووە ئەو وتەییەی (ئەبو عەلاَ المعری) بە نموونە بهێنمەوە کاتیَ دەلێت:

(في اللاذقية ضجة مابين أحمد والمسيح
هذا بناقوس يدق ذاك بمئذنة يصيح
كل من يدعوا الى دينه
يا ليت شعري ما الصحيح؟)

بە کوردیەکەی لە وەرگێڕانی د. کەمال غەمبار وا کەوتۆتەوە:

(لە لازقیە هەراو هۆریایە
نێوان ئەحمەدو خودی عیسایە
ئەو زەنگ لێدەدا، ئەم بانگی خودایە
خۆزیا دەمزانی کامیان ڕوایە)

لەو ماڵە مەسیحیانەی کە لەو گەڕەکە نیشتەجیَ بوون، هەبوون لەبەرئەوەی فەرمانبەری میری بوون یان لە شارەکانی تری عیراقەوە گوازرابوونەوە یان لەبەر زروفی سیاسی بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٦٣ کە هەندێکیان لە موسلەوە هاتبوون هەر چۆنێك بوو بیَ، من بەش بە حالی خۆم چەند هاوڕیەکم هەبوون چ لە قوتابخانە یان لە ناو گەڕەك بوو بیَ یەکێك لەو برادەرانە ناوی ئەکرەم شابۆ بوو باوکی مساح بوو ئێستا لە هۆلەندەیە، هەروها ئەدیب خەمۆو لیۆن ئاردەواس و زۆری دی.

لەو ماڵە مەسیحیانەی کە تاکو ئێستاش زۆربەیان لە هەولێر ماون ماوەیەکی زۆر لەو گەڕەکە بوونە (ماساك خەیات جۆرج ددانساز بایگردیچ ساڵح سوبی هۆین ساڵۆنی ئاڕایشگای هەبوو ماڵی ئاردەواس کوڕێکیان شلیمۆن ئاردەواس یاریزانی فتبۆڵ بوو، ماڵی خەمۆ کە ئێستاش کوڕەکەی لە بازاڕی هەولێر زێڕینگرە ناوی (ئەدیب)ە هەروەها چەند ماڵێك لە ئاکرێ هاتبوون مەسیحی بوون ئێستاش لە بازاڕی هەولێر دوکانی زێڕنگریان هەیە لەم ساڵانەی دواییانەدا لە عەنکاوە نیشتەجێ بوون کەسایەتی دیارو رێكو پێك بوون لەوانە (کاك ودیع - فائق - سەباح) هەروەها ماڵی لوسێ ئەرمەنی بێوەژن بوو بەرگدروو بوو، دەیانی تر کە ناکرێ لێرەدا ناوی هەموویان ریز کەم دەگەڕێمەوە سەر چەند بیرەوەرێکی خۆش لەوانە:

١- (مام لۆقەی ئوتیچی خوا لێی خۆش بێت)

مام لۆقا پیاوێکی رەقەڵەی رەشتاڵە وەك ئەوەی لەبەر رۆژ وشك کرابێتەوە هەموو بەیانیان لە عێنکاوە بە خۆو زەمبیلەیەك لەگەڵ کوڕیکی تەمەن هەشت ساڵی دەبوو ناوی (ئەدیب) بوو دەهاتە دوکانەکەی کە دوکانەکەش لە پشت بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و بەندیخانەو متصرفیەی کۆن بوو، مام لۆقا بەیانیان لەبەر دەم دوکانەکەی ڕەژووی دەخستە نێو ئوتوەکەی گەشی دەکردەوەو دەستی دەکرد بە ئوتو کردن، کوڕەکەی تا ئاستێك هاو تەمەنی من بوو ئێستا ماوە، بەو پێیەی بەردەوام هامشۆم دەکرد جلو بەرگی باوکم و مامو برا گەورەکەم دەبردە لای بۆ ئەوەی ئوتوی بکات، زۆر جاریش لەوێ دەوەستام تەماشای دەستو ئوتوەکەم دەکرد بۆیە ئێستاش لە گەڵدا بێ لە ماڵەوە کراسو جار جار پانتۆلیش هەر خۆم ئوتویان دەکەم بە تەماشا کردنی دەستو قامەکی ئەوەوە فێر

بوومـه هەڵبەتـە ئـەوەی باسـی دەکـەم دەگەڕێتـەوە بـۆ شەسـتەکان و تـا هـەفتاکانیش، بـەڵام ئـەوەی کـە نهێنـی بـوو باسـی بکـەم ئەوەیـە مـام لۆقا ڕۆژانە عارەقی فەلی لە عێنکاوەوە دەهێنا و دەیخستە بن مێزی ئوتوەکە گەنجانی ئەو گەڕەکە دەهاتن و لێیان دەکڕی لەبەرئەوەی فەل بوو هەرزان بوو نرخەکەی ڕەنگە هەر خۆی دروستی کرد بێ (ڕۆژێکیان ئاگادار بووم کوڕێکی گەنجی گەڕەکەکەمان قادێك و کراسێکی ئوتو کراو و شووشەیەك عارەقی لێ وەرگرت و پارەکەی دایە مام لۆقا بۆ ئێوارە ئەو کوڕە گەنجە هـەموو لـەش و قـات و قـەڕەوێتی لـە قـورو سـیانی نـاو گـەڕەك هـەڵاتبوو منداڵانی ئـەو گەڕەکـە دوای کـەوتبوون هـەر هـەنگاوێك دەڕۆیـی ودەکەوتـە خوارەوە هەر چۆنێك بێ بردیانەوە ماڵی خۆی بەڵام خاڵی گرنگ لێرەیە بۆ بەیانی هەمان گەنج، قات و کراس و قەڕەوێتی هێنایەوە لای مام لۆقا بۆی بشوا لە ئوتوی بداتەوە، من بە مام لۆقەم ووت وا دیارە ئەو عارەقەی تۆ زۆر کەسکونە و کاریگەر بووە، گوتی (ئەی ئیشی من چییە ئەگەر ئەو گەنجانە ئیمرۆ جلیان لە ئوتو نەدەم و بەیانی لە قوڕیان هەڵنەهێنم و دەبێ کارەکەم سەر بە ڕسق بێ ئەوەش کاسبی منە) لەو ساڵانەی دواییانەدا چیرۆکێکی (عبدالمجید لوتفی) م خوێندەوە دەڵێت " بولبولێك هەموو بەیانیان لەسەر درەختی حەوشەکەمان دەیچریکاند دەنگی زۆر خۆش بوو ڕۆژێکیان پشیلەیەك چرنووکی لێ گیر کرد و خواردی، زۆر تاقیبی ئەو پشیلەیەم دەکرد تۆڵەی لێ وەرگرمەوە دواتر هەر خۆم لەگەڵ خۆم دوام و گوتم باشە خوا ئەو پشیلەیەی بۆ ئەوە نەخوڵقاندووە تا بژی ئێ ئەوەش ژیانی لەسەر ئەوەیە بولبولێك و شتی تر بخوا بۆیە وازم لێ هێنا) خۆ مام لۆقەش وا خوڵقاوە خۆی و ماڵ و منداڵی بژێنی ئێ ژیان و ڕسق و کاسبیەکەی ئەویش بەم شێوەیە بوو.

٢- ئاڕایشگا یان بلێین سالۆنی دادە (هۆڕن) لەم گەڕەکە دادە هۆڕن بێوە ژنێکی قەڵەوی بە تەمەن خوی ئەرمەنی بوو، ئەو سالۆنەی یان بڵێم ئەو ئاریشگایەی جوانکردنی ژنانی لە ناو ماڵی خۆی دانابوو بۆ پرچ بڕینو نیگرۆ کردنی قژو رازاندنەوەی بووکەکانی گەڕەك ئەم سالۆنە لە رووی پێشکەوتنی ژیاری لە ناو چینی ئافرەتانی ئەو گەڕەکە رۆڵی خوی بینی بوو بۆ گۆڕینی سیماو رووخساری ژنان، دادە هۆڕن منی زۆر خۆش دەویست چونکە لێنەدەگەڕام منداڵانی گەڕەك شەڕی پێ بفرۆشن، کچێکی هەبوو ناوی (لویزە) بوو ئەویش پەیوەندی لەگەڵ ئەندازیارێکی ئەلمانی بەستو شووی پێ کرد، ئەو ئەندیازارە لە ئەلمانیاوە هاتبووە هەولێرو لە دایرەی ئیعاشە (فڕنی ئۆتۆماتیکی هەولێر) کاری دەکرد ساڵێکی نەبرد رۆژێکیان بینیم دادە هۆڕن لەبەر دەرگای ماڵی خۆیان دانیشتووەو دەگریا پێم گوت ئەوە بۆ دەگری دادە، گوتی ئەو سەگبابە ئەلمانیە گەڕایەوە ئەڵمانیەو لویزەشم رۆیی لەگەڵ ئەودا، دەتوانم بڵێم هەموو مەسیحیەکانی ئەو گەڕەکەو هەروها لویزەو لویزەکانی تر لە خۆ گۆڕینو خۆ جوان کردنو بە سەربەست بوونیان لە هەلسو کەوتو پەیوەندیان لەگەڵ ژنانی ئەو گەڕەکە زۆر کاریگەریان هەبوو بۆ فرێدانی پەچەو دواتر عەباو بەرەو پێشەوە بردنی عەقلیەتو رووخساری ژنانی ئەو گەڕەکە.

٣- رۆڵی (کەنیسەی قلب الاقدسی کلدانی) لە گەڕەکی عارەبان

بەڵێ ئەو کەنیسەیە کە کەوتبووە پشت ماڵی ئێمە بەردەوام جموجوڵی تیا هەبوو بە تایبەتی رۆژانی یەکشەممانو لە کاتی ژن مارە کردنو جەژنەکانو هەر وها زۆر جاران دەرسی ئاینی مەسیحی لێ دەخویندرا ئەم هەموو هاتو چوونو ئاهەنگو خۆشیە بە تایبەتی ژنو کچەکانی مسیحی بە سفووری جلی پاك ورەنگاو رەنگ دەهاتنو دەچوون

سەربەستو ئازادانە وایان لە ژن وکچانی گەڕەك کرد بوو کە بیر لە خۆیان بکەنەوە لە زۆر لایەن لاساییان بکەنەوە هەروەها پیاوەکانیش واتە گۆڕینی عەقڵیەت وئاکارو رەفتارو ژیان لە رووی کۆمەلایەتیو شارستانیو ژیاریو پێشکەوتنو بەرەو پێشەوە چوونەکاندا.

٤- پەیوەندی لە نیوان مەسیحیەکانو خەڵکانی ئەو گەڕەکە زۆر بتەو بوو هیچ رۆژیك بیر لە جوداوازی ئاینی نەدەکرا لە بۆنەکان لە خۆشی وناخۆشی بەشداری یەکتریان دەکرد ئێستاش لە گەڵدا بی، بەرامبەر پارکی شانەدەر بە لای پارکی منارەوە لە هەولێر کە پێشتر وێستگەی شەمەندەفەر بوو (مەحەتە) لە نزیك گەڕەکی عارەبان گۆڕی کچە بە شەرفی هەولێر یان بڵێین (یەزداندۆخت) واتە (ستی ئیمام) کە لە کاتی خۆی ئەو کچە کار وباری ئەو دیرەی هەڵسوڕاندووە ئێستاش لە گەڵدا بیّ ژنان بۆ مرازو دوعا دەچنە سەر ئەو مەزارگەیە.

## ناهاوتایی لە زمان و زەمەنی ئەوسا، لەگەڵ ئەمڕۆدا

(١٥)

بە تێپەڕبوونی کات و سووڕانەوەی میل و میلۆکەکانی کاتژمێرو بەربەست و بەرایی نەگرتن لەو لافاوە تیژڕەوەی بەرەو پێشڕەوی و پێشکەوتنەکان هەنگاو دەنێ، گۆڕانکارییە تازەکان سەر هەڵدەدەن بە ڕامالینی بەشێك لە کولتوورو زمان و زۆر شتی دی کۆنینەو پشت تێکردنی یان سپاردنی بە خانەکانی یادەوەری و گەلەری و مۆزەخانەو کەلەپورو فۆلکلۆرو شوێنەوارو گێڕانەوەی لە دوتوێی چیرۆك و رۆمان و یاداشتەکانی نووسەران یان بە تۆمار کراوەییە هونەرییەکان دەگێرسێنەوە.. هتد

لەو گۆڕانکارییانەی رۆژانە بەرچاومان دەکەویٚ لە هەموو بوارەکانی ژین و ژیاندا جگە لەو ئامێرو کەل و پەلانەی لە دایکبووی تەکنەلۆژیای سەردەمن، هەتا ئەو وشەو دەستەواژانەی لەنێو کۆشی زماندا هەڵڕژاون هەندێکیان نەك هەر لە کار کەوتوون بەڵکو بە رێکەوتیش بە سەر زمانی نەوەی ئێستادا دانایی و قسەی پێ ناکرێ، کە نەوەی ئێمەی لە سالانی پەنجاکان و هەتا هەفتاکانیش ئەو وشەو دەستواژانەمان لەسەر زار بوو لە قسەو گوفتارەکانماندا بە تایبەتی لەو گەڕەکەی ئێمەدا گەڕەکی عارەبان کە پێکهاتەی فرە نەتەوەو فرە زمان و تایفەو ئاینزای تیا بوو، هەولێریش بە گشتییەکەی بە دەوروبەرییەوە کە زۆربەی وشەکانیش میرات و

کولتووری پاشماوەی داگیرکەرانی عوسمانییەکان یان عەرەب بووە کە بۆ ئێمە مابۆوە، بۆ نوونە:

* (فنش) واتە لابردنی یەکێك لەسەر کار (فەسل) یان خانەنشین کراو دەگوترا فلانی کوڕی فلانیان فنش کردووە، ئێستا ئەم وشەیە بە سەر زاردا نەماوەو پشت گوێ خراوە

* (یاغنیش یاغنیشی) واتە: (هەڵەی - بێ ئاگای) یەکێك بە ئەوەی دی دەگوت تۆ یاغنیشی، تا ساڵانی هەشتاکانیش ئەم وشەیە بە سەر زاری نەوەی پەنجاکانو شەستەکانیش دادەهاتەوە، نەوەی ئەمڕۆ ئەم وشەیە بە سەر زاریدا دانایی‌و بە لە بیر کراوەیی ڕەش دەبێتەوە.

* (قەزاتە) واتە (رۆژنامە)

* (دیشلەمە) واتە خواردنەوەی چایە بە (قەند، کلۆی شەکر)

* (هەیتە - داروغە - حەس حەس) واتە پاسەوانو کەسانی داردەستی رژێمی ئەوسا ئەگەر ژنێك بێ شەرمو جەربەزە بووایە پێیان دەگوت دەڵێی هەیتەی

* (ئەوقات) وشەیەکی تورکییە بە مانای پارێزەر - محامی - بەڵام بۆ یەکێك بەکاردەهات ئەگەر زۆرزان بووایە دەیانگووت دەڵێی ئەوقاتە.

* (بەربەر) واتە سەرتاش، تا کۆتایی هەفتاکانیش دەمانگوت دەچینە لای بەر بەر کەچی نەوەی ئێستا ئەم وشەیەی لە لای نامۆیەو دەڵێت دەچمە لای سەرتاش (حەلاق)

* (موسلەحە): پیکابی پۆلیسی پیادەی چەکدار هەڵگر تا ساڵانی هەفتاکانیش بەم ناوەوە ناوی دەهاتو بە سەر زارانەوە بوو، ئێستا بە ناوی (نجدە فریاگوزاری) ناوی دێت.

* (قاوش) ئەم وشەیە زۆرتر لەسەربازگەکانو دایرەی پۆلیسو قشلەو نەخۆشخانەکان لەسەر زار بوو (قاوش) واتە (هۆڵ)

* (قوش پۆخی): واتە جیقنەی کێشکە، ئێستا بە (ڕازیانە) ناوی دەهێندرێتو لە ئەسڵدا وشەیەکی تورکییە.

* (قەڵلۆش) واتە مایە پووچ (ئیفلاس) ئەگەر یەکێك لە قوماردا یان لە مامەلەیەك دۆڕاوو مایە پووچ بووایە یان ڕییان پێ بگرتایەو رووتیان کردبا، دەیان گوت قەڵلۆشیان کردووە یان قەڵلۆش بووە.

* (لۆقنتە) وشەیەکی تورکییە واتە (چێشتخانە) لە یادمە تا ساڵانی هەفتاکانیش خزمەکانمان کە لە گوندو دیهاتەکان دەهاتن ئەگەر کاتی نان خواردن بە سەر چووبایە دەیانگوت لە (لۆقنتە) نانمان خواردووە، هەر چەندە زیاتر خولیای کەبابخەنە بوون، دوای کەباب خواردنیش دەچوونە چایخانەو دەیانگوت با چایەکی کەباب کوژیشی بە سەر داکەین، کە دکتۆرەکان دەڵێن دوای نانخواردن وا باشە بە لای کەمی نیو سەعاتێك بە سەر بچێت ئینجا (چایە) بخورێتەوە چونکە ڤیتامیناتی خواردنەکە دەکوژێت، ئەوسا کە گوتراوە چایەکی کەبابگوژ دیارە دووپاتی گوتەکانی دکتۆرەکانە بە سەر زاردا هاتووە رەنگە ئەوسا بە بۆچوونێکی زانستیانەیش بە سەر زردا نەهاتووە بەڵکو وەك قسەیەکی ئاسایی گوتراوەتەوە.

لە ناوەرۆکی قەسیدەیەکی بڵاوکراوەمدا لەم دوو دێڕەدا دەڵێم:

**یادیش خۆشە وەك نانی هەنگوین**
**تاڵیشە وەك سوێی برین**

یادەو بیرەوەرییە، ناتوانم لێی دابڕێم، کاتێ خزمەکانم لەو گوندو دێهاتانەی دەوروبەری هەولێر دەهاتنە نیو شارو کاتێ مێوان دەبوون لە ماڵی ئێمەدا کە لە سەنتەری شار بووین، ئەگەر خۆشترین خواردنیشمان ئامادە بووایە دەبوو بمنێرن بۆ لای کەبابخانەی مام پیرداود کە لە شەقامی مزەفەریە بوو یان کەبابخانەی ناو نەجاران لە نێو بازاڕی قەیسەری هەولێر دەبووایە کەبابیان بۆ بهێنم دەنا کە بۆ گوند دەگەڕانەوە ئەگەر بیانگوتبایە کەبابمان نەخواردووە واتە نەچوونەتە شار.

* (لەو گەڕەگەی ئێمەدا هەتا ناوی خواردنەکانیش زۆر بە قەبەیی و گەورەکردنێکەوە دەگوترا، بۆ نموونە لە (١٩٧٠)دا کوڕە خاڵێکمان لە گوندەوە هاتبوو لە لامان مێوان بوو، بۆ ئەوەی داوای کەباب نەکات و بەشدار بێت لەسەر خوانی ئەو خواردنەی هەمانە، گوتمان ئەمڕۆ خواردنێکی زۆر خۆشمان هەیە پەشیمان دەبیەوە ئەگەر نەیخۆیت، ئەویش گوتی دەبێ چی بێت؟!، گوتمان (کازم کەبابی و یاپراغ دیبی) دوای ئەوەی خواردنەکەمان هێنا گوتی پەکو لە دڵی خۆمدا گوتم داخوا چی بێت هەر (شفتەو مزەورە حیزە)کەی خۆمانە، ناوی ئەو خۆردنەتان هێندە گەورەو قەبە کردووە، *قسەیەکی نووسەرو رۆمانووس (جەبار جەمال غەریب)م خوێندەوە کە دەڵێت ((زەمەنی رووداو چەند چرکەو سەعاتێکە، بەڵام زەمەنی گێڕانەوە سنووری نییەو درێژ دەبێتەوە)) ساڵ ساڵی (١٩٦١) بوو لە گەرمەی شەڕی نێوان رژێمی حوکمەتی ئەوسای عێراق و کوردی باشوور یان بڵێین شۆڕشی ئەیلول، لەبەرامبەر بەنزینخانەی کۆن لە شوێن بازاڕی هاوچەرخی ئێستا (داون تاون)دا پیاوێکی لادێی دەشتی هەولێر جلەوی کەرەکەی بە دەستەوە بووەو بە عیشقی چەرە دوکەڵ و بۆنی کەبابخانەیك کە سەری لێ دەشێوێنێ و

ستوندەیەك و شوێنێك بەدی ناكات گوێدرێژەكەی لێ ببەستێتەوە و خۆی بگەینێتە كاباب حەیاتەكە، زیلێك یان بڵێین ئیڤایەكی سەربازی لەوێدا وەستاوە زۆر پوختە كەرەكەی لێ دەبەستێتەوە و بەرەو كەبابخانەكە دەچێت، پاش ماوەیەك شوفێری ئیڤاكە، واتە ئۆتۆمبیلەكەی بە گڕ دەخات بێ ئەوەی بزانێت كەرێكی لێ بەستراوەتەوە، بەڵێ لە زیلەسەربازییەكەوە ڕۆیشتن و كەریش بە دوای خۆی ڕادەكێشێ و دەبێ بە هۆپ هۆپ و پێكەنین و دەست ڕاشەقاند، ئەمەیش عیشقە كەباب.

* (خەفیە – سڕی) واتە سیخوڕ پیاوی ئاسایش، تا كۆتایی هەفتاكانیش دەیانگوت فلان خەفییە یان (سڕی یە)

* (قاقان – یان – قاقانی ڕەش قۆچانی ڕەش) واتە بەلگەنامەی تاپۆ (قەواڵە سەنەد) تا كۆتاكانی هەفتاكانیش ئەگەر یەكێك موڵكی بفرۆشتبووایە و پێچەوانەكەیشی دەبووایە قاقانی ڕەشی یان بڵێین قۆچانی ڕەشی هەبێت وەگ بەلگە ویستێك كە ڕووگەی كاغەزەكە ڕەش بوو بۆیە پێی دەگوترا قاقانی ڕەش یان قۆچانی ڕەش، هەروەها لوول دەدراو و لە نێو لوولەیەكی لە تەنەكە دروستكراوی درێژكۆلە دادەنراو كاری پێ دەكرا.

* (متصرف) واتە پارێزگا، والی شار، تا كوتایی هەفتاكانیش والی شار بە متصرف ناوی لەسەر زار بوو كە ئێستا پێی دەڵێین پارێزگا، زۆر لە مێژ نییە ئەم وشەیە لەسەر زمان سڕاوەتەوە كە تا كۆتایی هەفتاكانیش ئەم وشەیە بە كار دەهات.

– جگە لەو وشەو دەستەواژانەی خستمانە ڕوو، دیارە كەرستەو كەل و پەل و ئامێرەكانیش گۆڕانكاری وایان بە سەردا هاتووە كە زەمەن و تەكنەلۆژیا و زانست و پیشەسازی سەردەم دەستی لێ وەشاندوون بە

جۆرێك ئەگەر بیخەینە سەر لیستی بەراورد ژمارەیان خەیاڵییەو لە خوێندنەوە بەدەرە لە چاو ئەو پێشكەوتن و ئەو گۆڕانكاریانەی هاتونەتە ئارا، وا كەم نموونەیەك دەخەینە بەر چاوی خوێنەران لەوانە:

* (بەردەستێ) كە لە جیاتی شخارتە یان جۆرها چەرخی هەمە رەنگی جوان كە تەكنیكی جوانكاری لێ بەكار هاتووە بۆ داگیرساندن، هەڵبەتە وشەی (بەردەستێ) بۆ نەوەی ئێستا وشەیەكی نامۆیە، مەگەر لە گەلەری و پێشانگای كەلەپووردا چاویان پێی بكەوێت و بۆیان راڤە بكرێت ئەوسا زانیاریان لەسەری دەبێت.

* (قاپ قاپ) قاڵبێكی لە دار بڕاوەی ئەستوور شێوەی بە قەد ژێر پێیەكی گەورە بە پارچە قایشێك یان پارچە چووپێك پێوەی قایم كراوە بۆ لە پێ كردن لە شوێن (نعل سۆل پاپوچ سەندەڵ.. هتد) رەنگە تاك تاك ئێستاش لە مزگەوتەكاندا مابێ، بۆ رەگەزی مێینەیش دارتاشەكان تا ئاستێك هەندێك هونەركاری جوانیان تیا كردبوو كە ژنان لە پێیان دەكردو پێی دەڕۆیشتن تاق و تیقی لە دوورەوە دەبیسترا، تا ساڵانی هەفتاكانیش هەر هەبوو بە تایبەتی لە هەندێ ماڵی كۆنینەو مزگەوتەكان، بۆ یادێك و ئاهێك (برام – ڕەوانشاد) ناوی جەلال بوو لە من بە چەند ساڵێك گەورەتر بوو، ساڵی ١٩٦٥ بوو، بەرە بەری جەژن بوو تازە پێڵاوێكی نوێی كڕی بوو چووە مزگەوت بۆ نوێژی عیشا لە مزگەوتی پاشا كە لە گەڕەكەكەی خۆمان گەڕەكی عارەبان ئێستایش ئەو مزگەوتە ماوە، پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵ سەیرمان كرد بە تەقە تەقی (قاپ قاپ) لە پێی هاتە ماڵەوەو گوتی: كە لە مەحرەمی نوێژ هاتمە دەر پێڵاوەكەمیان لێ دزی بوو ناچار بەو قاپ قاپەی مزگەوت هاتمەوە.. جا كە (شەریعەت مەداری) فەرموویەتی كاتێ لە مزگەوتدا لە كاتی نویژ كردندا بیرم لە لای تاعەتەكە نییە بە قەد ئەوەی

بیرم لای پێڵاوەکانمە کە لە دەرەوەی مەحرەمدا جیم هێشتوون نەوەك بدزرێن، ئێستا لەو سەردەمەدا جۆرها نعل و سۆڵ و پاپوج و سەندەڵی قایش و پلاستیك دەبینین کە لە هەموو ولاّتانی دنیا دەهێندریٚ و لێرەش دروست دەکرێت، سووك و جوان، بە تایبەتی هی ڕەگەزی ژن و منداڵان کە تەکنیکی جوانکاری سەرنج ڕاکێشی وای بۆ کراوە بە (قاش و مۆروو)ی بە باوق و بریق و ڕەنگ و ئالاّو والاّیی، ناحەقیان نییە ژنانی ئەوسا بڵێن حەیف ئێمە هیچمان نەدی بیگێڕینەوە.

* (هەوجاڕ) ئەو ئامێرەیە کە لە دار دروستکراوە بۆ کێلاّنی زەوی بە دوو ئاژەڵ ڕادەکێشراو ڕایەڵ ڕایەڵ زەویە کێڵدراوەکە بە دیار دەکەوت، ڕەنگە ئێستایش لە هەندیٚ کوێرە دێدا بە کار بێت، ئەم ئامێرەش تا ناوەڕاستی هەفتاکان بە کار دەهات، دواتر لە بری ئەوە، ئامێری مۆدێرنی خێرا و کاریگەر لە ولاّتانی پیشەسازی هاوردە کراو کە لە مادەی پۆلاّ و ئاسن دروستکراوە بە ناوی (دیسك خەرماشە گاسن) نەك بە ئاژەڵ بەڵکو بە تراکتۆر ڕادەکێشریٚ و زەوی دەکێڵیٚ، بۆ ئەوەی بزەیەك بە سەر لێواندا بهێنم، دەشتەکییەکی ئەم دەشتەی هەولێر (تراکتۆر)ەکەی بە سەر لا تەنیشتێك وەرگەڕا بوو بە دیارییەوە وەستا بوو، خزمێکی خۆی لەو ئاقاردا گەیشتە لای و پێی گوت پەك زۆرم پیٚ ناخۆش بوو ئەو تراکتۆرەم وا بینی، خاوەن تراکتۆر گوتی دەنا من زۆرم پێخۆش بووە، زۆر حەزم لیٚ بوو بنەوەی واتە (ژێرەوەی) ئەم تراکتۆرە ببینم ئێستا بە چاکی هەموویم لیٚ دیارە.

## دوو ئامێری پێکچوو له دوو بۆتەی جیادا

(١٦)

كه ئامێری موزیکی قیسارەم بەرچاو دەكەوێت، سەرنجم ڕادەكێشێ دەمگەڕێنێتەوه بۆ سالأنێك كه یەكانگیر دەبێت لەگەڵ هەستو بیرەوەریەکانم، به تایبەتی لەو سالأنەی دوایانەدا كه ئەمدی (تارا جاف)ی هونەرمەند به دەسته ناسكو بەهرەوەرییەكانیدا تەلەكانی ئەم ئامێرەی دەلەراندەوەو ئاوازێکی سۆزداری دەپڕژاند.. ئەو پێكچوونه لەگەڵ ئامێرێکی دی كه دەیوروژاندم چیه؟ ئامێری پەرەچی (هەلاج) به عەرەبییەكەی (نداف) كه هەر له سالأنی پەنجاكانەوه تا كۆتایی هەفتاكانیش به فراوانی هەر مابوو، بەلأم له جیاتی پەنجەیەكی ناسك، پەڕەچی به كوتەكێك له ژێیەكانی ئامێری پەڕە كردنەكەی دەداو تۆپەڵی خوری هەڵدەتەكاندو تیکه تیکەی دەكردو خاوی دەكردەوه، هەروەها له دوكانێکی تردا به هەمان ئامێر گلۆته پەمۆی سپی له قۆزاخه دەرهێنراو بەر ژێیەكانی ئامێری پەڕەچی دەكەوتو خاو دەكرایەوه، جیاوازییەكەی ئەو دوو ئامێره ئەوه بوو، قیساره وەك مۆزیكو به نۆتەكانییەوه سەرو گیانمانی ئاسودەو خۆشنوود دەكرد، جار جاریش لەگەڵ ئاوازەكەیدا گورانی یان شیعری به دواوه بوو، خۆ ئەو ئامێرەی پەڕه كردنیش كه گریۆ گۆڵو تۆپەڵی خوریو پەمۆی بۆمان شیێ دەكردەوەو له ئالۆزییەكانی دوور دەخستینەوەو لەگەڵ خاوبوونەوەیشیدا وەك ئەوەی

شەڕێك بە ئاشتی بسپێرێت، ئەمەیش لە لای نووسەرو ڕۆناکبیرو شاعیران مانایەك بە ژیان دەبەخشیٚ، دیارە لە خوری خاو بووەوەدا (لباد) دروست دەکرا، لە پەمۆش سەرینو دۆشەكو لێفی ڕەنگاو ڕەنگ، نەرمو نۆڵ کە هەڵدەواسرا بۆ فرۆشتن بە تایبەتی بۆ تازە بووكو زاواکان، بەڵام ئێستا دۆشەك ئەسفنجەو لە جیاتی لێف پۆلسترو بەتانی وێنەداری نەرمو نۆڵ بەکار دەهێندریٚو کارگەی پیشەسازی گەورە گەورە بۆ خوریو لۆکەو دروستکردنی جلو بەرگو شتی تر دامەزراوە ئەو کارە خۆماڵیانە وەلاوە نراوە، لە هەمووی یادگار ئامێز تر بۆ من، یەکێك لە هاوڕیٚو برادەرە هەرە نزیکەکانم کە هاو تەمەن بووین هەر لە قۆناخی سەرەتاییو ناوەندی قوتابخانەیش هاو پۆڵ بووینو ماڵیشیان لە خوار ماڵی ئێمەدا نزیك قشڵەی پۆلیسی سوارەی گەڕەکی عارەبانی کۆن، ئەویش (نەشئەت عەبدولرحمان جەرجیس) بوو، باوکی دوکانێکی گەورەی لە شێوەی قاوشێك هەبوو بەرامبەر دەرگای قەڵای هەولێر کە پەڕەچیو شاگردەکانی بۆ کاری لباد دروستکردنی لە خۆ دەگرت، ڕەوانشاد (نەشئەت) لە دوای ئەوەی دەوامی قوتابخانەی تەواو دەبوو، دەچووە ئەو دوکانەو باسکی لیٚ هەڵدەکردو لەگەڵ شاگردەکانی باوکی لبادی دروست دەکردو نەخشو نیگاری ڕەنگاو ڕەنگیان دەئاخنییە لێوارو نێوەندی لبادەکە ئەوەشیان وەك لایەنێکی هونەریو جوانکاری، هەر لەو دوکانشدا بە خوری لە شێوەی شەبقە کە (سەر کلاو)ی پیٚ دەگوترا، هەروەها دروستکردنی (کەڕك) لە شێوەی پەستەك کە جوتیارانو شوانکارەو ئاودێران لە گوندو دێیەکان بەکاریان دەهێنا بە تایبەتی لە شەغرەو گواستنەوەی قرشەکان بۆ سەر جۆخینان یان لە کاتی گێرەو بە جەنجەڕ کوتانەوەی خەرمانو دواتر شەنە با کردن، واتە

بەكار هێنانی سەركلاّوو كەپك بۆ پاراستنیان لە تاوی هەتاوو گەرمای هاویندا كە تا ئێستایش ئەم دوو شتە هەر بەكار دەهێندری لە دەرەوەی شاردا، ئەگەرچی هەن لەگەلّ گوڕانكاریەكانی سەردەمدا ئێستا شەبقە بە كار دەهێنن، بەلّیّ منیش جار جار كە دەچوومە ئەو دوكانە ئەگەرچی تۆزو گەردی خوری پەڕە كراو هەناسەی تەنگ دەكردم، بەلاّم كاتیّ سەیری دەستو بازووو كوتەك لێدانی پەڕەچییەكەیم دەكرد كە ژێیەكانی دەژەنی و خوری تیكە تیكەو خاو دەكردەوە زۆر سەرنج ڕاكێش بوو، ئەگەرچی ئەو قیسارەیەی باسم لێوە كرد لە ژێدانی و لەراندنەوەی ژێیەكانی ئاوازی لیّ هەلّدەستاو گۆرانی بە دەم نۆتەكانییەوەی لێی دەكەوتەوە، خۆ ئەو پەڕەچیانەش بە دەم ژیّ لەراندنەوەی ئامێرەكەیان دەستیان بە گۆرانی گوتن دەكرد وەك ئەوەی ژیّ لەراندنەوە هەمیشە سیحرێكی چێژ وهونەری بە بەرەوە بێت، هەندیّ جار قۆریاتی توركیو بەستەی خۆش خۆشی بە دواوە بوو كە بە عیشقو خۆشەویستییەوە كارەكان یان خۆزگەو حەسرەتێكی ژەنیاری پەڕەچی لە پشتەوەی بووە، ڕەوانشاد (نەشئەت) جگە لەو كارەی لباد دروستكردن، كە لە قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندی هەر پێكەوە بووین، بە تایبەتی كە لە قەتابخانەی ناوەندی (زازا) بووین، لە (یەكێتی قوتابیانی كوردستان) لە سالّی ١٩٦٤ دا ببووین بە ئەندامو بە نهێنی كوردایەتیمان دەكرد كە شۆڕشی ئەیلول ئەوسا لەو پەڕی گەرمو گوڕیو تەكاندا بوو بەرامبەر بە ڕژێم لە پێناو سەربەخۆیی كوردستاندا، ئەوسا ڕژێمی عیراق بەرامبەر بە كورد دەستوەشێنو پڕ لە تاوانكاریو بیّ ڕەحمانە تەڕو وشكی دەسووتاند، كەچی بەندەو ئەو كاك (نەشئەت)ەو سەدانی دی لە قوتابیانی وەك ئێمە خزابووینە نێو ئەم تێكۆشانە نهێنییە، سەبارەت بە باوكەكان بەرامبەر بە

کوڕەکانیـان لـەو سـەردەمدا زۆر توندوتیـژ بـوون لـە پـاڵ ئـەوەی کـە خۆشەویستیان بەرامبەر بە کوڕەکانیان کەم نەبوو، بەڵام فەرامۆشیان نەدەکردن، دەبووایە دوای دەوامی قوتابخانە لە دوکانەکانیان کاریان بکردایە یان لە پشووی هاویناندا بۆ ئەوی فێرە کارو کاسبیو ئیشی قورس ببنو توندو تۆڵ بنو دەستو پێ سپی دەرنەچن، هەر وەکو زانای ناودار (جەی جی هۆلاندی) دەڵێت (خودا خواردنی هەموو باڵندەیەك دەدات، بەڵام بۆی ناخاتە ناو هێلانەکەیەوە) بە هەمان بیرو بۆ چوون (مکسیم گۆرگی)یش دەڵێت (ئەوەی بۆ ئەوە لە دایك بووە لەسەر زگ بخشێ هەرگیز ناتوانێ بفڕێ) بە داخەوە نەوەی ئێستا بار گرانیو هەموو بژێویان لەسەر باوکەکانە هەر لە خوێندنی بە پارە لە خوێندنگەکان لە هەموو قۆناغەکانو هەروەها دابین کردنی ماڵو خێزانیشو بە ئۆتۆمبیلەکانیشیانەوەو مەسرەفە هەمیشەییەکانیان، کە ئەوە دەڵێم نەك بە شێوە ڕەهاکەی بەڵکو وەك شێوە ڕێژەییەکە زۆربەیەو ئەمە واقیعە، دیارە سەردەمیشو بەرەو پێشەوە چوون زیاتر ژیانمان دژوار تر دەکاتو باوکسالاریو هەژموونەکانیان کەمتر دەکاتەوە، نەوە لە دوای نەوەی ترو گۆڕانکارییە نەوەستاوەکانیش داخوازی زیاترو ئەرکی زیاتری بە بەرەوە دەبێت، ئەو (نشئەت)ەی برادەرم ڕەوانشاد کە قوتابی بووو زۆریش زیرەكو تا قۆناغی کۆلێژیشی تەواو کرد، کاری لباد دروستکردنی دەکرد، کەچی کوڕەکانی ئەو کە ناسیاومانن ئێستاش هامشوی یەکتر دەکەینو دەیانبینم ڕۆژێك لە ڕۆژان کارێکی قورسیان نەکردووە، ئەمە (دیفاکتۆ)یە واتە ئەمری واقیعەو ڕێڕەوی ژیانەو دەبێ قەبووڵمان بێ.

## داڕوخان لە جەوهەری مرۆڤـایەتی، ڕەگێکی لە پێشکەوتنەکاندایە

(١٧)

جیهـانگیری‌و پێشـکەوتنی زانسـت‌و تەکنـەلۆژیا‌و پیشەسـازی‌و شارسـتانیەت بـە کەرسـتەی تـازە‌و بکەرەکانییـەوە، بـە پەیوەندییـە خێراییەکانیـەوە لـە هـەموو رووێکـەوە گۆڕانکاری بە سـەر ژیـان‌و نـەریت‌و خواسـت‌و ئـارەزووو کلتـوورو نەفسـیەتی مرۆڤـی داهێنـا بـە جۆرێـك ڕەسـەنایەتی‌و پـاکی‌و بەڕائـەت‌و خۆشەویستی ڕاستەقینە‌و ڕاسـتگۆیی بـەرەو ئاقـارێکی لا تـەریکی بـرد لـە لانـی مەعنەوییـەوە، هـەر چـەندە ڕووناکییەکـەی تـوانی تاریکییـەکانی پێشـووی بـەر لەسـەردەمی خـۆی داپۆشێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا داڕوخانێکی لە جەوهـەری مرۆڤـایەتی لـێ کەوتەوە، پێمان خۆش بێ یان نا، ئەم داڕوخانـە ڕەگێکـی لـە قووڵایی ئـەو بەرەو پێشەوە چوون‌و پیشکەوتنە تیژ ڕەوانـە دایـە کـە ڕۆحـی خـۆڕاگری مرۆڤ لـە نێوەنـدی هـەر دوو دەسـتە زەبەلاحەکانیـەوە بەنـد بـووە، لێـرەدا دەگەڕێمەوە سەر ژیانە سادە‌و ئاسـان‌و ساکارە بـێ خـەم‌و بـێ ئیتیکێت‌و نەرگسیەت‌و کـەم ئیرەیی‌و ملمـلانـێ وگوشـارە دەروونیـەکان.. هتـد، بـەڵێ مرۆڤی ئەوسا کە بە پاکی ژیانیان بە سەر برد‌و لە باوەشـی قەناعەتێکـەوە بوون نەك گیـرۆدەی دەستی تەماح‌و خواستی ڤالا‌و زۆر، جا بەشـێکی لـەو

ژیانەی دوێنێیی ئەو مرۆڤانەی ئەوسا دەخەمە بەر چاو بە تایبەتی لەو ساڵانەی کە تیایدا ژیاوم‌و بە چاوی خۆم وێنەکانیم بینیوە، بۆ نموونە:

* (خان) یان بڵێین (کاروانسەرا)

(ریکۆر) زانای ناودار دەڵێت: (ئێمە لە ناوەوەی خۆمانەوە دنیایەکمان هەڵگرتووە، وەك چۆن لە دنیایەکدا نیشتەجێین، دەشێ لێرەدا جۆرێك ئاوێتەیی لە نێوان ئەو دوو جیهانە بخەیتەوە)

منیش لە نێوەندی ئەو دوو جیهانەدا نیشتەجێ بووم‌و نیشتەجێم ئێستا، ئەوەی لە زاکیرەمدا هەڵمگرتوون لە ساڵانی پەنجاکان هەتا ناوەڕاستی ساڵانی هەفتاکانیش لەو هەولێرە چەندین خان هەبوون بە تایبەتی لەو گەڕەکەی ئێمەدا گەڕەکی عارەبانی کۆن، دوو خان هەبوون یەکێکیان خانەی سپی لە نزیك باتەو دەرگەی بازاڕ، ئەوەی دی خانەی شیخ یونس کە ئەویش لە تەنیشت تەکیەی شێخ عارف بوو لەو کۆڵانەی بەرامبەر باتا، خان لە عیراق‌و زۆربەی وڵاتانی دەوروبەرماندا هەبووە، هەندێك لەو خانانە (کاروانسەرا) لەو سەردەمەی ئێستاماندا بوون بەئوتیل‌و مۆتیل‌و ریستۆران‌و گەلەری‌و جێگای حەوانەوەو گەشتیاری‌و کات بەسەربردن، خانەکان دوو قات یان زیاتر بنیات نرابوون، قاتی خوارەوەی بەش بەش بوون کە (ناڵبەند پینەدۆز عەنبار یان بڵێین کۆگا بۆ داکردن‌و دانانی کەل‌و پەل - ئاخوڕی ئاژەڵ، ئاسنگەر - دەباغچی بۆ خۆشکردنی پێستی ئاژەڵان - سراج - کورتاندروو- چایخانەیەکی بچووك.. هتد)ی تیا بوو، لە قاتی دووەم یان سێیەمدا ژووری خەوتن هەبوو بۆ کاروانچیان‌و ئەو خەڵکانەی لە دەرەوەی شار دەهاتن بە ئاژەڵ‌و بارەوە بۆ مانەوەیان لێی دەخەوتن جۆرێك بوو وەك ئوتیل کە شێوازی

هەڵـنراوی قاتـەکانی سـەرەوە لەبـەر دەم ژوورەکانـدا بـە بەڵـەکۆن و تـاقی نەخش و نیگارو جوانکاریەك هەڵنرا بوون، بە داخـەوە لـەو شـارەی ئێمـەدا ئاساوەریشی نەماوە کەچی بو نموونـە هـەر وەك مێژوونووسـان ئاماژەیـان پێکردووە خانەی حەسەن پاشا لە ئاماد کە ئێستا بووە بە ڕستۆرانێکی پـڕ لـە هامشـۆو دانشـتن و حەوانـەوەی گەشـتیاران و خـەڵکانی شـارەکە، مێژووی دروسـتکردنی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەرەتاکانی سـەدەی شـانزەهەمی زاینی کە لە لایەن حەسەن پاشـای والی ئامـاد درووسـتکراوە کـە سـەرداری شـارەکە بـووە، هـەروەها مێـژوو نووسـان ئامـاژە بـەم واقیعـە دەکـەن کـە لـە عیرقدا، ئەو خان و کاروانسەریانە زۆرتر لە فەلوجە بوونیـان هـەبووە ئـەوتا (ئـەنبار) لـە ئەسـڵدا (عـەنبار) بـووە کـە لـە (خـان)دا (عـەنبار) هـەبووە بـۆ داکردنـــی کـــەل و پـــەلی قەتارچـــی و بازرگانـــان و رێبـــوارانی موســـافیرو حەوانەوەیان، هـەروەها بـۆ نموونـە لـە شـاری (مووسـڵ)دا خانـەی (حەمـەد قـەدۆ) هـەبوو، خـانێکی دوو قـاتی گـەورە لـە سـەنتەر شـار کـە لـە قـاتی خـوارەوەدا جێگـای ئـاژەڵ داکـردن و کۆگـا و دەباغخانـەی تیـا بـوو بـۆ دەبغ کردنـــی پێســـتی ئـــاژەلان، جگـــە لـــە پیشـــەکارانی دی وەك (ســـراج) بـــۆ دروستکردنی پێڵاوو قایش و قرۆش و فیشـەکدان، هـەروەها کورتانـدرووو پینـەدۆز، تێکـرای قـاتی دووەمـیش موسـافیرو رێبـوارو مێونـانی شـەو بـە خـــاو خیزانـــەوە لێـــی دەخـــەوتن وەك ئوتیـــل وا بـــوو، هاوینـــانیش لەسەربانەکەی قەرەوێلە دادەنرا یان خاوخیزانەکان نوێن و پێخەفی خۆیان ڕادەخست و لێی دەخەوتن ئەمەو ببوو بە نەریتێك لـە هاوینانـدا بـە گـەڕەك چەند خێزانێك رێکدەکەوتن بە پەست لە هەلێرەوە بەرەو مووسڵ دەچوون بـۆ عـین کبریـت و حـەمام عـەلی و زیـارەتی نبـی یونسـی و نبـی شـیتی ڕووخێندراو لە لایەن داعشـەوە.. هتـد، ئیتـر زۆربـەیان بـۆ خـەوتن روویـان

لەو خانە دەکرد (خانەی حەمەد قەدۆ) لەبەرئەوەی هەرزانیش بووو لە سەنتەری شار بوو، من یەکێك بوومە هەر لەسەردەمی منداڵیم تاکو هەراش بوومە، چەند جار لەگەڵ دایكو براو ماڵی باپیرانمو خاو خیزانی گەڕەك بە کۆ، بە قەمەرەو پەست چووینە مووسڵو لەو (خان)ەیەدا گیرساینەوە،

*وەك لە پێشدا ئاماژەم پێکرد (خان)ی شێخ یونس کە هەر لەو گەڕەکەی ئێمەدا بوو چەند بیرەوەرییەکی تایبەتیم لەگەڵ ئەو شوێنە هەیە هەر وەك لە کتێبی (جماليات المكان جوانییەکانی شوێن)ی (گاستۆن باشلار)دا هاتووەو خوێندوومەتەوە کە شوێنو جوانییەکانی لەسەردەمی خۆیدا بۆ ئەو قۆناخەی من تیا ژیاومو بینوومەو چێژم لێ وەرگرتووە چەندە سۆزو نەکهەو شوێنەواری کاریگەر بووە بە تایبەتی لە هۆنراوەو نووسینەکانمدا رەنگی داوەتەوە، بەڵێ خاوەنەکەی خان (شێخ یونس) ماڵیشان هەر لە گەڕەکی خۆمان بوو، پیاوێکی مام ناوەندی، هێمنو بە لوتف، کوڕێکی کە هەمیشە لە دوای دەوامی قوتابخانە لەگەڵ باوکیدا بوو لەو (خان)ەداو ناوی (عارەب) بوو بەڵام کورد بوونو دڵسۆزیش بۆ کوردایەتی، (عارەب) هاو پۆلی قوتابخانەی سەرەتایمو ناوەندیو هاوڕێم بوو بۆیە بەردەوام هامشۆی ئەو خانەم دەکردو ئەوەی بینیوومە لەو خانەیەدا: رێبواران، کارواچی، کە لە گوندو دێهاتەکانی ناوچە شاخاوییەکانو بە تایبەتی ناوچەکانی خۆشناوەتیو دەشتو دەری هەولێر روویان لەو (خان)و کاروانسەرایانە دەکرد بە ئاژەڵو بارەوە، ئاژەڵەکانیان لە (خان) دادەکردو کەلو پەلەکانیان لە کۆگاکانیان دادەنا، بۆ شەویش ئەگەر نیازی مانەوەیان هەبووایە، یان دەچوونە ماڵە خزمو ناسیاوەکانیان یان لە (خان)دا دەخەوتن، کەلو پەلو بەرهەمەکانیان بۆ

ئـاڵو گـۆڕ پێکـردن یـان فرۆشـتن بـوو چ وەك بـارە داری قەڵاشـەری کـە کەڵەشێرو مریشکی بە سەرەوە بوو، کیسەی پڕ لـە کا و هێڵکەی خۆماڵی لە خۆ گرتوو، دۆو ماستو پەنیرو سەرتوو بەرو بوومی شیرەمەنی، یان فەردە رەژوو، مێوەجات.. هتد، ئەمەی بینیوومە لەو خانەدا * ناڵبەندی لێ بوو، کە ئێسترو ماینو ئەسپەکانیان ناڵ دەکرد، سەرەتا سمەکانیان دەڕنی یان بڵێم دەیانسمیو لووسیان دەکرد، دواتر بە چەکوش ناڵێکی ئاسنینان بە بزمار لە سمەکانیان دەکوتی، هەندێ جار کەرو وڵاخەکان لەو خانەیەدا بە شیشەیەکی سوورکراوە داخ دەکران، نازانم بۆ ئەوە بوو نیشانەیەکیان پێوە دیار بێ یان بۆ چارەسەری نەخۆشی بوو گوایە (با)یان لێ دەردەکەن یا خوێنیان پاك دەبێتەوە هەر وەك لەو سەردەمدا دەمبینی زۆرێك لە پیاوان پشکۆی گەشی خەلووزیان لەسەر پشت یان سەر باسکی خۆیان دادەنا یان بە شیشێکی سوورکراوە جەستەی خۆیان داخ دەکرد بۆ هەمان مەبەست، دیارە لەو (خان)دا کە ئاژەڵەکان داخ دەکران بۆنی گۆشتی برژاویان ئەو پەندەی لێ کەوتۆتەوە (بە بۆنی کەبابەوە چوو نەیزانی کەر داخ کردنە) هەروەها لەبەردەم دەروازەی دەرگە دوو دەرییە گەورەکە کە بە بزماری گۆپکەدار نەخشێندرا بوو، پینەدۆزێکی بە تەمەن بە دەم تەقەڵی کەوشو پێڵاوی رێبوارانو قەتارچی لە دوورەوە هاتوو، قسەو سەربردەی زۆری هەبوو، گوێم لێ دەگرت، هەندێ جاریش لەبەر ئەو سێبەرە فێنکە ئاو ڕشێنکراوەی بە هێوری گۆرانی دەچڕی، لەبەرئەوەی بێوە پیاو بووو تاكو تەرا دەژیا، ئازارو ناخی هەڵڕێژراوی ئەو پینەدۆزەو بیرەوەرییەکانی قەسیدەیەکی درێژی پێ نووسیم بە ناوی (خاڵۆی پینەدۆز) کە لە گۆڤاری (رۆژی کوردستان)

ژماره (٥٩) لە حوزیرانی / ١٩٨٠ بلاوم کردەوە، چەند برگەیەکی لەو قەسیدەیە دەخەمە بەرچاو:

هۆ هۆ خالۆ

خالۆی پینەدۆزی بە نێو سالاً کەوتوو

تۆش چاوەکانت قووڵ بووینەو کز ئەسووتێن

وەکو قوتیلەی بەختی من

پیرێتی باری قورسی ناوە لە شانت

مەگەر گۆچانێ گوێ بگرێت، لە گلەیی قاچەکانت

نێوچەوانیشت وەکو شەقامێکی کۆن

هێندە پێچکەی جەوری زەمانی بە سەردا ڕۆیشتووە

وەك دڵە زامدارەکەی من، ڕێ ڕێ بووە

هۆ هۆ خالۆ

بە دەم تەقەڵی کەوشی ڕێبوارانی لە لادێوە هاتوو

شەنە بای خەرمانی بیرەوەری خۆش خۆش دەکەیتەوە

دەیانخەیتە بەر هەناسەی (هێیی.. هێیی زەمان!!)

ڕێبواریش لە دەفتەری (بافرا)و توتنی کەسکونی چیادا

جگەریەك دەپێچێتەوە دەستەوجێ

لەگەڵ گیان و هەستی مندا

دەیانخاتە بەر سوورە گڕی بەردەستێ

هەڵدەکاتە گۆرانیەك...

(کاروانەو هەی کاروانە

کاروان ڕۆیی و نایگەمێ

یارم لەگەڵ کاروانایەو

چۆن ئەم کاغەزەی بدەمێ؟!)

خاڵۆ کە ئێوارە داهات

لەگەڵ خۆتدا بمبەرەوە

بمبەرەوە ناو ئەو خانووە دێرینەی

نیشتمانێکی بچکۆلانەی تۆیەو

جیهانێکی گەورەی منە

وەکو شەوانی دی

لەبەر مێزە دارینەکەت دانیشەوە و

گوێت لە خشپەی مانگ دەبێو دەگەڕێتەوە

دەگەڕێتەوە و

لەسەر شانی دیوارە رووخاوەکەی حەوشەکەتدا

ئەو سەرو ئەو سەر دەکاتو

لە دوایدا هەڵدەنیشێتو دەتوێتەوە

(لە دوا دێڕی ئەم قەسیدە درێژەدا هاتووە).....

ئەم شەوەش وەکو شەوانی دی

خانوو کۆنەو

مێزی کۆن و

شەڕابی کۆن

ئای لەو مرۆڤە جوانەی

وەکو گەڵای درەختێ لە هەڵوەرینایە

ئای لەو مەستە دونیا دیدە دەروون گەرمەی

## وەك چۆلەكەیێ لە هەڵوەرینایە!!!

لە (خان)دا كورتاندروو هەبوو كە كورتانی سەر پشتی ئاژەڵانی دروست دەكرد باوكم ڕوان شاد ڕووداوی یەك لەو كورتان درووانەی بۆ گێڕامەوە.

(كورتاندروویێك لە دوكانەكەی خۆیدا، كورتانێكی كۆنی بێ كەلكی لە گۆشەیەكی لا تەریكی دوكانەكەی دانا بوو، هەر جارەی لیرەیەكی پاشەكەوت كردنی دەخستە نێوی، ڕۆژێكیان كوڕەكەی لە شوێن خۆی دادەنێ‌و كورتە سەفەرێكی دەكەوێتە بەر، لەو كاتەی ئەو كوڕە لە شوێنی باوكیەتی، كۆچەریەك كە دەیەوێت بەرەو كویستان بڕوات، ڕوو لەو دوكانە دەكات‌و دەڵێت: من دەستكورتم پارەی كورتانێكی نوێم پێ نییە ئەگەر كۆنە كورتانێكتان هەبێت بۆ خۆم ڕێكی دەخەمەوە، كوڕەی كورتاندروو لە نێو دوكانكەدا دەگەڕێت ئەو كۆنە كورتانە دەدوزێتەوەو دەیداتە كابرای كۆچەری‌و دەڵێت بگرە بێ پارە بە خێر بێت، كابرای كۆچەری دوای سوپاسمەندی لەگەڵ خێڵ‌و كەس وكاری‌و كارواندا بەرەو كوێستان دەڕوات، كورتاندروو دەگەڕێتەوەو تەماشا دەكات كورتانەكەی یان بڵێین دەخیلەكەی نەماوەو لە كوڕەكەی دەپرسێ ئەو كورتانەی لیرە بوو چی بە سەر هاتووە؟ بۆ نەماوە؟ كوڕەكەی پێی دەڵێت باوكە كورتانێكی كۆنی بێ كەلك بوو بە خێر دامە كۆچەرێكی هەژار، باوكە هیچ ناڵێ، ئیتر كە ئەو هەموو ڕەنج‌و لیرانەی لە دەست چووە، وەكو شێتێكی لێ دێت بە هەر گوزەرێكدا دەڕوا لەبەر خۆیەوە دەڵێت‌و دەڵێتەوە (چوو... چوو) پێی دەڵێن چ چوو؟ دەڵێت بە خۆم دەزانم، ئەو نهێنییە بە كەس ناڵێت، ساڵ دەسووڕێتەوە كورتاندروو لە دوكانەكەی خۆیدا دەبێت

هەمان كۆچەر دێت و كورتانێكی ڕزیوی پێیە، سڵاو دەكا و دەڵێت مامە گیان، ساڵی پار هاتمە ئێرەو كوڕێژگەیەك لێرە بوو ئەو كورتانەی بە خێر دایە من، بەڵكو هەندێك ڕێكی دەخەیتەوە، مامە كورتانەكەی لێ وەردەگرێ دەیباتەوە پشت دوكانەكەی و دەست دەخاتە نێو كورتانەكە دەبینێ لیرەكانی وەكو خۆی ماوە، دەگەشێتەوەو كورتانێكی نوێ دەداتە كۆچەرییەكەو دەڵێ ئەوەش خێری من و خوا حافیزت بێ، جا مامەی كورتاندروو بە هەر جێگایەكدا دەڕوا لەبەر خۆیەوە دەڵێت و دەڵێتەوە (هات.. هات) لێی دەپرسن چ هات؟! دەڵێ خۆم دەزانم، ئەو نهێنییە نادركێنێ.

## داد پەروەری ئاوڕداتەوە..
## گورگ لەگەڵ مەڕ ئاو دەخواتەوە؟

(١٨)

لە هەموو عیراقداو بە کوردستانەکەی خۆمانیشەوە دوای کۆدەتای ١٤/ی گەلاوێژ (فیئودالْ)کان بە هەر ناوێك بێت (میر- بەگ - چەلەبی- ئاغا - شێخی عەشیرەت) لێیان قەوما بە تایبەتی لە گوندەکاندا کە حوکمەتی ئەوسا بڕیاری دەست بەسەرداگرتنی زەوی‌و زارو موڵکە داگیرکراوە ناشەرعیەکانیان دەر کرد، جا جوتیارەکانیش بوون بە خاوەن زەوی‌و زار، (واشنتۆن) /ی نووسەر دەڵێت: (هەر رژێمێ توانای هەیە هەموو شتێکت پێ ببەخشێ کە پێویستت پێیەتی، هەروەها توانای هەیە هەر شتێکت لێ بسێنێ کە هەتە.) لە پەندێکی فەرەنسیشدا هاتووە: (گۆڕستانەکان پڕن لەوانەی کە وایان دەزانی خەڵك ناتوانێ دەست بەرداریان بێت.) هەر وەك لە ژمارەی پێشوودا ئاماژەم پێکرد لێرەدا تەنیا باس لە گوندەکانی دەشتی هەولێر دەکەم بە تایبەتی دەڤەرەکانی دزەییاتی کە ئاغایان هەبووەو ئەوانیش دوای کۆدەتاکەی ١٤ی گەلاوێژ گلۆلەیان کەوتە لێژی لە گوندەکانیان دەربەدەر کران بە تایبەتی ئەو ئاغانەی کە بەرامبەر بە کرمانجەکان زوڵم‌و زۆرداری‌و داگیرکاریان هەبووە لە پاڵ چەوساندنەوەیاندا کە تا ئاستێك توندو تیژیش بەرامبەر بە ئاغاکان کرا، ئەویش نەك بەرامبەر بە هەموو ئاغاکان چونکە لە نێو

ئاغاكانیشدا هەبوون پیاوی باش‌و نشتمانپەروەر بوون، بەڵێ، كە یاسای چاكسازی زەوی‌و زار دەرچوو، جوتیارەكان بوون بە خاوەن زەوی‌و ئاغاكانیش زۆربەی زەوی‌و زارەكانیان لە دەست داو وەكو هەموو جوتیارێك زەویان بۆ هێشتنەوە، بەڵام دوای ئەوەی لە لایەن بەعسیەكانەوە كۆدەتا بەسەر عەبدوالكریم قاسم كرا، وەزعەكە بە بارێكی تردا داشكایەوە

١- هەندێك لەو جوتیارانە، یان بڵێین كرمانجی گوند بوون بە پێشمەرگەو چوونە ڕیزی شۆڕشی ئەیلوول‌و ژیانێكی شەڕەفمەندانەیان هەڵبژارد، هەروەها لە ساڵی (١٩٦٣)دا كە رژێمی بەعس دڕندانە تر كەوتە ڕاوەدو نان‌و گرتنی خەڵك‌و وێرانكردنی گوندەكان هەروەها گرتنی شیوعیەكان‌و ئەشكنجەدانیان، زۆربەی كادیرانی حزبی شیوعیش چوونە ڕیزی شۆڕشی ئەیلوول.

٢- هەندێك لەو ئاغایانەی كە پێشتر ناسرا بوون بەوەی گیانی نشتمانپەروەری‌و كوردایەتی‌و دادپەروەریان هەبووە ئەوانیش زوڵم‌و زۆری دڕندایەتی بەعسیان قەبووڵ نەكردو بوون بە پێشمەرگەو چوونە ڕیزی شۆڕش.

٣ - جا ئەو ئاغانەی هاتنە نێو شار.. هەروەها كرمانجەكانیش، بە چ بارێك داكەوتەوە؟

*كرمانجەكان بۆ بژێوی‌و ژیانكردن، پێناسەكانیان گۆڕی لە (جوتیار)وە بوون بە (كرێكار)

*هەندێك لە ئاغاكان كە پارەو پولیان هەبوو بوون بە خاوەنی كۆمپانیاو فابریقەو موڵك‌و بەرژەوەندی تایبەت، هەندێكیان خرابوونە نێو

دام‌و دەزگاكانی ئەمن‌و ئاژانسەكانی حوكمەتی ئەوسا‌و هەندێكیش بوون بە سەرۆك جاش... جا بارەكە وا كەوتەوە،

ئاغاكـــان (فیئــودالْ) بوونـــە (بـــۆرژوا) جوتیارەكـــانیش هاتنـــەوە بەردەستیان‌و لەلایان بوون بە كرێكار یان جاش‌و بەردەست‌و خزمەتكار‌و سەركار.

ئەوەندی خۆم بینیوومە كە لەگەڵ باوكم‌و دایكم دەچومە گوندەكانی دەشتی هەولێر یان لە مێوانەكانمان گوێبیست دەبووم.. ئەگەر چەند دیاردە‌و حاڵەتێكی نێو گوندەكان بخەمە روو لێرەوە دەست پێدەكەم...

أ - دیوەخان

*زۆربـــەی دیوەخانـــەكانی گونـــدەكان پێـــك هـــاتبوون لـــە ژوورێكـــی لاكێشـەیی گـەورە، بـە لبـادو مـافوری ڕاخـراو، لـە ناوەڕاسـتی دیوەخـان ئاگردانیك دەبینرا، لە گۆشە‌و سووچێكی دیوەخانیش ئاگردانیكی تر یان مەنقەلەیەكی گەورەی پڕ لە پشكۆی ڕەژووو قاوەچی لێی دەست بە كار بـوو، ئاغـا لەسـەرینگانی سـەرەوە پـاڵی بـە بـالیفێكی خریلـەی چەشـنی بـاگردین ئاسـا دەداو نێسـكەی سمێڵانـی دەهـات ئەگـەر ئاغـا ژن عـاجزی نەكردبا یان كێشەیەكی بۆ نەڕخسا با ئاوا جەوی هەبووە، مەلایـەكیش بە تەنیشتەوەی بوو بۆ ئەشهدو بیللا، بەلاّم هەموو مەلایەكیش نا چونكە لـە مـەلاكانیش هـەبوون لەگـەڵ حـەق‌و ڕەوا بـوون رۆحـی كـورد پەروەریشـیان هـەبوو، هـەروەها زۆربـەی كـات موختـاری گونـدیش ئامـادەیی هـەبوو لـە دیوەخاندا، خەڵكی عام‌و گوندی یان بڵێن كرمانج‌و دەستە‌و پێیـەكان لـە خـوارەوەی دیوەخـان یـان لـە نـاو پـێڵاوان دادەنیشـتن، ئاغـا هـەر زوو زوو دەعـوەت‌و خـوانی دیوەخـانی ئامـادە بـوو بـۆ كەسـایەتییەكان‌و مـأمورانی

حوكمەت‌و کاربەدەستان بۆ ڕایی کردنی ئیش‌و کارەکانی یان پەردەپۆش کردنی زوڵم‌و تاوانەکانی، ئەو کات پۆلیسی سوارە دەچووە گوندەکان بۆ گرتن‌و تەبلیغ کردنی گەنجان بۆ خزمەتی سەربازی، جا ئاغا ویستبای یەکێك بشارێتەوەو نەڕوا بۆ سەربازی ئەوە باشچاوش‌و پۆلیسەکانی نانخواردی دەکردو ڕازیان دەکردن، ئەگەر ڕقی لە کەسانێکیش هەڵگرتبا کە گوێڕایەڵی ئاغا نەبوونە ئەوە گەنجەکەی تەسەلیم دەکردن‌و ڕاپێچیان دەکرد بۆ سەربازی، خۆ لەو دەعوەتە گەورانەی ئاغا دەیکرد دەبووایە باجەکەی جوتیارەکان بیدەن بە دەست‌و دیاریانەوە بۆ ماڵی ئاغا هەر لە کاوڕو عەلەشیش‌و مریشك‌و شتی تر، هەتا لە کچ بە مێردانیش دەبووایە بە ئاگاداری ئاغا بووایە، ئەمە تا ساڵانی ناوەڕاستی هەفتاکانیش، بەڵام دواتر بنیاتنانی دیوەخان بە شێوەیەکی سەردەمیانەو جوانکاریەکی دی دەبیندرێ، ئێمە قسەمان لەسەر دیوەخانەکانی ئەوسای بەر لە ساڵانی هەفتاکان‌و بەرەو سەرەوەترە (ئەوسا لە دیوەخانان چ دەگوزرا؟)

*لە ناو دیوەخاندا ئەو وتەیە بووە بە پەند کە ئاغاکان یان دارو دەستەکانیان گوتوویانە (کرمانج ساوە بڕاوە) واتە ئەگەر کرمانج تێر بوو چاوی سوور دەبێ سمێڵی گڤ دەبێ یان پیاوێك دەکوژێ یان ژنێك هەڵدەگرێ.

*لە دەرەوەی دیوەخانیش ئەو کرمانجانەی خاوەن کەرامەت‌و جوامێر بوون لە ناخی خۆیاندا دژ بە زوڵم‌و ئاغایەتی‌و نادادپەروەری بوون، ئەم وتانە، لە ئەوانەوە سەری هەڵداوە

(ئەمڕۆ ئێرە دیوەخانە... سبەینێ هێلانەی مشکانە) یان (گۆزەی سوورو ئاوی شەوێ... ئاغاو کرمانج ڕێك ناکەوێ)

*ئەو خەڵکە عامەی گوندنشین ئەگەر ئاغا بۆ کارێکی ڕاسپارد با کە سەرکاری ئاغا دەیهێنا دەبووایە دەست لە سینگ و بە (بەڵێ وایە) وەڵامەکەی بێت دەنا وشەی (نا) بە بارێکی مەرگەسات بۆی دەکەوتەوە، ئەم مەسەلەیە لە لانی سایکۆلۆژییەوە لە مێشکمدا کاری کرد بوو ئەوەتا لەم کۆپلە شیعرەمدا کە لە دیوانی (شەوارە)دا هەیە لە ١٩٧٨ بە چاپم گەیاندووە تیایدا دەڵێم:

لە کۆشك و خانەی قەیسەر و
دەست لە سینگ و، بەڵێ وایە
نەنووشتامەوەو وتم نا .
لە خاچی برسیەتییان دام
زەنگی مردنیان بۆ لێدام
مۆمی نانیان کوژاندمەوە
بەڵام نا نا
بوو بە مسیح، بوو بە سوقرات
بوو بە چرا
برسیەتیمی ڕەواندەوە

## له شارم‌و گوندیم‌و پێچه‌وانه‌كه‌یشی

(١٩)

له سالآنی په‌نجاكان‌و تا سالّی (١٩٦٣) به‌ر له‌وه‌ی هێرش‌و داگیركردنی گونده‌كانی ده‌شتی هه‌ولێر به تایبه‌تی گونده‌كانی كه‌ندێناوه‌و قه‌راج‌و مه‌خموورو گوێڕ.. هتد له لایه‌ن رژێمی به‌عس‌و حه‌ره‌س قه‌ومی‌و جیش‌و جاشی خالید بن ولیدو نیشته‌جێ كردنی عه‌ره‌ب له شوێنی كوردان‌و داگیركردن به ئه‌نجام بگه‌یێندرێ، به‌ڵێ به‌ر له‌و به‌رواره، به‌رده‌وام له‌گه‌ڵ دایك‌و باوكم ده‌چوومه گونده‌كان، چ بۆ سه‌ردانی خزمه‌كانیان یان هه‌ر بۆنه‌یه‌ك هه‌بووایه، جا ئێستاش كه له شارم بیره‌وه‌رییه‌كانی گوندو لادێكانی ئه‌و ناوچانه‌و دواتر ئه‌و گوندانه‌ی له كاتی پێشمه‌رگایه‌تیم دیومه یان لێی بوومه له مێشكمدا ناڕه‌وێته‌وه، له ئه‌لقه‌ی پێشوو كه باسی دیوه‌خان‌و ئاغاو ره‌عیه‌و مسكێن‌و گزیرو مه‌لاو موختارو چی تیا ده‌گوزرا، ده‌مه‌وێ ئه‌وه‌ش بڵێم له دیوه‌خانه‌كاندا، زۆربه‌ی ئاغاكان له‌گه‌ڵ دارو ده‌سته‌كانیان به‌رده‌وام پیلانی ئه‌وه‌یان داده‌ڕشت كه چۆن ناته‌بایی‌و دووبه‌ره‌كی‌و ململانێ‌و ناكۆكی‌و ڕكابه‌ری‌و ئیره‌یی بخه‌نه نێوان به‌ره‌ی كرمانجه‌كان به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی بۆنی پیاوه‌تی‌و غیره‌ت‌و جوامێری‌و كه‌سایه‌تیان لێ ده‌وه‌شایه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی یه‌ك نه‌گرن‌و ڕۆژێ له ڕۆژان دژ یان ڕوو به ڕووی به ئاغاكان نه‌بنه‌وه، زۆر جاریش له دیوه‌خاندا یه‌كێكیان ده‌كرده ئامانج به ناوی سوعبه‌ت‌و گاڵته‌و گه‌پ‌و مه‌زاق پێكردن، له‌سه‌ر

حیسابی بە پێکەنین خستنی ئەوانی دی، ئیتر بە شێوازەکانی تێکشکاندنو تەوسو تێزو قسەی بە تێکولْو پلارو توانجو جەفەنگو ساتیر، دواتر مەسەلەکە دەکەوتە دەرەوەی دیوەخانو لە ئەنجامدا کیشەو هەتا شەڕیشی لیْ دەکەوتەوە لە نێوان کرمانجەکانو ناتەبا بوونی لیْ دەکەوتەوە، لە گوندێکی دەشتی هەولێر لە باشتەپە بە تایبەتی لە پەنجاکانو هەتا سالاْنی شەستو دوو لەو خزمانەی ئێمە کە زوو زوو دەگیران لەبەرئەوەی ناحەقیان قەبولْ نەدەکردو دەستیان دەوەشاند، جا کە مالْی ئێمە لەو گەڕەکەی عارەبان لە نزیك بەندیخانەی بنکەی پۆلیسی هەولێر بوو بەرامبەر بە پارێزگای ئێستای هەولێر، بۆ نموونە هەر جارەی ئەو دوو کەسە (سادقو فەیسەلْ) کە خزمێکی نزیکمان بوون زوو زوو دەگیران دەبووایە من نوێنیان بۆ ببەم بۆ بەندیخانە دواتر باوکم واسیتەی بۆ دەکردن، کە ڕۆژی ئازاد بوونیان دەبووایە بچمو نوێنەکە بهێنمەوە بۆ مالْ، قسە خۆشەکە لێرەیە، جارێکیان کە دوای بەند بوونیانو بریاری ئازاد کردنیان درا دیسان چوومەوە بۆ هێنانەوەی نوێنو یاتاخەکان کە ئەو کات تازە کوریژگەو هەراش بووم هەندێك لە پاسەوانەکانی بەندیخانەکەش دراوسیْو خزمو ناسیاومان بوون، دوای ئەوەی مام سادقو مام فەیسەل منیان ماچ کردو ویستم باوەش بە یەتاخەکان بکەم، پێم گوتن مامە (بۆ یەتاخەکان لێرە جیْ نەهێلْم خۆ بەینێکی دی هەر دێنەوە ئێرە؟) زۆر لێم توورِ بوون وتیان ئەمە قسەی تۆ نییەو قسەی گەورانە نوینەکە هەلْگرەو جارێکی دی چاوتان پێمان ناکەوێتەوە، گەڕامەوە مالْ قسەکانم بۆ باوکم گێڕایەوە یەکەم جار بوو شەپا زللەیەکی توندی لێدام، هەر بە پەلە خوی گەیاندە خزمەکانیو ساردی کردنەوەو گوتی ئەو کوڕەم بە تەمەن بچووکە نازانم چی لەگەلْ بکەم کە قسەی گەورە

دەکاو لە خۆی گەورەتر، جا لە سالآنی هەفتاکان دوای ئەوەی چەند وتەیەکی (ڕەسوڵ هەمزاتۆڤ)م بەر چاو کەوت کە دەڵێت (دایکم دەیگوت: دەشێ دەمی بچووك قسەی گەورە بکات) یان دەڵێت (باوکم دەیگوت: دەشێ درەختی بچووك بچووکیش باخچەی گەورەی پێی بڕازێتەوە) یان (گوللەیەکی بچووك کەشتیەکی گەورە کون دەکات) ئەم وتانەی هەمزاتۆڤ ئەو ڕۆژانەی خۆمو قسە گەورەکەی خۆمو یەکەم شەپازللەکەی باوکمی بیر هێنامەوە، ئێستایش بە تەمەنمو جار جار قسەی گەورە دەکەم یان دەنووسمو بلاو دەکەمەوە، باجی زۆرم داوە یان پاداش کراوم.

دەگەڕێمەوە بۆ بیرەوەریم لەگەڵ گوند، کە جوانترین دیمەن لە لای من بیری ئاو بوو کە کچانو ژنان دەستیان لە گوریس شل دەکردو دەولکیان شۆڕ دەکردەوە بۆ ناو بیریو ئاویان دەردەهێناو گۆزەکانیان لێ پڕ دەکردو بە لەنجەو لارەوە بەرەو ماڵ دەبوونەوە، جا چ کوڕگەلێك لە بۆسەدا بوونەو ئاڕاستەیان بۆ کام کچ بووە ئەمەیان خویانو (خودا)یان دەیزانی، ئەوە بوو لەبەرواری ١٩٨٠ شیعرێکم نووسی هەستم کرد بۆ هەمان ڕوژانی ئەو گوندانە دەگەڕێنەوە کە بیری ئاویو سیحری جوانییەکەی ئەم شیعرەی پێ داڕشتوومە، بەلآم بە داخەوە دوای وێرانی گوندەکان وەك چۆن لە ناوچە شاخاوییەکانو زورگو تەلآنەکان رژێمی بەعس کانییەکانیان چیمەنتۆ ڕێژ دەکردو دایاندەپۆشت لە گوندەکانی دەشتایش بیرە ئاوەکان پڕ خۆڵو بەرد دەکران، جا ئەم پارچە شیعرەم لەگەڵ چەند کۆپلەیەکی تر لە میهرەجانی دووەمی شیعری یەکێتیی نووسەرانی کورد / مەڵبەندی گشتی کە لە سەلیمانی کە ئەنجام درا، خویندمەوە هەندێ لە برا نووسەرەکان گوتیان هەموو کۆپلە شیعرەکانت سیاسیو کوردانە بوو تەنیا ئەو کۆپلەیە نەبێ تا ئاستێك جنسی بوو،

گوتم نەخێر بۆیە ئەم کۆپلەیەم هەڵبـژارد بـۆ ئـەوەی ئـەم وێنەیـە بخەمـەوە بـەر چاوی گونـد نشـینانیان کـە بیرە ئاوەکـەیان و بیرەوەرییـەکانیان ڕەش کراوەتەوە، لەسەر رژێم و تاوانەکانیان بیان وڕژێنم و لەسەر مافە ڕواکانیان لە رژێم هەڵگەڕێنەوە، بەڵێ شیعرەکە وا کەوتۆتەوە، کچانی گوند، سینگ و باخـەڵیان دەخەنـە سـەر زاری بـیری ئـاوو دەولـك شـۆڕ دەکەنـەوەو ئـاو هەڵدەهلێنجن، دوای ئەوەی گۆزەکانیان پڕ دەکەن و بیرەکـە جـێ دەهـێڵن، بیرەکە بە حەسرەتەوە ئاه هەڵدەکیشێ کە بە تەنیایی لەو ئاقارە ماوەتـەوە جێیان هێشتووە، ئەم شیعرەش لە گۆڤاری (نووسەری کورد) ژمارە (٥) لـە ت ٢ی ١٩٨٠ بلاو کراوەتەوە، بەم شێوەییە:

(بیرو گۆزە)
هانکە هانکی، کەف و کوڵی بیرێکی قووڵ
گلپەو حەسرەت و ئاهی دەپرژاند
تکەی گەرمی، دلۆپ دلۆپ دەتکایەوە
پرسیم: چی بوو، ناڵەی تۆ هەر نەبڕیەوە
گوتی: رۆژبێدارم لە دەست جوانەکانی عیشق و ئەوین
لێم دێنە پێش و دەمکوژن
هێندەی سینگ و باخەڵ بخەنە سەر زارم و
هەناسەی ساردم هەڵمژن
(دەولك)یش شۆڕ دەکەنەوە دەمهەژێنن
لە دوای گۆزە پڕکردندا
دەڕۆنەوەو جێمدەهێڵن

هەر چەندە لە رۆمانی کاریتەدا یەشار کەمالْ دەڵێت:

(خۆت لە قەرەی گوندییان مەدە.. گەڕت لە گەڕیان مەئاڵێنە)

بەڵام گوندنشینان جۆرە داب و نەریت و ڕەوشتێکیان هەیە کە کەسانی شارستانی لێیان نزیك بن سوود لە هەڵەکانیان و موکوربوونیان لەسەر ۱+۱ = ۲ ناگۆڕدرێت کە دواتر باجی ئەو لاملیەیان دەدەن بۆ کەسانی رۆشنبیر دەبێتە پەند، بە هەمان شێوەش جۆرە جەربەزەیی و غیرەتێکیان لێ بەدی دەکرێ کە زۆر ئاوڕ لەبەرژەوەندی و دوا رۆژیان نەدنەوە، لەوەش هەر باجەکە دەدەن بەڵام دوو حاڵەت بۆ شارستانەکە دەخوڵقێنێ راهاتن لەسەر قەبولْ نەکردنی ناحەقی و بیرکردنەوە بۆ چارەسەری و پێوانەیی لە نێوانی رێژەی زیان و قازانج لە هەر مەسەلەیەکدا.

کە لەگەڵ باوکم و داپیرەم و دایکم دەچووم گوندەکانی خزمانمان بە هەر بۆنەیەك بووایە بیرەوەری ئەو گوندانە کە وێنەی جوانی هاتنەوەی مەڕو بزن و ئاژەڵان هەتا بۆن وبەرامی تۆزەکانیان لە مێشکمدا کەڵەکە بووەو ماوەتەوە یان ناعورو ئاو ڕاکیشانی بە ولاخ و هەروا شایی و ڕەشبەلەك و ئەسپ سوارو سروشتە دلڕفێنەکەی و گۆمی ئاوی پڕ لە قازو مراوی و جوکەو چریکەی چۆلەکەو بولبولان قیرەی باڵندەو بۆڕەی چێلْ و مانگاو نازی بێری و بەردەبێرو هەرەوزی و سەر پەرێزو گیشە کردن و نسرمە بایەکی بیگەردو خاوێن و فێنك... هتد، ئەو وتانەم زیاتر پەیوەستە بە دەشتی هەولێرو دەشتی قەراج و کەندێناوەو موڵکیەو ناوچەی بەرانەتی، هەڵبەتە ئەو دیمەن و سروشتانە کاریگەری تۆمار بووی بە شیعر داکەوتووتەوە بۆ نموونە لەم شیعرەمدا کە دەڵێم:

ئێوارە بوو
لە تەك دیواری مزگەوتی گوندێكدا وەستا بووم
ئەز لە نێو جەستەی خۆمدا نەبووم
بە زەنگی زەنگولەی ملی مەڕەكان
هاتمەوە هۆش خۆم
سەرم هەڵبڕی
گیژۆلەیەك لەسەر بان
بە هێوریو پارێزەوە
دەستی خستبووە بەر مەمكان
جار جاریش پرچی هەڵدەداوە بۆ كاكەی شوان
وردە وردە زەردەی خۆریش
تیشكە زەردباوەكانی دادەڕژان
لە ناوەوەی خۆمدا روحی سروشتیم
كەوتە بەر رێژنەی دیمەنە جوانەكان

## کاتێ رێکەوتەکان رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە

(٢٠)

لە ساڵانی هەشتاکان بوو دوای ئەوەی (ئۆرزدی) لە باڵەخانەی جەلیل خەیات لە هەولێر داخرا کە پێشتر زۆرینەی گەنجان هامشۆی ئەو شوێنەیان دەکرد نەك هەر بۆ کەل و پەل کرین بەڵکو بۆ پیاسەیەك و چاوبازیو کات بەڕێ کردنیش ڕۆژانە دەڕژانە نێو ئەم (ئۆرزدی)یە چونکە تاکە (مۆڵ)ی ئەو سەردەم بوو لە هەولێر، کەچی دوای داخرانی ئەو ئۆڕزدیە تاقانەیە، ئیتر دەتوانم بڵێم هامشۆی گەنجان بەشێکی گوازرایەوە بۆ نێو بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر بەو پێیەی لە هەر دوو ڕەگەزی نێرینەو مێینەی زۆری تیا لە هامشۆو پڕ لە جموجۆڵ بوو وەکو مامۆستاکانو فەرنبەرو قوتابیان، جا کە من ئەو کات فەرمانبەرێك بووم لەو بەڕێوەبەرایەتیە، ئەو هۆبەیەی کارم تیا دەکرد (ژمێریاری) بەرامبەر بە هۆبەیەك بوو بە زمانی عارەبی نووسرا بوو (شعبە زمان الاجتماعی) لە ژێرەوەیشی بە کوردی نووسرابوو (هۆبەی زەمان).. رۆژێکیان سێ کچی جوانکیلە، پێدەچوو تازە بە مامۆستا دامەزرا بوون، لەو دالانە تێپەڕین منیش لەبەر دەرگای هۆبەکەی خۆمان وەستابووم ئیتر دوو کوڕە گەنجیش لەولاوە بە پێچەوانەی ڕێڕەوی ئەوان هاتنو لێیان تێپەڕین، یەکێکیان لەبەرخۆیەوە گوتی (هێی هێی زەمان) منیش گوتم (ئەوەتە هۆبەی زەمان) کوڕەکە گوتی لەگەڵ ئەو زەمانەم نییە.. جا زەمەنو زەمانێك تێپەڕ بوو لە

بەهاری ١٩٩١ کە کۆچ و کۆڕەوی ملیۆنی میللەتەکەمان بەرپا بوو واتە دوای ڕاپەڕین بووە دەرپەڕین، جێی سەرسوڕمان بوو ئەوەی کە پێشتر نەیدەتووانی چەند مەترێك بە پای پەتی بە ڕێوە بڕوات، بە سەدان کیلۆ مەتر ڕێگای بە پێ بڕی تا ناو ئێران و تورکیا و سنوورەکان، منیش وا ڕیکەوت کە لە ئێران لە (سەقز) لەگەڵ منداڵەکانم لە ماڵی خزمێك بووین، میوانێکی زۆری ئاوارە بووانی لێ بوو، یەکترمان نەدەناسی، لە دانیشتنێکی خێزانی دانشتبووین، باسی ژیان کرا منیش گوتم (عبدالعزیم قەساب) شاعیری لوبنانی، هۆنراوەیەکی هەیە سەبارەت بە ژیان کە مامۆستا هەژاری نەمر کردوویەتی بە کوردی دەڵێت:

چەپکەردی گەردوون گەڕان کوشتمی
نەزان پەرستی بۆ نان کوشتمی
هەر چەوسانەوەی بێ حەسانەوە
ئەی مردن لە کوێی (ژیان) کوشتمی

من چ بزانم یەکێك لەو کچانەی لەوێ دانشتووە ناوی (ژیان)ە، خانە خوێ ساتەو پڕ هەڵیدایێ گوتی ئەوەتە (ژیان)، منیش گوتم لەگەڵ ئەو (ژیان)ەم نیە.

دەڵێن بەرد بە بەرد دەکەوێ، گوتم ئەوەتە تۆڵەی ئەوسام لێ بۆوە کە گوتبووم ئەوەتە هۆبەی زەمان.

٢- لە ژمارە (٤) ی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ساڵی ١٩٧٧ بە ناوی (هەڵبژاردە لە دیوانی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان) کە وەك پاشکۆیەك دەرچوو، دوو کۆپلە شیعرم تیایدا بڵاو کرایەوە کە برای شاعیرو

رەخنەنووس شەهید (دڵشاد مەریوانی) لە ژێر ناونیشانی شیعرو ئینجانەی سەرنجیِ) خستبوویە ژێر ڕووناکییەکانی هەڵسەنگاندنو ڕاڤە کردن لە دوتوێی لێکۆڵینەوەکیدا یەك لە کۆپڵەکان کە تیایدا دەڵێم:

منداڵەکەم لەبەردەم دەرگای کۆگاییِ
پێی لە دوا ناییِو چەقیوە
بووکەشووشەیێکی بچکۆلانەی دیوە
گڕناگەی شینی تێبڕیوە
چاوی ڕکەی، لە گیرفانی بەتاڵی من گەورەترە
چاوی ڕکەی پشکۆی گڕە
لە مرۆڤـێکی بیِ تاوان زۆر گەشترە؟!!

کە لەو بەرواره ئەم شیعرەم بلاوکردەوە هێشتا هاوسەرگیریم نەکردبوو کەچی باس لە باوکێك دەکەم کە دەستی منداڵەکەی ڕادەکێشیِو منداڵەکەش دڕناگەی لە بووکە شووشەیەك گرتووە چاوی لەسەر لا ناچیِو فرمێسکان هەڵدەڕێژیو باوکە بیِ چارەکەیشی هەموو گیانی بووە بە گڕو حەسرەتو گیرفانیشی بەتاڵە، ئیتر زەمەن تێپەڕیو پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٣ هاوسەرگیریم کردو کوڕێکمان بوو ناومان نا (ڕێبین)، دواتر لە ساڵی ١٩٨٦ بۆ ماوەی سیِ ساڵان دوای جێگۆڕکیِ کردنم بە خانووەکەمان لە خانوویێکی بە کریِ بۆ خۆ حەشاردان لە ناو ماڵ بۆ خۆ پاراستن لە گرتنو ڕاوە دوونانی بەعسو ڕژێمەکەی هەر لە هەولێر لە گەڕەکی ئەندازیاران گیرسامەوەو لە نێو ئەو خانووەدا ژێر زەمینێکی لا

تەریکی هەبوو بۆ خۆ حەشاردان لە کاتی تەنگانەو لێپرسینەوەو گەڕان بە دوای خەڵکانی وەك ئێمە مانان.

لە ساڵی ١٩٨٨ لێبووردنێکی گشتی لە لایەن ڕژێمەوە دەرچوو زۆر حەسرەتمەند بووم جارێکی تر ناو بازاڕی هەولێر ببینم ئەوەبوو دەستی (ڕێبین)م گرت کە تەمەنی (٥) ساڵان بوو، بە ناو بازاڕدا دەڕۆیشتین یەك دانە (ربع دینار)ی ئەو کاتم پێ بوو، لە دوکانێکدا لە نزیك شەقامی باتا کوڕەکەم (ڕێبین) چاوی بە بووکەشووشەیێك کەوت (تەیارۆکەیەکی کۆپتەر) بوو کە نرخەکەی نۆ بە قەد پارەکەی نێو گیرفانی من بوو کاتی بینیم پڕی دایە ئەم تەیارۆکەیە منیش بە هەزار حاڵ لە دەستیم وەرگرتەوەو ئەویش بە گوڕ فرمێسکی دادەباراندو چاوی لەسەر ئەم تایەرۆکەیە نەدەگواستەوە، لە منەوە دەست ڕاکێشانی ئەو و، لە ئەویش باراندنی فرمێسك، دواتر بە بووکەشووشەیەکی نایلۆنی هەرزان گیرم کردەوە، گوتم بزانە چۆن دوای ساڵانێك کە هێشتا هاوسەرگیریم نەکردبوو لە ١٩٧٧ ئەو کۆپڵە شیعرەم بڵاوکراوەتەوە دوای ئەو زەمەنە (ڕێکەوت بە ڕێکەوت) کەوتەوەو شیعرەکەی خۆم وەك سەگێك قاپی خۆمی گرتەوە؟!!.

ئەمجارەیان کۆپڵەی دووەمی نێو ئەم پاشکۆیە لەو گۆڤارەدا وەك لە پێشدا ئاماژەم پێکرد کە لە ١٩٧٧ بڵاو کراوەتەوە کە دەڵێم:

**ئافرەتێکە ئاوارەیە**
**سێ منداڵی بە کۆڵێ پێ هەڵناگیرێ**
**هەر لە ڕێدا.. هەر لە ڕێدا**
**ناشزانێ کامیان فڕێدا؟!!**

برادەرو ناسیاو پێیان دەگوتم ئەو شیعرەی تۆ کە لە ١٩٧٧ بلاْوبۆتەوە واتە ئافرەتێکەو ئاوارەیەو هەڵەتە بووە ناتوانێ هەر سێ منداڵی بە کۆڵەوە هەڵگرێو غار بدات، دەبێ یەکێکیانی جێبهێڵێو هەر سێیانیش جگەری ئەون کامیان هەڵبژێرێت بۆ جێهێشتن؟! کەچی کە لە کۆچو کۆڕەوی بەهاری ١٩٩١ دا هەمان حاڵەتمان بینیو ئەو کۆپلە شیعرە وەك سەگێك قاپی خۆمی گرتەوە کە بڵێم (رێکەوت بە رێکەوت) کەوت، یان بڵێم بەرد لە جێی بەرد.

## به ســادەیی دەژیان.. به ئارامی دەخــەوتــن

(٢١)

(پاولـو كۆیلـۆ) دەڵێت: (هـەر چـەند زیـاتر لـه ژیانماندا بـەرەو پـێش دەڕۆین، زیاتر ساته وەختی دژوار له ژیانماندا دێته كایەوە)

ئـەو لافاوە خۆشـڕەوو تیـژڕەوەی سـەردەم‌و پێشـكەتنەكانی ئـەمڕۆی تیایدا دەژین به هیچ بەربەستێك بەرایی لـێ ناگیـرێ‌و ناگەڕێتـەوەو لەگـەڵ خۆیدا زۆر شتی كۆنینه ژێر ئاو دەخات‌و تازەكانیش سەر ئاو، من لێرەدا دەمەوێ بڵێم له ساڵانی پـەنجاكان‌و تـا كۆتـایی هـەفتاكانیش لـەو هـەولێرە به گشتی‌و لەو گەڕەكی لێی ژیاوم بۆ ماوەی چل سـاڵ، گـەڕەكی عارەبـان، خـەڵكی بـه سـادەیی دەژیـان‌و بـه ئـارامی دەخـەوتن ئەگەرچـی كـەلتوورو داب‌و نەریت‌و هەڵس‌و كەوتیان جۆرێك بـوو جیـا لـه ئێسـتا، زۆربـه هـەژار بوون‌و بڕوایان به خورافات‌و وەهـم‌و خـەون‌و ژیـان بـه ڕێكردنێكـی سـادەو ساكار بوو، هێشـتا پەنجەیان به دوگمـەكانی مۆبایـل‌و ئـەنترنێت‌و ئامێرە پێشـكەوتووەكانی ئـەو سـەردەمه نەكـەوتبوو، كـه دووچـاری نەخۆشـیەك دەبـوون، بڕوایـان بـه جـۆرە چارەسـەریەك هــەبوو، كـه باسـیان دەكـەین پێكـەنین‌و حەپەسـانێك دامانـدگرێ، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا نـاتوانین ئـەو بـیرەوەری‌و یادگاریانـەی ئەوسـا فـەرامۆش كـەین، هـەروەها بنەمایەكـه بـۆ نـەوەی ئێسـتا كـه ئـارام بـین‌و سـوپاسمەند بـین بڵـێن بـاوك باپیرانمـان وا

ژیاون و ئێمەش لە ئاسانکارییەکانی ئەوان وئەو خۆشگوزرانیەدا با بە ئارامی بخەوین خۆڵ لە چاوی ئەو سەردەم و ژیانەمان نەکەین لەم لایەنەوە، چونکە لایەنی دی هەیە کە تەنگژەی ئێستایی بە بەرەوەیە.

(ڤۆلتێر) دەڵێت: ئەتوانی گوڵ بخەیتە ژێر پێت، بەلأم ناتوانی بۆنەکەی لە هەوا دوور بکەیتەوە)

لە کتێبی (ئەراگۆن لە ڕوو بە ڕووی سەردەمدا) کە (د. فوئاد ئەبو مەنسور) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، لە دیمانەیەکدا یەك لە پرسیارەکان کە لە (ئەڕاگۆن)ی شاعیری ناوداری فەڕەنسی دەپرسن (تۆ زۆربەی کتێبەکانت بە ناوی (مجنون ئیلیزا) (چاوانی ئیلیزا) (ئیلیزا.. ئیلیزا) .. هتد، بۆ؟!!، لە وەلأمدا گوتی: گەر من یەك ئیلیزام خۆش نەوێ چۆن دەتوانم زۆربەی ئیلیزاکانم خۆش بووێ؟ ئەو خێزان و ماڵەم کە نیشتمانێکی بچووکی منە خۆشم نەوێ، چۆن دەتوانم خێزان و ماڵەکانی گەڕەکەی خۆم خۆش بووێ؟ کە گەڕەکەکەم خۆش نەوێ چۆن دەتوان شارەکەم خۆش بووێ؟ کە شارەکەم خۆش نەوێ چۆن دەتوانم هەموو فەڕەنسام خۆش بووێ؟ کە فەڕەنسام خۆش نەوێ چۆن دەتوانم گشت گێتیی و دنیام خۆش بووێ؟)

ئیتر منیش لەو گەڕەکەی تیایدا ژیاوم و خۆشەویستیم بۆ یادو بیرەوەرییە خۆش و ناخۆشەکانی، هەندێك لەو سادەیی و وەهم و خەون و بەسەزمانییە و هەژارییەی ئەو خەڵکانەی ئەسا دەگێڕمەوە کە لە پەنجاکانەوە تا کۆتا هاتنی هەفتاکانیش ئاوا دەژیان و جۆری بیرکردنەوە و هەڵس و کەوتیان بە نەوەی ئەمڕۆ ئاشنا بکەم چونکە هەر وەکو (ئابە بەدریۆ) دەڵێت: (چرکەیەك دەرکەوتنی خۆر، هەفتەیەك یادەوەری باران لە نێو دەبات) بۆ نموونە:

١- لەو گەڕەکەی ئێمەدا بینیوومە منداڵیان نەخۆشی گرانەتای گرتووە بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر نوژدارو لای دەرمانساز وەك بڕوا بوون بە خورافەی کۆنینە بۆ چارەسەر کردنی منداڵە نەخۆشەکە مێرد منداڵێکیان ڕەوانەی بەر دەرکی ماڵێکیان کردووە کە پیاوەکەیان خاوەنی دوو ژنە بە تایبەتی لە کاتی خۆر ئاوا بووندا، ئیتر مێرد منداڵەکە لەبەر دەرگای ماڵی ئەو خاوەن دوو ژنە پڕ بە گەرووی هاوار دەکات:

های شەوتا.. های شەوتا

بە شەو دەگرێ تا

بە ڕۆژ بەردەدا

ماخۆی چوارچاو

چ دەرمان دەدا

خاوەنی چوار چاویش کە گوێی لەم هاوارە دەبوو چ خواردنێکی لەبەر دەم بووایە دەبووایە کەمێکی لە قاپێك بکردایەو ئەو خواردنە دەدرایە منداڵەکەو بڕوایان وا بوو بەم حاڵە چاك دەبێتەوە

جارێکیان بۆ هەمان مەبەست مێردمنداڵێکیان ڕەوانەی بەر دەرگەی ماخۆی چوار چاو کردووە کە پیاوەکە خاوەنی دوو ژنە، مێرد منداڵ هەمان ئەو دێڕانەی سەرەوەمان دووپات دەکاتەوە، خاوەنی دوو ژنەکە دێتە بەر دەرگاو بە مێرد منداڵەکە دەڵێت کوڕم بڕۆ بەر دەرگای ماڵکی تر هاوار بکە، ڕاستە من خاوەنی دوو ژنم بەلاّم ژنێکم چاوێکی کویرەو من ماخۆی سێ چاوانم نەك چوار.

٢ – به چاوی خۆم بینیوومه منداڵی کۆرپەلەو ساوا کە چاوی کول دەبوو، دایکان هەڵدەستان بۆ چارەسەر کردنیان میزی ئاژەڵانیان لە چاویان دەکردن بە تایبەتی میزی چێلّو گوێدرێژان کە بڕوایان بەم جۆرە چارەسەرییە هەبوو، ئاوا خەڵکەکە سادە ساکار دەژیان.

٣- ژنانی ئەوسا هێندە بە پاکیو کەمزانو بێ فڕوفێڵ بوون رۆژێکیان بە دەنگ گریانو قاوقیژەی ماڵێکەوە چووم سەیرم کرد کۆرپەلەیەك لە باوەشی دایکێتی گیانی لە دەست داوە، دایکەکە بە دەم نوزانەوەو فرمێسك هەڵڕشتنەوە دەیگوت (رۆڵە بەخێوم کردی بە شیری قوتی.. بە ئاوی کتلی.. خواش بۆ خۆی بردی)

٤- هەر چەندە دیاردەی (سیحرو خاڵ کوتانو جادوو سووتاندنی بخووردو لە فینجان ڕوانینو چوونە سەر مەزاری شێخو موشایخانو شتی غەیبیو وەهمو خورافەو نوشتەی چاو وزارو دوعاو ڕەشکردنو کتێب گرتنەوەو فالّو بەستنی زاواو بووكو بازووبەندو حەمایل گوللە بەند. .هتد کە ئەو جۆرە دیاردانە ئێستاش لە گەڵدا بێ لە هەموو دنیادا هەر هەیە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی، یان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر پەیڕەو کردنیان کەمترو زۆرتر گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە، جا لەو گەڕەکەی ئێمەدا ئەوسا ئەم دیاردانە زۆر بە فراوانی پەیڕەو دەکرا کە خەڵکەکە کەمتر بڕوایان بە چارەسەری زانستیو نوژداران هەبوو، لەم گەڕەکەی ئێمەدا چەند ماڵە سەیدێك هەبوون، بۆ ئەوەی لە خەڵکی جیا بکرێنەوەو بە سید بناسرێنەوە سەر (لووت کەپوو)یان بە خاڵێکی شین کوترا بوون، زۆر جاریش منداڵانی تریش کە زۆر خۆشیان بویستبووایە سەر لووتیان دەکووتی، ئێستاش لە گەڵدا بێ سەر لووتی من ئەو دەنکە خاڵە شینەی بە سەرەوەیە کە بەر ئەم دیاردەیە کەوتوومە، لەبەرئەوەی

ماڵی ئێمه له تەنیشت ماڵی خوا لێخۆشبووان (سید غنی و سید غانم و سید نوری سید خەنجەر) بوو، هەڵبەته زۆربەی ئەم دیاردانەی ئاماژەمان پێکردن زۆرتر له لایەن ڕەگەزی مێینه پەیڕەو دەکرا و بڕوایان پتر پێ هەبوو نەك پیاوان، که ئێستایش دنیا و زەمەن گۆڕاوه هەر وەکو شاعیری جوانەمەرگ (ئەنوەر مەسیفی) دەڵێت: (جاران دنیا فەل بوو، بەلاّم ئێستا خەریکه خڕ دەکرێتەوه) له کۆمەڵگای کوردەواری خۆمانیشدا خەریکه ئەم دیاردە سەیرو سەمەرانه دەپووکێنەوه، ئەوسا کاتێ دۆم و قەرەجەکان به نێو گەڕەکەکان دەگەڕان که زۆربەیان ژن بوون و بژێوی خۆیان وەدەست دەهێنا که دەچوونه نێو هەر ماڵێك به بێ دەستکەوت نه دەهاتنه دەرەوه ئەویش به خوێندنەوەی ناو لەپی ژنان و فینجان خوێندنەوەو خەتەنه کردنی کچان به نهێنی به بێ ئاگاداری پیاوان، سەیر لەوەدا بوو له هەمان کاتدا که پیاوه جەنتا به دەستەکان له کۆلان دەسووڕانەوه بۆ ئەوەی چ ماڵێك کوڕەکانیان (سونەت) بکەن به ئاشکرا وادەیان وەردەگرت و به ئاهەنگ و داواتکردن و خۆشی به بێ ئەوەی شەرم و شاردنەوەی تیا بێ ئەنجام دەدرا چونکه هی نێرینه بوو نەك مێینه، هەروەها دۆم و قەرەجەکان کەل وپەلی زۆریان له پاشۆڵ بووو دەیانفرۆشت وەك فرفرۆکه خریلەی دارین و تەشووی ڕستن و چەقۆی دەسکداری دروستکراو له قۆچی ئاژەڵ هەروەها بێژینگ و سەرەند و بنێشتی کوردی.. هتد جگه لەمانەیش دانسازیشیان دەکرد بۆ جوانکردنی ددان به پاقرو زڕه زێڕ له ددانیان چەسپ دەکرد به پارەیەکی هەرزان، زۆر جاریش مێرد منداڵەکانی ئەو دۆم و قەرەجانه به تەپل کوتان و بەند گوتن گەڕەکیان دڵخۆش دەکرد و پارشیان وەردەگرت.

٥- هەر لەو سەردەمانەی ئاماژە پێکردووە خەڵکی هێندە هەژار بوون بە دوای لاف و گەزاف نەدەگەڕان بە قەد ئەوەی کە بە دوای نان و بژێوی عەودالْ بوون، جل و بەرگیان ئەگەر ساڵە و سالْ بکڕیبووایە کە دەشدڕا پینەیان دەکرد، خۆم بینیوومە لە پینەیەك و دووان و زیاتریش بە جلەکانەوە بووە بە دەر لە چەند کەمینەیەك لە ئاغاکان و زەنگینە خوا پێداوەکان نەبێ، بەڵێ هەژارەکان کە ڕەنگی جلەکانیان دەگۆڕا قاڵپێك سویتیان دەکڕی کە بە قەد قەوارەی شخارتەیك بوو بچووکتریش بە ڕەنگی شین یان ڕەش لە مەنجەڵێکی ئاوی کوڵیویان دەخست جلەکانیان لە نێویدا ڕەش یان شین دەکردو هەڵیان دەخست تا وشك دەبۆوە، جگە لەوەش (خمچی) هەبوون، من بۆ خۆم (قادر خمچی)م دەدی کە چەند مەنجەڵێکی لەسەر ئاگر دانا بوو لەو گۆڕەپانەی کە ئێستاکە بووە بە پارکی نیشتمان واتە لەبەر دەم باغی شار لەو هەولێرە، چەند ڕایەڵە رستەیەکی ریز کرد بوون کراس و ئاوەڵ کراس و جل و بەرگی هەمە چەشن بە ڕەنگی خمی ڕەش و شینی هەڵیواسیبوو بۆ هیشك بوونەوەو دواتر پارەی خۆی وەرگر دەگرت و جلەکانی دەدایەوە خاوەنەکانیان.

## شەقــام، شۆستەی لە دەستداوە

(٢٢)

یادی بەخێر شاعیری جوانە مەرگ (ئەنوەر مەسیفی) بەر لە کۆچکردنی لـەم شـارە دێرینـەی خۆمـان هـەولێری خۆشەویسـت، چـەند ئێوارەیـەك وا ڕێككـەوتووە بـە یەكـەوە پیاسـەیەكمان كـردووەو بـە دەوری قـەڵادا سوڕاینەوە، زوو زوو بە دەم داڵغەوە سەرچیخ دەڕۆیـی و لەسـەر شـەقامدا دەستم ڕادەكێشا و دەمگوت (ئەنوەر مەسـیفی... وەرەوە سەر ڕەسیفی)

كەچـی ئێسـتا ئەگـەر قـەدەر ژێـر گلـی نەكردبایـەو پیاسـەیەكی وەك جارانمان كردبا بـە دەوری قـەڵادا خـۆ لەسـەر جەسـتەی شـەقامیش بووایـە نەمدەتوانی پێی بڵێم ئەنوەر مەسیفی... وەرە سەر ڕەسیفی، چونكە سـەر ڕەسیفەكان واتە شۆستەكان داگیر كراون لە لایەن دوكاندارەكان بـە جـۆرێ هێنـدە كـەل‌و پـەل‌و ئاسـن‌و ماسـن‌و ئـامێری ئاسـنینی گـەورەو بچـووك‌و سـۆندەو كێبـڵ نـازانم چ‌وچـی.. هتـد لەسـەر شۆسـتەكان دانـراون ئەگـەر ڕۆیندەیـەك بـوێرێ بە سـەر شۆستەدا بڕوات ئـەوە دڵێكـی گـەورەی هەیـە چـونكە وەك ئـەوەی لەبـەرەی جـەنگ بـێ هێنـدە مەترسـیدارە ئەگـەر سـاتمەیەك بكـات وا بـە سـەر ئـەم ئاسـن‌و ئامێرانـە دادەكـەوێت بـێ شـك ئێسك‌و پرووسكی وردو خاش دەبێ، خۆ دوكانـدارەكان ئەوەنـدەی كـەل‌و

پەلەکانیان لەسەر ئەو شۆستانە ریز کردووە ئەوەندەیان لە ژوورەوەی دوکانەکانیاندا نیە.

ئەمە کەی ڕەوایە، کەی شارستانییەتە، کەی مەدەنیەتە، کەی شارو پایەتەختی گەشتیاری (٢٠١٤) یە، تۆ بڵێی ئەم شارە شارەوانی تیا نەبێ؟ ئەم شارە لێپرسیراوی بۆ پێداچوونەوەکان لە خەوێکی قووڵی بێئاگایی یان لە سەفەرێکی درێژ خایەن بن؟

بە نۆێژی نیوەڕۆ بە زەقە زەقی چاوانی دانیشتوان و هاوولاٚتیان رۆژانە ئەم دیاردە ناشیرین و قێزەوەنە دەبینین بە تایبەتی بگرە هەر لە چایخانەی مەچکۆو ژێر قەلاٚت و ژێر قەلاٚت ئینجا بەرەو بازاڕی سوورچیان و تا دەسووڕێتەوە بەرەو باشوور کە شێخەللاٚیە ئەویش پێویست دەکات ڕۆمانێکی هەزار لاپەڕەیی لەسەر بنووسین بە ناونیشانی (جێم کە... ڕێم کە) نەك هەر شۆستەکان بگرە ئەمجارە ناو شەقامەکانیش بە ئارەبانەو دەستفرۆشی و ڕایەخی سیخناخ و جەنجاڵ و ناشیرین، هەر چەندە کەمێك باشترە ئەگەر رۆیندە ساتمەش بکات ئەمجارەیان بە سەر ئاسن و ئامێران داناکەوێ بەڵکو بە سەر سەدان کارتۆنی بەتاڵی فڕیدراوی هەڵنەگیراوەی دوکاندارەکان و ڕایەخ فرۆشەران و دەستفرۆشەران دادەکەوێ رەنگە شکستی قۆڵ و باسکی لێنەکەوێتەوە، کەس لەگەڵ ئەوەدا نییە خەڵك لە کاسبی و کار بڕەتێنێ و لە کاریان بخات، بەلاٚم نەك لە نێو چەقی شاردا بەم شێوەیە، ئەمە چ گوناهو کارەساتێکە هاولاٚتیان هەست بە هاولاٚتی بوون و شارپەرستی و ولاٚتپەرستی نەکەن و زگیان بەم شارە نەسووتێ و هەست بە لێپرسینەوە نەکەن و لە خۆیان نەپرسن بۆ مافی ڕۆینی خەڵك لەسەر شۆستەدا زەوت بکەین؟ بۆ شت فڕیدان لە هەڵگرتنەوە زیاتر هەبێ؟ ناشیرینی و قێزەوەنی لە نێو چەقی ئەو شارەدا وەکو دڕندەیەك دەمی

کردبێتەوە بۆ هەڵلوشینی پاکیو جوانی لەو شارەدا ئەوەندەی جوانکاریش کراوە ببێتە قوربانی ئەم دیاردە ناشیرینانەی لەبەرچاون؟؟!
بۆ بۆ؟

## ئەو تاسەو ئارەزووانەی لە قوولاّییەوە سەر هەڵدەدەن

(٢٣)

باسترناك دەڵێت:

(مرۆڤ لە دایك بووە بۆ ئەوەی بژی، نەك ژیان لە خەڵكێكی تر قەدەغە بكات)

هەر لە ئەزەلەوە، لە منداڵێكەوە كە تازە پێی گرتووە تا دەگاتە پیرترین مرۆڤ، غەریزەیەكی جیوەیی لە گیانی مرۆڤدا چەكەرەی كردووەو پەیتا پەیتا جۆشە دەروونییەكانو تاسەو تا سوقو ویستو خۆزگەو ئارەزووەكانی داگیرساون، بە ناوپۆشراوەیی یان رووكەشی، دواتر ملەو ململانێو دژكاریو ڕكابەریو كێبركێو ئیرەیی، چ بە وتەو جولەو كردار بوو بێ، خۆ یەك شتی ڕەها نییە كە هاوەكەی نەبێ،، دەنا هەمووی هاودژنو بە یەكەوەش هەڵدەكەن وەك (نێر مێ) (تەڕ وشك) (شیرین . تاڵ) (ژیان مردن) (رۆژ شەو)...تا. بێگومان (سالب موجەب) دژ بە یەكن بەلاّم بە یەكەوە رووناكی كارەبا دەبەخشێنن.

لە قوولاّیی ناخی مرۆڤیشدا ئەهریمەنێكو ڕەحمانێك یان بڵێین (خێرو شەڕ)ێك هەیە، تەرازووەكە بە چ لایەك لا تەراز دەبێت، خێرەكە قورستر بوو ئەوە بە سەر شەڕەكە زاڵ دەبێت پێچەوانەكەیشی بە هەمان شێوە.. دوورتر بگەڕێینەوە بەرەو دواوە، ئەوەتا قابیل هابیلی برای كوشتووە لە ئەنجامی ململانێو دژكاریو بەرژەوەندییە تایبەتیەكانیان، خۆ ئێمەش

ئەگــەر لــە نــەوەی قــابیلی بکــوژو هــابیلی کــوژراو بــین بــەدەرنیین لــەو حاڵەتانەی خستمانە روو، ئەگەرچی بە بێ بوونی ململانێو جیاوازییەکان گەشە کردنو داهێنانو پێشکەتنو تێکۆشان وهیچ کارێکی سەرکەوتوو بە ئەنجام ناگات، ئەمەیان لایەنی ئەکتیڤیو گۆڕەپانی یەکەمە (کۆلن سان جۆن دیلسۆن)ی نووسەری ناودار دەڵێت: (لە رووی زانستییەوە روون بۆتەوە کە وشەی ململانێ " التنافس " واتە بەردەوام بوون، ئەویش نەك لە نێو کۆمەڵە هونەرکارەکانداو بەس بگرە لە نێو گشت چینو توێژو بنیاتنـــەرە تایبەتمەنـــدەکانیش بـــە ئـــەنجام دەگـــات.) بـــەڵام لایـــەنی (نـەرێنی)یشـی هەیـە ئەگـەر بـە بـاری تونـدو تیـژیو شـەڕو ئاشـوبو وێرانکاری داکەوتەوە کە بە دوو ئاراستەی جیاواز کاری خۆی دەکات، یـان بـە داخـراویو ناوپۆشـاراو کـە غـەریزەکان وەدەرناکـەون، یـا بـە کراوەییو ڕاستەو خۆ، بۆ ئەم مەبەستەیش (تۆماس هۆبز)ی فەیلەسوف دەڵێـت (زۆر جـاران ململانـێو کێبرکـێ، شـەڕانگێزیو تونـدو تیـژی لێ دەکەوێتـەوە وا لـە مرۆڤـ دەکـاتو پـاڵی پێـوە بنـێ بـۆ دەسـت بـە سـەر داگرتنـی ئـەو شـتەی دەیـەوێت.) ئەمەشـیان گۆڕەپانـە نەرینییەکەیـە. مرۆڤـ کە غـەریزەی شـەڕو ململانێیـی تێکـەڵ بـە ژیانییـەوە بـووە ئـەوەتا مێـژوو بۆمـان دەگێڕێتـەوە جـەنگی جیهـانی، شـەڕو ئاشـووبی وڵاتـانو هەرێمیو ناوچەییو گەڕەكو گەڕەکێكو خێڵو عەشیرەتو عەشیرەتێكو دوو خیـزانو هـەتا لـە نـاو یـەك خێزانیشـدا، جا بەڵامانـەوە نـاوێزە نییـە ئەگەر بڵێم ئەوەنـدەی مـن لـە بیرم ماوەو بینیومـە هـەر لە پەنجاکانـەوە تـا سەرەتاکانی شەستەکانیش شەڕە بەردی نێوان مێـرد منـداڵانو جـار جـار پیاوەکانیشی دەگرتە خۆ لە نیوان دەنشتوانی قەڵاو گەڕەکی تـەیراوە کـە دەیـان منداڵـە هەراشـەکانی تـەیراوە دەسـت بـە بـەردەقانیو دارلاسـتیك لـە

دامێنــی قەڵاتــەوە هێرشــیان دەكــردو هــەوڵیان دەدا بــە بــەرزایی قەڵاتــەوە هەڵــگەڕێن بــەدەم جنێــوی قێــزەوەن و بــەرد وەشــاندن، یــەكێك لــە دورشمــەكانیان (ســەر قــەڵات و بن قــەڵات.. خۆتــان بگــرن تــەیراوە هــات) بــە هــەمان شــیوە لەســەر قــەڵاتیش بــەرد وەشــاندن و جنێــودان و گیــانی شەرانگێزی هەبوو، جار جاریش بە شێوەیەك شەڕە بەرد فراوان دەبوو پۆلیس دەكەوتە نـاو بژێویان، شـەڕی لەشـكری شكستخواردووی هۆلاكۆ بۆ هەولێرو سەر قەڵا، شەڕی داگیركاری و دەركی بوو، ئـی مرۆڤـ بـێ شـەڕ نـاتوانی، نـابێ شـەڕی نـاوخۆیش هـەبێ؟! ئەگەرچـی گـوڵ گـەڕەكێتی كـە چوویتە باخ بـۆنی بكـەیت نـەك بیـوەرێنی، بـە قرتاندنیشـی بـۆ ئـەوە بێـت پێشكەشی ئەویندارەكەتی بكەیت.

ماڵی ئێمە لە چەقی شار بوو لە گەڕەكی عارەبان، خانەوادەكەی ئێمەش كە دەمانێك بووە لە شار ژیاون و بەڵام زۆربەی خـزم و كەسـە نزیكـەكانمان لـە گونـدو دێیـەكانی دەشـتی هـەولێر دەژیـان كـە عەشـیرەتێكن بـە نـاوی عەشـیرەتی (سـێیان)ە كـە بـە سـیان نـاوی دەهێنـدرێ كەچـی وشـەكە (سێیان)ە، سێ برا گەورە بوونە لەو بەرەبابانەوە پێكهاتەكە دروست بووە، لەسـەرەتاكانەوە لـە ئێرانـەوە هاتونەتـە نێـو كوردسـتانی باشـوور، ئـەوەتا ئێسـتایش لـە ناوچـەی پشـدەردا گونـد هەیـە بـە نـاوی (سـەر سـیان) كـە هەندێك لەو عەشیرەتە لەوێ نیشتەجێ بوونە بەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری لـە دەشـتی هـەولێرە لـە ناوچـەكانی (موڵكییە كەندێناوە قەراج شەمامك و سـەنییە و دوبـز) خـاوەنی گونـدی خویـان بوونـە كـە (٣٩) گونـد لـە خـۆ دەگرێت، ئاغا و كرمانج و سیستەمی ڕعیـە و مسـكینیان قـەبوڵ نـەكردووە بەڵكو لە هەر گوندێك یەكێك وەك برا گەورە و خزمانی نزیك خۆیان هەبووە كـە نـاوی كێخوایـان بـۆ دانـاوە وەك موختـارو دەمڕاسـتی گوندەكـە بـۆ

نێوەندگیریی‌و بە کار بردنی ئیشوکارەکانیان‌و ڕێزیان گرتووە.. جا ئەو خزم‌و کەسوکارانەی دایکم‌و باوکم کە دەهاتنە نێو شار بە شانازییەوە مێوانداریمان دەکردن‌و لە هەموو بۆنەکانیان دەچووینە گوند، هەر لە قۆناخی منداڵییەوە تا ئێستایش خولیای دەرە شارم.

کەچی هەر لە دەشتی هەولێر لە ناوچەکانی دزەییاتی ئاغاو کرمانج هەبووە، ئاغاکان خاوەن موڵك‌و گوندو زەویی‌و زاری زۆرو قەمەرەو جوتیارو شوان‌و گاوان‌و سەرکارو رعیەو مسکین‌و خزمەتچی‌و مەسینە هەڵگرو مشەخۆرو شایەدمەندی دەست لە سینگ‌و دیوەخانی (بەڵێ وایە)، کرمانجەکان لە لایەن ئاغاکان‌و دارو دەستەکانیان دەچەوسێندرانەوە، هەر چەندە هەموو ئاغاکان پیاوی خراپ نەبوون، هی وایان تیا بوو کەسی تێکۆشەرو کورد پەروەرو دادپەروەریش بوون، دزییەکان چوار بەرەباب بوون (بەرەی ماڵی فارس بەرەی ماڵی کاکەخان بەرەی ماڵی بایز بەرەی ماڵی پاشا) زیاتر لەسەردەمی مەلەکی، فیئودال‌و دەسترۆو خاوەن دەسەڵات بوون، بەڵام ململانێ‌و رق‌و کینەی کرمانجەکان بە ناوپۆشراوی هەر هەبووە بەرامبەر بە ئاغاکان ئەوەتا مێژووە نزیکەکە باس لە ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر دەکات دژ بە ئاغاکان بە ڕابەرێتی حزبی شیوعی لە (١٩٥٣) کە لە گوندی قازی خانەوە سەری هەڵداوە. لە دوای کۆدەتای (١٤) تەمووزی (١٩٥٨)یش دەر کەوت چۆن جوتیاران هێرشیان کردۆتە سەر ئاغاکان‌و لە گوندەکانیان‌و دەربەدەریان کردوون‌و دواتر یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرچووو جوتیاران بوون بە خاوەن زەوی.

(١)

که باس له بیرەوەرییەکانی خۆمو ئەوانەی وەك خۆم بوونەو پانۆڕامای ڕووداوەکانو باس له باری سیاسیو کۆمەڵایەتیو کەلتوریو کوردایەتی بکەم، دەگەڕێمەوەو دەڵێم بەرواری لە دایکبوونم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥١) واته هەر له پەنجاکان تاکو ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ له نێوانی ئەو چەند ساڵانەدا ساڵانێك بووە وەك گورگێك هەڕەتی تەمەنی ئێمەی خواردووە چی بۆ خۆشیەکی ئەوتۆی ئایندەمانی جێنەهێشتووە واته ناحەقم نەبووه کە لەم چەند کوپلە شیعرەدا کە لە دیوانی (گوڵە یاقوتییەکان)دا ٢٠٠١ دا هاتووه بڵێم:

تەمەنم هەڵکشا، نانێکی ڕەق بوو
به زەبروزەنی دۆژەن
وەك زەوی ئاو لێبڕاو
شەق شەق بوو
ڕۆژگاریش (مشك) ئاسا
به کرته کرت سێ بەشی لێ کرتاندم
ئاخۆ بەشەکەی تر، چۆنی بشارمەوە
له مەکۆی گەلە مشکانی دوورخەمەوە

هەڵبەتە جێنشین، شوێن، ماڵ، جێگای حەوانەوەی مرۆڤە، ئەگەر لە ماڵی خۆت، خۆت بە مێوان زانی چونکە پێشبینی دەربەدەر بوون دەکەیت نەك ئارامی و نیشتەجێیی، هەر وەك کریستۆڤەر مارلۆ دەڵێت: (ئەزانم کە چیم، بەڵام نازانم دەبمە چی) بە هۆی کورد بوونەوە کە بەهارو نیرگزی گەنجییەتیت لە دەست دا، ئەستەمە لە پایزدا ئەو بەهارەت بۆ بگەڕێتەوە، مرۆڤی کورد بە تایبەتی ئەوەی نەیویستووە ببێتە بەندەی ناخی خۆی و دەسەڵاتدارە دیکتاتۆرەکان هەمیشە وەك ئەوەی بە نیو کێڵگەی (مین)دا بڕوات، هەر چەندە وەك ئەوەی (ئابە بەدریۆ دەڵێت: چرکەیەك دەرکەوتنی خۆر، هەفتەیەك یادەوەری باران لە ناو دەبات) بەڵام بە داخەوە تیکۆشەران نەیانتوانیوە پڕ بە دڵ پێبکەنن چونکە وەك خەیام دەڵێت: بولبول وتی بە زبانی حاڵ... ڕۆژێ پێکەنین ساڵێ گریان، ئەوەی بە پاکی و خاکی ژیا و خاك و جێ نزرگەو نیشتمانەکەی خۆشویست و ئامادە بوو ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوەو نەسڵمێتەوە کە بە ڕۆحێکی هەوڵ و خەبات و تێکۆشانی کوردانەو پێشمەرگایەتیی یان خەباتی شاری و ژێرزەمینی هەڵبژێرێ، دەبێت باجی ئەو ڕێگایەی هەڵیبژاردووە بە گیان و تەمەن و خۆشی و بەرژەوەندیەکان بیدات و پێشی ڕازی بێت.

نووسەر (عبدالمجید لوتفی) لە بیرەوەرییەکانیدا دەگێڕتەوەو دەڵێت:

(کەڕەتێك لە یەکێك لە هەوارگە جوانەکانمان بووم، دنیا گەرم بوو، گۆرەوییەکانم داکەندو قاچم خستە ناو ئاوی ساردەوە کە بە جۆگەڵەیەکی بچووکا ئەچوو، زۆر هەستم بە خۆشی کرد، لەو کاتەشدا کچێکی جوانکەلە لەبەر دەمما وەستا وتی:

– مەرحەبا مام حاجی

– وتم: مەرحەبا

- وتی: ئاوی ئەو جۆگە بچکۆلەیە هی خواردنەوەیە مام حاجی
منیش قاچم لە ئاوەکە دەرهێنا و وتم:
- سوپاست دەکەم، بەڵام ئەی کیژۆڵەی جوان ناوت چییە؟
بە زەردەخەنەیەکی درێژەوە وتی:
- ناوم ئاوی پاکە مام حاجی

بەڵێ منیش بە پاکی بە دریژایی ئەو تەمەنەم خۆم پارستووەو زۆر بە متمانەوەش دەڵێم لێنەگەڕاوم پنتکە مەرەکەبێکی ڕەش بە سەر کراسە سپیەکەمەوە هەبێت و منەتیش بە سەر هیچ کەسێکەوە ناکەم چونکە بە هۆی کوردبوونمو هەر خۆشم وام هەڵبژاردووە، دیارە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردەو فەزاییەی لە خێزانەکەمەوە بۆم ماوەتەوە هەر لە باوکمەوە کە کوردێکی دڵسۆزو نیشتماپەروەر بووە، هەروەها لە نێو خیزانێکەوە چاوم هەڵێناوە بەو پێیەی ماڵمان لە گەڕەکی عارەبان بووە زۆر گومانی خراپ بە سەر ماڵی ئێمەوە نەبووە، برا گەورەکەم کە فەرمانبەر بوو لە دادگای هەولێر بە ناوی جەلال ڕشید هەر لە شەستەکانەوە کادیرێکی کارای پارتی بوو، لە ناو ماڵی ئێمە کۆبوونەوەی حزبی دەکرا تا ئەو کاتەی پۆلیسی (سری) یان (خەفیە)یان پی دەگوت، هەستیان پیکرد بووو ماڵی ئێمەیان پشکنی و هیچیان دەست نەکەوت بەڵام (جەلال)ی برام ئیدارییەن گواسترایەوە بۆ رواندز، بەڵام لەویش کاری ڕکخستنی خۆی دەکردو رۆڵی لێپرسراوەتی هەبوو، دیارە منیش لە ژێر ئەم کاریگەریانەدا خولیای خەبات و کوردایەتی داگیری کردمو ئەوە بوو لە ساڵی (١٩٦٤)وە چوومە ڕیزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە، وام دەزانی کە لەم ڕێکخراوە نەبم کورد ڕزگاری نابێت، ئەوسا لە تەمەنی

چوارده ساڵیدا بووم لە پۆلی یەکی ناوەندی زازا لە هەولێر.. جا بەڕێوەبەرو مامۆستاکانمان بریتی بوون لەبەڕێزان:

مامۆستا عارف شێخ رووف نەقشبەندی/ بەڕێوەبەر

دواتر مامۆستا حمید حەمەد خۆشناو بوو بە بەڕێوەبەر لە شوێنی ئەودا

مامۆستا حسام شاکر یاریدەدەری بەڕێوەبەر بوو

مامۆستاکانیش: موسا خلیل - خدر حوسێن - صنعان ئەمین - شمعون هرمز - تەحسین حاجی ئەحمەد - ئیدریس حسیب - رەشید ئەتروشی - ئەحمەد عەباس - یحیا مەرجان - دڵشاد تۆفیق - یونس مەحمود - لەتیف حامد - شێخ جەلال بەرزنجی...

ئەوەی شیاوی وتنە لە مامۆستاکان کە ناوم هێناون رۆحیان شاد بێت (لەتیف حامد نووسەرو چیرۆکنووس بوو - یونس مەحمود ئەستێرەیەك بوو لە یاریزانانی تۆپی پیێ و - یحیا مەرجان گۆرانیبێژو هونەرمەند بوو.

دواتر بە چەند ئەلقەیەك باس لە خەباتی قوتابیان و پێشمەرگایەتیم و ساڵانەکانم دەکەم.. لە ئەلقەکانی پێشووتریش باسی لایەنی کۆمەڵایەتی و داب و نەریت و کەلتورو ژیانی ئەوسای پەنجاکان تا کۆتایەکانی هەفتاکانم کردووە کە لە گەڕەکەکەی خۆمەوە گەڕەکی عارەبان دەستم پێکردووە ئینجا هەموو هەولێر، کە ئەوسا چەند بە سادەیی و ساکاری ژیان بەڕێوە چووە دوور لە تەکنەلۆژیا و ئەلکرۆنیات و ئامێرە پێشکەوتووەکان و پەیوەندییە خێراکان و بەرەو پێشەوە چووی سەردەم و تازەکارییەکان، بەڵام بەر لەوەی بگەڕێمەوە سەر ئەسڵی مەبەست، یەك لە بابەتەکان کە باسم لێوە نەکردووە و زۆرێك لە نووسەران باسیان کردووە ئەویش (حەمە شێت)ە کە لە پەنجاکانەوە تا کۆتایی هەفتاکانیش لە بازاڕی هەولێر

دەبینـدرا خەڵکەکـە پارەیـان دەدایـێ ئـەویش بـە ئاسـنی دەداو کـوی دەکـردەوەو جـارو بـار قسـەی وای دەکـرد لـە قسـەی مرۆڤـی ئاسـایی نەدەچوو جا یەك بابەت لە بارەی ناوبراو کە کەسێك باسی نەکردووەو خۆم بە چاوی خۆم دیومە، ئەوە بوو (لە مزگەوتی شێخی چۆڵی دەخەوت هـەر پـارەو یارمەتیـەکی دەدرا بـە ئاسـنی دەدا، هـەموو ئـەو ئاسـنو کەرستانەی کۆی دەکردەوە لەو مزگەوتە کەڵەکەی دەکرد، دانیشتوانی دەوروبەری مزگەوت کە بە وەڵی ئیماندارو پیاو چاکیان دەزانی ئێواران چ جۆرە شێوکایان هەبووایە بۆیان دەبرد ئەویش مەنجەڵێکی گەورەی هەبوو هەموو شێوەکانی لەو مەنجەڵە دەکرو سماقی پێدا دەکردو تێکی دەدا هەمووی سوور ڕەنگ دەکرد، ئاگرێکی بە داری قەلاشکەری دادەگیرساندو مەنجەڵەکەی دەخستە سەریو دواتر چەند سەلکە سەهۆڵێکی دەخستە سەر شێوی رەنگ سوور، جا کەس نەیدەزانی حکمەت لەوە چییە ئاگر لە بن مەنجەڵو بەفریش لەسەر مەنجەڵەکە؟!! لەو سەردەمدا بۆ نەوەی ئێمەی کورد کە لە نێو (شۆڕشو شەڕو دانووستاندنو ئاشتیەکی کەم خایەن)و گرتنو ڕاوەدوونانو ترسو داپەلۆسینو تۆقاندنو کودەتای سەربازی بەردەوام لە عیراقو گۆڕینی رژێمێكو هاتنی رژێمێکی دی، ڕاگویزانی گوندەکانو تالانو وێرانکاریو تەعریبو پێشێڵ کردنی مافی کوردو حاڵاتەکانی دەروونی مرۆڤی کورد کە نەدەکرا بە ئازادی دەنگ هەڵبڕین زۆر لەو نا دادوەریو تاوانو ستەمەی بەرامبەرمان دەکرا لە ناخمانەوە خوڵی دەخواردو دەمانیخواردەوە وەك ئەو پەندەی (پڕی زگم قسەیە سەری زمانم بقەیە) جا (ئەگەر دەنگێ دەکەم، دەنگم دەچێ ئەگەر دەنگێ ناکەم ڕەنگم دەچێ) جار جاریش وێستگەیەکی ئومێد، جا دەبێ نەوەی ئێمە بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەست بوونە بە ڕۆحی نەتەوایەتیو

کوردایەتی چەند سوودیان لە ژیان و خۆشی و لە گەنجایەتیان وەرگرتبی[٢]؟،
بۆیە ئەم پانۆڕامایە خاڵ بە خاڵ دەخەمە روو هەر لە دوای ڕووخانی
دەسەڵاتی پاشایەتی و نەمانی مەلیك فەیسەڵی دووەم تا ڕاپەڕینی بەهاری
.١٩٩١

(٢)

له ساڵی ١٩٥٨ له مانگی تشرینی دووەمدا، له پۆلی دووی سەرەتایی بووم له قوتابخانەی (نەهزە) کە دوو دەوامی تیا دەکرا، قوتابیانی (نهضة)و (بۆتان) ئەو قوتابخانەیە کە ئێستاش بیناکەی وەکو خۆی ماوەو ناوی بووە بە (قوتابخانەی شێخی چۆلی بنەڕەتی تێکەڵاو) دەرگای سەرەکی دەکەویتە سەر ئەو شەقامەی بەرەو مەرقەدی سولتان موزەفەرەدین و پاریزگای هەولێر درێژ دەبێتەوەو لایەکی تری شوورە سەرەکیەکەی بەرامبەر بە (فولکەی بە تەمای خوا)یە کە ناوی ئەو فولکەیە وا رۆیشتووە، ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بیلێم، هەر لەو ساڵەدا سەر لە بەیانی کە رۆژ لە دەرو پایزێکی فێنك و خۆش بوو، تازە گەڵای زێڕکەفت لەسەر باخچەکەی قەتابخانەدا بەدی دەکرا، قەتابیانی هەموو پۆلەکان لە گۆڕپانی قوتابخانە ریز کراین و بەڕێوەبەری قوتابخانە کە ناوی (بویا) مەسیحی و دانشتووی عێنکاوە بوو، بەو حەیزەرانەی بە دەستەوەی بوو لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی قوتابخانە وەستا و گوتی، قوتابیان، ئێستا لێرەوە ریز بە ریز دەچنە دەرەوەو ئەو جێگایەی لەسەر رەسیفی ئەو شەقامەی بۆتان دانراوە یەك ریز دەوەستن و ئەو رێنماییانەی ماموستاکانتان چیتان پێتان دەڵێن جێبەجێ دەکەن، ئەوەی هەر سەرپێچیەك بکات رۆژی دواتر ئەو حەیزەرانەی ناو دەستی من دەبینن چیتان بە سەر دێنێ.

بەڵێ لەم بەرو ئەو بەری سەر ئەو شەقامەی نزیك قوتابخانەكەمان تا نزیك پاریزگا بە ریز قوتابی و فەرمانبەرو كارمەندانی دایرەو دامو دەزگاكانی میری و عەسكەرو پۆلیس و خەڵك وەستا بوون، دوای چەند كاتژمێرێك بوو بە هەراو چەپلە ریزان و مقۆ مقۆ، لەسەرەتای شەقامی بەر دەمی قوتابخانەكەماندا كەژاوەی هاتووەكان وەدیار كەوتن، كەژاوەی هاتنی شا فەیسەلی دووەم، سەرتا چەند ئەسپسوارێكی پۆلیسی سوارەو دواتر چەند سوار ماتۆڕ سكلێك و ئینجا تیپێكی مۆسقا ژەنی سەربازی و پاشان لە نێو قەمرەیەكی سەر والآ شا فەیسەلی دووەمی پادشای عیراق یان بڵێین مەلیك فەیسەل، مێرد منداڵێك بوو، بە هەردوو دەستان سلاوی لەم بەرو ئەو بەری پێشوازیكەران دەكرد گویم لە مامۆستاكەم بوو دەیگوت ئەوەی لە تەنیشت مەلیكە (عبدوئیلا)یەو ئەوەی تر (وصی)یە لە گەڵیدا، لە نێو ئاپۆرەی ئەو خەڵكە بە چەپڵە رێزان و بژی و هاوارو گوڵباراندن و دەست ڕاوەشاندن و سلاو كردن كەژاوەكە بەرەو قوتابخانەی (سانویەی اربیل) ڕۆیشت، ئەو قوتابخانەیە بریتی بووە لە خویندنگای سێ ساڵ ناوەندی و دوو ساڵ ئامادەیی، ئێستا شوێنەكەی پارێزگای هەولێرەو لە تەنیشت ئەو قوتابخانەیش دایرەی بەرید هەبوو، ئەو باخەی فوارە ئامێزە ئێستا لە نێوەندی بازنەی قەلآو پارێزگادا بەرامبەر بە بریدەكە ئەو كات دایرەی شارەوانی بوو. هەروەها بەرامبەر بە پارێزگای ئێستاش (متصرفیە) هەبوو كە ئێستاكە ئەو بینایە قائمقامیەتی هەولێرو ئەنجومەنی پارێزاگای هەولێر تیایدا دەوام دەكەن، ئەوسا (متصرف) پادشا یان بڵێن والی شار بوو كە ئێستا بە (پارێزگا) ناودارە.

دوای ئەوەی هەر یەكێك لەوانەی لە پێشوازی شا فەیسەل بوون و شەقامەكان ئارام بوونەوەو مامۆستاكانمان پێیان ڕاگەیاندین، قوتابیان

بگەڕێنەوە ماڵەکانتان، منیش بە هەڵم زانی بچمە ئەو خەستەخانەی کە ئێستاش ماوە لەو بەری شەقامی پارێزگای هەولێر بە بەری رۆژئاوە بەرامبەر سینەما سەلاحەدینی ئەوسا کە ئەو سینەمایە ئێستا تێکدراوەو بووە بە گەراجی ڕاگرتنی ترومبێلان و چەند دوکانێك، ئەو کات ئەو خەستەخانەیە، خەستەخانەیەکی سەرەکی چەند قەرەوێلەیی بوو لە هەولێر کە هێشتا خەستەخانەی کۆماری دروست نەکرا بوو، ئەوە بوو دوای شۆڕشی چواردەی تەممووز خەستەخانەی کۆماری بنیات نرا، جا لەو خەستەخانەیەی کە بەرامبەر سینەمای سەلاحەدین بوو ئەوسا، چوومە نێو خەستەخانەکە چونکە باوکم نەخۆش بووو بە نەخۆشی (تەنگە نەفسی) لەوێ خەواندبوویان بۆ چارەسەری، لە کارمەندێکی ئەوێم پرسی باوکم نەخۆشەو ناوی (رەشید ئەحمەد)ە لە چ قاوشێکە، منی بردە لای باوکم، باوکم منی بینی لە شوێن خۆی راست بۆوەو باوەشی پیا کردم گوتی کوا لەگەڵ کێ هاتووی، گوتم دوای تەواو بوونی پێشوازیمان لە مەلیك فەیسەل، مامۆستاکان ئێمەیان ئیزن داو نەچوومەوە بۆ ماڵ و غەریبی تۆم دەکردو هاتمە لای تۆ، ئیتر تیر ماچی کردم و هێلکەیەکی بۆ سپی کردم و پاشان پرتەقالێك، ئەوەی شایەنی وتنە ئێستاش لە گەڵدا بێ نازانم سیحری ئەو تام بۆنەی ئەم هێلکەو پرتەقالە بۆ لەسەر زارم وەك تام و بۆنیش لە لوتم نارەوێتەوە؟! کە کتێبی (جمالیات المکان)ی (گارسۆن باشلار)م خوێندەوە ئینجا تێگەیشتم کە جوانی شوێن و بیرەوەریەکان و وێنە هەستەوەرییەکانی (بۆن)و (تام)و ژیان دوای گەڕانەوە بۆ ڕابردووو داکەوتن بە سەر سۆزو سووتانەکانی چ دوکەڵێکی سپی نەبینراوی هەیە کە لە ناخەوە دەردەچێت و قوڵپی گریانەکانی هەمیشەین و لە یاد ناکرێن.

بـەڵێ زۆری پـێ نەچـوو سـاڵ سـووڕایەوە لـە ١٤ /ی تـەممووزی ١٩٥٨ کۆدەتایەك ڕاگەیەندرا بە ناوی گۆڕینی دەسەلاّتداریەتی پادشایی مەلەکی بۆ کۆماری کە بـە رابەرایـەیتی زەعیم عەبدلکریم قاسم ئـەنجام درا، مـەلیك فەیسەلـی دووەم کوژراو سەرۆك وەزیران نوری سەعید لە ترسی کوشتنی خۆ پاراستن لە بەغدا بە عەباو پەچەوە ئەو ماڵ ئەو ماڵی کردووە پاشان ئاشـکرا بـووەو کـوژراوە هـەروەها (وصـــی)و زۆربــەی کاربەدەســتان‌و دەسـت‌و دایرەکـانی مەلـەکی، گیران‌و دادگـایی کـران، وەك ئـەو پەنـدەی (ڕۆژێ لەسـەر پشـتی زیـن‌و ڕۆژێ زیـن لەسـەر پشـت) زۆرینـەی هـەمان خەڵکانی بەر لە شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ کە گوڵبارانی مەلیکیان دەکـردو لـە پێشوازیدا بوون ئەو کاتەی هاتە هەولێر کەچی لـە ١٤ی گەلاویـژی ١٩٥٨ دا لـە گۆڕەپـانی بـەر دەم پارێزگـای ئێسـتاو متصـرفیەی ئەوسـا بـە بـژی عەبـدولکریم قاســم‌و بمــری نۆکــەران‌و پادشــای گــۆڕ بــە گــۆڕو دارو دەستەکانی هوتافیان دەکێشاو هەڵدەپەڕین‌و چەپڵە ڕێزانیـان بـوو، چـەند ڕۆژێك لـەم گۆڕەپانـەدا ئاهـەنگ‌و شـایی‌و خۆپیشـاندان‌و خۆشـی دەربڕین دەسـتی پێکـرد، ئێمـەی منـدالانی هـەراش بـێ ئـەوەی فـامی سیاسـەت بکــەین‌و بــزانین مەســەلە چــییە بــێ پســانەوە هەڵپــەڕو داپــەڕمان بــوو (تۆنتـرەقە)مان دەتەقاندو فیشکەشێتەمان هەڵدەدایە ئاسمـان‌و دڵخـۆش‌و سـەر مەسـت بـووین، ئـەم دروشمانـە لـە نێـو ئـاپۆرەی ئامـادە بووانـەوە دەگوترایـەوە (بـژی گـەل ڕۆڵـەی گـەل مـام ڕەحمـان‌و شـێخە شـەل) (زەعـیم ئێمــە فـەللاحین بـۆ جمهوریـیـەت سـیلاحین) ژنـانی ئـازادیخوازانیش بـە تایبەتی ئەوانەی لەبەرەی حزبی شیوعی بوون یەك دەنگ هاواریان دەکـرد (دەمانــەوێ سەربەســتی عــەباو پێچــە هەڵبســتی) دژ بــە ئاغاکــانیش جوتیـاران کـە بەشـداری ڕێپێـوان‌و ئاهەنگـەکان ببـوون گەلـێ دروشمیـان

هەبوو بۆ نموونە (ئەملام تاتو ئەو لات تات ئاغا هەڵیٚ شەعب هات) بە دەیان دێڕو رستەی تر.

–چەند مانگێك بە سەر شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ تێپەڕ بوو، لەگەڵ برایەکم کە برا گەورەم بوو بە ناوی (جەلال)و لە سینەما سەلاحەدین بووین، شەو بوو، لە هۆلی سینەمادا هێشتا فیلمەکە تەواو نەببوو، بووە غەڵبە غەڵبو مقۆمقۆ، چی بووە گوتیان دەستڕێژی گوللە لە عەبدولکریم قاسم کراوە لە بەغدا، جەلالی برام دەستی گرتم گوتی با بڕۆین، زۆر تێکچووو هەناسەبڕ بوو، چونکە زەعیمی زۆر خۆش دەویست، لە دەرەوەی سینەمادا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی قسەیان کردو بەرەو دایرەی بەرید رۆیشتین کە چەند هەنگاوێك لە سینەماکە دوور بوو، لە پێش دایرەی بەرید خەڵکانێکی ئێجار زۆر کۆ ببوونەوە لەگەڵ بەغدا لە پەیوەندی بوون، زۆری پێنەچوو لە دایرەی بریدەوە موژدەیان ڕاگەیاند کە زعیم عەبدولکریم قاسم برینی سووکەو سەلامەتە، ئیتر خەڵکەکە دڵنیا بوون گەڕانەوە ماڵی خۆیان.

***

لەو گەڕەکەی عارەبان کە لێیی بووم، بگرە لە پەنجاکانو شەستەتەکانو تا ناوەڕاستی هەفتاکانیش سنووری دانیشتوانی هەموو هەولێر هێندە فراوان نەبوو بە گەڕەکەکەی ئێمەوەش زۆربەی خەڵك هەژارو بیٚ دەرامەت بوون، هێشتا خۆر سەری لە ئاسۆوە دەرنەدەهێنا بە سەربازو پۆلیسو کرێکارو کاسبکارەوە دەچوونە سەر کاری خۆیان، هەندێکیش مامۆستاو فەرمانبەران بوونو کەمتر لە رەگەزی مێینە، ئەوکات چەند مزگەوتێك هەبوون لەو گەڕەکە بۆ نوێژ کردنو بە سەر بردنی پیاوەکانی گەڕەك، هەتا مەلاو فەقیٚو شێخو سەیدەکان، رۆحێکی

کوردانەی بەرزیان هەبوو، نەك وەك ئیسلامێکی سیاسیی و پەیوەندار، مزگەوتەکانی ئەو گەڕەکە کە هەبوون ئەو کات (مزگەوتی پاشا – مزگەوتی دێرە بڕوشە – مزگەوتی مەحموود حەلاف دواتر لە هەفتاکان مزگەوتی پیرێژن – مزگەوتی حاجی حەسەن – مزگەوتی حاجی حوسێن پەیدا بوو، هەروا تەکیەی شێخ محی الدین – شیخ عارف و سید نوری سید خەنجەرو خەلیفە مەجید) هەبوون، ئەوەی شایەنی وتنە ئەوسا بە مایکرۆفۆن و (مکبرە) بانگ نەدەدرا، مەلا یان یەکێك لە فەقێ و کەسانی دەنگ گەورە لە کاتی بانگدان بۆ نوێژ کردن دەستی دەخستە پەناگوێی و بانگی دەدا، لە دەمی کۆیبەکانم بیستووە، فەقێیەك لەو کاتەی بانگ دەدا، بارەدارێك بەو گەڕەکەو لە خوارەوەی مزگەوتەکە تێپەڕ دەبێت، خۆ نابێت بانگەکە ببڕێت، لە لایەکی دی پێویستی بەو بارە دارەیە بیکڕێت لە دەستی نەچێت، لە نێوانی هەر دێڕێکی لە بانگەکەی، دەڵێت ئەو بارە دارە بە چەندی، دە خزمە بیگێڕەوە بە هەشت درهەمان، ئیتر بارە دارەکەش مسۆگەر دەکات و بانگەکەش دەدات.

لەو گەڕەکەی ئێمە ئەگەر یەکێك ئەمری خوای کردبا لە مزگەوت کۆدەبوونەوەو کفن و گۆڕ هەڵکەندن هەموو بە کۆمەکی و هاوکاری دەکرا و زیاتر بە پای پەتی جەنازەو دارە مەیتەکەیان بە سەر شانەوە هەڵدەگرت و قەبرستانەکانیش لە دەوروبەرو نزیکی گەڕەك بوون وەك قەبرستانی ئیمام محەمەدو شێخی چۆلی و چراخ کە ئێستاش هەر ماون، خۆ ئەگەر مردووەکە (سید) یان (شێخ) یان شەهیدو کەسایەتیەکی دیار بووایە ئەوە لە یەك لە تەکییەکان دەف لێدەرو دەروێشانی بە شیرو زەرگ بە دەست و پرچی کراوەیان ئالآیەکی بەرزی سەوزی سەیدەکان بەرز دەکرایەوە لە پێشەوەی جەنازەکەدا، جار وا بوو شێخی تەکیە یا سیدی ناودار لە گەڵدا

بوون ئیتر بە دەف لێدان و حەی و حوی دەروێشان و شمشێر جولاندن و یان زەرگ لە خۆدان و جەماوەرێکی زۆرو هەموو ژن و منداڵانی گەڕەکیش لەمبەرو ئەوبەری جادەو کۆڵانەکە دەوەستان و هەبوو لە هاڕەی گریانی دەدا بەو شێوەیە تا دەگەیشتنە گۆڕستانەکە.

- هەر وەکو ریکۆری زانا دەڵێت: (ئێمە لە ناوەوەی خۆمانەوە دنیایەکمان هەڵگرتووە وەك چۆن لە دنیایەکدا نیشتەجێین، دەشێ لێرەدا جۆرێك ئاوێتەیی لە نێوان ئەو جیهانەدا بخەینەوە)

لەو گەڕەکەی خۆماندا لە هەرەتی تەمەنێکی هەراش و گەنجیەتی چەند هاوریەکی دڵسۆزو هەمیشەیم هەبووە تا ساڵانێکی زۆر پێکەوە بووینە بە زۆربەی نهێنی و بەزمی یەکترمان زانیوە لەوانە (سابیر جەبار - سید عەزیز - ئەسعەد محەمەد قەرەداغی - نەشئەت عەبدولڕەحمان - هاشم سید نوری) جگە لەو هاوڕێیانەی هاوخەبات بووینە لە کارە نهێنیەکانی رێکخستنی حزبی و رێکخراوەیی کە ئاماژەی زۆرم پێکردووە لە ئەڵقەکانی تر.

- یەکەمجار لەگەڵ برای شاعیر نەوزاد رەفعەت یەکترمان ناسی لە ١٩٦٧ دا، ئەو کات لە قوتابخانەی ناوەندی کۆماری لە هەولێر دەیخوێد، رۆژی هەینی بوو، سەرەتای بەهار بوو، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دی لە قوتابخانەی ناوەندی زازا بووین، بەندە - نەوزاد رەووف دۆغرەمەچی و هەلال یاسین و ئیبراهیم عەبدولقادر دۆغرەمەچی لە بەیانییەوە بە دەم خوێندنەوەو جارو باریش قسەو نوکتەی خۆش تا پاش نیوەڕۆ لە دارەتوو خۆمان دییەوە کە ئەوکات لە گەڕەکی ئیسکان بەو لاوە دەشت و چۆڵەوانی بوو، لەوێوە دوای ئەوەی هەندێك خواردنمان پێ بوو خواردمان هەر بە دەم خوێندنەوەی وانەکانمان گەڕاینەوە نێو شارو ماڵەکانمان،

ئێمە کە لە چینی هەژارو مام ناوەندی بووین ئاوا خوێندنمان دەکرد چونکە لە ماڵەوەمان ژووری سەربەخۆمان نەبووە تیایدا بخوێنین، تەنیا رۆژانی باران و سەرما و سۆل دەرنەدەچووین، دواتر لێرە ولەوێ لە گازینۆو چایخانەکاندا لەگەڵ نەوزاد رەفعەت دادەنیشتین، هەستم دەکرد قسەکانی وەك خوێنەرو رۆشنبیرێك جیا بوو لەگەڵ زۆربەی ئەو برادەرانەی جار جار دادنیشین پێکەوە، ئەوە بوو لە ١٩٦٩ لێك دابڕاین لەبەرئەوەی من چوومە ناو شۆڕش و ریزی پێشمەرگەو نەوزاد رەفعەتیش چووە بەغداو لە کۆلێژی بەشی کوردی وەرگیرا، لە ساڵانی هەفتاکان شیعرێکی نەوزادم خوێندەوە بە ناوی ئەسپێکی باڵدار لە گۆڤاری بەیان و وێنەکەی لەگەڵ شیعرەکەی دابەزی بوو، ئینجا زانیم ئەوە بووە بە شاعیرو دواتر بەردەوام بوو تا ئیستایش شاعیرێکی سەرکەوتووە.

***

-یەکەم سەفەرم بۆ بەغدا لە ساڵی ١٩٦٨ دا لەگەڵ کاك (سابیر جەبار)ی هاوڕێم کە ناوبراو شارەزایی هەبووو پێشتر دوو جاریتر سەفەری کرد بوو بۆ بەغدا، باوکم بۆ ئەو سەفەرە سێ دیناری دامێ کە بڕیارمان وا بوو شەش رۆژمان پێ بچێت، لە هەولێریش لە شەقامی باتا گەراجی عەبدوڵلاّ دایە خەجێ هەبوو سیارەی نێرن دەوەستا بۆ بەغدا بە (١٤) درهەم سواری نێرن بووین و ئێوارە لە بەغدا لە ئوتێل (نزار) لە شەقامی رەشید دابەزین، نرخی ئوتێل شەوانە نەفەری بە (٦) درهەم بوو، لە خوارەوەی ئوتێل چێشتخانەیەکی لێ بوو برنج و شلەو گۆشت و تورشیات بە تێرو تەسەلی خواردمان نەفەری بە (١٢٠) فلوس بوو، بۆیە لێرەدا ئاماژەم بەو نرخانە کردووە لە لەگەڵ بەرواری سەفەرەکە تا نەوەی ئێستا بەراوردێك لەگەڵ دوێنێدا لە لای دیار بێت.. بەغدا چێژو سیحرو

لەزەتێکی ئەوتۆی هەبوو کە گەڕاینەوە بۆ هەولێر لە بەهانەیەك دەگەڕام بۆ
ئەوەی جارێکی دی بچمەوە، جا لەو سەردەمدا لە شەستەکان تا کۆتایی
هەفتاکانیش (ڕەگەزنامە – جنسیە عراقیە) دەبووایە لە بەغدا دەربهێندرێ
هەروها بۆ دامەزراندن لە وەزیفەدا دەبووایە (عدم محکومیە) ئەویش لە
بەغدا دەربهێنرێ بۆ گشت هاولاّتیانی عیراق، جا کە پشووی هاوینە
دەستی پێکرد هەر لەو ساڵەدا (١٩٦٨) بە بەهانەی دەرهێنانی ڕەگەزنامە
ی عیراقی سەفەرم بۆ بەغدا کردەوە سێ جار منیان گەڕاندەوە بۆ هەولێر
گوایە هەڵە لە مامەلەکەمدا هەیەو تەواو نییە، دوعام دەکرد هەر تەواو
نەبێت بەڵکو بەردەوام دەبم لەو سەفەرانەم بۆ بەغدا، بەڕێوەبەرایەتی
رەگەزنامەی هەموو عیراق لە گەڕەکی بەتاوین بوو بە نێرو مێدا لەو
بەڕێوەبەرایەتییە سەگ صاحێبی خۆی لێ نەدەناسییەوە، هی وا هەبوو
دەیگوت ئەوە مانگێکە لێرەم کارەکەم تەواو نەبووە، جا باوکم بە سید
نوری سید خەنجەری گوت نامەیەکم بۆ بنووسێ کە زاوایەکیان ناوی
مەعروف بوو بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرخ بوو لە بەغدا بەڵکو کاری
رەگەزنامەکەم بۆ تەواو کات، جا سید نوری گوتی دوو رۆژی تر هاشمی
کوڕم دەچێتە ماڵی خوشکم واتە ماڵی زاواکەمان با موحسین لەگەڵ ئەودا
بڕوات و کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکەن، جا بۆ جاری چوارەم بوو بچمەوە
بەغدا ئەمجارەیان لەگەڵ هاوڕێم هاشم سید نوری چووم، جا لەوێ کاك
مەعروفی بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرخ فایلەکەی لێ وەرگرتم و دایە دەست
یەك لە پۆلیسەکانی و چووین بۆ لای بەڕێوەبەری رەگەزنامە، ئەویش
زەنگێکی لێداو پۆلیسێك یەك دوو ژووری پێ کردم و بە نیو سەعات
پەنجە مۆریان پێکردم و پێناسەکەیان داوە دەستم و تەواو.

ئێوارە هاشم هاتە لام لە ئوتێل‌و پیاسەمان دەکرد، جحێڵ‌و هەرزەکار بووین زمانی عەرەبیمان باش دەزانی، هاشم گوتی وەرە با ئەو پیاوە بە ساڵە چووە تورە بکەین، ئەو پیاوە پیرە لە دوکانەکەیدا کە کەلوپەلی ئاسن‌و ماسی ریز کرد بوو واتە (معدات) سەفتەیەك دینار ونیو دینارو روبعی لە دەست بوو دەیژمارد، هاشم پێی گوت (بلاٰ عندك پاكێت گریڤن؟) واتە جگەرەی گرێڤنت هەیە؟ پیاوەکە دەمارەکانی نێو چەوانی گرژ بوون، پارەکانی خستەوە بار یەك‌و ژمارەکەی لێ تێکچوو گوتی (ولك كلب أبن... متشوف ئەی شی ابیع) واتە سەی کوری... تۆ نابینی من چ دەفرۆشم) جا لێنەگەڕاین قسەی زیاتر بکات بە پێکەنین‌و تریقانەوە دەست وبرد رۆیشتین لە دوای ئێمەدا دیار بوو هەر بۆڵە بۆڵی بوو.

جا زۆربەی ئوتێلەکانی شەقامی رەشید لەو ساڵانەی ئاماژەم پێکردووە، کوردانی هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستانی عیراق لەو ئوتێلانە دادەبەزین‌و زۆربەیان بە جلی کوردییەوە دەبیندران‌و کورد زۆر بە رێزو بە چاوی خۆشەویستییەوە سەیر دەکرا لە لایەن خەڵکانی بەغدا عەرەب‌و بە تایبەتی کوردانی فەیلی، ئەو کوردە بە جلی کوردییەوە کە زۆربەیان فایلێکی لە بن کەوشی بووو سواری ئامانەی ژمارە چوار دەبوو بۆ بەتاوین‌و بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامەی عیراق‌و بۆ وەدەستهێنانی ڕەگەزنامە، وەك بۆیان گێڕاومەتەوە لە ١٩٥٨ کە شۆڕش یان بڵێین کۆدەتای ١٤/ی گەلاٰویژ سەرکەوت خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە پەیدا بوو لە شەقامی رەشید، چاویان دەگێڕا کوردێك ببیننەوە بە جلی کوردی‌و جەمەدانی لەسەر بێ تا هەڵیبڕن لە ناو جەماوەردا (هوتاف) بە کوردی لێدا، جا لە پڕ یەکێکیان دەستکەوت‌و هەڵیانبڕی کە ڕانکوچۆغەیەکی لەبەر بوو لەسەر شانیان دانا، کابرای کوردە هاواری کرد

(له ڕێیی خوا أنا سیٚ جار عەمەلیات) بە (هوتاف) تیگەیشتبوون وەلاٚمیان (یعیش.. یعیش) کابرای کوردە هاواری کرد (خزمە هەر پێلاٚوەکەم هەڵگرمەوە) وەلاٚمەکانیان (یعیش – یعیش)

***

وەك لە ئەلقەی پێشوودا ئاماژەم پێکردووە، ئەمەیش پانۆڕامەیەکە چۆن ڕژێمەکان و دەسەلاٚتدارانیان کۆدەتای سەربازی و سیاسی، یەك بە دوای یەکدا هاتوون، ئێمەی نەوە و گەنجانی ژیاوی ئەو سەردەمانە چۆن لە ژیانی کۆڵەمەرگی و نائارامیدا تەمەنمان بە فیڕۆ چووە بە تایبەتی ئێمەی کورد، ژیان لە ناو عیراقێکی پڕ لە کێشەو مەزهەبگەرایی و چەندین نەتەوەو کەمایەتی بە نەبوونی مافی نەتەوایەتیی و ئازادی پێویست و زەبرو زەنگی یەك لە دوای یەکەکانی دەکتاتۆرییەتی ڕژێمەکان و بە قەبوڵ نەکردنی یەکترو بوونی چەوساندنەوەو نادادپەروەری، زۆری ژمارەی زیندان و گوڕستانەکان و شەهیدان و ونبووان، هەژاری و دەمکوتکردن و ئەشکنجەو وێرانی، کەمم وتووە ئێوە زۆرتریش دەزانن، واتە لە نێو ئەم وەزعانەدا ژیاوین، دەرفەتیش تێپەڕیوەو ناگەڕێتەوە، بەهارێکی کورت و لا لوت بوونی نێرگزو پوکانەوەی وەك (مارك ئورل) دەڵێت: (گوڵ کاتیٚ هەست بە بۆنی خۆی دەکات کە بولبول لەسەری بخوێنیٚ) کەچی بولبولەکانی ئێمەیان هەڵفڕاند، تازە بە درەنگ کات، چۆن دەگەڕێنەوە.. ڕاستە وەك (ڤۆلتیر) دەڵێت: (ئەگەر لەبەرامبەر پێشهاتە خراپەکان دڵتەنگ و دەستەو ئەژنۆ دانیشیت، مانای وایە کەسێکی لاوازی) وەنەبیٚ بەندە وەك کەسێك خۆم لاواز نیشان دابیٚ، چونکە شانازی بەوە دەکەم هەموو ژیانم بە خانەوادەکەمەوە لە تێکۆشان و بەرگری و خۆڕاگری بوونە هەمیشە دژ بە دژە بای وەشتی ڕووداوەکان وەستاوین، بەلاٚم بە شێوە

گشتییەکە وا بووە، دەنا ڕاهاتووین لەگەڵ شێلانی قوڕە خەستەکە، وەك برای نووسەر حەمە کەریم عارف دەڵێت (ئێمە وەك شووشە واین، کەی شکاین، تیژتر دەبین) بەڵێ بە درێژایی مێژووی کورد هەر لە شەڕی چاڵدیرانەوە (١٥١٤) وە تا ئێستا زۆر هەڵسانەوەو سەرکەوتنمان بینیوە بۆ ماوەیەك بە دەسەلاتو ئازاد بووینە، پاشانیش نسکۆو شکستو کەوتن، کەم پێکەنینو زۆر گریانمان هەبووە، هەر وەك (خەیام) دەڵێت (بولبول وتی بە زبانی حاڵ.. ڕۆژێ پێکەنین ساڵێ گریان) جا وەك پانۆڕامەیەك ئەو سەردەمانەی بە سەرماندا تێپەڕیوەو بینیومانەو بیستوومانە دەخەینە ڕوو.

١ - سەردەمی دەسەلاتدارێتیی مەلەکی - پادشاێتیی:

تەمەنم هەشت ساڵان بوو، لە پۆلی سێیی سەرەتایی لە قوتابخانەی (نەهزە) قوتابی بووم لە (١٩٥٨)دا کە ئێستایش قوتابخانەکە ماوە، لا دیوارێکی دەکەوێتە سەر فولکەی بە تەمای خوا، ناوی فولکەکە وا ڕۆیشتووە، هەروەها لەسەرەتای ئەم فولکەوە جادەکەی درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە بنایەی پاریزگای ئێستا، جا لە مانگی نیسانی ١٩٥٨، مەلیك فەیسەلی دووەم هاتە هەولێرو ئێمەی قوتابیان بە ڕیز ڕیز کراین لەبەر دەرگای قوتابخانەکەمان، پێش نیوەڕۆ بوو کەژاوەی مەلیك فەیسەڵ بە بەر دەممان تێپەڕ بوو.

لەبەرئەوەی لە ئەلقەکانی پێشوو بە دوورو درێژی باسم کردووە نامەوێ جارێکی دی بگەڕێمەوە سەری.. چەند مانگێکی پێنەچوو شۆڕشی ١٤ /ی گەلاوێژ بە سەرۆکاییێتیی زەعیم عەبدولکریم قاسم ئەنجام دراو ڕژێمی پادشایەتی تەفرو تونا بوو، لەسەردەمی پادشایەتی تەمەنەکەم وا بووە هەستم بە باری سیاسیو نەتەوایەتیو ئابووری ئەو

جۆره وەزعانە نەکردووه وەك پێویست چونکە تەمەنەکەم بە دوور بووە لە هەستپێکردنی ئەو مەسەلانە، بەلاّم دەزانم کە خەڵکی بە هەژاریو نەداریو سادەییو ساکاری دەژیان، هەولێر لەو قۆناغو سەردەمەدا ئەو گەڕەکانەی لە خۆ دەگرت (قەلاّت) کە نیشتەجێبووانی پێك هاتبوون لە ئاغاکانی هەولێری، گوندو زەویو زاریان هەبوو لە دەشتی هەولێر لە ڕێگای جوتیارو سەرکارەکانیان بەربوومو بەرهەم هێنانی کشتوکاڵیو ئاژەڵداریان بۆ دەستەبەر دەکردن، هەروەها کەسایەتیو پیاوانی ئاینی ناودارو چەلەبیو ئەفەندیو بازرگانو پیشەوەرانی قەیسەریو بازاڕ لەو نێو ئەو قەلاّتەدا نیشتەجێ بوون، زۆربەیان وەك تایبەتمەندیەکی جێماوی سەردەمی عوسمانی بە تورکی قسەیان دەکرد چونکە لەو سەردەمدا ئەوەی بەو زمانە قسەی دەکرد گوایە ئەسڵی ڕەسەنی دانیشتوانی هەولێرەو کارەکانی لە داموو دەزگاکانی حوکمەتو دایرەکان بە چاکی دەڕۆیشت، دیارە کۆڵەگەی مانی میللەت بە زمانەوەیە کە بمینێ، بۆیە عوسمانییەکان هەوڵیان داوە خەڵکی ئەم شارە بە تورکی قسە بکەنو هاندانی لە پشتەوە بووە، لەو سەردەمدا حوکمی مەلەکی پادشاییی زۆرتر بایەخی بە چینی فێۆداڵ (ئاغاو بەگو چەلەبیو میرو شێخی عەشیرەتو پیاوانی ئاینیو دەرویشو شێخو تەکیەو حوجرەی مەلایانو مزگەوتی داوە... هتد)

هەولێر چەند گەڕەکێکی سەرەکی لە خۆ دەگرت وەك گەڕەکی (عارەبان - تیراوە - تەعجیل - سعدوناوە - سێتاقان - سیداوە) هەروەها لە دەوروبەریدا عێنکاوەو باداوەو قوشتەپە.. هتد) لەو سەردەمدا کەس تەلەفزیۆنی نەبوو، تەنیا ڕادیۆ - قەوان (گرامافۆن) دواتر تسجیل بە بەکرەی شریت، تەنیا ماڵە خواپێداوەکانو مام ناوەندەکان هەیان بوو نەك

کرێکارو هەژاران‌و نەداران، یەك سینەما هەبوو بە ناوی سینەمای (حمرا) بە ساڵاچووان دەگێڕنەوە لە (١٩٤٦) دامەزراوە، یەکەم فیلمی مسری بووە بە ناوی (السلامە)، وەرزش هەبوو وەك تۆپ تۆپێن‌و پاڵوانانی وەرزشی قورس لەش جوانان‌و نمایشی ساڵانەی قوتابخانەکان، بە شێوەیەکی گشتی دواکەوتن‌و هەژاری‌و نەخوێندەواری‌و هاندانی کۆنەپەرستان لە لایەن دەسەڵاتدارانەوەو کەمی‌و زەحمەتی ڕێگاو بانەکان‌و کوشتنی ڕۆحی نەتەوایێتیی، بەڵام ژیان‌و ئارامییەك هەبوو، پارە تا ئەو ئاستە کەم بوو، خۆراك‌و کەل‌و پەل، ئالوگۆڕ دەکرا، بۆ نموونە لە ناوچەی خۆشناوەتی دۆشاوو گوێزو مێوژیانی دەهێناو لە دەشتی هەولێر بە گەنم‌و نیسك نۆك‌و ئەو جۆرە شتانە ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرد کاتێ خزمەکانمان لە گوندەکانەوە دەهاتنە ماڵی ئێمە بە مێوانی کە لە گەڕەکی عارەبان بووین‌و چەقی شار بوو نزیك بازاڕ، زیاتر حەزیان لە کەباب بوو، دایکم ڕەوانشاد قاپێکی فافۆنی دەدایە دەستم دەچوومە بازاڕی ناو نەجاران، کەبابخانەی نەجار ئێستاش ماوە، کوڕو نەوەکانیان بەڕێوەی دەبەن، ئەوەی شایانی باسە کەباب دانەی بە (١٠) فلوس بوو، واتە ئەوەندە پارە کەم وبەقیمەت بوو.

(٣)

وەك لە پێشدا باسم كرد، میللەتی كورد لە ئەنجامی شەڕو كێشەو ململانێی و كۆدەتا سەربازییەكان و گۆڕنكارییەكان و نادادپەروەری ڕژێمەكان و ترس و ڕاڕایی و كوشتارو گرتن و ڕاوەدوونان و گوشارو شەڕەكان وەك ئیسفەنج تەڕاتی گەنجییەتی ئێمەی هەڵمژیوە، مرۆڤ بۆ ئەوە دروست نەبووە بەو شێوەیە بژی، دروست بووە ژیان بكات، ژیانیش بە خێرایی دەڕوات و بە دوایدا ڕا دەكەین و نایگەینێ، چ لە كەمانێك بكەم تەلەكانی پسا بێ، (واین دایەر) دەڵێت (ڕابردوو لە دەست هەموومان دەرچووە، ئایندەش بەڵێنی پێمان داوە، هەموومان لەم چركە ساتەدا دەژین) - تەمەنم هەشت ساڵان بوو، لەبەرە بەیانییەكی زوو لە ناو ماڵی ئێمەدا بووە ژاوە ژاوو چپە چپ، چی بووە؟ باوكم و برا گەورەكەم و مامم كە لە یەك خانوو دەژیان، بە دەنگ هاتن و هەڵسن هەڵسن قەوما، هەموومان بە چاوی خەواڵوەوە، چی بووە، باوكم وتی بێدەنگ بن وا بەیانی ژمارە (١) دەخوێنێتەوە، ئینقلاب كراوە، واتە شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ ١٩٥٨، ئەو كات لە ڕادیۆ خوێندرایەوە چونكە تەلەفزیۆن و ئامێری ئەلكترۆنیات و ئەو جۆرە شتانە نەبوو، دواتر بەیانامەكە لایەن عبدوالسلام عارف دەخوێندرایەوەو چەند جاریش دوو پات دەكرایەوە، جا شۆڕش یان كۆدەتایەكی سەربازی بە سەر دەسەڵاتداریەتی مەلەكی و پادشایی بە سەرۆكایەتی زەعیم عەبدولكەریمقاسم ئەنجام دراو

سەرکەوت، سەردەمی کۆماری (جمهوری) ڕاگەیاندرا، ڕۆژی یەکەم سەرەتا بۆ ماوەی ڕۆژو شەوێك قەدەغەی هاتو چۆ ڕاگەیاندرا (منع التجول) ئیتر پاش هەڵسانی منع التجول جەماوەرێکی زۆری هەولێر ڕژانە سەر جادەکان‌و بە تایبەتی لە گۆڕەپانی پێش موتەسەرفییە کە بەرامبەر پارێزگای ئێستا بوو، چەند ڕۆژێك دەهۆڵ دەکوتراو فقیەی زوڕنا نەدەپسایەوەو ئاهەنگ‌و شایی‌و خۆشیەك هەبوو زیاتر چینی کرێکارو جوتیارو پیشەکاران‌و زۆربەی جەماوەر پێیی دڵخۆش بوون، تەنیا چینی دەرەبەگ‌و خوا پێداوەکان نەبێ کە سیاسەتی تازەی کۆماری لەبەرژەوەندی ئەوان نەبووو تیایدا زەرمەندو ڕیسوا دەبوون، ئەو کات حزبی شیوعی ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە جموجۆڵ‌و ئاهەنگیران، بەندە بەو پێییەی کە ماڵەکەمان نزیك بوو لە گۆڕپانی ئاهەنگەکان‌و تەمەنەکەشم وا بوو بەردەوام لە نێو ئاپۆڕەی ئاهەنگەکاندا بووم، بێ ئەوەی هیچیش لە بارەی سیاسەتەوە بزانم، ئیتر دوای ئەو شۆڕشە خەڵکی هەستیان بە ئارامی‌و سەرفرازییەك دەکرد بە تایبەتی دوای ئەوەی چەند گۆڕانکاریەك‌و مژدەی خۆش ڕادەگەیاندرا بۆ بەرژەوەندی زۆربەی چین‌و توێژە هەژارو چەوساوەکان بوو کە تیایدا سودمەند دەبوون (ئەوەی لە یادم ماوەو بینیوومە)

١ - گۆڕەپانێك بە ناوی فولکەی زعیم کە پەیکەری زەعیم عەبدولکەریم قاسمی لێ دانرا لەو شوێنە کە ئێستا بووە بە پرد لە نزیك سەندیکای ئەندازیارانی ئێستا، زۆر هەن ئێستایش بۆ ناونیشان دەڵێن، فلان شوێن لە نزیك فولکەی زەعیمە.

٢ - لە گۆڕەپانێکدا، ئەو فولکەیەی ئێستا بەرامبەر بە ئوتێلی شیراتۆنە لە هەولێر، نافورەیەك دروست کرا، کە بە (ئاوی کەسك‌و سۆر) ناوی

ڕۆیشتبوو، لەبەرئەوەی خەڵکی ئەو شارە، بە تایبەتی لە شەوانی هاوینان پۆل پۆل بە ژن و منداڵ و خاوخێزانەکان بە گەورەو بچووك لە دەوری ئەو نافوورەیە کۆ دەبوونەوە پێیان جوان بوو ئاوەکان ڕەنگاو ڕەنگ دەبووو ڕووەو ئاسمان بەرزو نەوی دەبۆوە، زۆربەی خەڵکەکە سادەو هەژارو ساکار بوون، بۆ نموونە ئێستایش وەك ئاماژەو ناونیشان نەوەی ئەوسا کە بڵێیت هۆڵی میدیا لە کوێیە؟ پێت دەڵێن لە نزیك ئاوی کەسك و سۆری جارانە.

٣ – هەر لە دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژدا، خەستەخانەی کۆماری (جمهوری) دروست کرا کە پێشتر لە هەولێر یەك خەستەخانەی بچووکی چەند قەروێلەیی هەبوو بەرامبەر سینەما سەلاحدین کە ئێستا ئەو سینەمایە رووخاوەو نەماوە.

٤ – یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرکرا کە زەوی و زار بە سەر جوتیاران دابەش کراو بەو بارەدا کەوتەوە ئاغاو خاوەن موڵك و دەربەگەکان تیایدا لە زەوی و زارەکانیان بێبەش کران و بە سەر جوتیاران دابەش کرا یەکسانییەك ڕەخسا.

٥ – بەیاننامەی لێبووردن بۆ گیراوە سیاسیەکان دەرچوو ئەوانەی لەسەردەمی پادشایەتی حوکم درا بوون، لە زمانی باوکمەوە دەمبیست کە (شێخ ئەحمەدی بارزانی) یەکێك بووە لەوانەی لە بەندیخانە ئازاد کراوەو خەڵك پێی دڵخۆش بوونەو جەماوەرێکی زۆر پێشوازییان لێ کردووە، هەروەها خەڵك و کوردەواری زۆر کەیف خۆش بوونە بە گەڕانەوەی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی و هاوەڵەکانی لە ڕووسیاوە بۆ کوردستان و پێشوازی گەرمی لێکراوە لە لایەن هەموو چین و توێژو جەماوەرەوە.

٦ – لە یادمە هەر لەو ساڵەدا ١٩٥٨ دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ جەماوەرێکی زۆری هەولێر روویان لە یاریگای هەولێر کرد کە کۆپتەرێك لەو یاریگایە نیشتەوەو دواتر زانیمان کە (عبدالسلام عارف) هاتووەو لەو یاریگایە وتارێکی بۆ جەماوەری ئامادە بووان خوێندۆتەوە، دواتر کاتێ عبدالسلام عارف گەیشتە بەر دەرگای مەزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ من لەوێ لە نێو ئاپۆڕەی خەڵکەکە وەستا بووم و بە چاوی خۆم بینیم چۆن عبدالسلام بە سەر پەیژەکان کەوت و کۆمەڵێك لە کەسایەتییەکان و کاربەدەستانی حکومەت و کەسە دیارەکانی هەولێر پێشوازیان لێ کرد، لەوانەی کە دەمناسی لە پێشوازیدا بوون خوالێخۆشبوو قازی ڕەشاد موفتی، جەماوەریش بە ناوی برایەتی کوردو عەرەبەوە هوتافیان دەکێشا.

٧ – هەروەها لە دەستکەوتاکانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ، مەلایەکان، کە لە مزگەوتەکان شەهادەی دوانزە علمی ئاینیان وەدەست هێنا بوو، بڕیاریان بۆ دەرچوو، بوون بە مامۆستای ئاینی لە قوتابخانەکان وانەی ئاینی و قواعیدی عەرەبی بڵێنەوە هاوتای مامۆستایانی دەرچووی دار المعلمین و پەیمانگاو کۆلێژەکان بە پێی ئاستی زانایيان کە هەندێکیان لە زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە – میسر، شهادەیان وەدەست هێنا بوو،

ئەم بڕیارەش مەبەستێکی لە پشتدا بوو کە وڵات زیاتر بەرەو علمانیەت بەرن.ئەمەو نوکتەیەکی بیر هێنامەوە (لە خۆیەتی پەروەردەی هەولێر دوای ئەوەی مەلایەك دەچێتە لای فەرمانبەرەکەی بۆ تەواو کردنی مامەلەی دامەزراندنی، فەرمانبەرەکە دۆسیەکەی تەماشا دەکات و پێی دەڵێت هەمووی تەواوە تەنیا ماوە شەهادە بێنی، مەلاکەش دەڵێت (اشهد ان لا الە الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) فەرمانبەرەکە پێدەکەنێ و دەڵێت مامۆستا من شەهادەی بڕوانامەی ئاینیم دەوێ، خۆ کافر ئیسلام ناکەم.

(٤)

- (مرۆڤـ) كـه بـه تەمەنـدا تێدەپـەڕێت وەك ئـەوە وايـە بـە فـلاش بـاك بگەڕێتـەوە سـەردەمی هـەڕەتی گـەنجیو باسـی ئەوسـای خـۆیو خێـزانو كۆمەڵگاكەی بكاتو لەگـەڵ ئێسـتايدا بـەراوردی بكـات كـە جياوازييەكـەی ڕۆژانـی بـژێویو ژيانكردنەكـەی بـە پانتـايی مـەوداو زەمەنـە فرەوانەكـەی لەگـــەڵ ئـــەو تەمەنـــەی ئێســـتايدا ڕادە بـــەدەرە، هەڵبەتـــە ئـــاخو ئـــۆف هەڵكێشـانێكی زۆری بـە بەرەوەيـە هـەر لـە نهێنييـە ناوپۆشـراوەكانیو كـردەوەو كارەكـانی كـە لـە هەنـدێكيان ئارەقـەی زەردی شـەرمەزاری دەردەدات، لـە هەنـدێكيان پەنجـەی پەشـيمانی دەگـەزێتو بـەڵام بـای ئەوەشی هەيە كە شانازی پێوە بكاتو بيگێڕێتەوە چ بە نووسين يان قسـە كـردن لەسـەر بيرەوەرييـەكانی هـەر چـەندە ئـەو ڕاسـتيەش دەزانم وەك (پەرمۆدا يەترا) دەڵێت: (گەر درەنگ گەيشتيە وێستگە ناتوانی شكات لـە كەسێ بكەيت كەوا بۆچی شەمەدەفەر بە بێ تۆ ڕۆيشت)

لە دوای هەڵگيرسانی شۆڕشـی ئـەيلول / ١٩٦١ تـاكو ١٩٦٣ ئەگـەر وەك قۆناغێكی تر باسی بكەم، لەو قۆناغەدا گۆڕانو ڕووداوی زۆری بـە بـەرەوە بوو، لەوانە (بەهێز بوونی ڕۆحی نەتەوايـەتیو يـەكبوونو دروسـتبوونی متمانـەو بـە دەنگـەوە چـوونی هـەموو چـينو توێـژەكانی نـاو شـارو دەرەوەیو هاوسـۆزی بـۆ شـۆڕشـی كـورد، لـەو سـەردەمدا تـەنيا پـارتی ديموكراتی كوردستان پێشڕەوايەتی دەكرد بە سەرۆكايەتی بارزانی نەمر،

لەسەرەتای دروستبوونی هێزی چەکداری و پێشمەرگەی کوردستان هەموو میللەت و عەشایرو کەسایەتییەکان و حزب ڕۆڵیان هەبوو، لەو نێوەندەشدا بنکەکانی پۆلیس و پۆلیسەکانی کورد کە لە هەموو شارو شارۆچکەکان بە چەك و تفاق و زەخیرەی زۆرەوە چوونە نێو ڕیزی شۆڕش، هەروەها ڕێکخستنەکانی پارتی و یەکێتی قوتانیانی کوردستان و نشتمانپەروەرانی کورد، ڕۆڵی بێ وێنەیان دەدی و کارا بوون بۆ پەیوەندی کردن بە هێزی پێشمەرگەو بڵاوکردنەوەی ڕۆحی نەتەوایەتی و کۆکردنەوەی پیتاك وخۆراك ونوین و پێداویستی و یارمەتی و ڕەوانەکردنی بۆ نێو شۆڕش و پاڵپشت کردنی پێشمەرگە، لەو ماوەیەدا کوردایەتی وا بەهێزو بتەو ببوو تا ئەو ئاستەی کە منداڵەکانیان تازە دەهاتە سەر دنیاوە ناوی کوردیان لێ دەنا، یان ئەوانەی لەو هەولێرە کە قسە کردن ببوو بە تایبەتمەندێکی ئەو شارە بە زمانی تورکی قسە دەکرا، ڕۆژانە بەیانی باش و ڕۆژ باش دەستپێك بوو، وردە وردە بە تێپەڕ بوونی زەمەن و بەردەوامی شۆڕش و بەشدار بوونی ڕۆڵەکانیان قسە کردن بە کوردی بە فرەوانی جێگیر بووو قسە کردن بە تورکی تا ڕادەیەکی زۆر بەرەو نەمان چوو، هەروەها نووسەرو شاعیرو هونەرمەندان بە شیعرو نووسین و گۆرانی و سروودەکانیان گیانی بەرخودان و پێداگرییان دەوڕوژاند، لەو سەردەمدا بە تایبەتی ڕادیۆ (ئێرە دەنگی کوردستانی عیراقە) ڕۆڵی سەرەکی هەبوو، کورەی شۆڕش و بەرگری جۆش دەدا، کە شەو دادەهات لە زۆربەی هەرە زۆری ماڵەکان بە نهێنی لە ڕادیۆدا گوێیان بۆ دەنگوباسەکانی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق قولاغ دەبوون، بەڵام مۆسقایەکی قێزەوەنی دەنگ گەورەی ڕژێم (هانی هانی) مێشکی گوێگرانی ئاڵۆز دەکرد، پەرۆشی خەڵکەکە بۆ بیستنی چالاکییەکانی

پێشمەرگەو دەنگوباسی نێو شۆڕش نەترەی گوێگرتنیانی پێ بەرنەدەدان.

شۆڕشی ئەیلول هۆکارێك بوو کە گیانی نەتەوایەتی لە دڵو دەروونی کورد هێندە بەهێز بکات بە تایبەتی لەو سەردەمدا تاکە حزب پارتی بوو رۆڵی سەرەکی هەبوو لە شۆڕشدا بۆیە جگە لە کەسانی بێ لایەن، لە حزبو بەرەی تریش بە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر، رۆژ بە رۆژ دەهاتنە نێو ریزەکانی پارتیو شۆڕش، بۆ نموونە لە ماڵی ئێمە برای لە خۆم گەورەتر بە هەشت ساڵ لەگەڵ مامێکم کە لە هەمان خانوودا بوون، هەردووکیان لە رێکخستنەکانی حزبی شیوعیدا بوون، وازیان لەو حزبە هێناو چوونە ریزەکانی پارتی لەبەرئەوەی کاریگەری شۆڕشی ئەیلولو کوردایەتیو چالاکییەکانی پێشمەرگەو رۆژگارەکە کاری تێکردن هەر بەو شێوەیە بۆ گشت. لە گەڕەکی عارەبان بووین، زۆربەی ماڵەکان سەربانیان پێکەوە نووسا بووو چەندین حەساری تیا بوو، زۆربەی کەسەکان لە یەکتر ئاشکرا بوون کێ کوردایەتی دەکاو کێ سیخوڕە، بەڵام متمانەو رەسەنایەتی خەڵکانی لەو سەردەمدا وا بوو کە خۆشەویستیو لێك نەترازانو گوێنەدانە بەرژەوەندییە تایبەتییەکان کەس زیانی بە ئەوەی تر نەدەگەیاند.

رۆژێك باوکم زۆر دڵخۆش بوو، گوتمان دیارە هەواڵێکی خۆشت بیستووە، گوتی وایە بەڵام باسی نەکەن، دوێنێ پێشمەرگە دەستی بە سەر موچەیەکی زۆر داگرتووە لە مابەینی هەولێرو کۆیەدا، زەمەن تێپەڕی لە ساڵی هەشتاو سێ لە سورداش داوەتی مام جەلال بووین لە نێوەندی وتەکانیدا گوتی دەستمان بە سەر موچەی کۆیە داگرتوو بوو مەئموری خەزینە فەردەی پارەیان بە پشت دادابوو بە سەر شاخ دەکەوت، لە

پشتەوەیدا پێشمەرگەیەك خۆی لێ تووڕە كردووە پاڵی پێوە ناوەو پێی گوتووە، ئێ دەبڕۆ، مەئمورەكەش پێی وتووە (بۆ خۆت لێم تووڕە دەكەیت.. كەمم هێناوە، درەنگ هاتوومە؟)

دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، ڕژێمی ئەوسا دەستی كرد بە گرتنی تێكۆشەران بۆ بەندیخانەكانی بەسڕاو خوارووی عیراق ڕەوانەی دەكردن، هەروەها پۆلیس و سەربازانی كورد بە هەمان شێوە بۆ خوارووی عیراق دەگواستەوەو لە كوردستانی نەدەهێشتن، لە شوێن ئەوانە پۆلیس و سەربازی عەرەبی دەهێنایە كوردستان، لە هەولێریش بە تایبەتی لەو گەڕەكەی عارەبان بە خاوخێزانەوە خانوویان بەكرێ دەگرت بە تایبەتی ئەو گەڕەكە جگە لەوەی سەنتەری شار بوو لە بنكەی پۆلیسی هەولێرو ئۆردوو واتە سەربازگەی هەولێر نزیك بوو، ئێمەش كە ماڵمان لەو گەڕەكە بوو بە بینینی ئەو وەزعانە ڕۆحی كوردایەتیمان ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەسەند، زۆر جاران كە لەسەر جادەی موزەفرییەو باتا پێشمەرگەی ناوخۆ چالاكیكی ئەنجام دەدا بە كوشتنی خۆفرۆش و سیخوریك، ئەنجامدەر بە خۆو دەمانچەی دەستییەوە ڕای دەكردە نێو گەڕەگەكەی عارەبان و دواتر بە پرە پرو تەنگە نەفسییەوە چەكدارانی ڕژێم لە ئێمەی گەنجان و هەتا لە ژن و منداڵانی گەڕەكیان دەپرسی ئەو بكوژە بۆ كام لای ڕۆیی، ئێمە دەستخەرۆمان دەكردن ڕێگاو كۆڵانە پێچاو پێچە پێچەوانەكەیمان نیشان دەدان. لە نێو شاخ و تەلان و گردو زورگەكانیش هەتا لە دەشتەكانی دەرەوەی شاردا شەڕ هەبوو.. هەروەها چالاكییەكانی پارتیزانی پێشمەرگە دەنگوباسەكانیان گەرم و گوڕ بوو، ئەو كوردەی دڵسۆز بوو بۆ كوردایەتی لە حاڵەتی ڕاڕایی و نائارامی و چاوەڕوانیدا بوو، دیارە كاریگەری شەڕەكان لە ناو شارەكانیشدا بەوە دادەشكایەوە كە

ڕژێم و دەستە و دایرەی خەفیە و هەواڵگری و سیخوڕەکانیان هەڵدەستان بە کـاری گـرتن و ڕاوەدونـان و پشـکنین و لەسـەر جادەکـانیش داواکردنـی ناسنامە و گومـانی زۆرو توندوتیـژیش لـە خـاڵی بازگـەکانی نێـوان شـارو شارۆچکەکان کارا بوون.

(٥)

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو شۆڕشێك وەرچەرخان و پێشکەوتنێکی پلە بە پلەی بەرەو گۆڕانکاری و چوونە پێشەوەی بە بەرەوەیە لە هەموو ڕوویێکی شارستانی و کەلتووری و هونەری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و بەهێز بوونی ڕۆحی نەتەوایەتیی و بەر فرەوانی مێشکی کەسانی نێو کۆمەڵگا بە تایبەتی کە باس لە شۆڕشێکی نەتەوایەتی دەکەم کە بەرپا بوونی شۆڕشی ئەیلول بوو لە باشووری کوردستاندا، ئەگەرچی شۆڕشێکی چەکداریش بوو بەڵام پەیتا پەیتا کاریگەری بە دیار دەکەوت دەنا ئەگەر بۆ نەوەی دوای خۆم هەندێك لە بژێوی و ژیانکردنی خۆم باس بکەم هەر لە پەنجاکان و شەستەکان تا کۆتایی هەفتاکانیش لە ڕووی کۆمەڵایەتی و شارستانیەتییەوە ئاوا ژیانمان کردووە بەو ئامێرو کەرستەو وەزعانەی تر بۆ نموونە:

١ – لە خانوویێك دەژیان سێ ژوورو هەیوانێکی هەبوو ماڵی ئێمەو مامم و برایەکی کەم ئەندامامان هەبوو، ئا لەو کاتانەی کە هەستم بە خۆم کرد بوو ئەو برایەم ناوی جەبار بوو مشلول بوو هەر لە ماڵ بوو زۆر سۆزدار بوون بەرامبەری هەرچی خواردن و میوەو شکۆلاتەو شتێکیان بدابووایە ئاماژەی بۆ من دەکرد بە نهێنی و ئاشکرا بووایە بەشێکی دەدایە من و زۆر خدووی ببووم و خۆشم دەویست بە داخەوە ماڵە خزمێکمان لە گوندەوە هاتبوون بۆ لای پزیشك یان بڵێم لای نوژدار لەبەرئەوەی کوڕەکەیان تووشی کۆخەڕەشە ببوو، شەو لە لای ئێمە لە ماڵەوەمان

خەوتن ئەو برایەم جەبار تووشی هەمان نەخۆشی بوو بە توندی گرتی و تا بووە هۆی وەفات و کۆچی ئەبەدی، تا ئێستا ئەو کۆچەی لە دڵم دەرناچێ چونکە لەو تەمەنەمدا کاریگەری بۆ جێهێشتم، هەروا جەلال برای گەورەم گەنج بووو تازە بە فەرمانبەر لە دادگای هەولێر دامەزرا بوو، جگە لە دایکم و باوکم و داپیرەم، ماڵی مامم بە خۆو ژن و دوو منداڵی ساوایان هەبوو هەمووومان لەو خانووە دەژیاین لە گەڕەکی عارەبان، ئەوەی شیاوی وتنە داپیرەم کە ناوی فاتمە بوو ئەگەرچی ناوی دایکیشم هەر فاتمە بوو، بەڵام داپیرەم ڕێژەی پیاوەتی زۆر بوو زیاتر لە ڕێژەی ژنایەتی، لەگەڵ جلی کوردی کە پۆشیبووی هیزاری لەسەری دەبەستا و زۆربەی ئیش وکاری ماڵەوەمانی ڕادەپەڕاند، ئەگەر بە زستانان تەقەو ڕەقەیەك بهاتبووایە بەو پێیەی دز هەبوون ئەو سات، ئەوە بواری کەسی نەدەدا دەستی دەدایە خەنجەر رای دەکردە دەرەوە بە دەم دەنگەکەوەو یان دەچووە سەربان و دەگەڕایەوە دەیگوت هیچ نییە، هێندە منی خۆش دەویست، ڕۆژێکیان باوکم دەچووە موصل و منیش هەراش بووم زۆر هەوڵم دا لەگەڵ خۆیدا بمبات، نەیبردم، دەستم بە گریان کرد، ئەو داپیرەم ژیری کردمەوە گوتی خەمت نەبێ هەر ئێستا من دەتبەم، هەڵسە جلت بگۆڕە، چووینە لای چایخانەی بایز کە ناوەکەی دیارە لە هەولێر لەوێ پەست و قەمەرە دەوەستا و دەڕۆیشت بۆ موصل، سواری قەمەرە بووین و گەیشتینە موصل تا ئێوارە لە بازاڕو زیارەتی نبی یونس و چوینە عەینکربیت و زۆر شوێن، منی گەڕاند و کاتی مەغریب چوینە گەراجی هەولێرو گەڕاینەوە ماڵ، بە باوکمی گوت کوڕەکەمت نەبرد بۆ موصل، خۆ من نەمردوومەو هەم، ڕەوان شاد ئەو داپیرەیەم هەموو ساڵان دوو کاوڕی لەو هەیوانەی ماڵەکەمان بە خێوی دەکرد کە ئەو دابەستیانە دەڕسکان و

قەڵەو دەبوون، ئینجا لە چڵەی زستاندا سەریان دەبڕیو گۆشتەکەی دەکردە قاورمەو باسمەو دونگەکانی دەتاواندەوە لەگەڵ قاورمەکە دەیکردە نێو گۆسکەو وردە وردە لێمان دەخوارد، جگە لەوەش بەردەوام چێڵێکی شیرداری بە خێو دەکرد لە نێو هەمان هەیوانی دوودەری لەو خانووەدا، شەوانە شیرەکەی هەوێن دەکردو لە بن (سەوەشیر)ی دایدەنا بە تایبەتی ئەگەر هاوین بووایە لە حەوشەکەمانو بەیانیان کە سەوەشیری هەڵدەداوەو سەری مەنجە ماستەکە سەرتوویەکی زەردیلەی هەبوو بە کەوچکێك لە دەمی منی دەنا، ئەوجا دەیبردە ژوورەوە، لە زستانێکا کاوڕەکانیان سەر بڕی بوو تاوتوێی گۆشتەکانیان دەکرد، لە پڕ پشیلەیەك پری دایە پارچە گۆشتێكو بە سەر پەیژەکان کەوت، ئەو داپیرەیەم کە چەقۆیەکی گەورەی بە دەستەوە بوو ڕایوەشاندە پشیلەکەو لە تریقەی پشتی داو کەڵەواژ بۆوە ڕۆحی دا، گوتی چۆن لێ دەگەڕێم بە ئاسانی گۆشتم لێ بڕفێنێ، باوکم زۆر سەرکۆنەی کردو پێمان ناخۆش بوو بەڵام داپیرەم ئاوا بوو ئاکاریو پەشیمانیش نەبۆوە لەو گوناهەی کردی، هەر دوو ڕۆژی پێ نەچوو لەسەر هەمان پەیژەکان کەوتە خوارەوەو سێ پەراسووی شکا، ئەو داپیرەیەم ڕەقەڵەو زەعیف سووکەلە بوو وەکو پەلیك سوك سوك هەڵدەسوڕاو هەموو کارێکی ماڵەوەی گرتبووە ئەستۆی خۆی، دوای کۆچ کردنی ڕۆحی شاد بێ، ئەویش کاریگەری زۆری بۆ بەجێهێشتم.

٢ – ژووری خەوتنو میواننو نان خواردن هەر یەك ژووری گەورە بوو، لە کاتی نان خواردن دەبووایە ژنەکان پشت لە پیاوان بکەن نەك ڕوو بە ڕوو دانیشنو نان بخۆن، لەو ژوورەدا دەلاقەی هەبوو بۆ دانانی شووشەواتو کتێبو دەفتەری قوتابخانەو قەندی تەوریزێ کە جار جار

دەهاتــە خــوارو لەســەر تەبەقــەو بــە شەكرشــكێن گڵــۆت گڵــوت دەكــراو دەخرايـە نێـو شـەكردان جگـە لـە راديـۆى بـە ئاليـەرو پـاترى گـەورەى لـە تەكييـەوە دادەنـدرا لـەو دەلاقانـەدا، ژوورەكانمـان بـە كاريتـەى رايـەڵ كـرا بوون ئەگەر مێوانێك لەو خواردنە گەرمەى بەر دەمى پەلەى كردبا لە دەمى خۆى نابا لەبەر گەرمى چيشتەكەو شەرمەكەى رووى لە كاريتەكان دەكـرد دەيژمارد، كە لەو خانووە سەردەمانەى ئێستادا ئـەوەى پێيـى نـاژمێردرى لـەو ساپيتانەدا كاريتەيـە كـە نـەماوە، ئـەو كەرسـتانەيش بە كار دەهات، چـێنى بـۆ دۆو ماسـتاو كـە بـە كـۆتكى داريـن دەخورايـەوە، هەرزارلـەى زەخـيرە هــەبوو بـۆ هــەڵگرتنى دانەويلــەو خــۆراكو پيويســتمەنديەكانى زستانە لە هەبانەو گۆسكو جەرِەدا، ئەوكات بە قاپ دەگوترا هيربار، لـەو خۆراكو كەرستانەى بە كار دەهات لەو سەردەم كە بە يادما دێت ئەوسا رۆنـى راعـى – سـابوونى فۆرمـەليكو سابوونى جـەمالو برنجـى سـوور بـۆ دۆڵمـەو (عەنبـەر بـۆ) بـۆ ئاسـاييەكەى. ئـەو رۆژانـەى كـە مێوانمـان لـە گوندەكانى دەشـتى هـەولێرو كەنديناوەو دەشـتى قـەراج دەهـاتن شـەو لـە لامان دەمانـەوە، من ئـەو ئێوارەيـە زۆر دڵخـۆش دەبووم لەبەرئـەوەى شـەو زۆرم لىٚ دەكردن حەكايـەتم بۆ بێـژن، زۆر شـەوانيش وا رێكدەكەوت مـامم (محەمەد)و براگەورەكـەم (جـەلال) لەگـەڵ هەنـدێك لـە ئامۆزاو خوارزاكـانى بـاوكم كـە جـار جـار دەهــاتن، پۆكــەر يــان بڵـێم قومارِيــان دەكــرد يــان كەرەمســتانىٚ بـۆ شـەو بـە سـەربردن، جـا ئـەو شـەوانە ميـوەو چـەرەزات دەكرا و شەوێكى چێژدار بوو لە شەوە خۆشەكان بۆ من چونكە ئەو زەمـان نە تەلەفزيونو ئايپاتو يارى ئەلكترۆنياتو شتى ئاوا هـەبىٚ پێيـەوە كات بەسەربەرين، لەسەرەتاى شەستەكان بوو، شەوێك ئامۆزايەكى باوكم نـاوى (حەمەد) بوو لە ماڵى ئێمە مێوان بوو لەگـەڵ مـامو جـەلالى برام دەسـتيان

کرد بە یاری پۆکەر، سەعات (٣) شەو بوو بە زریقەو گریان لە خەو هەڵسام گوتیان (حەمەد) ئەمری خوای کرد، ئەو کات زۆر لە بابەتی پاڵپەستۆ (زەخت)و ئەو جۆرە نەخۆشیانە نەدەزاندراو کەس زوو زوو پشکنینی بۆ جەستەی خۆی نەدەکرد لە نەخۆشیەکانی خۆی بگات، تومەز ئەو ئێوارەیە دایکم کوبەی حەلەبی دروست کرد بوو کە لە ئەرمەنییەکانی دراوسێمان فێر ببوو، رەوانشاد حەمەد موختاری گوندی عەلیاوە بوو، پیاوێکی جەربەزەو دنیا دیدە بوو، گوتبووی ئەو کوبەیە زۆر خۆشە، هێندەی خوارد بوو، تا سەعات دوو نەخەوتبوون، ئەوە بوو شەو لە لرخ لرخی گەرووی و خوێن وەستانی و پاڵەپەستۆی خوێن کۆتا بە ژیانی هات، باوکم زۆری خۆش دەویست گوتی ژنەکەم بەو کوبەیەی دروستی کرد بوو ئێوەش بە قومار کردن کۆتایتان بە ژیانی کوڕە مامەکەمتان هێنا، بەو پێیەی ماڵەکەمان لە نێو جەرگەی شارو بازاڕ بوو، زۆر دڵخۆش دەبووین بەو خزمانەی کە لە گوندەوە دەهاتن، جا من کە کوڕە ناوەنجی و سووکەڵەی ماڵ بووم، ئەگەر تەقە لە دەرگەی ماڵەکەمان بهاتبووایە دەبووایە یەك پێ راست بمەوەو دەرگا بکەمەوە، ئای چەند دەگەشامەوە کاتێ دەمدیت خزمەکانی دایکم و باوکمن لە پشت دەرگاوە، هەر زوو ماچیان دەکردم و دەیانگوت (باوە) کوی.. باشی، هەندێ جار هەندێك لەو مێوانانە لا باڵێکی مریشکە قوندەیان بەڕەڵڵا دەکرد بۆ ئەوەی قیڕ قیڕی لێوە بێت تا پێشوازییەکیان بە گەرمتر لێ بکرێت لەگەڵ مەنجەڵە ماستی سەر بە گیا و گوڵ و پونگ داپۆشراو بە دەستەوەیان بوو، یان چەند خۆش بوو ئەو کاتانەی دەستمان دەخستە نێو ئەو کیسە خامە سپییەی کای تیا بووو هێلکەی تیا، یەك یەك دەرمان دەهێنا لە ناو کیسەی (کا) دانرا بوو تا نەشکێن، وای لەو ماستەی مەڕی کە خام و

وگیا و پونگی بەهاری ئەوسامان لەسەری لا دەدا، ئێستاش بۆن و بەرام چیژەکەی لە کەللەم ناڕەوێتەوە

٣ - ئەوەی ئێمە زۆر بێنازو ماندوو بووین ئەگەر پەرژین بیّ وەك مریشکی سەر زبڵدان و خۆڕسك بەراورد لەگەڵ مریشکە خاوخاتوونەکانی دەواجن وا بووین، بۆ نموونە بەندە لە تەمەنی هەشت و نۆ ساڵان بووم، دەبووایە بەیانیان لەگەڵ قوقەی کەڵەشێرو دەنگی بانگی اللە اکبر هەڵسابام لەو خەوە خۆشەی بەیانیان، عارەبانەیەکی گچکەی بۆربەرینیان بۆ کڕیبووم بە غڕەغڕ بە کۆڵان و جادەکان دەکەوم بە تایبەتی لە هاوینان (بەفر - سەهۆڵ)کە پێمان دەگوت (بوز) وشەیەکی تورکی بوو بۆمان مابۆوە لەبەرئەوەی سەهۆڵ دەست نەدەکەوت ئەگەر ئاوا زوو فریای نەوتباین، دەبووایە بچمە دامینی قەڵات نزیك چایخانەی مەچکۆ لەوی بوز بکرم لە لای (عەدیّ یان فەتحی) ناوێك کە تازە دایاندەگرت، بەو بەیانە چۆڵ و سامناکەی نێو گەڕەك منی مێردمنداڵ زۆر جارانیش ترسێك دایدەگرتم، پاشان دەبووایە ریز بگرم بۆ نانی فڕنی لەو گەڕەکەی خۆمان، کە دەهاتمەوە ماڵیش بەقرەجێکی بچکۆڵە واتە سەتڵێکی بچووك دەدرایە دەستم بۆ ئەوەی بچمە خوار ماڵی خۆمان ماڵی مریەمە عارەب کە گامێشەوان بوون، شیرو قەیماغ بهێنم ئەوجا هەموو ماڵ لە خەو هەڵدەستان و نانمان دەخوارد ئەوەش ژیانی ئێمەو بە بەراورد لەگەڵ میردمناڵ و گەنجەکانی ئێستا.

٤ - کە دەچوومە ناو بازاڕی هەولێر هەر لەو ساڵانەی لەسەرەوەدا ئاماژەم پێکردووە جوانترین دیمەن کە دەمدی و بەرامبەری دەوەستام دوکانی ئاسنگەران بوو کە کوورەی داگیرساوی سوور سوور هەڵدەگەڕا بە هەمبانە گڕو گڵپەکانی تاوو جۆش دەدراو ئاسن لە ناویدا وەك پۆڵوی

سوور سووری گەشاوە دەبینران، دواتر دەخرانە سەر سندان بە چەکۆشان ئەو ئاسنە سوور گەشە نەرم ببوو، ئەو شێوەو قەوارەییەی مەبەستیان بوو لییان دروست دەکردو دەهاتە بەرهەم، بۆ نموونە: گاسن - داس - ناڵ بۆ سمی وڵاخ - دەمە تەپشو - خەنجەر - شمشێر - تەورداس... هتد، ئەوەتا لە ژێر کاریگەری ئەو دیمەنانەی ئەوسا چەند دێرە شیعرێکم هۆنیوەتەوە کە دەڵێم:

ئاسنی سارد
لەسەر سندان دانەندرێ
تا بە جۆشدانی ئاگر گەرم نەکرێ
بە ئارەزووی چەکوش ناکشێ‌و ناچەمێتەوە
بکریتە داس، بۆ دروێنەی گوڵە گەنمی گەردەن زێڕین
یان گاسن، بۆ هەڵدڕینی ورگی خاك
ناڵ بۆ سمی وڵاخ
مەقەست بۆ هەڵپاچینی باخ

- هەروەها (سەراج) هەبوون بۆ دروستکردنی رەخت‌و فیشەکدان‌و کیفی دەمانچەو دروستکردنی پێڵاو.. هتد، یەکێك لەو سەراجانە (ئەحمەد سەراج) بوو باوکی شاعیر هاشم سەراج یادی بەخێر، ئێستا ئەم دوکانانە نەماون سەیری قامك‌و دەست‌و بازوویان بکەین کە چەند وێنەیەکی سەرنج راکێشیان بەجێ هێشتووە لە زاکیرەی نەوەی ئێمەدا.

٥ - تا ناوەڕاستی هەفتاکانیش لەو هەولێرە کە وەرزی بەهار وەدەر دەکەوت، پەرەسێلکەکان‌و حاجی لەق لەق دەگەڕانەوە، بۆنی بەهار

گەنجانی بە گەڕ دەخستو تەقینی خونچەو لەرینەوەی لقە دارەکانو ئاوس بوونی چرۆکانیانو سەوز بوونی دامێنی قەڵات وەدیار دەکەوت جا سەیرانی ئەوسا کە خەڵکی خاوەنی جۆرەها ترومبێلْ نەبوون، بە پای پەتی هەموو گەڕەكو کوچەکانی شار بە ژنو پیاو گەورەو هەراشەکانیانەوە هەر یەکێ شتێکی هەڵدەگرت بەرەو رەزی سەعید ئاغا کە ئێستا بووە بە پاركو بەرامبەر پەرلەمانی هەرێمی کوردستانە یان بەرەو ئاوی میریو وێستگەی شەمەندەفەرو غاباتی کوران دەڕۆیشتن، لە ناوەڕاستی شەستەکانو دواتر وردە وردە جێبو نێرنو ترومبێلی گەورەو بچووك زۆرتر بوون جا دانیشتوانی ئەو شارە دەچوونە سەیرانگەی بەستۆڕە کە ئەوسا ئاوێکی زۆر بە چەمی داوین هەورازەکەیدا دەڕۆیشت تەماشا دەکەین یەکێ لە گۆرانییەکانی هونەرمەند (باکووری) لەسەر ئەو سەیرانگایە دیچڕێ:

هەڵسە هەڵسە کچی جوان
بەهارەو کاتی سەیران
هەڵسەو جلت بگۆڕە
با بچین بۆ بەستۆڕە

هەر لەسەرەتای مانگی ئادارەوە بگرە نەك هەر گەشتو سەیران بەڵکو بۆنەیەکی زۆر زۆر لەو مانگەوە دەستپێدەکات بۆیە راستیان گوتووە:

کۆڵان بە کۆڵان، جادە بە جادە
مانگی ئادار هەمووی بۆنەو یادە

جا لەو مانگەدا گەورەترین یاد لەو بەروارەی ئاماژەم پێکردووە لەسەرەوەدا، یادی نەورۆزە کە هەمیشە فاکتەرێکی هاندەرو داینەمۆیەکی کاریگەر بووە بۆ جۆشدانی کوردپەروەران و شۆڕشگێڕان و بابەتی نەتەوایەتی و سیاسی لە هەر چوار پارچەی کوردستانی گەورەدا، ئەوەتا (شتراوس) دەڵێت: (زۆربەی کۆبوونەوە سیاسیەکانمان لە شێوەی سەیران و گەشتدا ساز دەکرد)

بەڵێ هەر لەو مانگەدا نمایشی قوتابخانەکان و ئاهەنگەکانی هونەری و کۆڕو ڤیستڤاڵەکانی ئەدەبی و وەرزشی دەکرا، لەسەردەمی نەوەی ئێمەدا یادکردنەوەی نەورۆز بە ئاشکرا قەدەغە بوو، بە داگیرساندنی ئاگرو یادکردنەوەی، سزای قورسی بە بەرەوە بوو هەر یەکێ پێیی هەڵسا با، کە ئەو یادە دادەهات، دایکم و باوکم دەست لەسەر دڵ و ترس و نائارامی دایدەگرتن چونکە برا گەورەکەم (جەلال) لە شەوانی نەورۆزدا لەگەڵ برادەرانی هاو حزب کە پارتی بوون لەگەڵ دڵسۆزانی متمانە پێکراو و کورد پەروەر، جگە لە بلاو کردنەوەی بەیاننامەو پیرۆزبایی جەژنی نەورۆزو چالاکییەکانی پێشمەرگە دژ بە رژێمی ئەوسا، ئاگریشیان دەکردەوە لێرەو لەوێ، ئەوەندەی لە یادمە هاوەڵی ریکخستن و تیکۆشەرانی بریتی بوون لەو هەڤالانە (عەلی رەسوڵ - جواد شیروانی - ئەحمەد شەریف - باسل عەلاوی - دڵدار محەمەد گەردی - ئەحمەد رەشوانی - وەفا - سابیر ئیسماعیل..هتد

جا قەدەغە کردنی ئاهەنگ و ئاگر هەڵکردنی نەورۆز تا ساڵی ١٩٦٦ بەردەوام بوو، هەر لەو ساڵەدا کە سەرۆك کۆماری عیراق عبدالسلام عارف لە ناو کۆپتەرێکا بوو لە بەسرا کۆپتەرەکە کەوتە خوارەوەو عبدالسلام وەك گۆشت فری وەك رەژوو کەوتە خوارەوە، براکەی عەبدولرەحمان

عارف لە شوێنی ئەو بوو بە سەرۆك كۆماری عیراق و (عەبدالرحمان بەزاز)یش بوو بە سەرۆك وەزیران و دانیان بە دەسەڵاتی لامەركەزی نا بۆ كورد لە باشووری كوردستان و بەیاننامەی ٢٩ی حوزیران ١٩٦٦ دەرچوو كە یەك لە بڕیارەكان ئەوە بوو نەورۆز بە ئاشكرا یادی بكرێتەوە.

(٦)

كە بە بڕبڕەی ساڵانی تەمەنم دێمە خوارەوە دەردەکەوێ مێژوویەکی چەندە کارەسات ئامێزمان هەبووە واتە نەوەی ئێمە وەك کورد کە ئێستایش هەمان خوڵخولەو زەمینە بە جیاوازێکی کەم تا ئاستێك هەر هەیە، ئەو گورگانەی دوێنێ کە تەمەنمانی خوارد بۆ ئایندەش لەبەر چاومان لاناکەون، تەنیا جیاوازییەکە ئەوەیە هوشیاریو درك پێکردنی نەوەی ئێستایە ئەگەر سوود لە ئەزموونەکانی ئێمەی ڕابردوو وەرگرنو سەر لە خۆ نەشێوێنن هەندێك قەرەبووی ماندوو بوونو کۆ ئازارو مەینتییەکانمان بۆ بکەنەوە. فرانسیس بێکن دەڵێت: (زیادە ڕۆییەکانی دەورانی لاوێتی قەرزێکە لە پیریدا دەبێت بیدەینەوە، ئەوەی لە ڕۆژگاری لاویدا بە هەدرمان دەدا، لە پیریدا ئارەزوومەندی دەبین).

لێرەدا پرسیارێك لەبەر دەممانداا قووت دەبێتەوە، من بەش بە حاڵی خۆم کە چاوم هەڵهێنانەوەو لە تەمەنی هەرزەکاریو لاوێتیو تا ئەمڕۆ واتە ژیان بە سەر بردن لە نێو ڕووداوەکانو گرمەی شەڕەکانو گرتنو ڕاوەدوو نانو هەڕەشەو تۆقاندنو لە سێدارە دان.. هتد، واتە تێپەڕ بوون بە نێو وێستگەکانی شەڕو کەم ئاشتیدا بگرە هەر لە دەستپێکی شۆڕشی ئەیلولەوە سەرجەم بە نێرو مێینەوە لە نەوەکانی هاوکوفی بەندە لە هەمان کۆڕان ژیاون، قەرزی ئەو زێدە ڕۆییەی لاوێتیی کێ لە پیریدا بۆی قەرە بوو دەکاتەوە؟

ڕووداو لـە دوای ڕوداوو ناڕەحـەتی و شـەڕو کۆدەتـا، لـە ١٢ی ئـاداری ١٩٥٩ (عبـدلوهاب شـواف) کـە فەرمانـدەی سـوپا بـوو لـە موصـل کەسـێکی شـۆڤینی بـوو لەگـەڵ ژمارەیـەك لـە ئەفسـەران لـە موصـڵ و کـەرکوك لـە دەسـەلأداریێتی حکومـەتی عەبدولکەریمقاسـم هەڵگەڕایـەوە بـە نیـازی کۆدەتایەك، بەڵام دوای شەڕو کوژران و دەستگیر کردنی زۆربەی ئەفسـەرو دارو دەستەکانیان، شکست بەو کۆدەتایە هات و دەسەڵات و حکومەتەکەی عەبدولکەریمقاسم بەردەوام بوو.بەڵام.....

لــە یادمــە لەبەرەبــەیانی ١٩٦٣ کۆدەتــای حزبــی بــەعس بــە ســەر عەبـدولکریم قاسـم ئـەنجام درا، لـە دوای بەیاننامـەی ژمـارە (١) کـە گوایـە شۆڕشـێکی تازەیـەو ئـەنجام دراوە، کەچـی کودەتایـەکی سـەربازی بـوو، بەیان لە دوای بەیان دەخوێدرایەوە لە رادیۆی بەغدادا، لە هـەموو ماڵێکـدا لەو عیراقەدا خەڵکی گوێ قوڵاغ بوون و هاتووچۆ قەدەغە کرا،

کۆدەتـای ٨ی شـوباتی ١٩٦٣ بەڵایـەکی گـەورە بـووو قـوڕێکی خەسـتی گرتەوە بۆ عیراق بە گشتی و بۆ کـورد بـە تایبـەتی هـەر چەندە لەسـەرەتادا ناڕەزایی و بەرەنگار بوونـەوەی هـەبوو بـە تایبـەتی لـە لایـەن گـەلی کـورد لـە کوردستان و حزبی شیوعی، ئەوەندەی من لـە یادمـە لـە گۆڕەپـانی کـۆتری سـەلام لــە هــەولێر خۆنیشـاندانێك بــەرپا بــوو کــە زۆربــەی هــەرە زۆری شـیوعیەکان بـوون، دیـم یـەکێك لەوانـەی هەڵیانبـڕی دژ بـەو کۆدەتایـە هوتافی دەکێشا ناوی حەمە زیاد بووو دراوسێمان بوو بە حەمـەزیاد تـاپۆ ناسـرا بـوو، کەچـی گیـراو زۆریـان ئەشـکەنجە دا. هــەروەها نـاڕەزایی خۆنیشـاندان و هێـرش کردنـە سـەر چـەند بنکەیـەکی پـۆلیس و داگـیر کردنیـان و تەقـە کـردن و پشـێوی لـەو شـارەی هـەولێر دا بـەرپا بـوو، بـەڵام حوکمـەت بـە هێـزی سـەربازییەوە بـە تانـك و زرێپۆشـەوە هاتـە چـەند

گەڕەكێك و بانگی ڕادەگەیاند كە كەس لە ماڵەوە دەرنەچێت، لە ئەنجامدا وەزعەكەی دامركاندەوە بەڵام بە زەبری كوشندە كە زیاتر بەر حزبی شیوعی كەوت و زۆربەی كادیرە بەرچاوەكانیان ناچار بوون ڕوویان لە شاخ كردو پەیوەندیان بە شۆڕشی ئەیلوولەوە كرد، نعمت عەبدوللا سەرۆكی سەندیكای پەرلەمانتارانی كورد دەڵێت: (لەگەڵ كۆدەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣، یەكەم ڕوو بە ڕوو بوونەوەی دژی بەعسییەكان لە شاری هەولێر لە گەڕەكی سەیداوە، واتە لە خانووە قوڕەكان ئەنجام درا، دەستیان گرت بە سەر مەخفەرەكەی پۆلیس و سەرئەنجام خەڵكێكی زۆر بەشداریان تێدا كرد، دوایش تووشی زیندان بوون، ڕادیۆكان بە سەیداوەیان دەگوت مۆسكۆی دووەم، ئەوێ ڕۆژێ سەیداوەو هەروەها لە دەستپێكی شۆڕشی ئەیلوولیشدا كە قەڵای خەباتگێڕان بوو، لەو سەیداوەیەدا بە سەدان شۆڕشگێری لێ لە دایك بووە).

جبران خلیل جبران دەڵێت:

**بە ئازادیم وت: كوڕەكانت لە كوێن**
**وتی: یەكێكیان لە خاچ دراو مرد**
**یەكێكی تریان بە شێتی سەری نایەوە**
**ئەوەی تریشیان هێشتا لە دایك نەبووە**

- بە درێژایی تەمەنی شۆڕشی ئەیلول، هەر شەڕو دانووسان و پشوودانێك و دەستكەوتی تازەو لە هەمان كاتدا پیلانگێڕان دژ بە كوردو شۆڕشەكەی و فێڵ و تەڵەكەبازی تا خۆ قایم كردنی یەك لە دوا یەكەكانی

ڕژێمەکان بەردەوام بوو، واتە بۆ نەوەی ئێمە لەو سەردەمدا ژیان لە نێوان بەهاری تەمەن کورتو دۆزەخدا ژیان بە سەر بردن بووە،

هەر بینیومانە وەك ئەو پەندە ئاسا (تاوانکەر وا بە لای یارەوە - بێ تاوانیش سەری بە دارەوە) یان (لەتێنان مردم.. هاشە هاشێ ئاوێ مێشکی بردم)

دوای ئەوەی حوکمەتی بەعس بە سەرۆکایەتی ئەحمەد حەسن بکر دامەزراو عەبدولکەریمقاسم دەستگیر کراو گوازرایەوە ئێزگەی بەغدا، بە گوللەباران کردنی زعیم کۆتایی بە دەسەلاتی هێنرا، حوکمەتی تازەی بەعس بۆ ئەوەی خۆی قایم بکات وەك تاکتیکێکی کاتی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول بە سەرۆکایەتی خوا لێخۆشبوو مستەفا بارزانی کە لەسەرەتادا حوکمەتی بەعس هەتا بە ئۆتۆنۆمی رازی بوو کە داوای شۆڕشی کورد بوو لەو کاتدا، ئەم گفتوگۆیە درێژی کێشا پشوودانێکیش بوو بۆ پێشمەرگەو هەڵسووڕانی وەزعی کوردو ناوچەکان، بەلام نیازی گلاوی حوکمەت هەر بۆ بەرێکردنی کاتو دەرفەت وەرگرتن بوو تا بە تەواوەتی خۆی قایم دەکات، ئەوە بوو لە ٩ /ی حوزەیرانی ١٩٦٣ دا حوکمەتی بەعس لە بەغدا بەیاننامەیەکی دەرکرد کە چەندین خاڵی لە خۆ دەگرت لەسەر بنەمای (اللامرکزیە) بۆ مەسەلەی کورد وەك چارەسەری، ئێستاش لە یادمە بەو پێیەی گەلی کوردو شۆڕشەکەی بەو لامەرکزییە رازی نەبوون، دروشمێك لە نێو جەماوەری کورد بلاو ببۆوە دەگوترا (پێمان تەزی... نامانەوێ لامەرکەزی) بەڵێ لەسەرەتادا بەعسیەکان دەسەلاتی تەواویان بە سەر دەفەی هەموو جومگەکانی ئیدارەو بەڕێوەبەرایەتییەکان هەبووو دەسەلاتیان سەپاند بوو، بە دەستێکی قورسو بێ بەزەییانە دژ بە نەیارو هاودژەکانیان

گـرتن‌و ئه‌شـكه‌نجه‌و تۆقانـدنیان ئـه‌نجام ده‌دا، جـاش‌و بـه‌كریٚ گـیراوی كوردو هه‌روه‌ها له‌ هۆزه‌كانی عه‌ره‌ب به‌ تایبه‌تی له‌ ناوچه‌كانی هـه‌ولێر بـه‌ نـاوی (فرسـان سـه‌لاحدین)و (فرسـان خالیـد بـن ولیـد) یـان قه‌یـد ده‌كـردو سیاسـه‌تی ڕگـویزانی كـوردان‌و ده‌ربـه‌ده‌ر كـردن هـه‌ر لـه‌ ده‌شـتی هـه‌ولێرو كه‌ركوك‌و خانه‌قین زۆربه‌ی ئه‌و ناوچه‌ كوردیانه‌ی ده‌سه‌لاٚتیان پێدا ده‌شكا ئه‌نجامیان دا، دوژمنـداریان نایـه‌وه‌ لـه‌ نێـوانی هۆزه‌كـانی كـوردو عـه‌ره‌ب (حه‌ره‌سی قه‌ومی)یان هه‌بوو به‌ ده‌یان تاوانیان ئه‌نجام دا، به‌ڵیٚ ده‌سـه‌لاٚتی بـه‌عس لـه‌ مـانگی شـوبات ١٩٦٣ تـا مـانگی تشـرینی دووه‌مـی ١٩٦٣ به‌رده‌وام بوو، دواتر عبدالسلام عارف ده‌سه‌لاٚتی حوكمه‌تی گرتـه‌ ده‌سـت‌و وه‌ك سـه‌رۆك كۆمـاری عـیراق ڕۆڵـی به‌عسـی نه‌هێشـت تـا ئـه‌و كاتـه‌ی لـه‌ فڕۆكه‌یـه‌كی كۆپتـه‌ر لـه‌ به‌سـرا كه‌وتـه‌ خـواره‌وه‌و كوتـایی بـه‌ ژیـان‌و ده‌سـه‌لاٚته‌كه‌ی هـات لـه‌ ١٩٦٦ دا، ئـه‌و وته‌یـه‌ بلاٚو بۆوه‌ (طـار لحـم... وقـع الفحم) واته‌ گۆشـت هـه‌ڵفڕی‌و ڕژوو – خـه‌ڵووز بـه‌ربۆوه‌، ئێمـه‌ی كـورد لـه‌و عیراقه‌دا، هـه‌ر هـه‌موو ڕژێمـه‌كان یـه‌ك لـه‌ دوای یـه‌ك هه‌میشـه‌ هـه‌نگوینیان نیشان داوین، به‌لاٚم ژه‌هریان ده‌رخوارد داوین، تۆ وه‌ر له‌گه‌ڵ دوژمندا بژی وه‌ك ئه‌وه‌یـه‌ كـه‌ فه‌یله‌سوفی هینـدی ده‌ڵێت (ئـه‌و كه‌سـه‌ی له‌گـه‌ڵ دوژمنـدا بژی چه‌شنی ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ مار بخاته‌ گیرفانییه‌وه‌.)

له‌ ساڵی ١٩٦٣ دا بوو له‌ ماڵه‌وه‌ماندا كه‌ ده‌لاٚقه‌یك تـه‌رخان كـرا بـوو بۆ بـرا گه‌وره‌كـه‌م (جـه‌لال) كتێـب‌و ده‌فتـه‌ری په‌یوه‌سـت بـه‌ خوێنـدنی قوتابخانـه‌ی تیا بـوو، لـه‌ تـه‌ك ئـه‌و ده‌فتـه‌رو كتێبانـه‌دا بینیم كتێبـی تـری تیایـه‌ به‌ره‌گه‌كـه‌ی وێنـه‌ی سـه‌رنج ڕاكێشـی پێوه‌یـه‌ بـه‌ تایبـه‌تی تـازه‌ سه‌ره‌تای هه‌رزه‌كاریم بوو كتێبه‌كان به‌ بیٚ پێزانینی ئه‌و واته‌ برایه‌كه‌م، كه‌ ڕۆمـان‌و چـیرۆك‌و دیـوانی شـیعر بـوون ورده‌ ورده‌ بـه‌ نهێنـی ده‌مـبردو

دەمخوێندەوە، یەکەم ڕۆمان کە خوێندمەوە (الغریب)ی ئەلبێر کامۆ بوو، دواتر دیوانی (همسە العشاق)ی پیربال محمود بوو، هەروەها دەفتەرێکی دانا بوو لەو دەلاقەیە، ئەویش شیعری کوردیو ڕۆمانسی بوو خۆی نووسیبووی، ئیتر لەو ڕۆژەوە چێژم لە خوێندنەوەی کتێب وەر گرت، لە زمانی عەرەبیش باش بووم، ئیتر هامشۆی (پەرتوکخانەی گشتی)م دەکرد بەر لەوەی ببێتە دایرەی ئەمن، کە ئیستا ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستانی لەسەر بنیات نراوە، زۆر کەیفمان بەو دەرگەیەی دەهات کە دەچووینە ژوورەوە دەسووڕا لە گەڵی سووڕمان دەخوار ئینجا بە ژوور دەکەوتین، لەو سەردەم شتێکی مۆدێرنو تازە بوو شتی وامان نەبینی بوو وەك لە ئێستادا زۆرەو ئاساییە، بەرێوەبەرەکەی ناوی کازم بوو، یەکێك لە فەرمانبەرەکانی ڕەوانشاد (مەجید هێرش)ی شاعیر بوو کە زۆر کوردپەروەرو دڵسۆز بوو هەمیشە ڕانكو جۆغەی لەبەر دەکرد لە کاتی دەوامی پەرتوکخانەکەشدا، جا خدووم کەوتە سەر خوێندنەوەو وردە وردە شیعری سەقەتو پەتەقم دەنووسی بەڵام جیڕ بە جیڕم دەکرد پاش ئەوەی نیشانی ئەمو ئەوم دەدا کە شارەزاییان هەبوو لە چۆنیەتی داڕشتنی شیعر، شیعرەکەمیان بە شیعر نەدەزانی، بەڵام هەر وازم نەهێنا تا لە دواجاردا سەرکەوتنم وەدەست هێنا.

(٧)

لە پێشدا ئەو دوو قۆناغەمان باس کرد، لە کۆدەتای ٨ی شوبات / ١٩٦٣ کە لەلایەن بەعسیە شۆڤینیەکانەوە ئەنجام درا بە کوشتنی عبدولکریم قاسمو نەمانی حوکمڕانییەکەیو دەسەلاٌتیان سەپاند بۆ ماوەی ساڵێك، لەو ماوەیەدا، دانووسانو ئاشتییەکی فێڵاٌویان ئەنجام دا تا خۆیان قایم کرد دواتر بە ئاگرو ئاسنو دەستێکی قوڕس کەوتنە ویزەی تێکۆشەرانی کوردو شۆڕشە مەزنەکەیو چەندین تاوانی قێزەوەنیان ئەنجام دا ئینجا قۆناغێکی دی لە ت ٢ / ی ١٩٦٣ دەستی پێکرد کە مشیر ڕکن عەبدولسلام عارف دەسەلاٌتی گرتە دەست، ئەویش کەسێکی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوو ئەگەرچی ڕۆڵی بەعسو حەرەسی قەومی نەهێشتو بەردەوام بوو لە حوکمڕانی عیراقدا تا نیسانی ١٩٦٦ بەلاٌم بێ تاوان نەبوو بەرامبەر بە کورد، بە هۆی کەوتنە خوارەوەی کۆپتەرێك کە لە نێویدا بوو لە شاری (بەسرا) باشووری عیراق تیایدا سووتاو گیانی سپارد، ئەویش ماوەیەك هەر بۆ خۆ قایم کردن، دانووسانی فیلاٌوی ئەنجام داو دواتر هێزی سوپای بەرامبەر بە کوردو کوردستانو شۆڕشەکەی بە کار هێنا، ئێمەی گەنجانی ئەوسا چۆن نەڵێین (گورگەکەی دوێنێ هەرەتی تەمەنی ئایندەشمانی خوارد) ئەگەر وەك خۆم لە جیاتی کوردانی ژیاوی ئەو سەردەمان بدوێم حەقی خۆمە کە لەو پارچە شیعرەدا گوتومە:

**کورد بوون وەك ئیسفەنجێك**

**تەڕێتیی تەمەنمی هەڵمژی**

**وەك جگەرەیەکی داگیرساو**

**توتنی ژیانمی سوتاند و**

**دوکەڵە سپییەکەی هەڵفڕی**

**میلی زەمەن لە بازنەی تەمەندا**

**بۆ دواوە نەسووڕایەوە**

**ژیان گوزەری کردو نەگەڕایەوە**

**جگە لەو شانازییە نەبێ**

**کە لە شوێن خۆیدا مایەوە**

لە ماوەی ئەو دوو قۆناغەدا، لەسەر هەولێرو دەوروبەری دەوەستم کە تیایدا ژیاوم و بەو چاوانەی خۆم ڕووداوو وێنەکانیم دیوەو بەو گوێچکانەیش گوێ بیستی بوومە، بەڵێ جگە لە ناهەمواریی و شەڕو دواکەتن و جەهالەت و ویرانی و گرتن و خوێن ڕشتن و ئازارەکانی دەروونی هاولاتیان و نائارامی و ڕاڕایی هەمیشەیی شتێکی تر نەبوو ناوی خۆشنوودی بێت. ئێستاش یادو بیرەوەریەکان هەر تازەن هەر وەك (ئیبن قوتەیبە) دەڵێت: (ئەوەی ئەمڕۆ نوێیە، سبەی کۆن دەبێت، ئەوەی بە کۆنی دەزانین، دوێنێ نوێ بوو)

هەندێ لە تاوانەکانی ئەو ڕژێمە بۆ نموونە:

لە شاری کۆیە دوای ڕەشبگیریەك لە ١٩٦٣/٧/٧ دا، بە فەرمانی جەنەراڵ تاها شەکرچی، شەش هاووڵاتی بێ تاوان لە دینگەکانی ناو بازاڕیان بەستانەوەو دەستڕێژیان کردن، بۆ ترساندن و چاو شکاندنی خەڵکەکەی دانیشتوانی ئەو شارە، کاتی خۆی لە ١٩٦٩ دا لە ناوچەی هێزی سەفین لە هێران پێشمەرگەو مامۆستای شۆڕش بووم، لەگەڵ خوالێخۆشبوو ئیبراهیم عەبدولواحید کۆیی و شەهید ئازاد حەمە گەمحان پێکەوە بووین ئەو ڕووداوەیان بۆم گێڕامەوە، ئەو تاوانکارییە لە مێشکمدا پەنگی خواردو بەو وێنە شیعرە دا کەوتەوە کە دەڵێم:

که شەو داهات

گڵۆپەکان هەر پێنەبوون و دانەگیرسان

پرسیم هەواڵ

وتیان دەمێکە شکاون

وتم ئێوە بەردەقانی مناڵەکان بشارنەوە

پێیان گوتم.. ئەی نازانی

کاتێ پیاوانی شارەکەمان

لە ئەستونگەکانی شەقام بەسترانەوە

لەگەڵ دەستڕێژی گوللەی سوور

گڵۆپەکان کوژانەوە؟!!

– بەڵێ لەسەرەتای ١٩٦٥ وە پەیوەندی شۆڕشی ئەیلوول و حکومەت بەرەو لێکترازان و هەڵوەشانەوەو ڕووەو شەڕ ڕۆیشت، لە ئاداری ئەو

ساڵەدا سوپای عیراق لەگەڵ جاشە خۆفرۆشەکانەوە هێرشێکی دڕندانەیان بۆ ناوچەکانی کوردستان دەست پێکرد بە هەموو جۆرە فڕۆکە هێرشبەرەکانی وەك (ئالیۆشن و میك ١٧و ١٩و ٢١) بۆردمانی ناوچەکانی کوردستان و پێشمەرگەکانیان دەکرد، بەڵام خۆ ڕاگری و قارەمانیەتی پێشمەرگەو شەڕی جوامێرانەو کۆڵنەدانیان، شکستیان بە سوپاو جاشەکان هێناو لە زۆربەی بەرەکانی شەڕدا سەرکەوتنی گەورەیان تۆمار کردو دوژمنانیان سەرسام کرد.

کازانتزاکی نووسەری ناودار دەڵێت: (خێرو شەڕ دوژمنی یەکترن، هەروەها هاوڕێی یەکن لە کاردا) بەڵام بەعس و حەرەسی قەومی لەو سەردەمەی خۆیاندا خێریان وەلاوە نابوو، تەنیا شەڕەکەیان ئەنجام دەدا بە وەدەرنانی لادێ و گوندەکانی دەشتی هەولێر / قەراج و کەندیناوەو مەخمورو گوێر بە سوتاندنی خەرمان و تالأن کردنی ماڵ و ماڵاتیان، دایکان کۆرپەیان لەبەر مەمکان بووەو ڕایان دەکرد، پەیڕەو کردنی سیاسەتی بە عەرەب کردن و ڕاگواستن و کوشتنی ئەو کەسانەی بەدەنگ هاتبان یان بەرامبەریان هەڵگەڕا بوونایەوە، ئەو پەیوەندیو تەباییەی لە نێوانی کوردو عەرەب هەبوو تا ئاستی بە ژن هێنان و تێکەڵ بوون و خزمایەتی کردن لە باریان برد، دوای ئەوەی بە پاڵپشتی سوپاوو حەرەس قەومی لەگەڵ هۆزە عەرەبەکانی (شەممەرو جبوری و تەی) تاوانی زۆریان ئەنجام دا، بۆ نموونە (شێخ حەنەش حەمود) سەرۆکی هۆزی (تەی) لە ناوچەی گوێر لەگەڵ چەکدارەکانی چەندین گوندی تالأن کردو کوشتن و کوشتاری تیا کرد ئەگەرچی بەرگری بەرامبەریان دەکرا بەڵام هێزی سوپاو حەرەس قەومیان پاڵپشت بوو، بە هەمان شێوە سەرۆکی کۆچەریەکانی هۆزی شەممەر (شێخ حەواس کنعان) هەمان تاوان و

کردەوەی ئەنجام دا، جا ئەو سیاسەتەی ڕژێم بە شێوەیەکی فراوان پەرەی سەند لە گوندەکانی مخمورو دیبەگەو ئەو ناوچە پان و پۆڕەدا، ئەوەی بە بیرم دێ خزمانمان بە تایبەتی عەشیرەتی سیانەتی کە ماڵمان لە شار بوو دەهاتن و دەربەدر ببوون هەواڵی ناخۆش و ئەو کارەساتانەیان دەگێڕایەوە، کە گەورەتریش بووم باوکم بۆی گێڕامەوە کە لە قرچەی هاویندا لە ١٩٦٣ دا بە ناوی (حەماد شەهاب) هێرشێکی گەورەو فراوان کرایە سەر ناوچەکانی دیبەگە واتە گوندەکانی هۆزی سیانەتی وەك (دەربەند، بیرەبات، جاستان، دڕکە، گابەرەکە، چەرت و کێسمە، پەرکانە، گەزوەشان، قوچ.. هتد. جا پیاوە جوامێرو رق ئەستورەکان بوون بە پێشمەرگەو پەیوەندیان بە شۆڕشی ئەیلولەوە کرد، ئەوانەی پیرو کەنەفت بوون لەگەڵ ژن و منداڵ و خاوخێزانیان روویان لە شار کرد بە تایبەتی بۆ هەولێر، یەکێ لە خاروانەکانم کە شانازی پێوە دەکەم هەر لەو ساڵدا ١٩٦٣ دا توانی ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکەی سیانان بکاتە پێشمەرگەو خۆیشی بوو بە سەرلق و بەرەنگاری هیرشەکانی دوژمنان بۆوە، ئەویش سابیر کاکەشین بوو تا شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٥ توشی نسکۆ بوو بە پیلان و ڕێکەوتنی جەزایرو ئێران و عیراق بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە بێ پسانەوە هەر پێشمەرگە بوو، ڕۆحی شاد بێت، هەروەها لە ناو هۆزەکانی دی و هەموو لادێ و گوندەکانی دەشتی هەولێردا کەسایەتی و قارەمانای وای لێ هەڵکەوت کە ڕۆلێکی جوامیرانەیان هەبوو، بوون بە ئامر هێزو ئامربەتالیۆن وسەرلق و سەرکردەو هەڵسان بە کۆکردنەوەی پێشمەرگە وچەکدار کردنیان و ڕوو بە ڕووبوونەوەی ڕژێم و خۆفرۆشان، خۆ ئێستاش لە گەڵدا بێ ئاساوەری پەیڕەو کردنی ئەو سیاسەتە نەگریسە لەو ناوچانە هەر هەیەو نەپساوەتەوە.

(٨)

لـه كـانوونى يەكـەمى ١٩٦٥ كـه مشـير ركـن عبدالسـلام عـارف سـەرۆك كۆمارى عيراق بوو، كۆنگرەى ئيسلامى دەبەستا دژى كـوردو بـۆ ناشـيرين كردنى و زەمينه خۆشكرن تا به دەستێكى قورستـر لـه كـورد بوەشـێنىٚ به خـەياڵى كـرچ و كـاڵى، هـەر لـەو بەروارەشـدا لـه دەشـتى هـەولێرو چياى سـەفين و كۆيـه، بـه فرەوانـى هێرشـێكى سـەربازى ئـەنجام دا بـه پاڵپشـتى زرێپـۆش و چـەكه قورسـەكانى بـه بەشـدارى جـاش و خۆفرۆشـان لەسـەر زەوى و له ئاسمانەوەش به فرۆكه نەسانەوەكانيان و هێرشى بەردەوام، به تايبەتى له دەشتى هەولێر تا كانوونى دووەمى ١٩٦٦ بەردەوامى هـەبوو، بـەلاٚم دەمـى لـه نوشسـتى چـەقى و بـه لـه خۆبـوردووى و خـۆڕاگرى پێشمەرگەكان بـه ناچارى پاشەكشـەيان پێكـردن، جا شـەڕ لـه دەور بـەرى هـەولێر بـىٚ، هەڵبەتـه نـاو شـاريش دەوڕوژێو ئـارامى نامێنێت، هـەر لـەو ساڵ ١٩٦٥دا فەرماندەى فيرقـەى سـەربازى كـه لـه ئۆردووى هـەولێر بـوو، خوالێخۆشبوو رەشاد موفتى كەسايەتێكى ئاينى و قازى و مـوفتى دادگـاى هەولێر بوو زۆر خۆشەويست بوو، بانهێشت كـرا لـه لايـەن فەرماندەى ئـەو فرقـەوه كـه فەتوايـەك دەر بكـات بـه حـەلاٚل كردنـى خـوێنى پێشـمەرگەو شۆڕشگێڕان، بەلاٚم ناوبراو زۆر بوێرانه رەتـى كـردەوه ئـەم فەتوايـه بدات و هەڵوێستێكى كوردانەى نواندو مێژوويێكى جوانى تۆمار كرد.. بەڵىٚ چەند جوانه (ئۆكتاڤيۆ باز) دەڵێت: (چرات به دەستى كەسێكەوه دى، رێـزى بـۆ

دابنیّ‌و سلاّوی لیّ بکه) سلاّو لەو چرا بە دەستەی بە هەڵوێست‌و خۆ راگر بوو)

هەر لەو ساڵدا کە بەندە لە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووم زۆر سەر گەرم‌و دەروێشانە کارم دەکرد، لە (ناوەندی زازا)دا دەمخوێند، بەشی ناوخۆیی قوتابیانی کوڕان لە پشت ئەو ناوەندییە بوو زۆربەی قوتابیانی دەرە شار بوون‌و زۆربەشیان ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوون بە نهێنی کوردایەتی‌و خەباتیان دەکرد، هەر هەموومان هەستمان بە یەکتر دەکردو زۆربەمان یەکترمان دەناسی کە لەو هێڵەو رێکخراوە کار دەکەین، جا دایرەی ئیستخبارات‌و ئەمن هەستیان بەو جموجۆڵی چالاکیانەی یەکێتیی قوتابیان کرد بوو دەیانویست سەرە داوێکیان دەست کەویّ بەلاّم دڵسۆزی‌و متمانەو نهێنی پاراستنی نێوانەکان ئەو بوارەیان بۆ نەهێشتبوونەوە، ئەوەبوو یەکێك لە ئەندامانی لێژنەی شار لە ریزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان کە رۆڵی لێپرسراویەتی هەبوو شەهید نوری نانەکەلی دەستگیر کرا لە بنکەی پۆلیسی هەولێر، هەروا دەیان کادیری پارتی دیموکراتی کوردستان بەند کرا بوون، یەکێك لەوانەی ئەو کات لێپرسراوەتی یەکێتیی قوتابیانی دەکرد بە دوو ناو (بهرام – کاکل) ماوەیەك خۆی شاردەوە ئەگەرچی ئەو متمانەیەی هەبوو کە هەڤاڵ نوری نانەکەلی نە خۆی دان پیا دەنی‌و نە ناوی قوتابییەکی تر دەهێنیّ لە ریزی رێکخستنەکان، بەلیّ کاتی ئیمتحانات بوو، شەهید (نوری نانەکەلی) یان بە دەستی کەلەپچە کراوی کە لە لایەن دوو پۆلیسەوە هەر دوو قۆڵیان گرتبوو چەکدارێکیش لە پشتەوەیان‌و هێنایانە بەر دەم هۆڵی ئیمتحانات، چەند قوتابیەك لەبەردەم حانووتی قوتابخەکەو نزیك هۆڵەکە وەستا بووین، شەهید نوری بە تیلە

چاوێکی و بە ورەیەکی بەرزو خەندەیەکەوە سەیری دەکردین وەك ئەوەی بڵێت مەترسن، وەستێندرا لەبەر دەم هۆڵەکە تا بە پەلە مامۆستا (حسام شاکر) کە جێگری بەڕێوەبەر بوو هات و بردیانە ناو هۆڵی ئیمتحانات و ئیمتیحانی خۆی بدات، بەڵێ رۆژانە بەو شێوەیە دەیانهێنا و دەیانبردەوە بۆ بەندیخانەو ماوەیەکی زۆری نەبرد کە ئازاد کراو لەو ساڵیش کە بەو شێوەیە ئیمتحانی دەدا پلەی یەکەمی وەدەست هێنا و دواتر بەردەوامیش بوو لە خەبات و تێکۆشانی خۆی لە ریزی یەکێتیی قوتابیان و پارتی، تا شەهیدیش بوو هاوڕێی گیانی بە گیانی بووین، دواتر بووین بە خزم و کەس و کاری یەکتر کە خوشکی من براژنی ئەوەو برازای ئەویش بووکی منەو نەوەمانی لێ کەوتۆتەوە.. ڕۆحی ئارام و شاد بێت.

ئێمەی گەنجانی ئەو سەردەمانە هەر لە قۆناغی منداڵییەوە تا ئێستایش لەگەڵ دابێ کە ناوە ناوە کیشەو ناڕەحەتی و شەڕ یاخەمانی بەر نەداوە، نەلوایە چێژ لە ژیان وەرگرین وەك پێویستە، هەروا پشت لە هەندێ داب و نەریتی دواکەوتووو خورافات و جەهالەت بکەین، هەڵبەتە ئاشتی و سەربەخۆیی و ئازادی ژیانی مرۆڤ ئاسودە دەکات بەرەو پێشکەوتن و داهێنان هەنگاو بنێ بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی هوشیاری و هزرو ئەدەب و هونەرو رۆشنبیریەکی سەردەمانەو لاسایی کردنەوەی دونیای مۆدێرن لە کارە چاکەکانیان و بەرهەمهێنی و تەکنەلۆژیا و ئایندخوازی، ئەوەتا لەسەردەمی ئێمەدا شار پڕ بوو لە شێت و کەسە نەخۆشە دەروونیەکان (بەرخۆکە بە تەسبیح، شێتەکانی دەژمارد کە بریتی بوون لە هەیاسە شێت سەرۆکیان بوو زۆر دڕو ترسناك بوو، (حەمە) کە خەڵکێك پیان وا بوو (وەلی) یە، جار جار دەگریا دیووت (کە شوانیت پێ نەدەکرا ئەو مەڕانەت بۆ بەرەڵلا کرد) هەر وا چورچە –

جومعە – پیرداود – مەمەد – پەنجاو پێنج – کەسكو سۆر – سالحە شێت – کسۆك – دارا شێت – میرووله) دەیانی تر لە شەقامو کوچە کۆلانەکان دەسووڕانەوە یان بۆ گاڵتەو گەپ دەیاندواندن یان لەگەڵ منداڵان دەکەوتنە بەرد بارانی یەکتر.. چەندین تەکییە هەبوون لەو شارەدا، دەروێشکی زۆر لە ناو شاردا دەبیندران هەندێ جاران دەچوومە تەکییەی خەلیفە جەلال لە گەڕکی تەعجیل لە شەوانی هەینیدا زیکریان دەکرد، دروێشەکان بە پرچ کراوەیی و زەرگیان لە دەم وسەرو لەشیان دەدا یان دەمیان پڕ ئاگر دەکرد، خەلیفە دەست بە (شیمشێر)ەوە دەروێشیکی لەسەر شمشێرەکە درێژ دەکرد..هتد، بۆ مانگ گیرانیش لە نێو شاردا دەبووە تەنەکە لێدان، کە باران نەباریبووایە مەلاو شێخ و دەرویش و خەڵکە موسلمانەکە دەچوونە دەرەوەی شارو نوێژە بە بارانیان دەکرد، لە ناو گەڕەکیش چەند گەنج و پیاوێك بە تەنی بنی منجەڵ و سێڵی نان دەم و چاوو لەشیان لە تەنی ڕەش هەڵدەسوی و دەبوون بە کۆسە بەبەو بە نێو گەڕەك دەسووڕانەوەو کچان و ژنان لەسەر تارمەو بانەکان بە سەتڵ (پەقرەج) ئاویان پێدا دەکردن، زۆربەی گەنجان و پیاوەکان بێ کارو کاسبی خەریکی کەلا بەردانێ و لگاوو شەڕە کەڵباب وشەڕە کەوو دۆمینەو سەرکۆلان گرتن و پلارو قسەی بە توێکڵ و جار جار لە دڵتەنگی و بێ ئیشی (شەر لە بەتاڵی باشترە) شەڕێکیان دەکرد، پیرەکانیش دەچوونە مزگەت یان لە پەنا دیوارەکان دامەیان دەکرد خامۆشی و داتەپیوو بێ کاری و دواکەوتوویی و بێ خزمەتگوزاری وێنەیەکی قێزەوەنی ئەم شارە بوو، لە رەمەزانان لەو شارەدا دوو جار تۆپ دەقەێندرا لە ئۆردووی یان بڵێین سەربازەگەی هەولێر ئەویش کاتی بانگی ئێواران بۆ شکاندنی رۆژو پاش شێوان بەم نێوە شەوە ئەوەی منداڵ و پیرۆکە بوو لە ترسان بە

چاوی خەواڵوییەوە لە ترسان لەرزی دەگرت، هەر لەو ساڵانەی کە شۆڕشی ئەیلوول بەردەوام بووو دواتریش، لەسەر دیواری ئاودەستەکانی مزگەوتەکانو یانەو ئەو چێشتخانانەی توالێتیان هەبووایە بە بژیو بمرێو دروشمی شۆڕشگێرانە بە جۆرەها تەباشیرو قەڵەمی رەنگاو رەنگ دژ بە رژێمو دار ودەستەکانیان دەنووسراو واتە ببوون بە لەوحەو تابلۆی هەمیشەیی ئەو دیاردەیە، خۆشترین بیرەوەری بۆ نەوەی ئێمە ئەو نمایشەی ساڵانەی قوتابیانو قەتابخانەکان بوو کە لە وەرزی بەهاراندا لە یاریگەی خۆجێیی هەولێر ئەنجام دەدراو چالاکی وەرزشی زۆری تیا بووو خەڵات بە سەر قوتابیانی یەکەمو دووەمو سێیەمو قوتابخانەکان دابەش دەکرا،

کەی خەڵکی هێندە رووی دەکردە سەموون خانەکان وەك ئێستا بەڵکو تەنیا سەموونی ئیعاشە هەبوو کە ئێستایش دایرەکەی ئەو فڕنە ماوەو بووە بە شارەوانی ژمارە (-) لەبەرامبەر مزگەوتی صەواف کە لە کۆتایی پەنجاکانەوە دروستکراو لە گەڕەکەکان چەند بریکارێکی هەبوو ئەو بەشە صمونەی بۆی دیاری کرا بوو دەیفرۆشتەوە هەر صمونێکی بە (٥) فلوس دەدا، نەخێر زۆربەی دانیشتوانی ئەو شارە روویان لە ئاشەکان دەکرد بۆ لێکردنی باراشو ژنەکان لە ماڵ نانی تیریان دەکرد، ئەو کارە ئێستا زۆر کەم بووە خەڵکەکە هەموو روویان لە فرنەکانەو نانی تیری ئامادە کراو دەکڕن، بۆ نموونە کاریگەری ئەو ئاشانەی دیوومە لەگەڵ داپیرەم زۆر جار دەچووم بۆ باراش لێکردن ئەم شیعرەی لێکەوتۆتەوە کە لە دیوانی (چۆڕاوگە) دا هاتووە لە لاپەڕە (٣١) کە لە ساڵی (١٩٨٤) بە چاپم گەیاندووە تیایدا دەڵێم:

**بەرداش وەك بارانی سەر بە كلاوە**

**بە خورە خورو كەفچرینییەوە**

**وەك رێژنە تەرزە، بە چەقە چەق و،**

**مارپێچی دوكەڵی قیرنیەوە**

**چەخماخەی دەداو...**

**تەڵەزمو رووناكی دەپرووشێنێ**

**لە سورگەی خۆیدا، لەگەڵ ئاسنو ماسن دەجەنگێ**

**دەسوورێتەوەو دەسوورێتەوە**

**وەك دڕندەیەكی برسی دەمی كردۆتەوە**

**لە دامێنیشیا، ئاردی ڕەنگ سپی دەوڵەمەندان و**

**ئاردی رەشكوڵی هەژاران، دەكێشرێتەوە**

**ئاشەوان بە خۆیەوە نازانێ، دەمێكە بووە بە ترمۆمەتر**

**چەند جارەی بەرداش دەسوورێتەوە**

**ژمارەو پلەی تەمەنی لە ئاسمانی ترمۆمەتردا**

**باڵ لێ دەداو بەرز دەبێتەوە**

هەروا، نان كردنو لەسەر سێڵ برژاندنو لەسەر فەرشەی بە گەچ دروستكراو پان كردنەوەیو ناوبرێشكو بۆنی نانو بیرەوەریەكانی دایكم كە لە كۆبەندی دیوانی (كارێزە مەرجان) دا بەرگی دووەم ل٢٢ هاتووە، دوای كۆچ كردنی دایكم بە ناوی (دایكم كۆچی بە سوێ)دا ئەو چەند دێڕی لە قەسیدە درێژەكەدا هاتووە بۆ نموونە دەڵێم:

**رۆژو مانگو ساڵ گلۆر دەبێتەوە**

**وەك تیرۆكی دایكم بە سەر فەرشەی جێماویدا**

**رۆژگار پەرە وەریوەكانی پێ كۆناكرێتەوە**

(٩)

کەم ئارامی، کەم ئاشتی و کەم ژیانکردن بەرێوەچوو، زۆرتر شەرو کێشەو ناڕحەتی و پەیرەوی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەو ئاوارە بوون و ڕاگویزان سەر پشك بوو بەرامبەر بە کورد جا لە ٨/ی شوبات ١٩٦٣ تا کوتا هاتنی فەرمانڕوایی مشیر عەبدوالسلام عارف لە ١٩٦٦دا، شاری هەولێر کە مەبەستمە لێوەی بدوێم، بەو سیاسەتە نەگریسەی لەو شارەدا پەیڕەو دەکرا ببووە هۆی ناگزووربوونی دانیشتوانی و داتەپینی شار، هەر چەندە تێکۆشان و کوردایەتی و بەرانگار بوونەوەو خۆڕاگری کۆڵەگە بوون بۆ کۆڵنەدان و ئایندەخوازی بەرامبەر بە ڕەشەبای دوژمن، بەلاّم وێنەکانی هەژاری و مەینەتی زۆر زۆر بوو، ئەو شیعرەم، ڕاستیەکە هی ئەوسا بۆ ئێستا:

لە ناو گەڕکەکەی سالأنی ئەوسا
عەسەلیە فرۆش و لەگلەگ فرۆشیك
دڵخۆشی دەکردین
بە ڕاکە ڕاکە تا پێیی دەگەیشتین
ئەوسا وەك ئێستا
(بابە نۆئیل) یێکمان نەدیبوو
هەگبەی پڕ بێ لە نوقڵ وبووکەلەو دیاری منداڵانە
بە پێکەنین و تریقانەوە رووەو رووی بچین

خۆ ئێستایش نابمەوە بە منداڵەکەی ئەوسا
بڕۆم بەرەو پیلی بابە نۆئیلەکی ئێستا

نەوەی ئێمە نەك لە قۆناغی منداڵی بێبەش و خۆشی نەدیو بووینە هەر لە نەچێژتنی خواردن و خواردنەوەی بە ڤیتامیناتی هەمەجۆرو تەندروست، یان تێر بوون بە یاری و تریقانەو پێکەنین و سەفەرو چاو کرانەوە، بەڵکو لە قۆناغی مێرد منداڵی و هەرزەکاری و لاویەتیش لەو مەینەتییەدا بەشمانی تیا هەر هەبووە، تەنیا خوا پێداوەکان بە ژمارەیەکی کەم، باوکەکانیان قوتابخانەیان پێ تەواو دەکردن و هاوینان لە کاتی پشوودانی قوتابخانە دەیاناردنە مزگەوتەکان بۆ ئەوەی لە لای مەلاکان فێرە قورئان و ئەلف و بێی عەرەبی و زمانی عەرەبی بن، کەچی منداڵە هەژارەکان لە قوتابخانەش بێبەش دەبوون و دەبووایە ئیشی دەستگێڕی بکەن، یان ئەگەر لەبەر خوێندنیش بوونایە کاتی پشوودانیان لە هاویناندا بە پێی قۆناغەکانی تەمەنیان دەبوو کار بکەن تا بتوانن لە خوێندن بەردەوام بن، جگە لەوەی حەیزەرانی باوکسالاری و مامۆستا سالاری و وەستا سالاری کە دەبوونە شاگرد لە دوکانەکانی پیشەوەراندا لەوێوە بوەستێ، خۆ باسی ڕەگەزی مێینەمان نەکرد لەو سەردمدا کە بارو ژیانیان قورستر بوو، بۆ چوونە بەر خوێندنیش لەبەر هەژاری و دواکەوتوویی و ئاستی ڕۆشنبیری خێزانەکانیان بیبەش بوون، ئەوەتا کاردانەوەی ئەوساش لەو شیعرەدا دەرم بڕیوە بە ناونیشانی (ئەو سەردەمانەی لە یاد ناکرێن) لە کۆبەندی شیعرەکانمدا لە (کاریزە مەرجان)دا لاپەرە ٢٤٣دا هاتووە کە دەڵێم:

**زەنگ لێ دەدرێ.. زەنگ لێ دەدرێ**
**قوتابیان بەرەو ژووری پۆلەکانیان دەکەونە ڕێ**
**ئەو مێردمنداڵەم دێتەوە یاد**
**لە چایخانان،**
**لەسەر شۆستەی شەقام و پەنا دیواران**
**ژیانی سەخت ڕاو دەنێ و بە دوای نان کەوتووە**
**سینی جگەرەو نوقڵیاتی بۆ رەش و سپی راگرتووە**
**هەژارییەو پێی وتووە**
**لە ئاست قوتابخانەکاندا دەست بە چاوانتەوە بگرە**
**کە زەنگ لێدرا، گوێی لێ مەگرە!!**

لەو سەردەمدا ئەوەی کە چێژو خۆشی بووایە بۆ مێردمنداڵە هەراشەکان تەنیا جەژنەکان بوون، ئەو فیلیمانەی لە بەیانیان و ئێواران نیشان دەدران بە تایبەتی فیلیمی ماشستی و هەرقەڵ و تەڕەزان کاتێ پەنجەرەی شیشبەندی ئاسنینیان بە بازووە بەهێزەکانیان لێك دەترازاند و دەهاتنە دەرەوە بە نێو دوژمنەکانیان دەکەوتن دەبووە چەپڵە ڕێزان و فیقە کێشان، یان فیلمەکانی کابۆیی کاری کۆپەرو.. هتد، شەوانیش بۆ ژن و پیاوان فیلمی سۆزداری هیندی و میسری زیاتر نیشان دەدرا، جا لە هەولێر سینمای (حەمرا)هەبوو لەگەڵ سینما صلاحدین و دواتر سینما سیروان، وەك لە پێشدا باسم کردووە کاسبی دەستگێڕش هێندە زۆر بوون لەبەر هەژاری، هەر وا زۆربەی پیاوان لە چایخانەکان کاتیان بە سەر دەبرد لەبەرئەوەی رۆژێك یان دوو رۆژێك کاریان کردبا چەند ڕۆژێکیش بێ کار دە بوون، لە چایخانەکاندا شرقەی پولەکانی دۆمینەو زاری تاوڵە

سانەوەیان نەبوو، بۆیە ئەم تەنزە خەندە ئامێزە لە ژێر کاریگەری ئەو ڕۆژدا نووسیومە کە دەڵێم:

لە ئان و ساتێکدا
لە ڕاست و چەپەوە
- بەخێر بێیت
چایەچی: چ دەخۆیەوە
مێردمنداڵێك: بۆیاخ ناکەی
ئەوەکەی تر: پاکێت، بنێشت، حەبی سەرئێشان
سواڵکەرێك: دەست پان دەکاتەوە، خێرێکم پێبکە
(ئەی هاوار وەڵامی کامیان بدەمەوە)
لە تەنیشتمەوە: دووشەش مرد
(خوا لێیی خۆش بێت)
تازییەکەی لە کوێیە
لەناو لەپی ئەو هاوڕێیە

***

لە هەولێر کە زۆر ناوی (سەلیم قاقا) دەهێندرا لەبەرئەوەی سەر قافڵەی ڕیشۆڵە و کێشکە (چۆلەکەگرەکان) بوو، کە هەندێك لە پیاوان بە مەنجەڵی کێشکەی کولاو دەگەڕان و هاواریان دەکرد کولایە کێشکە، کێشکەی کولاو، خەڵکیش دەیانکڕی، جا سەلیم قاقا ویستوویەتی هاوسەرگیری بکات، پیان گوتووە چیت هەیە سەروەت و سامان، گوتویەتی ئەی ئەوە نییە ئەو هەموو ڕیشولە و کێشکانەی لە ئاسمانن هەر هەمووی هی من نین؟

جا دەگێڕنەوە گوایە کابرایەکی خەڵکی پردێ (ئالتوون کۆپری)کە وشەیەکی تورکییە لەسەردەمی عوسمانیەکانیەوە بۆمان ماوەتەوە واتە پردی زێڕین، ئەو پیاوە کە خەڵکی پردێ بووە زمانی تورکی زانیوە، کچێکی شارستانی هەولێری ویستووەو لێیان مارە کردووە، دوای گواستنەوەی خەزورانی ئەو کابرا، ئەو زاوایەیان بە بەردەست لە دایرەی پەروەردە دامەزراندووە، جا ژنەکەی بەو هاوسەرەی دەڵێت بۆ ئەوەی گوزەرانمان باشتر بێت، پارەو پولێك پاشەکەوت کەین بۆ ئایندەو منداڵەکانمان، تۆ بۆ پاش نیوەڕۆیان ئیشێك ناکەی، ئەویش دەڵێت چ ئیشێك، ژنەکە پێی دەڵێت لەگەڵ سەلیم قاقا بڕۆو ریشۆڵەو کێشکە بگرەو بیفرۆشە، کابرا وا دەکات، دواتر ژنەکەی پێیی دەڵێت من کیشکەکان دەکوڵێنم وا قازانجی زیاترە شەوان بە کولاوی بیفرۆشە، کابرا ئەوەش دەکات، ئەوجارە ژنەکەی پێیی دەڵێت تۆ دوای نوێژی سبەینان بەر لە لەوەی بچییە دایرەکەت، شامی نۆك و لۆبیات بۆ دەکوڵێنم لە نێو گەڕەکەکاندا بیفرۆشە، دەڵێ باشە ئەوەش دەکەم، پاشان دوای دوو مانگان براو کەس و کاری دێنە لای بۆ سۆراغ و زانینی وەزعی کابرا (زاوا) دەبینن هەێندە لەڕو لاواز بووە بە جۆرێ نەیناسنەوە، براکەی پێیی دەڵێت کوڕە بۆ وات لێهاتووە، دەڵێ جا بڵێم چی زۆر ماندوومە ژنەکەم ئەو هەموو ئیشەم پێدەکات، براکەی پێیی دەڵێت (کوڕە ئەو ژنە (؟) تەڵاق دەو لە یاخەی خۆتی کەوە) کابرا دەڵێت (ئێ بە قورئان مەجالم نییە) واتە مەجالی ئەوەی نییە تەڵاقی بدات.

***

لەم شارەدا (هەولێر) جگە لە نێو بازاڕو قەیسەری تەنیا چوار شەقامی سەرەکی هەبوو لە داوێنی قەڵاتدا کە شارستانییەتی پێوە دیار بێت و

گەرمو گوڕیەکی هاتوچووی تیا بێت ئەویش بە شەقامی (باتا)و مزفەرییە ناو دار بوو، لە پاریزگای ئێستادا بەرەو باتا دواتر کتێبخانەی سۆلاڤ خاوەنی سید ئەحمەد بوو، خۆیو کوڕەکەی وشیار سید ئەحمەد سەرپەرشتی دەکرد، کتێبو گوڤارو پێویستمەندی قوتابیانیانی دەفرۆشت، بە تەنیشتیەوە عەبدولڕەحمانو عبدولخالق دووبرا بوون مارکێتێکی بچووك ومیوەیشیان دە فرۆشت، جەلال بەیار /ی هونەرمەند شاگرد بوو لە لایان، دواتر کەبابخانەی مام پیرداود، کۆگای محەمەد رەسوولّو کتێبخانەی عەسکەری خاوەنەکەی بە رەگەز عەرەب بوو فاروق ناوێك بوو، هەر لەو ریزدا کتیبخانەی سەربەستی هەبوو کە زیاتر (قرتاسییە) واتە پێویستمەندیەکانی قوتابیانو دایرەکانی هەبوو، دوکانی مەجید پاقلاّوەچیو فرنی سەموونو ئازاخانەی شیمالّو وەهانو عیادەی چەند دکتۆرێك وەك دکتۆر موحسین دۆغرەمەچی - دکتۆر ئاگووب ئەرمنی بوو، دوکانێکی تری بەرگدرووی پیاوان ئەرمەنی بوو تا فولکەی کۆتری ئاشتی کە لەو نێوەندەدا دەلاّلّخانەیەك هەبوو کەونەی تیا دەفرۆشراو چەند ژنێکیش لوێدا دادەنیشتنو کەونە جلو بەرگیان دەفرۆش، لە خوار فولکەی کۆتری ئاشتیش چایخانەو گەراجی تەنەکەیان پێ دەگووت زیاتر گوندنشینان لەوێوە هات وچوویان بە پیکابو پەست مسۆگەر دەکرد.. هتد، لەبەرەکەی تری پارێزگای ئێستا لە پالّ قەلاّتەوە کە ئێستا بووە بە شوورەو دوکانەکان نەماون ئوتوچی قەدۆو چایخانەی عوسمان دەرگەلّەیی کە شەهید بوو بە هوی تەقینەوەیك لە تەنیشت ئەویشدا چاپخانەی کوردستان هی (گیو موکریانی بوو)، کە لە تەنیشتەوەیشی کامیرای شەمسی بۆ وێنە گرتن هەبوو، وێنەگر سەری دەبردە ناو کامیراکەوەو وێنەکەی دەگرت، پاشان بۆ بە دوور بوون لە

ڕووناکی دەستی دەبردە ناو قوڵە خامێکی ڕەش ئینجا عەکسەکەی لە ئاودا دەشووشتەوەو وینەکەی وشك دەکردەوەو دەیدایە دەست خاوەنەکەی، با بگەڕێمەوە سەر چاپخانەکەی ڕەوانشاد گیو موکریانی، مێردمنداڵ بووم ماڵمان لەو جادەیە نزیك بوو، زۆر سەرسامی ئەو نامیلکەو کتێبانە بووم کە مام گیو لە جامخانەکەی نمایشی کردبوون وەك (فڕی فڕی قەل فڕی، چیرۆکی رۆستەمو زۆراب، بەختنامەو ئەمیر ئەرسەلان‌و مەلا مەشهورو حەکایەتی دزو قازی‌و یوسف‌و زولێخاو کۆلکە زێڕینەو دیوانەکانی شاعیرانی کلاسیکی.. هتد، لە بیرمە کە چەند کچێکی دراوسێمان پارەیان دامێ چووم (بەختنامە)م بۆ کڕین، ئەو چاپخانەیەو بەرهەمە چاپکراوەکانی‌و ناوەکەی بە ناوی (کوردستان) لەو سەردەم‌و رۆژاندا چاوگەیەکی ڕۆشن‌و رۆشنگەری بوو بۆ هەولێر، خۆیشی پیاوێکی بەڕێزو کورد پەروەرو دڵسۆزو ماندوو بوو یادی بەخێر زۆر جاران لەگەڵ هاوڕێم رەوانشاد نەوزاد محەمەد عەلی موختار دەچووینە لای‌و دادەنیشتین تێر نەدەبووین لە قسە خۆش‌و جوانەکانی، بەڵێ لەو چاپخانەیە دواتر چەند دوکانێکی سادە هەبوون لەوانە دوکانی مام هەمزەی ماست فرۆش تا دەگەیشتە دوکانی مەی فرۆشێك عبدالمسیح کرستیان بوو دواتر دوکانی خوالیخۆش بوو محەمەد جامچی‌و دوکانی (ئیبراهیم بەربەر (حەلاق) کە کاری برینپێچی‌و (سونەت) کردنی ڕگەزی نێرینەی دەکرد، لەسەرووی ئەوانیشەوە بەرامبەر بە کۆگایەك کە لە جامخانەکەیدا جل‌و بەرگی پیاوانی هەڵواسیبوو خاوەنەکەی (مام صالح) بوو، لەبەرامبەریشیدا چەند بەرگدرووێك هەبوون لەوانە بەرگدرووی جەلیل خەیات، دواتر بوز فرۆش عەدێ ناوێك بوو ئینجا چایخانەی مەچکۆ لە دامێنیدا فولکەیەکی لێ بوو پۆلیسی هاتوو چووی لێ دەوەستا،

لەوێشەوە شەقامێکی ڕاکشاو تا فولکەی ئاوی کەسكو سوّر بەرامبەر شیڕاتۆنی ئێستا، لە هەر دوو بەری ئەو شەقامە دا، چایخانەی حاجی مستیلو گەراجی موصلو چایخانەی عەبۆ قاوەچیو گەراجی جەلال خەلیلو چەندین (چیشتخانە)و کەبخانەو دوکانی تر هەبوون دواتر یانەی فەرمانبەران، بە دیوی دیواری ڕۆژهەلاّتی یانەدا چەند دوکانێكو دواتر قەبرستانی چراغ هەروا لە شوێنی داون تاونی ئێستا جەژنان بن لەلوکیان پێ دەگووت منداڵو ژنو پیاوێکی زۆری لێ کۆدەبۆوە، ئەمە وەك کورتە پانۆرامەیەك لەسەر ئەو شارە کە چەند بچووكو شوێنە گشتیەکانی لە خۆ دەگرت، شارستانیەتی هەولێر لە بازنەی ٣٠ مەتری تێپەڕی نەدەکرد، ئەگەر کەسێك وەفاتی کردبا جەنازەکەی بە دارەمەیت لەسەر شان دادەندراو خەڵکی بە دواوەی تا لە گۆڕستانەکانی ناو شار دەیانناشت، سێیەم ڕۆژی تەواو بوونی تازیە کەسوکارو برادەرو ناسیاوەکانی تازیەدار دەچوونە سەر گۆری مردوو، بەر لە هاتنی ئەو خەڵکە چەند سەبەتەیەك تەڕە حەلوا لوولدراو لە نێو نانو کاتی خوا حافیز بوونیان بە سەر ئامادە بووەکان دابەش دەکرا.

–هەر لەو شارەدا تا ناوەڕاستی ساڵی هەفتاکانیش لە نێو چەقی شارو شەقامەکاندا دیاردەی زۆر پاشکەوتووانە دەبیندران وەك عارەبانەی ولاّغو کەرو ئێستری لێیی بەستراو، لە هاتوو چۆ دابوو، قەلاّبو لۆریو نەفت فرۆشو پەستو قەمەرەو جێبو ئامانەو زیلو ئیڤای سەربازیو عارەبانەی دەستیو پیکابی شڕو وڕو کەری کورەچییان کە خشت یان بلّێین کەرپوچی لە تێرکەکانی لێ بار کرا بوو، جا لەو سەردەم لە نێو چینی ڕۆشنبیراندا وا بلاّو کرا بۆوە لە چوار شت ترسان لەو شارەدا

١ – زیلی سەربازی ٢ – کەری کورەچیان ٣ – پەستی عوێنە

٤ – تەلەبەی بەشی ناوخۆیی..

بۆ؟ شوفێرانی زیلی سەربازی حەزی لێبوو مل لە هەموو شتێك بنێ و سەرپێچی یاسا بكات بۆ ئەوەی زیندانی بكرێت باشترە لەوەی بینێرن بۆ بەرەكانی شەڕ لە كوردستاندا، كەری كورەچیانیش بە بارەوە ملیان لە هەموو كەسێك دەناو بە هێزبوون، هەڵبەتە كەرن و نازانن لادان چییە، پەستی عوێنەش زوو زوو لە رێگادا وەردەگەڕاو ناودەنگەكەی وا رۆیشتبوو، سەبارەت بە تەلەبەی بەشی ناوخۆیەكانیش لەبەرئەوەی هی لادێ و گوندان بوون، رۆژانە برنج و گۆشت و گەرماویان بەردەوام بوو، ئیتر چاویان سوورو خرت و هەڵپەڕماو، بە حیسابی قسەی شارستانیەكان كرمانج تێر بێ دەبێ چاوەڕوانی چی لێ بكرێت، واتە جێگای مەترسین.

(١٠)

سەیر کردن و هەست پێکردن بە وێنەو ڕووداوەکان و گوزەر کردن بە نێو دەهالیزە وردەکاریەکان و شتە نەشاراوەکانی دوێنێ و بەراورد کردن لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە سەیرو سەمەرانەی ئیستامان لە هەموو بوارەکان بگرە لە هەڵکەوتەی زانستی و تەکنیکی بە کەرستە تازەکانی و شێوازە بەرهەم هاتووەکانی لەبەرەو پێشەوە چوونی شارستانیەت و ژیاری و تەکنەلۆژیا و ئەلکترۆنیات تا ئاستی بە کۆیلە کردنی مرۆڤ و کار کردن بە ڕۆبۆت و گواستنەوەی داب و نەریت و ڕەوشتە کۆمەلایەتییە ڕەسەنەکان بۆ گەلەری و بیرچوونەوەی شتە دێرینەکان و جێگرتنەوەی تازە بابەتە سەپێندراوەکان و بەرایی نەگرتنەوەی لەو لافاوەی ناوی گۆڕانکارییە تیژ ڕەوەکانی سەردەم و پێشکەوتنە تەقیوەکانە، کە دەگەڕێمەوە سەر نەوەی خۆمانی خۆشی نەدیو، کە پاڵی بە خۆشییەك دابێ بیگێڕینەوە لە سایەی فەرمانڕەوایی ڕژێمە یەك لە دوای یەکە ڕەگەز پەرستە داگیرکەرەکان بە هۆی کوردبوونمان و شوێنگەی جوگرافی و ناوچەیی و بژێویمان لەو ژینگەیەدا، جا بە هێنانەوەی چەند نموونەیەك و ژیانی مەینتیمان لە نێوەندی کەم ئاشتی و دانوسانی بە فڕوفێڵ و شەڕی بێ ئامانی وێرانکەر هەر لە ٨ / ی شوبات ١٩٦٣ کۆدەتای بەعس و دواتر نەمانی دەسەلاتداریەتی و پاشانیش فەرمانڕەوی مشیر ڕکن عەبدولسلام عارف و

بوونی بە سەرۆك كۆماری عیراق تا كۆتایی ١٩٦٦ كە مەبەستمە لێوەوەی بدوێم.

لەو هەولێرە و، لەو گەڕەكەی بەندە لێی دەژیام گەڕەكی عارەبان، گوایە پێشكەوتووترین گەڕەگ بووو لە نێو چەقی شاردا، هەر ڕووداوێكك، بە سەرهاتێك، بۆنەیەكی خۆش و ناخۆش هەبووایە، هەموو گەڕەك، یەك چاویان هەبوو بۆ بینین، یەك گوێچكەیان هەبوو بۆ بیستن، یەك زمانیان هەبوو بۆ بڵاوكردنەوەی، نەك وەك ئێستا ئەم دراوسێیە ئاگای لەوەی تر نییە

ڕۆشنبیری و زمان و كەلتووری عەرەبی لەو شارەدا زۆر بە فراوانی بڵاو ببۆوە هۆكارەكەشی خوێندنیش زیاتر بە زمانی عەرەبی بوو بە تایبەتی لە قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، هەروا نەبوونی پەیمانگەو زانكۆكان لەو شارەدا، دەرچووانی ئامادەیی بۆ خوێندن دەبووایە بچنە موسل و بەغدا لە پەیمانگەو زانكۆكانیان بخوێنن، گشت نوسراوو مامەلە یەكی ڕەسمی لە دەزگاو دایرەكان بە عەرەبی بوو، خوێنەری كتێبە ئەدەبی و هونەری و وەرگێڕدراوەكانیش زیاتر بە زمانی عەرەبی بوو، فیلمە عەرەبییەكان بە تایبەتی میسری كاریگەری زۆری هەبوو بە سەر دانیشتوانی ئەو شارە، لە چایخانەكان و مالآن دەبینرا كە وێنەی (محەمەد عبدالوهاب – فرید ئەترش – عبدلحلیم حافز – ئیسمەهان – ئوم كلسوم – لیلی موراد – نازم غەزالی – كچی كافرۆش).. هتد، هەڵواسرا بوو، لەو ساڵانەی دوایانەدا نەریتی جل و بەرگ پۆشینی ژنانی كورد شێوازی عەرەبی سعودی و خەلیجی بووەو بە فراوانی لەبەر دەكرێ.

ئێستا چۆن لەو شارە ململانێ و ڕكابەری لە لایەن هەوادارانی ریاڵ مەدریدو بەرشەلۆنە هەیە، ئاوا ڕكابەری و ململانێ لە نێوانی هەوادارانی

فرید ئەترەش‌و عبدالحلیم حافز هەبوو بە تایبەتی لە نێو گەنجان، براکەم ڕەوانشاد جەلال کە هەشت ساڵان بە تەمەن لە من گەورە تر بوو بەردەوام شـــریتی بـــەکرەی دەخســـتە ســـەر تەســـجیل، گۆرانیـــەکانی محەمـــەد عەبدولوەهابی لێدەدا، کەلتوورو ڕۆشنبیری عەرەبی داگیری کرد بووین، منیش ببووم بە عەوداڵی گۆرانیەکانی محەمەد عەبدولوهاب.

ساڵی ٢٠٠٥ لەسەر فەرمانی بەڕێز مام جەلال تالەبانی ئاهەنگێکی گەورەی شەوانە لە ئوتێلی سەلیمانی پەلاس دا ساز کرا بە ئامادەبوونی چـەندین کەسـایەتی‌و ئـەدیب‌و هونەرمەنـدان‌و لێپرسـراوانی حزبـی‌و حکومی کە لەوێدا دوای ئاهەنگەکە بڕوانەمەی مام جەلال بە ئیمزای خۆی دابەش کرا بە سەر ئەو نووسەرو شاعیرو هونەرمەندانەی کە پێشمەرگە بوونە یان لە شارەوە بەرهەمەکانیان بە ناوێکی نهێنی ناردوویانە بۆ ناو شۆڕش‌و بلاو بۆتەوە هەروا زەرفێکی (مادی)یشی لەگەڵ بوو، جا بەندە کە لە پێشمەرگایەتی شیعرم بلاو ببۆوە لەسەردەمی خۆی‌و هەروەها لە ژێر ناوی (چیا) لە گۆڤاری نوسەری کوردستان، لە شارەوە بە نهێنی نارد بووم لە ١٩٨٤ دا لە شاخ بلاو ببۆوە، یەکێك بووم لەوانەی شەرەفی ئەو ڕێزلێنانەم پێ بەخشرا، بەو پارەیەی لە نێو زەرفەکەدا بوو پێیی چوومە میسر، کە ئامۆزایەکم لوێدا نیشتەجێیی ئەوێ بوو کۆمپانیەکی بازرگانی هەبوو بۆ مانگێك شوقەیەکی بۆ گرتم، ئەوەی شایانی باسە، بەیانیەك لە دەرگەی ئەو باڵەخانەیەی شوقەکەمی لێ بوو، (بواب) دەرگەوانی شوقەکە گوتی ئەو پیاوە حەزی لێیە قسەت لە گەڵدا بکات، پیاوێکی بالا بەرزی ڕەشتاڵە تا ئاستێك بە تەمەن بوو دیشداشەیەکی سپی لەبەر بوو، فەرموو، گوتی (ما تشرب معایا شای؟) چایەکم لەگەڵ ناخۆیەوە، گوتم فەرموو، دانیشتین گوتی شوقەکەی من بەرامبەر شوقەکەی تۆیە لەو باڵەخانەیەدا

حەزم کرد تعارفێك بکەین، وا دەبینم هەموو ڕۆژێك سیارەیەکی های های دێ‌و لە گەڵیان دەڕۆی‌و شەوان دەتگەڕێننەوە، گوتم ئەوە ئامۆزامەو لێرەدا کۆمپانیەی بازرگانی هەیە، گوتی ئاستی خوێندەواریت؟ گوتم هەندێك لە فەقیاتیم خوێندووە، لەوە ترسام پیاوی ئەمن (مباحس) بێت، گوتی زۆر هامشوی میسرت کردووە؟ گوتم نەخێر یەکەم جارە، ئەی چۆن ئەو عەرەبیەو بەو شێوەزارەی میسر وەك ئێمە قسە دەکەی؟ وتم لە فیلمەکانی میسری فێر بوومەو خوێندنیشم بە عەرەبی بووە، گوتی: بۆچوونت بەرامبەر بە میسر؟ گوتم لە نێوەندی ئیحسان عبدلقدوس‌و نجیب محفوزدا دەیبینم، یەکەمیان لەسەر خواپێداوەکان‌و ئوستوقراتی‌و کۆمبرادۆرو برجوازیەکان دەنووسی‌و دووەمیش لەسەر لانەوازو گەڕەکە میللیەکان وهەژارو لێقەوماوەکان دەنووسی، گوتی ئەی هونەرمەندان؟ ناوی زۆرێك لە ئەکتەرەکانم ژمارد دواتر گۆرانیبێژەکانیان محەمەد عبدالوهاب‌و ئوم کلسوم‌و نجات صغیرەو فرید ئەترش‌و عبدالحلیم حافزو زۆرێکی تر، گوتی کام گورانی محەمەد عبدالوهاب) بت پێخۆشە، گوتم هەموو گۆرانیەکانیم پێخۆشە بەڵام ئەو دوو گۆرانییەی کە لە ئاهەنگێکیدا خوالێخۆش بوو جمال عبدلناسر ئامادە ببوو (أفكر في الى ناسيني، وأول يا عيني لى تبكي مادام ليل ملوش اخر) شیعرەکەم بۆ تەواو کرد، دووەم (کولیدا کان لیە) گوتی ئەگەر بێیتە شوقەکەم دەبینی هەمان گۆرانیم لەسەر تسجیلە، لە من مەترسە من پارێزەرم‌و مەباعس‌و ئەو شتانە نیم بەڵام تۆش فێڵت لێ کردم، گوایە کەمێك خوێندەواریت هەیە، هاتووی لەگەڵ ئامۆزاکەت وەك کرێکارێك کار بکەیت، تۆ یان نووسەری یان سیاسی، یان هونەرمەندی، گوتی تۆ خەڵکی کوێی؟ گوتم کوردم‌و لە کوردستانی عیراق دەژیم، گوتی کوردەکان زۆر زیرەکن، جا مەبەستم ئاوا

کاریگەری کەلتووری عەرەبی و زمانەکەی بە سەرمانەوە دەستڕۆ بووە ئەگەرچی لە شوێنێکی ئاواش سوودی دەبێت گەلی کورد بە زیرەك لە قەڵەم بدرێین.

(١١)

پاش بەياننامەی ٢٩ی حوزيرانی ١٩٦٦ ڕاگەياندرا بارودۆخ لە كوردستانی عيراقدا گۆڕانكاريەكی زۆری بە بەرەوە بوو لە رووی سياسی و ئابووری و گەشتياری و كۆمەڵايەتی و ناوەنگی كوردو مەسەلە ڕەواكەی لە ناو ولات و دەرەوەی ولات، هەروەها بۆ ڕێكخستنەوەی پێشمەرگەو شۆڕشەكەی بە سەرۆكايەتی بارزانی نەمرو پەرەپێدان و زياد بوونی جموجۆڵ و چالاكيەكانی ڕێكخراوە جەماوەرييەكان بە تايبەتی يەكێتيی قوتابيانی كوردستان و چین و توێژەكانی دی، كە باسی گەشتياريمان كرد واتە لە ڕێگای ئەو ئاشتی و ئاراميیەوە هاوينە هەوارەكان بوژانەوە ئەوەندەی لەو هەولێرە بەرچاومان دەكەوت هاووڵاتيانی بەغداو باشووری عيراق بە گشتی، ژمارەيەكی زۆر بە خاوخێزانەوە روويان لە شاری هەولێرو ناوچە شاخاويەكانی كوردستانيان دەكرد هەڵبەتە سوودی بۆ بوژانەوەی ئابووری و پەيوەندييە كۆمەڵايەتييەكانيش زۆر بووو كە زياتر لە كەسێتی كوردو ناوچەكە بگەن كە ميللەتێكی ئاشتيخوازەو پڕۆپاگاندە ژەهراوييەكانی ڕژێمەكان ڕەت كەنەوە كە دژ بە پێشمەرگەو شۆڕش و كورد هەڵدەبەستراو كورديان ناشيرين كردبوو وەك دڕندە نيشانيان دابووين، هەروەها ڕيكخستنەكانی پارتی و يەكێتی قوتابيان لەو ماوەيەدا توانيان و بە هەڵيان زانی كە كۆنفراس و كۆنگرەو چالاكی هەمە جۆر ئەنجام بدەن، دەرفەتێكی باش بوو بۆ نووسەران بتوانن بلاوكراوەو

نووسـینەکانیان بخەنــە ڕووو ئەمــەو لــە (١٩٦٧) دا ڕۆژنامــەی التــاخی زمانحاڵی پارتی لە بەغدا دەرچوو، ڕۆژنامەیەکی سیاسـی بـوو، لـە مـانگی ئایاری /١٩٦٧ دا چەند وزارەتێك درایە کورد واتە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستـان بـە سـەرۆکایەتی بـارزانی، لەوانـە (لیـوا فوئـاد عـارف جێگری سەرۆك وەزیران)و (ئیحسان شێرزاد وەزیری شارەوانی و گەشتو گـوزار) ئەگــەر لەســەردەمی عەبــدولڕەحمان عــارف هیــوری‌و ئاشــتی وکەشــی بوژانەوەو کرانەوە زیاتر بوو بەر لە ڕژێمەکانی دی بەڵام بۆ کورد کێشەو کـرژی‌و نائـارامی هـەر پەیـدا دەبێـت جگـە لـەو براکـوژی‌و دووبەرەکییـەی هەبوو لە نێـوانی بـاڵی پـارتی‌و بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی، کـە وا بـاو بـوو بـە (جەلالی‌و مەلایی) ناو دەهێنـدران، خـۆ پشـێوی تـر لـە هـەولێر ڕوویانـدا بـۆ نموونە لە ٢٨/ی مانگی ئەیلولی ١٩٦٦ دوای ئەوەی لە هـەولێر لـە دامێنـی قەڵاتــدا برایــەکی ســەرۆك جــاش (حەمــەی ســابیر) کــوژرا بــە دەســتی پێشمەرگە، ئیتر وەك لە سەلیمانی ئەو وشەیە باوە، قڵیشـایەوە، بـەڵێ لـەو شارەدا لە هەولێر، دوکانـەکان داخـران‌و خەڵکەکـە بـەرەو مـاڵ بوونـەوە کـە ئەم حاڵەتە زۆر جارانیش دوو پات دەبۆوە دوای تەقـەو کوشـتنی جـاش‌و سیخورەکان لە نێو جەرگـەی شـاردا، جـا ئـەو کەسـەی کـە براکـەی حەمـەی سابیری کوشتبوو گوایە ڕانکو وچۆغەیەکی لەبەر بووە، ئیتر چەکدارەکانی حەمەی سابیری سەرۆك جاش بە ناو شار کەوتن لە تۆڵـەی ئـەو برایـەی لـە تـەیراوەو کـوران‌و بـاداوەو سـەیداوە، ئـەوەی جلـی کـوردی لەبـەر بـوو بـە تایبـەتی ڕانکوچۆغە کوشـتیان لەوانـە گـەنجێك کـە نـاوی جمشـید عسـاف بوو، ماڵیان لە گەڕەکی عارەبان بوو چەند ماڵێك لـە خـوار مـاڵی ئێمـە بـوو، هاوڕێم بوو، یـادی بـەخێرو ڕۆحـی شـاد قوتـابی بـووو تـازە فـەریك‌و گـەنج بـوو یـەکێك بـوو لـەو شـەهیدانە، بـەڵام زۆری پـێ نەچـوو لـە تۆڵـەی ئـەو

گەنجانە لە ئێوارەیەکی عالفە بەر لە جەژن، پێشمەرگە قارەمانەکانی دەشتی هەولێر بە ڕابەری (عەلی تەکتریوف سیان) کە لە ژێر پردی شێراوە لە نێوانی (پردێ) ئالتون کۆپری‌و هەولێردا لەسەر ڕێی کرکوك لە بۆسەدا بوون چاوەڕوانی حەمەی سابیریان دەکرد بە هێزێکی زۆرەوە لە بەغداوە دەگەڕایەوە بۆ هەولێر جا عەلی تەکترێۆف خۆی‌و پێشمەرگەکانی بەراییان لە هێزەکە گرت ڕوواو ڕوو بە دەستڕێژنەی تەکتریۆف‌و چەکەکانیان لێیان گڕ دان ژمارەیەکی زۆر لەو هێزەی جاشەکان کوژران‌و بریندار بوون، یەکێ لەوانەی کە کوژراوو هەواڵی کوژرانەکەی لە کوردستان‌و ناو شاری هەولێر بلاو بۆوە سەرۆك جاش (حەمەی سابیر) بوو، ئەو ئێوارە یە کە بەیانی دەبووە جەژەن ئیتر بوو بە دوو جەژن، ئەوەی جێی داخە لوێدا پیاوی قارەمان‌و پێشمەرگە عەلی تەکتریوف سیان شەهید بوو.

– لە هەرەتی هەڵچوون‌و هەرزەکاری‌و گەنجییەتی بووم لە ساڵی ۱۹٦٥دا بووم بە ئەندامی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بە نهێنی‌و شاردنەوەی ئەو بابەتە لە پێنەزانینی باوکم‌و دایکم‌و برا گەورەکەم کە ئەو برایەشم لە ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان کاری نهێنی ناو شاری دەکرد ئەو کات لە پۆلی یەکی ناوەندی زازا بووم، یەکەم کەس کە هاوڕێم بوو لەو ساڵەدا پەیوەندی پێوە کردم کە لە نێو ڕیزەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بە نهێنی لە شاردا کار بکەم خوالێخۆش بوو (ئەسعەد محەمەد قەرەداغی) بوو ماڵیشان هەر لەو گەڕکەکەی خۆمان بوو گەڕەکی عارەبان، ڕۆژانە ڕادیوی دەکردەوەو لاسلکییەکانی پێشمەرگەی لە ڕادیۆکەی وەر دەگرت چ هەواڵێکی چالاکییەکانی پێشمەرگەو شەڕەکانی بەرەکان هەبووایە پێیی ڕادەگەیاندم جگە لەو بلاوکراوانەی لە ناو شۆڕشەوە دەهات‌و بە نهێنی دابەشمان دەکرد، وەك دەروێشێکی سەر

گەرم، کوردایەتی و شۆڕش و پێشمەرگە هەموو مێشکی داگیر کرد بووم، لە پاڵ خوێندنی قوتابخانەش، جگە لەوەش گوڕی گەرمی گەنجیەتی و خۆ بە شت زان، دڵداری و بێعاریەکیشم کردووە لە نێو گەڕەك و ئێرە وئەوێ بە شەرم و پارێزو شاراوەیی بۆ نموونە لە هەندێ لە شیعرەکانمدا ڕەنگی داوەتەوە ئەوەتا لەو شیعرەدا دەڵێم:

خەیاڵان دەکەم جارێکی تر بگەڕێمەوە
حەزی جارانم ببێتەوە بە تۆپێك
شەقێکی تێهەڵدەم و
هەڵیدەمەوە حەوشەکەی ئێوەوە
دواتر لە دەرگا بدەم و
جارێکی تر تۆپەکەم...
ڕووخساری تۆی لەسەر هەلنیشێ
ئەوینی تۆی پێوە بنووسێ
ئەوسا بیهێنمەوە

دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بە خاڵێك بکەم ئەویش ئەوەیە، نەك لە ریزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لەو سەردەمدا بگرە تا ساڵی ڕکەتنەکەی ١١ /ی ئاداری ١٩٧٠ لە نێو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردی ئەو پەڕی متمانە و دڵسۆزی و وەفا و پەیمان و جوامێری و شەڕەفمەندی و ڕەسەنایەتی و ڕاستگۆیی هەبوو، بەرژەوەندی و نەمیمی و مل شکاندنی یەکترو بێ بڕوایی لە دەرەوەی رۆحە گەورەکەی مرۆڤی کورد بوو، ڕۆحی کوردایەتی و خاکپەرستی لە ترۆپك بوو، ناوی پێشمەرگە هێندە پیرۆزو

گەورە بوو، خۆشەویستی سەرپشك بوو لە هەموو بوارەکاندا، ئەوەتا بە یەك ئیعازی ئاڕاستەیی شۆڕش و حزب لە هەولێر لە شوباتی ١٩٦٥ بۆ مانگرتن دژ بە کردەوە نەگیرسەکانی ڕژێمی ئەوسا زۆر بە سەرکەوتوویی بۆ ماوەی ٢٤ سەعات هەموو دوکانەکان داخران و دام و دەزگا و دایرەو کارەکانی ناو شار ڕاوەستا مانگرتنەکە زۆر سەرکەوتوو بوو.

(١٢)

ئەگەر حوكمڕانی عەبدولڕەحمان عارف سەرۆك كۆماری عیراق لە ١٦ /ی نیسان ١٩٦٦ دەستی پێكرد تا ١٧ / ی گەلاوێژی ١٩٦٨، بە درێژایی فەرمانڕوایی ناوبراو لە چاو دەسەلاتدارانی بەر لە خۆیو دوای خۆیشی ئارامترو باشتر بوو بە ڕێژەیەكی مام ناوەند هەر چەندە شلیو پەیتی تایە بوو، جار جاریش لە زۆر ڕووەوە گورگەكە لە خەو هەڵدەستا بۆ تەمەن خواردنمانو تێكشكاندنی دەروونیو نەهێشتنی خەندەو خۆشییەكی ژیانكردنمان ئێمەی كورد لە هەموو زروفو بارێكدا جەربەزو خۆ ڕاگرو لەسەر پێ وەستاوین، زۆر جاران دەڵێین چاك نییە ماوین، ئەو هەموو ماڵ وێرانیو ئاوارەییو شەهید بەخشینە، هەر بێ ئومێد نەبووین، ئەو وتەیەی نووسەری گەورەی ڕووسی (چیخۆف) لە لای هەر تاكێكی كورد دووپات دەبێتەوە بە ناچاری كە وتوویەتی: (بۆ ئەوەی ئیدی لەمەو دوا، تەنانەت ئەو كاتانەش كە لەو پەڕی نیگەرانی دایت، شادو بەختەوەر بژیت، یەكەم ڕازیبیت بەوەی كە هەتە، دووەم دەبێ باوەڕی تەواوت بە دەستەواژەی لەوانەیە لەمەش خراپتر ڕوو بدات، ئەگەر دڕكێك لە پەنجەت چەقی، بڕۆ سوپاسی خوا بكەو بڵێ چاك نەبوو لە چاوم نەچەقی)

خۆ خۆمانیش وەك كورد گورگ بووینە بۆ خواردنی هەڕەتی تەمەنی خۆمانو ئایندەشمان هەر وەك لە شانۆگەری (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا) هاتووە دەڵێت: (ئەوە ئەو مرۆڤەیە گلەیی لە پێلاوەكەی دەكات كە تەنگە،

کەچی هەڵەکە لە پێیەکەێیتی کە گەورەیە) ئەوتا شۆڕشەکەمان شۆڕشی ئەیلوول، کە لە ساڵی (١٩٦٤) وە بووین بە دوو باڵ و باڵی پارتی بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسی بە ڕێبەری ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانی، ئەم پەرتەوازییە و ململانێ و دووبەرەکییە پەرەی سەندووەو پەتا و بەڵا و ئافاتێك بووە یاخەی بەر نەداوین کە چەندین برا کوژی و شەری ناوخۆیی لێکەوتۆتەوە و دوژمنانی کوردیش بە هەڵیان زانیوە بە پیلانگێڕی و ئاگر خۆشتر کردن و هەر جارەی هانی لایەکیان داوە بەرامبەر بە لایەکەی ترو سەپاندنی هەژموونی ئەویان بە سەر ئەوەی تر بۆ بە فیڕۆدانی مافی کورد و لاواز کردنی داواکانی، ئەوەتا هەر لەسەردەمی عەبدولڕەحمان عارف، کە بۆ کورد و مافە ڕەواکەی پێمان باشتر بوو لەوانەی پێش خوی و دوای خۆیشی، کەچی دارو دەستەکەی لە ١٩٦٧ دا لایەنگیری باڵی مەکتەبی سیاسی دەکرد بۆ ئەوەی پەرە بە شەڕی ناوخۆیی نێوان هەردوو باڵی کورد و کورد کوژێنی بدات، لە هەمان کاتدا گفتوگۆی سیاسی و هامشۆی لێپرسراوە باڵاکانی بەردەوام بوون لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوول بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی، شەڕی ناوخۆیی کورد و کوردیش لەو ماوەیەدا بەردەوام هەبوو، دوای ئەوەی لە مانگی نیسان (١٩٦٨) دا سەرۆك هۆزی (تەی) فرسان خالید) (شێخ حەنەش) لە دەور بەری گوندی عارەبکەند خۆی و پاسەوانەکانی کوژران، بۆ تۆڵە سەندنەوە هەر لە هەمان مانگدا ١٩٦٨، هێزێکی گەورەی جەیش و جاش بە تۆپ و زرێپۆش و تانك، هێرشیان کردە سەر پێشمەرگەی دەشتی هەولێرو گوندی بێستانە کە زیاتر دەشتە، دوای ئەوەی پێشمەرگە قارەمانەکانی ئەو دەڤەرە بەرەنگاری ئەو هێزە زەبەللاحە بوونەوە لەم دەشتاییەدا توانیان هێزەکەی داگیرکەر بە زەرەرو زیانێکی زۆری

شکستخواردووو پاش بەجێهێشتنی چەندین لاشەی جەیش‌و جاش‌و بە تێکشاوی سوتانی تانك‌و زرێپۆش‌و چەکە قورسەکانیانیان بە سەر شۆڕی گەڕاُنەوە.

لەو بەروارو قۆناغەدا، مەبەستم شاری هەولێرە کە تیایدا ژیاوم ئەگەر لەگەڵ ئێستادا بەراوردی بکەم سەبارەت بە پێشکەوتن‌و دوا کەوتوویی لەگەڵ ئەو سەردەمدا، کە کاریگەری شەڕو نەبوونی ئارامی‌و ئاشتێەکی راستەقینەو بنیاتنان، بۆیە بە نموونە باسی ڕەنگ‌و رووناکی بکەم لەو سەردەمەدا پەیوەندی ڕاستەو خۆی هەیە بە دەروونی مرۆڤەوە بە تایبەتی لە قۆناغی منداڵی‌و دواتریش مانەوەی ئاسەوەری‌و کاریگەری لە گەورەیدا، بەڵێ لەسەردەمی نەوەی ئێمەدا، هەموو شیتێك رەش‌و سپی بوو، هەر لە کتیبی قوتابخانەکان بە وێنەو نووسینەکانیان، تابلۆو ناونیشانەکانی سەردەرەی دایرەو دوکانەکان، کتێب‌و نامیلکەکانی ئەدەبی هەتا ئەدەبی منداڵان کە وێنەی تیا بوو وێنەکان ڕەش‌و سپی بوون، هەر وا هەموو ریکلام‌و هەموو بڵاوکراوەیەك بە رەش‌و سپی بڵاو دەکرایەوە، هەتا ریکلامی سینەمەکان کە لە نێو بازاڕدا دەگەران‌و بە وەرقە بڵاویان دەکردنەوە وێنەو نووسینەکان بە رەش‌و سپی بوون، خۆ زۆربەی فیلمەکانی سینەماش رەش‌و سپی بوون، بۆ نموونە خۆشترین فیلم هەر چەندە فیلمێکی تراژیدی‌و دڕامی‌و گریاناوی بوو کە بینیوومە فیلمی (ام الهند)، بەلام، رەش‌و سپی بوو، کوا وەك ئێستا شەوانی شارەکانی کوردستان رەنگاو رەنگ، درەوشاوە بە گلۆپ‌و رووناکییەکان رازاوەیە لە دوورەوە جوانیە ڕەنگاو رەنگەکان بانگمان دەکەن، هەتا بۆ ریکلامی ماتەمینی‌و ئاهەنگەکان‌و هەر بۆنەو ئاگاداریەك بە فلێکسی رەنگاو رەنگ لە نێو شارداهەڵدەواسرێ، بەڵێ سەرەتا کە تەلەفزیون پەیدا

بوو لەو شارەدا هەر رەش‌و سپی بوو، مەگەر لە ئاهەنگی بووك گواستنەوە کە هەولێریەکان ئەگلەنجەیان دەکرد لە شەواندا رستەیەك گلۆپی رەنگا و رەنگیان هەڵدەواسی، یان لە سینەمەکان بە تایبەتی سینەمای حمرا گلۆپی سوور پێدەکرا لە لامان زۆر جوان بوو، یان خەڵکی ئەو شارە شەوان روویان دەکردە لای فوارەیەك واتە ئاوی (کەسك‌و سوور) کە لە ئەڵقەکانی پێشوو ئاماژەم پێ کردووە لەبەرامبەر ئوتیلی شیراتۆنی ئیستا بوو، بۆ چاو روونکردنەوە بە ئاوی کەسك‌و سۆر خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەری کۆ دەبوونەوە، رەنگ ئەوەندە بە نرخ‌و بەهادار بوو کەچی بینین‌و مامەلەمان لەگەڵ رەش‌و سپی بوو، ئەوەتا کاریگەری‌و بێبەشیمان لەو سەردەمدا لە لای بەندە وا کەوتۆتەوە لە قەسیدەی (رەنگ‌و گری) دا کە لە کۆبەندی (کارێزە مەرجان) دا لە لاپەرە (١٩٤) دا بلاّو بۆتەوە ئەوەش چەند دێرکە لەو قەسیدەیە کە بیخەمە روو:

رەنگەکان چەند جوان‌و بۆندار بوون
ئێستاش سیحرو پۆرگی جیلوەی تەقیویان
بە نێو سەرو دڵمەوە هەڵدەرژێن
بە هەورازی رۆژەکانمەوە هەڵدەگەرێن
ئای گلۆپە نارنجی‌و سەوزو سوورەکان
کە لە ئەگلەنجەو سینەما و
ئاهەنگەکان هەڵدەخران
یا لە ژێر فوارەی ئاوی ئافورەکانەوە
هەڵدەچوون بە ئاسمانا و
بە سەر سەرمانەوە دادەرژان

چەند جوان بوون، هێلکە رەنگاو رەنگەکانی
سەرە ساڵی جەژنی کرستیانەکان
چەند جوان بوون
شەمامەی بۆندارو بلیاردو نارنجەکان
عەریجی لوولەیی و لەگلەگ و
لەوزینەو گەزۆکان
چەند جوان بوون
ئەو بەردە لووسانەی سەر مەرقەدەکان
کە دایکم بە دەم نزاو پاڕانەوە
بە سەر سینگی دادەهێنام.... هتد

(١٣)

**بەندە لەگەڵ ڕەوانشاد دکتۆر عەبدوڵلا حەداد**

یەکەم دانشتن و پیکگەیشتنم لەگەڵ کاك عەبدوڵلادا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٦٧) ئەویش بە هۆی خوالێخۆش بوو هاوڕێی خۆشەویستمان کاك نەوزاد مەحەمەد عەلی موختار لە چایخانەی (ولیەم) کە ئەرمەنی بووو چایخانەکەی لە شوێن شوورەی پێشەوەی ئێستای پارێزگای هەولێر بەرامبەر سینەما سەلاحەدین ئیتر لەو ڕۆژەوە یەکترمان ناسی و زۆر جار یەکترمان ئەدی و مرۆڤێکی کورد پەروەرو بە وەفا و چاوتێرو خاکی بوو زۆر زۆر لە خەمی شارەکەی خۆی بوو لە بنەماڵەیەکی دیارو بەڕێزی هەولێر بوو لە ١٩٤٦ لە گەڕەکی (سەرا) ی قەلاتی هەولێر لە دایك بووە.

لە ساڵی ١٩٦٨ کە قوتابی بوو لە بەشی کوردی کولێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا سەردانێکی بەغدام کرد بەو ناونیشانەی بۆی دەستنیشان کرد بووم، چوومە لای لەوێش.

بۆ یەکەم جار بوو لەگەڵ مەحموود زامدار تەعارفی پیْ کردم کە ئەوسا هەردوو خوالێخۆشبوو دەستی نووسین و هەروەها لە نێو ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی لە عیراق ڕۆڵی بەر چاویان هەبوو کە ئەوکات منیش (ڕۆڵی لێپرسراوەتیم هەبوو لە یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا)

دوای ئەو سەفەرە لە ١٩٦٩ چوومە ریزی شۆڕش‌و بووم بە پێشمەرگەو تا رێکەوتنامەی ١١ ی ئادار ئەوسا یەکترمان بینیەوە ئەو یەکتر بینینی هاوڕیانەو خۆشەویستانەو ئاڵو گۆڕکردنی بیرو بۆچوون‌و بە یەکەوە چەند سەفەرێکمان لە نێو کوردستانەکەی خۆمان کرد، لەوانە بۆ ساغکردنەوەی ژیانامەی شێخ رەزای تاڵەبانی کە تێزی دکتۆراکەی لەسەر ئەو زاتە بوو چووینە کۆیە لای مەلایێکی پیری هاودەم وسەردەمی شێخ رەزا کە ناوی (کاشانی) بوو ئەویش شاعیر بوو، هەروەها بە یەکەوە چووینە کەرکووك لای ماڵە شێخانی خزم‌و ناسیاوانی شاعیری نەمر شێخ رەزای تاڵەبانی بۆ هەمان مەبەست، ئەویش لە ساڵی (١٩٨٠) بەر لەوەی بچێتە فەرەنسا بۆ خوێندن کە لە زانکۆی سۆربۆن وەرگیرا لە ساڵی (١٩٨٨) دواتر قۆناخەکانی باڵای بڕی‌و دکتۆرای لە ئەدەبی کوردی لە (١٩٨٨) وەدەست هێنا.

ئەو ماوەیەی کە لە فەرەنسا بوو ناوە ناوە نامەی بۆ ناردووم وهەموو برادەرانی خۆی بە سەردەکردەوە، یەك لە بیرەوەرییە خەندە ئامێزەکان ئەوە بوو لە ساڵانی بەر لە رۆیشتنی بۆ فەرەنسا جارێکیان من‌و بەرێز کاك محەمەدەمین دهۆکی لە ماڵیان داوەت بووین دوای نان خواردن‌و دانیشتنیکی خۆش کە خوا حافیزی لە یەك بکەین هەردوو کوڕەکانی خوا تەمەنیان دریژ بکات (کاوە) کە ئێستا ئەفسەرەو (بەختیار) کە کوڕێکی رۆشنبیرو لێهاتووو وەرگێڕە لە قونسولیەی فەرەنسی لە هەولێر، ئەو دوو کوڕە کە ئەوسا منداڵ‌و پێڕۆکە بوون زۆر بزێو بوون کە من‌و کاك محەمەدەمین هاتینە دەرەوە پێڵاوەکانمان لە پێ بکەین دیار بوو (کاوە) برنجی لە پێڵاوەکان کرد بوو (بەختیار)یش شلەی بە سەر داکرد بوو

بەو پێیەی کە دکتۆر عەبدوڵلای خوا لێخۆش بوو خۆی باسی دەکرد لە ساڵی (١٩٦٦) وە دەستی بە نووسین کردووە لە یەکەم نامیلکەی بە ناوی (نەفرەتی چوار خوایەکە) کە بە عارەبی بوو بە چاپی گەیاندووە تا دەگاتە دوا کتێبی مێژووی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی لە شاری هەولێر ١٨٩٠ – ١٩٥٨ هەروەها لەمەڕ شاعیران (میهری ونالی و عەلی فەتاح دزەیی) نووسینی بڵاو کردۆتەوە... هتد

ڕەوانشاد دکتۆر عەبدوڵلا حداد، زمانی تورکی وعەرەبی و فەڕەنسی جگە لە زمانی دایك (کوردی) دەیزانی

گۆڕی پڕ نوور بێ زۆر ماوە قسەی لەسەر بکەم لێردا ئەوەندە بوار هەبوو، حاجی قادری کۆیی شاعیر دەفەرمووێ:

مەرگ و ژین میسلی سێبەرو هەتاوە
ئەوەی باقی بمینێ هەر ناوە

ناوی (بەختیار)م هێنا بوو، کوڕەکەی دکتۆر عەبدوڵلا حداد کە زۆر بەداخەوە بەر تەقینەوەی مینی داعش کەوتووو گیانی سپارد، ڕۆحی ئارام و شاد بێت.

(١٤)

لــە گۆشــەنیگای قۆنـاغی رۆژانێـك نـە ئاشـتیو نـە ئـارامی بـۆ كـورد وخستنی بارو بنەو لێیی راكشان.. نەخێر بەڵكو دانووسانو قونە شەڕو خۆ رێكخستەوە رووەو هەڵشاخان هەر هەبووە، واتە ئەو كوردەهەمیشە هەر خۆی بە مێوان زانیوە لەسەر خاكی خۆیدا ئێمەی قوتابیانیش لەو سـەردەمدا بۆمـان نەلوایـە بـە دڵێكـی ئاسـوودەو متمانـەیی خـۆجێیی خوێنـدنی خۆمـان بـە ئیسـتراحەت بخـوێنین، هـەر چـەندە لەسـەردەمی حوكمڕانی عەبدولڕەحمان عارف سەرۆك كۆماری عیراق لە ١٦ ی نیسانی ١٩٦٦ وە تا ١٧ی تموزی ١٩٦٨ جۆرە سەربەستیەكو ئارامییەك هەبوو تا ئاستێك بەراورد بە رژێمەكانی تری بەر لە خۆیو دوای خۆی، ئەگەرچی جار جاریش شەڕو كێشەو گرژیو پیلانگێڕی لیّ دەكەوتەوە.

سـەبارەت بـە ڕێكخسـتنو رۆڵـی یـەكێتی قوتابیـانی كوردسـتان لـە نێوەنـدی ئـەو زەمەنـەی سـەرەوە دا كـە ئامـاژەم پێكـردووە لەبەرئـەوەی دەستەلاّداریەتی رژێمی ئەو سەردەم زەعیفو دەست قۆڕس نەبوو، كار كردن لە رێكخستنەكانی یەكێتیی قوتابیان ئەگەرچی بە نهێنی بوو، بەلاّم زۆربەی ئەندامانی نێو ئەو رێكخستنە یەكترمان دەناسیو لێك ئاشكرا بووین، بگـرە لـە نێـو هـەموو چینو توێـژەكانی كۆمـەڵی كـوردەواری ئـەو حالّەتە هەبووە هەتا لە نێو رێكخستنەكانی حزبیش، چونكە ئەو پەری متمانەو پەیمان نەشكاندنو رەسەنایّتیی هەبوو بە رۆحێكی كوردانەوە،

زمـان لێكـدانو راپـۆرت نووسـین لەسـەر یەكتـر دەگمـەن بـوو، هـیچ بەرژەوەندیەكیش لـە ئارادا نـەبوو، لەگـەڵ زۆربـەی حـزبو رێكخراوەكانی جەماوەری تر دۆستایەتیو هاوخەباتیی یەكتـر دەكرا بە تایبـەتی لەگەڵ حزبی شیوعی لـە كوردسـتاندا، نكوڵی لـە رۆڵـی ئـەو قوتابیانـە ناكرێ كە چـەند چـالاكو بزێـو بـوون بـۆ خـەباتی كوردایـەتی بـە تایبـەتی ئـەو قوتابیانـەی هـی گونـدو لادییـەكان بـوون لـە شـار دەیانخوێنـد چ لـە بەشـە ناوخۆییـەكان بـوون یـان بـە خاوخێزانـەوە دەربـەدەرو پەڕاگەنـدی شـار ببـوون، هـەروا خانـەی پێگەیانـدنی مامۆسـتایان (دار المعلمـین) كـە خوالێخۆشـبوو مجید ئاسـنگەر بەڕێوەبـەری بـوو، مۆڵگـەی رۆشـەنگەریو كوردایـەتیو رێكخسـتەكانی قوتابیـانو پـارتی بـوو، یەكـەم بڵاوكـراوەی ئـەدەبی بـە نـاوی تیشـك لەوێـدا بـڵاو كرایـەوە زۆربـەی شـیعرو وتـارو نووسـینەكان رۆحـی كوردایـەتی بـە بـەرەوە بـوو، مـن یـەكێك بـووم تـازە هەڵمـەقۆی شـیعرم لێ دەكەوتـەوە چوارخشـتەكیەكم تیایـدا بـڵاو بـۆوە ئـەو كات هێشتا نازناوم بە (ئاوارە) هەڵنەبژاردبوو بە نـاوی (موحسـین رشـید) بڵاو كرایەوە لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٩ دا،

لە ساڵی ١٩٦٧ دا پسولەی بە ئەندام بوونم بە (ئەنـدامی لیژنـەی شـاری هـەولێر) م پـێ بەخشـرا لـە لایـەن سـكرتاریەتی یـەكێتیی قوتابیـانی كوردسـتانەوە كـە دەرچـوو بـوو، شـەرەفمەند بـووم بـەو لێپرسـراویەتەو متمانەیەی پێم بەخشرا، لەو تەمەنەدا كە لە پۆلی سێی ناوەندی زازا بووم ئەوسا هەروا ئەندامی پارتی بووم لە حزبیشدا كاراو چالاك بووم. جا بۆ بەڕێوەبردنی یەكێتیی قوتابیان لە نێو شاردا دوو لیژنە پێكهاتبوو پاش ئـەوەی كـۆنگرەی پێنجـەمی یـەكێتیی قوتابیـانی كوردسـتان لـە ١٤ / ٧ / ١٩٦٧ بەسـتراو بڕیاری لەسەر درا، یەكەم لیژنەی شار كە لێپرسراوەكەی

ئیسماعیل حوسێن ئەحمەد بوو، ئەندامانی لێژنەکەش پێکهات بوون لە (سەردار ئەبو بکر عەزیز خەرابەدراوی - موحسین رشید (ئاوارە) - عەلی محمود جوکل - ئەسعەد محەمەد قەرەداغی - ئەکرم مەنتك - جاسم بامەڕنی) هەروا لیژنەی دووەم بۆ قەزاو ناحیەو دەرەوەی شار بوو کە لێپرسراوەکەی حسام کەریم بەرزنجی بوو

جارێکی دیکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ دا، گۆڕانکاری بە سەر لێپرسراوو ئەندامانی لیژنەی شاری هەولێر داهات کە پێکهاتبوو لە دوو لێژنەی شار، لێژنەی یەکەم بریتی بوو لە (عەلی محمود جوکل - ئەسعەد محەمەد قەرەداغی - سەردار ئەبوبکر عەزیز خەرابەدراوی)

لێژنەی دووەم پێکهاتبوو بوو لە (ئەکرەم مەنتك - موحسین رشید (ئاوارە) - عەبدوڵلا قەرەنی - قەهار رسوڵ)

لەسەرەتای کانوونی یەکی ١٩٦٧ دا لە لەسەرووی رێکخراوەکەی خۆمانەوە باقایەك (وەصل) ی مۆرکراو کە مۆری مەکتەبی سیاسی پارتی پێوە بوو درایە منو سەردار ئەبوبکر بۆ ئەوەی بە سەر چەند دەولەمەندێکی هەولێرو مامۆستاکانی خۆمان لە ناوەندی زازا دابەش بکەین لە بری وەرگرتنی یارمەتی بە ناوی (یارمەتی زستانە) بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان کە پارەکە (٣) دیناری ئەو کات بوو بۆ فەرمانبەرو مامۆستاکان، (٥) دیناریش بۆ دەوڵەمەندەکان، لەگەڵ سەردار ئەبوبکر رێك کەوتم کە پێکەوە بچینە لای دەولەمەندەکانو پارەکانیان لێ وەرگرین، دووەم کار وەرگرتنی پارە لە مامۆستایانی ناوەندی زازا کە خۆیشم قوتابی بووم لە سێیی ناوەندی ئەو قوتابخانەیە، ئەو وەصلانە کە درایە ئێمە دەبوو لە شانەکانی رێکخستنی خوارەوەی خۆمانیش چەند هەڤاڵێك هەڵبژێرین بەم کارە هەڵسن، بەلاّم منو سەردار کە دوو ئەندامی

لیژنەی شار بووین بڕیارمان دا خۆمان دابەشی بکەین نەك هەڤالآنی تری خوار خۆمان توشی کەشف بوون و کێشە بێن، جا من دەستم پێکرد یەك یەك بە نهێنیی پەیوەندیم بە مامۆستاکانم دەکرد لە ناوەندی زازاو دەمگووت ئەو پسوولەیە کە ناوی تۆی لەسەرە لەسەرکردایەتی شۆڕشەوە هاتووەو (٣) دینارمان بدەیتێ بە بۆنەی هاتنی زستانە هاریکاری پێشمەرگەیە، چەند مامۆستایەك بێ سێ و دوو پارەکەیان دەدامێ دەیانگوت تەنیا ئەو نهێنییە بپارێزەو ئاگات لە خۆت بێت، بەلآم رۆژی دواتر مامۆستا حسام شاکر کە جێگری بەڕێوەبەر بوو، گوتی کوڕی خۆم تۆ خۆت قوتابی لێرە چۆن ئەو جۆرئەتە دەکەیت لە مامۆستایانی خۆت دوای ئەو پارەیە بکەیت، جێی شانازییەو پێمان ناخۆش نیە، بەلآم پەیوەندی بە هیچ مامۆستایەکی تر مەکە تا تەگبیرێکی تری لێ دەکەین، ئەوە بوو لای خوالیخۆشبوو (لەتیف حامد)ی چیرۆکنووس کە مامۆستای عەرەبی بوو لەو قوتابخانەیە ناوەندی زازا، مامۆستا حیسام شاکر باسی لەگەڵ کرد بوو، مامۆستا لەتیف بانگی کردم گوتی کوڕم ئەو کارەی تۆ دەیکەی زۆر ترسناکەو کەشف دەبی و دەگیرێیی، لە چەند مامۆستایان پارەکەت وەرگرتووە؟ گوتم چوار، گوتی کێیان لەوانە پێی گوتی ئەو پارەیە نادەم؟ گوتم (شێخ جەلال بەرزنجی) کە خزمی خۆی بوو، گوتی هەموو وەصلەکان ناوی مامۆستاکانی لەسەر نووسراوە، گوتم بەڵێ، گوتی هەموو وەصلەکان بیدە بە من و پارەکانت بۆ وەردەگرم و وا جوانترە نەك تۆی قوتابی خۆت لێرەی و تۆ لێیان وەرگریت، وەصلەکانم دەیێ و بۆ رۆژی پاشتر پارەی لە هەموو مامۆستاکان وەرگرتبوو هەتا لە (شێخ جەلال بەرزنجی) یش و مامۆستایەکی عەرەبیش موصلاوی ناوی (سالم) بوو.

(١٥)

پاش ئەوەی (عبدالسلام عارف) سەرۆك كۆماری عیراق لە نیسانی ١٩٦٦ لە ناو فڕۆكەیەكی كۆپتەر بووو لە شاری بەسڕا كەوتە خوارەوەو كۆتایی بە ژیانی هات (عەبدولڕەحمان عارف) براكەی بوو بە سەرۆك كۆماری عیراق، هەروەها د. عەبدولڕەحمان بەزاز بوو بە سەرۆك وەزیرانی عیراق، ئەوەی شایەنی وتنە دوای ئەوەی سوپای عیراق لە شەڕی نەبەردی مێژوویی هەندرێن لە ١٢/ ٥ / ١٩٦٦ لە لایەن پێشمەرگە قارەمانەكانی حزبی شیوعی و پارتی تێكشكیندران، وتوو وێژی ڕژێم لەگەڵ سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان بە سەرۆكایەتی مستەفا بارزانی نەمر دەستی پێكردو لە ئەنجامدا بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ ڕاگەیاندرا، هەڵبەتە ئەو جۆرە ڕێكەتنانە هەم بۆ شۆڕشی كوردو ئایندەی كورد سوودمەند بوو، هەم بۆ ڕژێمە لاوازەكەی ئەوسا تا خۆی بگرێتەوەو لێمان بێتەوە مەیدان، دیارە هەموو ڕژێمەكان كە هەر ڕكەوتنامەیەكیان مۆر كردبا پاش ئەوەی بە هێز دەبوون و خۆیان دەگرتەوە لە خالەسەرەكییە گرنگەكان پاشكەز دەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارەی چەند خاڵێك جێگیر دەبوو بە سوودی كوردو مافە ڕواكەیدا دەشكایەوە،

لە ٢٦ی تشرینی یەكەمی ١٩٦٦دا، سەرۆك كۆمار عەبدولڕەحمان عارف بە یاوەری شاندێك گەیشتنە هەولێر، ئەو كات تەمەنم پانزە ساڵان بوو لە پۆلی سێیی ناوەندی زازا بووم، لە بەیانییەكی تەرو فێنك جادەكان

ئاوڕشـیێن کـرا بـوون، سـەرەتای پـایز بـوو، ئێمـەی قوتابیـان لەبەرامبـەر چـایخانەی بـایز، لـەو فولکەیـەی نزیـك ئەنجومـەنی وەزیرانـی هـەریمی کوردستان ڕاگیرا بووین لە هەردوو بەری جادەدا لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر، هێشتا هەر بەیانی بوو لە پڕ کاروانی ترومبێلان و فیقە فیقی ترۆمبیلانـی پـۆلیس و گـڕە گـڕی مـاتۆڕان دەسـتی پێکـرد و گـەژاوەی سـەرۆك کۆمـار عەبدولڕەحمان عـارف دەرکـەت لـە نێـو سیارەیەکی سـەر والآ، لـە هـەر دوو بەری جادەدا گوڵباران دەکرا تا لیمان تێپەر بوو، ئەو کوردە بڕوای وا بـوو ئەو سـەرۆك کۆمـارە کەسێکی باش و خێـر ویستە بۆیـە هێنـدە بـە گـەرم و گوڕی ڕێزی لێ گیرا، دوو ڕۆژ لەو شارە مایەوە پاشان بەرێ کـەوتن چوونـە لای بەڕێز سەرۆك مستەفا بارزانی نـەمر سـەرکردایەتی شۆڕشـی ئـەیلوول بـۆ وتوویـژ کـردن، کوردسـتان بـە گشـتی دلخـۆش بـوون بـەو ڕێکـەوتن و ئاشـتییە، بـەلآم گرێیـەك و دڵگرانییـەکی تیـا بـوو، ئـەویش ئـەو ململانێـی و شــەڕو لــێکترازان و براکوژییــەی لــە نێــوانی بــاڵی مەکتــەبی سیاســی و ســەرکردایەتی پــارتی بــە تونــدی پــەرەی ســەند بــوو، ئــەو کــات ئــەو دەستەواژەیە بە کار دەهـات (مـەلایی و جـەلالی)، لـەو سـاڵدا مـن ئەنـدامێکی کـارای یـەکێتی قوتابیـانی کوردسـتان بـووم و هـەروەها ئەنـدامی پـارتی دیموکراتی کوردستان بەرەی سەرکردایەتی پارتی (مەلایی) بووم

لــەو نووســینەی ســەرەوەمدا نــاوی چــایخانەی بــایزم هێنــا، ئــەو چایخانەیە لە هەولێردا وا ناوی ڕۆیشتووە بوو، ئەگەر بۆ یـەکێکی غەریبـە شار، ناونیشانی ئەنجومەی وەزیرانی هـەریمی کوردسـتانی بـۆ هەڵـدرا بـا، دەبـوو بگوترایـە لـە نزیك چـایخانەی بـایزە، خـۆ مـام بـایز چایخانەکەشـی نەماوە، وەك ئەوەی بـاوە لـە نێـو بەغـدادا (ویـن وزارە الـدفاع؟.. مقابل لـبن اربیل) واتە وەزارەتی بەرگری عیراق لە کوێیە؟ لەبەرامبەر ماستی هەولێر.

-لەبەرواری ٢١/ ٣ / ١٩٦٧دا ئەو کات ئەندامی لیژنەی شار بووم لە یەکێتی قوتابیانی کوردستانو ئەندام لە پارتی دیمراتی کوردستان، لە دەشتی هەولێر، لە گوندی سابراغ، پارتیو سوپای (پێشمەرگەی کوردستان) بە بۆنەی چەژنی نەورۆز، ئاهەنگو نمایشێکی سوپایی لە دەشتی هەولێر ساز دا، داوەتنامەمان بۆ هات بە تایبەت بۆ ئەوانەی رۆڵی لێپرسراوەتیان هەبوو لە یەکێتی قوتابیانو پارتی، بە نهێنی لەو رۆژەدا بچینە ئەو شوێنە لە گوندی سابراغ، دەشتی هەولێر،

لەبەرە بەیانی ١٩٦٧/٣/٢١ دا (تەحسین هەینی، موحسین ئاوارە، سەردار ئەبوبکر حاجی عەزیز خەرابەدراوی، ئەسعەد محەمەد قەرەداخی، نیهاد شەشخان، دکتۆر فرهاد عومەر) بە قەمەرەیەکی دۆجی شرو ور، خۆمان گەیاندە گوندی سابراغو شوێنی مەبەست کە لە دەرەوەی گوندەکەدا شانۆیەکی جوانو رێك دانرا بوو، جەماوەرێکی بەرچاو لەو ناوەدا کۆببوونەوە، سوپای شۆڕشگێری کوردستان بە چەند هەنگاوێ دوورتر لە شانۆ، بە چەكو تفاقەوە ریزیان بەستبوو، سەرەتا ئاهەنگ لەسەر شانۆ بە سروودی ئەی رەقیبو نەورۆزو ئێمە پێشمەرگەینو دواتر وتاری ناوچەی دەشتی هەولێر لە لایەن شەهید عەلی هەژار خوێندرایەوە، هەروەها لەو ساڵدا بوو کە دووبەرەکی کەوتە نێوان حزبی شیوعی، بەرەی لیژنەی مەرکزیو بەرەی قیادەی مەرکەزی، جا (حەسەن عەدۆ) بەناوی حزبی شیوعی قیادە سەر بە عەزیز الحاج وتارەکەی خوێندەوە، دواتر چەند تۆپێك بۆ خۆشی لەو شوێنەدا تەقێندرا و، ئیتر سوپای پێشمەرگەی کوردستان کەوتنە جولەو نمایش کردن بە جۆرەها چەکی قورسو سووك کە بینەرانیان سەرسام کرد، نیوەڕۆ بوو پرسیاری ئەو خزمانەم کرد کە پێشمەرگە بوون لەوێدا زۆریانم بینی، یەکێك لە خاڵوانم

سابیر کاکە شین بوو ئەو کات سەرلق بوو، چاوی پێم کەوت‌و ماچی کردم‌و نانی نیوەڕۆم لە گەڵیاندا خوارد، پێی گوتم کوڕی خۆم تۆ قوتابی، بۆ وا خۆت کەشف دەکەیت، مەکتەبەکەت تەواو کە ئەوجا دەم لەو کارانە وەردە، باشە ئێستا چ بە باوکت بلێم وا دەکەی، گوتم خارە دەنا خۆم‌و براکەشم ڕۆڵی لێپرسراوتیمان هەیە لە شار بە نهێنی کار دەکەین بۆ شۆڕش، وتی کەواتە یان دەگیرێیی کە ئەوها بزیو بی یان ڕۆژێك دێیەوە لای خاری خۆت‌و دەڵێیت هاتوومەتە ریزی پیشمەرگان، قسەکەیشی وا دەرچوو کاتێك چەندێك لە هەڤاڵەکانم لە ١٩٦٩ دا دەستگیر کران لە لایەن ڕژێمەوە، من چوومە ریزی پێشمەرگەو لە گەلالە لە ناوچەی باڵەکایەتی کە سابیر کاکە شین لەوێ بوو، بەخێر هاتنی کردم‌و گوتی لە گوندی سابراغ چیم پێ گوتی هەر وا دەرچوو، هەر لەو ئاهەنگەدا یەکێ لەو پێشمەرگانەی خزمانم گوتی: ئەها ئەو هەموو تۆپە گەورەو لوولە درێژانەت دیوە کە مشەمبا و بەتانیان پێدا دراوە، گوتم ئای چەند ورەمان پێ بەرز بۆتەوە؟ گوتی، بەینی من‌و تۆ بێت لای کەس باس نەکەیت، مەکتەب لە کیس خۆت مەدەو خوێندنی خۆت تەواو کە، ئەو هەموو تۆپە گەورەو لوولە درێژانە هەمووی کاریتەنەو مشەمبا و بەتانی پیا شۆڕ کراونەتەوە، بۆ بەرز کردنەوەی ورەی خەڵك، لە دڵدا زۆر نیگەران بووم، بەلام کارێکی ئەوتۆی لێ نەکردم ساردم کاتەوە، هەر چۆنێك بێت سیاسەت‌و شۆڕشەکان، فێڵ‌و ریکلام‌و تەکتیك‌و درۆی سپیان هەیە.

عیراق‌و کۆدەتای سەربازی‌و ڕژێم گۆڕین بە بەردەوامی، کوردستانیش، ناسەقامگیری‌و شەڕی زۆرو کەمی خۆشگوزەرانی‌و ژیانکردن بە بوونی عەقڵیەتی رەگەزپەرستانەی ڕژێمەکانی بەغدا، هەر نا شەڕو ململانێی کورد بە کورد لە ناو خۆیدا، واتە ئەو گورگەی هەمیشە ئامادە بووە

هـەرەتی تەمـەنی لاویـەتیمان لـووش کـاتو ئاینـدەمان بـەرەو پـیریو کەنەفتیو وێرانی دەروونی بەرێت.

جارێکی تر بەغداو کۆدەتاو چەند بەیاننامەیەکی تازەو قەدەغە کردنی هـاتو وچـوو دواتـر دانووسـانێکی تـر لەگـەڵ کـورد، لەبـەرە بـەیانی (١٧ تـەموزی ١٩٦٨) دا، لاوازی هـەژمـوونی سـەرۆك کۆمـاری عـیراق فریـق عەبـدولڕەحمان عـارف لـەو سـاوو هـەبوونی کێشـەکانی نـاوخۆییو دەرەوەی، بەتایبەتی لەگەڵ ناسیۆنالیستانی عەرەبو تێکچوونی ڕەوشی سیاسیو ئـابووریو کۆمەڵایـەتی، واتـە زەمینـە بـۆ بـەعس هەڵکـەوت بـۆ جـاری دووەم بگەڕێنـەوە سـەر دەسـەڵات بـە ڕێگـای کۆدەتـاو کەتیبەیـەکی زرێپۆشی گاردی کۆماری کە دەستیان بە سەر کۆشکی کۆماری داگرتو لە بەیاننامەی ژمارە (١) دا ڕایان گەیاند کە کۆدەتایـەکی سپییەو خـوێنی تیا نەڕژاوەو پیلانە داڕژاوەکیان سەری گرت بە لادانو خانەنشین کردنی عەبدولڕەحمان عارفو ڕەوانەی لای خێزانەکەیان کردوە، ئەوکات سـەرۆك وەزیـران تـاهیر یـەحیا بـوو، حکومـەتی نـاوبراو هەڵوەشـایەوە، پـاش کۆبوونـەوەیان بـە نـاوی ئەنجومـەنی تـازەی سـەرکردایەتی شـۆڕش، لیـوا ئەحمـەد حەسـەن بـەکر بـوو بـە سـەرۆك کۆمـاری عـیراقو عەقیـد عبـدلرزاق نایف بوو بە سەرۆك وەزیرانو حکومەتە تازەکەیان پێك هێنا.

کۆدەتـا لـە دوای کۆدەتـا، کۆدەتایـەکی تـر لـە ٣٠ی تـەموزی ١٩٦٨ دا، بەعسـیەکان هەڵسـان بـە دەسـتگیر کردنـی سـەرۆکی وەزیـران عبـدالرزاق نـایفو پاکتـاو کردنـی دارو دەسـتەکەی هـەروا دەرکردنـی بەیاننامەیـەکی تازە لە لایەن ئەحمـەد حەسـەن بکـر، گوایـە حکومـەتێکی دی دیمـوکراتیو شۆڕشگێڕو یـەکگرتوو دادەمـەزرێننو دۆزی کـورد بـە ئاشـتیانە چارەسـەر دەکـەن، بـە نـاوی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شۆڕشـی عـیراق لێبـوردنێکی

گشتیان دەرکرد بۆ هەموو ئەوانەی کەوا لە شۆڕشی کورد بەشداریان کردووە لە کوردستانی عیراقدا، دواتر هەر بە سەرۆکایەتی ئەحمەد حەسەن بکر، بڕیار درا، موحسین دزەیی وەك وەزیری کارو باری باکوورو ئیحسان شێرزاد وەك وەزیری کارو نیشتەجێ کردن‌و تەها محیەدین مەعروف بە وەزیری دەولەت دامەزران، جا تەها محیدین مەعروف بەر پرسێك بوو لە پشکی باڵی مەکتەبی سیاسی دامەزرا، جا ئەو حکومەتە تازەیە بەڵێنی دووپات کردەوە کە وادەو بەندەکانی ۲۹ی حوزیران جێبەجێ دەکەن‌و چارەسەری دۆزی کورد دەکەن.

بەلاًم کوردو گەلی عیراق بە گشتی بڕوایان بە بەڵێنەکانی حزبی بەعس نەدەکرد چونکە زۆر دژواری‌و دڕندەیی‌و ژەهری حەرەس قومی‌و بەعسیانیان چێژ تبوو.

لەو ماوەیەدا رۆژنامەی (التاخی – برایەتی) بەردەوام بوو لە دەرچووونیدا، کەچی لە تشرین یەکەمی ١٩٦٨ دا ئەو حکومەتە رێگای دەرچوونی رۆژنامەی (ئەل نوور) ی دا کە رۆژننامەیەکی سیاسی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو.

لە ئەیلولی ١٩٦٨ دا حکومەتی بەعس بڕیاری دا رۆژی نەورۆز ۲۱ی ئادار ببێت بە جەژنێکی نەتەوەیی‌و فەرمی بۆ کورد ئەو رۆژەش بکرێتە پشووی فەرمی.

بەلاًم لەگەڵ ئەو دەستکەوت‌و بەڵێنانەی وادەی بە کورد دەدا، لە هەمان کاتدا بە بەرنامەیەکی ملعونانە لە لایەك پشتگیری باڵی مەکتەبی سیاسی دەکردو چەند دەستکەوتێکی بۆ دەستەبەر دەکردن لە هەمان کاتدا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر پەیوەندیەکانی نەپچڕاند بوو، لە ژێرەوەش ڕێژەی جاش‌و سیخوڕو

بەکرێگیراوانی لە زیاد بووندا بوو، هەروا پارییەکی سیاسیانەی بە هوشیاریو بەرنامەی ڕێژی پەیرەو دەکرد بۆ خۆشکردنی ئاگری برا کوژیو دووبەرەکی لە نێوانی باڵی پارتیو باڵی مەکتەبی سیاسی، کە شەڕی هەر دوو باڵ گەیشتە ئاستو ڕادەیەكو قۆناغێکی زۆر ترسناكو شەڕی کورد بە کورد بەردەوامی هەبوو، جا حکومەت بۆ باڵی مەکتەبی سیاسی چەند دەستکەوتێكو کارێکی بەر چاوی ئەنجام دا بۆ ئەوەی دژ بە باڵەکەی تر دۆخێك بخوڵقێنێ برەو بە دژایەتیو شەڕو ململانییەکانیان بدات، بۆ نموونە لەو کارانەدا (قەبوڵ کردنی قوتابیانی باڵی مەکتەب سیاسی لە کۆلێژی سەربازیو کۆلێژی پۆلیس لە بەغدادا، گۆڕینی سەردەرەو تابلۆکانی دوکانانی شارو شارۆچکەکانی کوردستان لە عارەبییەوە بۆ ناوی کوردی، کردنەوەی چەندەها بنکەو بارەگای چەکداریو کارکردنی سیاسی بۆ باڵی مەکتەبی سیاسی لە نێو شارەکانو دانانی (محەمەدەمین فەرەج) بە پارێزگای هەولێر..هتد) ئەمەو دوای بنبەست بوونی گفتوگۆ لە نێوانی سەرانی بەعسو باڵی پارتی لە تشرینی دووەمی / ١٩٦٨ دا حکومەتی بەعس دەستی کرد بە پەیرەوی سیاسەتی تۆقاندنو نانەوەی پشێویو ڕاگواستنو گرتنی کادیرو هەڤاڵانی پارتی، هەروا داخستنی ڕۆژنامەی زمانحاڵی ئۆرگانی پارتی (التاخی - برایەتی)

لە شەوی ١٨ی ئەیلولی ١٩٦٩ ڕژێمی بەعس لە هەولێر هەڵیکوتایە سەر چەند ماڵێك لە گەڕەکەکانی ناو شارو لەو شەوەدا چەندین ئەندامانی کارای یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، باڵی پارتی دیموکراتی کوردستان / دەستگیر کرد لەوانە (ئیسماعیل حوسێن - عەلی محمود جوکل - ڕەفعەت عەبدوڵلا واتە شەهید ڕێباز - محەمەد عباس واتە شەهید

شاخەوان، سعدی خلیل – عبدالرزاق ئەحمەد – کەمال مستەفا هەمزە – یوسف محەمەد علی – قادر سینما، کە بردرانە زیندانی فیرقەی سربازگەی هەولێر (ئۆردی) جا بەندە کەسێك بووم لە ئەندامانی لیژنەی شاری هەولێرلە یەکێتیی قوتابیان ماوەیەکی زۆریش یەکێك لە گیراوەکان (ئیسماعیل حوسێن) لێپرسراوی من بوو، زۆربەی ئەو هەڤاڵانەش هاوڕێم بوونو لێك ئاشکرا بووین کە لەو ڕێگایە خەبات دەکەین، کاتێك خوالیخۆشبوو سەردار ئەبوبکر خەرابەدراوی و خوالێخۆشبوو ئەسعەد محەمەد قەرەداخی پێیان ڕاگەیاندم کە لە ماڵ نەمێنمو خۆم حەشار دەم لەبەرئەوەی زۆربەی هەڤاڵانمان ئەوانەی نەگیراون جێگۆرکێیان کردووەو خۆیان شاردۆتەوە، هەروا من ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانیش بووم سەرەتا هەڤاڵ (عەبدوللا خەیلانی) لێپرسراوم بوو دواتر گۆردرا بوو بە (حەمید ی گچکە) بۆیە لە لای ئێمە بە حەمیدی گچکە ناوی دەهات چونکە (حەمید ئیبراهیم) مان هەبوو ڕۆڵی لێپرسراوەتی هەبوو لە پارتی بۆ ئەوەی ناوەکان تێکەڵ نەبن، جا من دەبێ چی بکەم کە ئەو هەڤاڵانەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان گیراونو زۆربەیان ڕۆڵی لێپرسراوەتیان هەیە یەکێکیان لەوانە لێپرسراوی من بووە جگە لە یەکێتیی قوتابیانیش ئەندامێکی پارتی بوومە خۆ دەبێ هەڵوێستێك وەرگرم، لە ئەڵقەی داهاتوو باس لەو هەڵوێستەم دەکەم کە بەوە داکەوتەوە چوومە ریزی پێشمەرگەی کوردستان.

(١٦)

-دوای هەڵـــگیرسانی شۆڕشـــی ئـــەیلول، ئیتـــر گـــەلی کـــورد دەبـــێ چاوەڕوانی چی بکات، ڕۆژو مانگو ساڵەکان بە سەر یەك دادەکەوتنو یەکتریان جێدەهێشتو شەو ڕۆژیش بە سەر یەکدا ئاودیو دەبوون، دەبێ لە دوای خۆیاندا چیان جێهێشتبێ جگە لە کێشەو خوێنو شەهیدی سەر بـەرزو زینـدانی کردنـی تیکۆشـەرانو پشـکنینی مـاڵانو داواکردنـی پێناسەی گەنجانو وێرانەییو سەرکوتکردنی کوردانی دڵسۆزو خاوەن هەڵوێست هەروەها زیاد بوونی ڕێژەی هەتیوو بێوژنانو بە ئاوارە بوونی گوندنشـینو نائـارامی لـە شـاردا، لـە لایەکـەی تریشـدا چـالاکییەکانی تێکۆشەرانو ئەنجامدانی کاری پارتیزانی لە نێو شاردا، کە بەو بارەدا کەوتبوو ڕژێمێك دەستی خستبووە خنخنۆکی دیموکراسیەتو ئازادی تـاكو چـاندنی تـرسو تۆقانـدنو گـرتنو ڕاوەدوونـان، هـەروەها جـێگیر کردنی کارمەندو دەسەڵاتدارانی سەپێندراوی عەرەبی ڕگەزپەرست لە پاڵ سیخورانی زۆڵە کوردو جاش، بگرە هەر لە کەسانی پۆلیسو سەربازو مەدەنی، یەکێك لە لەوانەی وەك والی شاری هەولێر کە بۆ لیوای هەولێر دامەزرا بە موتەسەرف بە ناوی (بدرالدین علی) کەسێك بوو عەسکەری بە پلەی سەرهەنگ (عقید) خەڵکی تەلەعفەر بوو، گوایە بە ڕەچەڵەك تورکمان بووە بەڵام بە وتەی خۆی گوتویەتی من عەرەبم، بۆ بەدبەختی ئەو شارە کەسێکی زۆر ڕەگەزپەرستو توند تیژ بوو بەرامبەر بە کورد، بەر لەوەی

ببێت بە موتەسەرف، قایمقامی ڕواندز بوو، لەگەڵ زۆرینەی سەرۆك هـۆزو ئاغاو میرو بەگو دەرەبەگەکانی ناوچەکانی دەرەوەی هەولێر پەیوەندی هەبووەو کەم شارەزا نەبووە. بەڵێ لە نیسانی ١٩٦١ وەك موتەسەرف لە لیوای هەولێر دەست بە کار بووە لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کە کۆداتای بەعسی ئەنجام درا، جاریکی دی کرایەوە موتەسەرفی هەولێر هەڵبەتە ناسیویانە کە چەند لە خزمەتی ڕەگەزپەرستییەو دژ بە خواستەکانی کوردە، جا لە شوێن خۆی مایەوە تا ساڵی ١٩٦٤، وەك لە پێشدا باسمان کرد لەبەرئەوەی زۆر دژ بە کوردو دەستی قوڕس بوو، وەك تاوانبارێكو داوێن پیسیش بووە، بۆیە لە مانگی ڕەمەزانی ١٩٦٥، ڕۆژێك بەر لە جەژن لە ناو جەرگەی بەغداد بە سزای گەلیان سپاردو کوژرا، ئەو هەواڵەش لە هەولێر کە دەنگی دایەوە، بوو بە دوو جەژن لە هەولێرو کوردستان بە گشتی، هەندێك لەو کردەوانەی کە موتەسەرفی ناوبراو ئەنجامی داوە لە ماوەی دەست بەکاربوونی:

١ – لەبەر شارەزایی و دیبلۆماسیەتی و پەیوەندییە بە هێزەکانی لەگەڵ سەرۆك هۆزە کوردو بەرژەوەندخوازو دەرەبەگو عەشایرەکان، دەیکردن بە جاشو سیخوڕو چەکدار دژ بە شۆڕشو پێشمەرگەو کوردایەتی، هەروەها دواتر لە گەل عەشایری عەرەبی ناوچەکانی دەشتی هەولێریش پەیوەندی بە هێزی هەبوو کە (فرسان سەلاحەدینو فرسان خالید بن ولید)ی لێ کەوتەوە بەو پێیەی دەسەڵاتی زۆری پێ سپێدرا بوو.

٢ – گواستنەوەی کاربەدەستانو فەرمانبەرانی دڵسۆز ئەوەی بۆنی کوردایەتی لێ بهاتبووایە بۆ خواروی عیراق ودوورخستنەوەیان لە کوردستان یان لە شارەوەوە بۆ شارۆچکەو شوێنە دوورەکانی دی، بۆ نموونە ئەگەر لە خێزانەکەی خۆمانەوە دەست پێبکەم براکەم (جەلال

ڕەشید) لە دادگای هەولێر فەرمانبەر بوو بە فەرمانێکی ئیداری لە هەولێرەوە گواسترایەوە بۆ ڕواندز لەبەرئەوەی گومانی لێ دەکرا لە ڕێکخستنەکانی پارتی بێت، لە حەقیقەتیشدا هەر وا بوو، جا دەیان وەك ئەو بەم شێوەیە.

٣ - قەدەغە کردنی زۆرێك لەو خۆراكو پێداویستیانەی کە دەبردرانە دەرەوەی شاری هەولێر بۆ گوندان، ئەو دوکاندارانەی لە شار بوون دەبووایە کارتی بایعیان هەبووایە بۆ وەرگرتنو فرۆشتنی بۆ نموونە (چا).

٤ - بدرالدین علی موتەسەرف فەرمانی سەیر سەیری دەردەکرد بۆ نموونە، لەوانە ماینو گوێدرێژە بار هەڵگرەکان کە لە دەرەوەی هەولێر بۆ ناو شار دەهاتنو دەگەڕانەوە، بە دەیان کەرو باری بەند کرد لە قشڵەی پۆلیسی سوارە، ڕۆژانە خاوەنی کەرەکان بە خۆو جۆرکێك (کاو جۆ)وە دەهاتنە مواجەهەی کەرەکان نەوەك لە برسانا بمرن، شەوانیش کە ڕێکەوتی وەرزی هاوین بوو خەڵکەکە لەسەربان دەخەوتن، واتە دانیشتوانی گەڕەکی عارەبانو دەوروبەری قشڵە لەبەر زەڕەزەڕی کەرەکان خەویان لێ نەدەکەوت.

٥ - دوای کۆدەتاکەی ٨ی شوبات ١٩٦٣ حوکمڕانی بەعس کە توندو تیژیو گرتنو ڕاوەدوو نانی خوشكو برایانی کەسانی نێو ڕکخستنەکانی حزبی شیوعی لە هەموو عیراق دەستی پێکرد (حەرەس قەومی) ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لەو قۆناغەدا، کەوتبوونە وێزەی تێکۆشەرانی پارتیش، بۆیە بە شێوەیەکی فراوان جگە لە کوردانی دڵسۆزو پارتی هەتا عەرەبەکانیش ئەوانەی کەشف بوون لە ڕیزەکانی ڕکخستنەکانی حزب شیوعین زۆربەیان چوونە ڕیزی پێشمەرگەی کوردستانو پەیوەندیان بە شۆڕشی ئەیلول کرد بۆ نموونە لەوان کەسان کە لە بیرمە (عەقید کافی)

عەرەب بووو شیوعی خزمی مام وادی کەشاف بوو، ماڵی مام وادی دراوسێمان بوو لە گەڕەکی عارەبان دواتر دەرکەوت ١٩٦٣ لە شەڕی هەندرێن پێشمەرگەی پارتیو حزبی شیوعی دەرسێکی وایان دایە داگیرکەرانی کوردستان قەت لە بیری نەکەن، مێژوو ئەو شانازییە بنووسێتەوە قارمانانی ئەو داستانە سەروەرییە لە یاد نەکریٚ.

٦ – ئەو موتەسەرفە بەدرەدین علی، هەتا بە دوای هونەرمەندو نووسەرانو کەسایەتییەکانی هەولێری دەنارد بۆ ئەوەی پێیان ڕابگەیێنیٚ کە خۆیان بپارێزن لە ڕێکخستنەکانی پارتیو شیوعیو پەیوەندیان بە شۆڕشی ئەیلوولەوە نەبیٚ، دەنا سزاکانیان قوڕس دەبێت، بە دوای باوکی ئەو کەسانەی دەنارد کە بۆنی شیوعیاتیان لیٚ دەهات بۆ نموونە جارێکیان ئەو موتەسەرفە بە دوای باوکی مامۆستای وەرزشوان (ڕەمزی وەلی) دەنێرێت گوایە ڕەمزی لەگەڵ حزبی شیوعی پەیوەندی هەبووە، باوکی ڕەمزیش پاوێکی سادەو کەمزان بووە، بەدرەدین عەلی بە باوکی ڕەمزی دەڵێت (أبنك تقدمي؟) باوکی ڕەمزیش دەزانی ئەو وشەیە بەرامبەر بە شیوعیەکان بەکار دەهات، بویە بە ساکاریو نەزانی خۆیەوە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت (لا والله مو تقدمي مسلك رجعي) موتەسەرفیش تووڕە دەبێت دەڵێت (گەواد لیش انا رجعي؟) واتە پێی دەڵێت بۆ من کۆنەپەرستم؟ دواتر موتەسەرف دەزانی پیاوێکی کەمزانو سادەیە لە ژوورەکەی وەدەری دەنی پێی دەڵێت بڕۆ لێرەو کوڕەکەت بۆم بنێرە.

لە ئەڵقەی پێشوودا باسم کردووە کە لە شەوی ١٨ی ئەیلول / ١٩٦٩ دا چەندێك لە هەڤاڵانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان کە رۆڵی لێپرسراویەتیان هەبوو، دەستگیر کران، منیش کە یەکێك بووم لەو هەڤاڵانەی رۆڵی لێپرسراوەتیم هەبووو لێپرسراوەکەی منیش یەکێك بوو لە دەستگیراوەکانو هەر هەمووشیان منیان دەناسی، لە لام روون نەبوو، ناوی منیش هەیە بۆ گرتن یان نا، یان ئەوانەی دەستگیر کراون ناوی منیش ئاشکرا دکەن یان خۆ ڕاگرنو دان نانێن بە هیچ شێوەیەك، ئیتر دەبێ ئەو بابەتە بە هەند وەرگرم، بۆیە لە رۆژی ١٩/ ئەیلول / ١٩٦٩، یەکەم هەنگاوم چ پسولەو بڵاوکراوەیەکی نهێنی هەبوو لەماڵەوەماندا هەڵمگرتو دواتر دایکم بانگ کرد، وەزعەکەم تێگەیاندو پێم گوت تۆ بە شێنەیی لەگەڵ باوکم قسە بکەو تێیگەێنە، جا ڕەنگێکی هێناو رەنگێکی برد، زەرد هەڵگەڕاوو گریێ کەوتە قوڕگی، کە هەندێك هاتەوە سەرە خۆی، گوتی جا چ دەکەی؟ گوتم یان دەبێ بچمە ریزی پێشمەرگانو ناو شۆڕش یان خۆم بشارمەوە بزانم دواتر ئەنجامەکەی چۆن دەبێت.

دایکم گوتی، با وەکو جارەکەی ترمان لێ نەیەت کە زمانیان لە (جەلال)ی برات دا بوو بە کتو پڕی ماڵەکەمان بپشکننو هەمووی سەراو بن کەن، چی شتی نهێنیت هەیەو بیبە لەگەڵ خۆتو لێرە مەوەستەو بڕۆی ماڵی باوکم، پێنج رۆژە ماڵیان گواستووتەوە کەس نایاننناسیو ناونیشانیان دیار نییە لەو گەڕەکەی تازەیاندا، پاشان لەگەڵ باوکت دێینە لاتو تەکبیرێکی لێ دەکەین، بەڵی ماڵی ئێمە هەر لە گەڕەکی عارەبان بوو، دەرچووم بۆ گەڕەکی تەیراوە ماڵی باپیرەم نزیك بوو، لە تەیراوە خانووەکەیان دەکەوتە نزیك باڵەخانەی جەلیل خەیات کە ئەو کات باڵەخانەکە درووست نەکرا بوو، شوێنی باڵەخانەکە حەسارێك بووو لە

تەنیشت ئەو حەسارەش دوكانێك و گۆڕەپانیكی لێ بوو بۆ فرۆشتنی گەچ و خشت و چەوو لم، بەرامبەر بە دادگای هەولێر كە ئێستا ئەو دادگایە نەماوە بووە بە گۆڕەپانێكی گەورەی وەستانی ئۆتۆمبیلان لە دامێنی قەڵاتدا، بەڵێ، لە ماڵی باپیرەم گیرسامەوە و وەزعەكەم تێگەیاندن، زۆری پێ نەچوو پاش نێوەڕۆ، دایكم و باوكم هاتن، باوكم ماچی كردم و هیچی پێوە دیار نەبوو كە وەزعی پێ تێكچوو بێ، خۆی دنیا دیدە بوو، جەربەزە و خۆ ڕاگر، بۆ ئەوەی من تێكنەشكێم و ورەم دانەبەزێ، گوتی كوڕم ئیش لە پیاوان دەقەومێ، سەبارەت بە ئێمە یەكەم جار نییە و دوا جاریش نابێ، مادام ئەو ڕێگایەمان گرتووتە بەر، هەر چەندە حەزم نەدەكرد خوێندنەكەت لە كیس بچێ لە چواری ئامادەیی، ئەو كات خوێندنی قۆناغی ئامادەیی دوو ساڵ بوو (چوار و پێنج)، گوتی من هەستم پێدەكرد سەین و بەینێكت هەبێ لە رووم نەدەدای، بەڵام نەمدەزانی ڕۆڵی لێپرسراویەتیت هەیە، پرسیاری لێ كردم، جا خۆت دەڵێیی چی؟ گوتم لەبەرئەوەی ئەو برادەرانەی من ئەوانەی لە هێڵی ڕێكخستنن هەموویان نەگیراون خۆیان حەشار داوە، دەستم بە هیچیان ڕاناگات، با دایكم بچێتە ماڵی عەلی رەسوول، وا باشترە رەوانەی ناو شۆڕشم بكات لە دەشتی هەولێر، باوكم گوتی مادام خۆت ئەو ڕێگایەت هەڵبژاردووە و منیش متمانەم بە تۆ هەیە كە كوڕی باوكی خۆتی و ئارام دەگری و روو زەردم ناكەیت، گوتی منیش وام بڕیار دا بوو چونكە ئەو جارە نەگیرێیی، جارێكی دی هەر دەگیرێی مادام هێندە بزێو بیت، دەی هەتا زووە با دایكت بڕواتە لای ماڵی عەلی رەسوولێ، ماڵی كاك عەلی لە گەڕەكی تەعجیل بوو، ئەو كات لێپرسراوی ناوچەی پارتی دیموكراتی كوردستان بوو لە هەولێر و لە شاردا، كاتی خۆی لێپرسراوی برام

(جەلال)بوو لە ڕێکخستنی پارتی و پەیوەندی خێزانیشمان لەگەڵ خێزانی ئەواندا بە هێز بوو، بە پەلە دایکم چووە ماڵی عەلی ڕەسووڵ، دایکی عەلی پێیی گوتبوو عەلی سەفەری کردووە پێنج ڕۆژی پێ دەچێ، بەلام بڕۆ لای (زرار محەمەد شریف کاپەش) خەزوری کاك عەلی کارمەندە لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر ئەویش تەتەری خۆی هەیە دەرمان و پێویستمەندییەکانی تەندرستی بۆ پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر دەنێرێت با کوڕەکەت لەگەڵ ئەو تەتەرانە ڕەوانە بکات، دوای چوونی دایکم بۆ لای کاك زرار لە هەمان کاتدا، کاك زرار گوتبووی دەبێ چەند ڕۆژێك چاوەڕوان بکات وەزعەکە تەواو نییە، تەتەرەکانیش وا بە زوویی دەرناکەون، کە دایکم گەڕایەوە بۆی باس کردین، باوکم گوتی وەستان باش نیەو (پەلیك) ناوێك شوفێرو دراوسێمان بوو بە قەمەرەیەك لە هێڵی هەولێر – ڕواندز هاتووو چۆی دەکرد، باوکم هەڵی دایێ گوتی کوڕم خۆت ئامادە کە بەیانی لەگەڵ قەمەرەی (پەلیك)ی دراوسێمان دەچینە لای (جەلال) ی برات، خۆ ئەویش لە ڕواندز پارتییەو ئاگادارم پەیوەندی لەگەڵ پێشمەرگەو شۆڕش هەیە با ڕەوانەی ناو شۆڕشت بکات، باوکم یەك قسەی هەبووو نەیدەکردە دوو، بەیانی ٢٠ی ئەیلول ١٩٦٩ سەعات شەش قەمەرەی (پەلیك) لەبەردەم ماڵی باپیرەم وەستا و دایکم و باپیرەم و داپیرەم ماچیان کردم و چاویان پڕ فرمیسك بووو خوا حافیزیم لێ کردن، سواری ئۆتۆمبیلەکە بووم باوکم لە پێشەوەی ترومبیل و برایەکم (تەحسین) تەمەنی دوانزە ساڵ بوو لە پشتەوەی ترومبیلەکە بووین، چاوم دایە دایکم و داپیرەم بە دەستیك چاویان دەسڕیەوە بە دەستەکەی تر خوا حافیزیان لێم دەکرد، پاش نیوەڕۆ گەیشتینە ڕواندز بێ ئەوەی لە ڕێگا و بنکەکانی پشکنین هیچ لێپێچینەوەیەك لە گەڵماندا بکرێت تەنیا

پێناسەکانیان سەیر دەکردو بڕۆن، لەو خانووەی جەلال/ی برام دابەزین کە لە لایەن خوالێخۆشبوو عەلی باویل ئاغا پێی دابوون لە نزیك ماڵ خۆیانداو کوڕکەیشی (سەدیق عەلی باویل ئاغا) برادەریان بوو، جا جەلال /ی برام لەگەڵ ڕێکخستنی پارتی بووو ڕۆڵی لێپرسراویتی لە حزب هەبووو فەرمانبەر بوو لە دادگای ڕواندزو (تەحسین چیچۆ) موهەندسیش هەولێری بووو لەگەڵ ڕێکخستنی حزبی شیوعی بوو، هەردووکیان پێکەوە لەو خانووەدا دەژیان، دوای نان خواردنی نیوەڕۆ، باوکم گوتی کوڕم جەلال ئەوە (موحسین)ی برات چەند برادەرێکی گیراون و ڕەنگە ناوی ئەویش هەبێت و بیگرن بۆیە بریارمان دایە لێرەوە بینێریە ناو شۆڕش بە تایبەتی بۆ لای خاڵە سابیر کاکەشین کە ئیستا لە گەلاڵە نیشتە جێییە، (جەلال)ی برام گوتی منیش وام پێ باشە نەوەك بگیرێ و تەتەرمان هەیەو بەیانی ڕەوانەی دەکەین.

(١٧)

- هەر وەك لە ئەلقەی پێشوو باسم کرد براکەم (جەلال) گوتی تەتەرمان هەیە بەیانی زوو ڕەوانەی ناو شۆڕش و ریزی پێشمەرگانی دەکەم، بەلاّم باوکم لەگەڵ ئەو برایەم بۆ ماوەیەك دوو قۆڵی دانیشتن بیّ ئەوەی من بزانم قسەو باسەکەیان چییە، ئایا لە بارەی منە، یان بابەتێکی تر، خۆ ئەو جۆرە دانیشتنانە نهێنیەك لە خۆ دەگریّ، دوای قسەکانیان گوتی ئەوە دەچم تەتەرەکە دەبینم بۆ وادەی بەیانی، ئیتر دوای کاتژمێرێك گەڕایەوە رووی لە باوکم کردو گوتی بەیانی سەعات شەش و نیو لێرەوە دەردەچین، تەتەرەکە بارێکی (کا) ی بار کردووە بۆ جوندیان دەبات، ئێمەش لەگەڵ ئەو ترۆمبێلەی گرتوومە بە دوایدا دەچین کە لە کاولۆکان (موحسین) سواری لۆریەکە دەبێت و تۆو تەحسینی برام بە هەمان ترومبێل دەگەڕێنەوە هەولێر منیش بۆ راوندز هەڵدەکشێمەوە.

بەیانی لە هەمان کات ئامادە بووین ئەو قەمەرەیەی بە کرێیی گرتبوو لەگەڵ لۆریە بار هەڵگرەکە هاتن، دیار بوو جەلالی برام پارەی دابووە شوفێری لۆریەکە تکەو جگەرو نان و پاکەتی بۆ بنکەی پشکنینی سەربازی لە کاولۆکان بوون کڕی بووی، بە هەمان تەگبیرو پلان بەرەو خوار بووینەوە، بەر لەوەی بگەینە بنکەی پشکنین، لۆریەکەو قەمەرەکە وەستان، حاڵەتێکی زۆر تراژیدی بوو، ئێمە لەو دوڕایانییە کە بوو بە سێڕیان، باوکم ماچی کردم پێوەی دیار بوو گرێیی کەوتە هەوکی بەلاّم بە

سەر خوی نەهێنا، هەروا برایە گەورەکەم جەلال ماچی کردم شێوەی هەمان حاڵەتی باوکم بوو، کەچی (تەحسین) برام ئەو کات تەمەنی دوانزە ساڵاَن بوو فرمێسك بە سەر گۆناکانی ڕێچکەی بەستبوو، خۆ منیش قوڕگم پڕ گریان بوو بەڵام باوکم وای فێر کرد بووم جەربەزەو خۆ ڕاگر بم لەو حاڵەتانە هەموو فرمێسكو خەمەکانم ئاودیوی نێو ناخی خۆم کردەوە، شوفێری قەمەرەکە هەر لە ناو قەمەرەکەی خۆی بووو نەهاتە خوارەوە، ئیتر دەست لێك بەردانێکی تراژیدی بوو، من بەکراسێکی شڕو شەرواڵێك لە شێوەی سەکنی لۆریەك لە پێشەوەی لۆری لەگەڵ شوفێر بووم بەرەو هەواری جوندیان، باوکمو تەحسینی برام بەرەو هەولێرو برایە گەورەکەشم (جەلال) هەلکشایەوە بەرەو ڕواندز، دەستمان لێك هەڵدەتەکاندو دوا حافیزی لە باوكو کوڕو سێ ڕێگای لێکترازاو.

ئەوەی شیاوی وتنە ئەو دەست لێك بەردانو سێڕیانە ئاساوەری بە سەر چەندین شیعرەکانمەوە هەبووە بە نائاگایی کەوتۆتە نێو شیعرەکانم بۆ نموونە ئەوەتە لە شیعری (شاری ئێواران کە لە ژمارە (٦٩) ئابی / ١٩٧٨ لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بڵاو کراوەتەوە، هەروا لە دیوانی (چۆڕاوگە) مدا ل ٣٣ دا هاتووە تیایدا دەڵێم:

لە گۆڕەپانێکا دەگریم
دوو ڕێگاو سێ ڕێگام لە مل دەئاڵێنێ
هەڵدەکشێیی و...
شۆڕ دەبمەوە
لە لوتکەی ئاسۆی غەریبدا
ڕێگا باریكو تۆش بچووك دەبییەوە

## منیش بۆ شاری ئێواران
## بە گریان دەگەڕێمەوە..!!

بەر لەوەی بگەینە بنکەی پشکنین بە چەند مەترێك شوفێری لۆری گوتی خۆت مات و بێدەنگ کە، بە خۆیشی سوکانی بەردا بوو دەستی کرد بە سەماو چەقەنە لێدان و سەربازەکانی بنکەکەش چاویان لیبوو، کە ڕایگرت دوو زەرفی گەورەی دانیٚ بە عارەبی گوتی ئەوە تکەو جگەرو نان و ئەوەش پاکەتی جگەرەیە، سەربازەکە بە عارەبی گوتی اتلع (دەرچە) بیٚ ئەوەی هیچ قسەیەك بکەن، شوفێرەکە گوتی مەترسە من لەگەڵ ئەوانە ڕاهاتووم دانە خۆرەم کردوون، جا من پشوویێکم هاتەوە بەرو ئازاد بووم، منی بردە (بەرزێوە) چەند هەنگاوێك مابوو بۆ بنکەی پشکنینی پێشمەرگەو گوتی وا من جێت دەهێڵم ئەوەتە پێشمەرگەکانی ئەو بنکەیەت لیٚ دیارە، بڕۆ لایان ئیتر خوا حافیز، چەند هەنگاوێك ڕۆیشتم گەیشتمە ساباتێك کە یەکەمین بنکەی پشکنینی پێشمەرگەو شۆڕش بوو لە ناوچەی باڵەکیانی ئازاد بوودا،

سلاٚوم لیٚ کردن و پێنج پێشمەرگەی چەکدار بوون یەکە یەکە تەوقەم لەگەڵ کردن، گوتیان فەرموو، ئەو پسولەیەم دەرهێنا کە مۆری سکرتاریەتی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی بە سەرەوە بوو کە تیایدا نووسرا بوو کە ئەندامی لێژنەی شارم لە یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە هەولێردا، پێشمەرگەیەکیان گوتی بیدە بەو هەڤاڵە لێپرسراومانە، لێپرسراوەکە خوێندییەوە گوتی ئیٚ فەرموو، گوتم هاوڕێکانم کە ڕۆڵی لێپرسراوەتیان هەیە لە یەکێتی قوتابیان دەستگیر کراون لە هەولێر لە لایەن دایرەی ئیستخباراتی عەسکەری، منیش بۆ ئەوەی نەگیرێم وا

هاتوومەتە ناو شۆڕش دەمەوێ ڕەوانەی گەلاڵەم بکەیتو لەوێ خزمانم هەن کە پێشمەرگەن بۆ ئەوەی ناونووسم بکەن وەك پێشمەرگەیەك، گوتی ئەوە تۆ بووی لەو لۆریە دابەزی؟ گوتم بەڵێ، گوتی تێگەیشتم، هەر ئێستا ترومبێلێك بێت ڕەوانەی گەلاڵەت دەکەم.

زۆری پێنەچوو ریزێك ترومبیلێ لەبەری رۆژهەڵاتەوە بە دوای یەك کەوتبوونو زۆربەی ترومبیلەکان جێبی لاندرۆڤر بوون دەنگی گۆرانی محەمەد عارف جەزرای ئەو ناوەی پڕ کرد بووو چەفیەو دەستەسڕ هەڵتەکانیشی لەگەڵ بوو، جێبەکان وەستانو قوتووەك قەنادی ئێرانیان دایە پێشمەرگەکەی بنکەی پشکنین گوتیان لە ڕەژووکەریان بووك دەهێنینو دەگەڕێینەوە بۆ گەلاڵە، ئەوان ڕۆیشتنن لێپرسراوی بنکەکە گوتی وەرە برالە قەنادی بخۆو لە گەڕانەوەی ئەو ترومبێلانە بە گەر یەکێکیانت دەدەم بۆ گەلاڵە، ماوەیەك کەمو چاوەڕوانی بە هەمان بەزمو گۆرانی ترومبیلەکان گەڕانەوە، جێبێك لە جێبە لاندرۆڤەکان تەنیا شوفیرێکی تیا بوو، لێپرسراوی بنکەکە پێی گوت ئەو کوڕە گەنجە لەگەڵ تۆ بێ لە گەلاڵە دایبەزێنە، گوتی با بفەرمووێ، هەرکە سواری ترومبیلەکە بووم ئای ئەوە کەمال نییە؟! ئەویش بە دەم ڕۆیشتی ترومبێلەکەوە سەیرێکی کردم (کوڕە کاك موحسین ئەوە چ دەکەی لێرە؟) تەوقەیەکی گەرمان کردو پێك شاد بووینەوە... بەڵی لەگەڵ کا کەمال لە یەك گەڕەكو گەڕەکی عارەبان بووین لە منداڵییەوە پێکەوە یاریمان کردووەو لە گەورەیش هاوڕێی یەکتر بووین، کەمال پێشمەرگەی حزبی شیوعی بوو لە هەندرێنو منیش (پارتی)و تازە هاتوومەتە ریزی پێشمەرگەو شۆڕش، رێکەوتێکی زۆر سەیر بوو، دوای هەواڵ پرسینو چ دەکەینو چینو کێ لە گەڕەك ماوەو مردووەو باسی هەولێرو وەزع.. هتد

گوتی له گەلاڵه دەچییه لای کویٚ؟ گوتم خارم (سابیر کاکەشین) گوتی دەیناسم، بووکەکە دابەزێنین ئوجا جاریٚ دەچینه دەربەند ڕایات، له چێشتخانەکەی ئەویٚ تەشریبیٚکی خۆشیان هەیه، نانێك دەخۆین و دواتر دەتبەمه لای ماڵی خاره سابیر، به دەم خەندەوه گوتی، مادام به گەر بووکیٚ کەوتی دیاره ئایندەشت خۆش دەبێت.

(١٨)

دوای نان خواردنو پشوودانێك لە دەربەند ڕایات کە هاوینە هەواری شۆڕشو پێشمەرگان بوو لەو سەردەمدا، لەگەڵ کاك کەماڵ گەڕاینەوە گەلاڵە دەمەو عەسر بوو بردمییە بەر دەرگای ماڵی خارە سابیر، کاك کەماڵ گوتی مام سابیر بزانە کێم بۆ هێناوی، دوای ئەوەی خارە سابیرو هەردوو کوڕەکانی کاکەشینو نوری ماچیان کردمو دیار بوو مێوانیشی هەبوو، جا مام سابیر گوتی ئەها گوێتان لێ بێ، ئەمڕۆ ٢٢ / ئەیلول / ١٩٦٩ یە، لەبەرواری ٢١ /٣ /١٩٦٧ دا، ئەو خوارزایەم هاتە گوندی سابراغ لەگەڵ چەند برادەرێکی، بە نهێنی لە شارەوە هاتبوون، کە لەوێ ئاهەنگی نەورۆزو نمایشی لەشکری پێشمەرگەی شۆڕشگێڕی کوردستان کرا بە چەكو تفاقی سووكو قورس، نێوەڕۆکەی لە لای من نانی خوارد، پێم گوت کوڕم تۆ قوتابی بۆ هاتوویتە ئێرەو خۆت کەشف دەکەی، گوتی خارە دەنا دەوری لێپرسراوەتیشم هەیە، هەر چەندە ئەو کات سووکە مفاوەزاتێك لە نێوانی ئێمەو حکومەت هەبوو، ئەو کات پێم گوت مادام ئاوا بزێو بیت یان دەگیرێیی یان ڕۆژێك دەتبینم دێیەوە لای خاری خۆت، ڕووی لە من کرد گوتی وا نەبوو؟ گوتم ئەرێ وەللە ئەوها بوو، ئەوەتا هەندێك لە برادەرەکانمو لێپرسراوەکەیشم گیراوەو منیش وا هاتوومەتە لای تۆ، پێشمەرگایەتی حەقەو نا حەق نییە، گوتی یاخوا بەخێر بێیت،

دوای چایە خواردنەوە گوتی نانی بۆ ئامادە بکەن خۆ نانت نەخواردووە، گوتم بە زیاد بێت دەعوەتی کاك کەمال بووم.

شەو خاڵ سابیر داینیشاندم بە تەنیا گفتوگۆی لە گەڵدا کردم، پێی گوتم وا هاتووی بۆ ئەوەی شەرمەزاری باوکت و خزمان نەبم، من نامەوێ بەو تەمەنە چەك هەڵگری و بڕۆیتە ئەملاو ئەو لا، هەر لەگەڵ من بە لە نێو ماڵی مندا تا ماوەیەکی دی دەگەڕێینەوە نیو هێزی دەشتی هەولێر، ئەوەی راستی بێت مام سابیر ئەو کات سەرلق بوو بەڵام کێشەیەکی هەبوو لە هێزی دەشتی هەولێر لەگەڵ لێپرسراوێکی باڵا دەست، سەرۆك بارزانی نەمر مەبەستی بوو ماوەیەك لە گەلاڵە بیهێڵێتەوە تا کێشەکەی هێور دەبێتەوەو چارەسەری دەکەن ئینجا بگەڕێتەوە، مام سابیر بەردەوام لەگەڵ (مەحموود ئاغای کاکە زیادی کۆیەو کێخوا سمایلی تەلان) هەمیشە پێکەوە دانیشتن و هاوڕێی یەکتر بوون ئەم دوو بەڕێزانەش کێشەیەکیان هەبوو لە گەلاڵەدا بۆ ماوەیەك نیشتەجێ کرا بوون، هەروەها زۆرجاریش لەگەڵ کاك فەرەنسۆ حەریری و عەبدالرزاق بێتوشی هاوڕێ و هاودانیشتنی یەکتر دەبوون، ئیتر لەو شەودا خاڵ سابیر کە قسەی لەگەڵ کردم، وەڵامەکەم، باشە بەڵام ئەگەر چەکداریش نەکەم لە جێگایەك وەکو کادیرێکی حزب یان هەر دامو دەزگایەکی شۆڕش کار بکەم نەك هەر لە ماڵ لێرەدا بێ ئیش و کار دانیشم، گوتی دەی با بزانین جارێ وا بە، ئەمەو بۆ بەیانی بەرە بەری نیوەڕۆ بوو گوتم پیاسەیەك لە ناو بازاڕی گەلاڵە دەکەم، ئەم بەرو ئەو بەری شەقامێکی راکشاوو پێچاو پێچی ناو گەلاڵە هەمووی دوکان بووو زۆربەی کەل و پەل و بابەتەکانیان ئێرانی بوون، چەند چێشتخانەیەکی لێ بوو هەروا گەرماوێکیش، ئەو کات بەو شارۆچکەیە دەگوترا پایەتەختی شۆڕش، کاتێ لە چەقی ئەو شەقامەدا

بووم سەیری ئەملاو ئەو لام دەکرد وەك کەسێکی غەریبو بیانی، پێشمەرگەیەك هاتە پێشمەوەو گوتی ئەها لەو دوکانە ئەو قات خاکی لەبەرە دەیەوێ قسەت لە گەڵدا بکات، چووم پیاوێك بە قاتی خاکیو دەمانچەیەکی بە قەدییەوە بوو لەبەر دەم دوکانەکە دانیشتبوو، چوومە پێشو گوتم فەرموو، پێی گوتم تۆ کێیو چ دەکەی لێرەدا دێو دەڕۆی؟ منیش هەندێك بە گرژییەوەو مەغروریەکی گەنجانە گوتم تۆ چ ئیشت هەیە بۆ دەپرسی، دوکاندارەکە وەڵامی دامەوە گوتی کوڕی جوان ئەوە کاك فەڕەنسۆیە، منیش یەکسەر دەستم درێژ کردو تەوقەم لە گەڵی کردو گوتم داوای لێبووردنت لێ دەکەم نەمناسی هەرچەندە وەکو ناو بەریزت چاك دەناسم، گوتی قەیناکە تۆ چ دەکەی لێرە؟ دەستم بردو پسولەکەم دەرهێناو گوتم ئەوەتە من لە ناو هەولێردا ئەندامی لیژنەی شار بوومە لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانو هەروەها ئەندمی پارتیم، لێپرسراوەکەمو هاوریانم گیراون منیش خۆم بە دەستەوە نەدا هاتوومەتە ناو شۆڕش، هەروا براکەم جەلال رشید لە دادگای رواندز فەرمانبەرەو کادیرێکی کارایە لە پارتی ئەو ڕەوانەی ئێرەی کردوومە، پیی گوتم بە راستی برای ئەوی؟ گوتم بەڵێ، سەرێکی لەقاندو بەخێر بێت، ئەی لە کوێ دابەزیوی؟ گوتم لە ماڵی خارە سابیر کاکەشین،

– ساتەو پڕ دوکاندارەکە هەڵسایەوەو ماچی کردم گوتی بابەکەی بابم ئەوە تۆش لە عەشیرەتی سیانی خۆ هێشتا نیوەڕۆ نەبووە ئاوا گەرم بووی، دواتر زانیم دوکاندارەکە بە ناوی (مستەفا هەولێری) ناودار بوو خەزوری (کاکل ئاغای سەربە شاخی سیان) بوو خزم بوو،

– کاك فەرنسۆ گوتی دەتەوێ لە کوێ جێگیر بیت؟

گوتم خاڵە سابیرم دەیەوێت هەر لە لای ئەو نیشتەجێ بم، بەلاّم بۆ من ناخۆشە ئاوا بم، دەمەوێ لێرەدا بێ کار نەبم، کاك فەرەنسۆ گوتی کە هاتی لە چ قۆناغێکی خوێندن بووی؟

گوتم لە قۆناغی چواری ئامادەیی بووم.

- گوتی من مام سابیر ئیقناع دەکەم‌و تۆ پەیوەندیت بە منەوە بێت، هەر سبەی ڕەوانەی لای مامۆستا (محەمەد ئیسماعیل‌و لەتیف نادر)ت دەکەم لێپرسراوی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕشن، دەورەی دووەم لەو ڕۆژانە دەست پێدەکات لەوێ خوێندنت تەواو دەکەیت‌و ڕەوانەی گوندێك دەکرێیت‌و دەبیت بە مامۆستای شۆڕش، من دەمەوێ یارمەتیت بدەم مادام سەر بەو خانەوادەیەو چالاکیت هەبووە لە شاردا.

گوتم زۆر دڵخۆشت کردم نازانم چۆن سوپاست بکەم.

بەڵێ: هەر وا کەوتەوە کاك فەرەنسۆ لەگەڵ مام سابیر قسەی کردو نامەیەکی دامێ چوومە ناو پردان لای مامۆستا (محەمەد ئیسماعیل) نامەکەی خوێندەوە هەندێك پرسیاری لێ کردم سەبارەت بە پلەی حزبی‌و قۆناغی خوێندن‌و کوێم‌و لە کوێ هاتووم، زۆر ڕێزی لێ نام بە تایبەتی دوای ناسینم کە من کێم، لە نێو لیستێك ناومی نووسی‌و خۆی‌و مامۆشتا لەتیف نادر رواندزی‌و مامۆستا محەمەد عەلی لەسەر ئیستمارەیەك ئیمزایان کرد، ئیمزایان بە منیش کرد، گوتی پاش چوار ڕۆژی تر سەعات ٩ی بەیانی وەرەوە ئێرەو دەوامی پەیمانگەکە دەست پێدەکات تۆ وەرگیرایت.

(١٩)

-هـەر لـەو مانگـەی ئـەیلول١٩٦٩دا لـە یەکـەم ڕۆژی دەوام کـردن لـەو پەیمانگەیـە، پەیمانگـەی پێگەیانـدنی مامۆسـتایانی شۆڕشـی ئـەیلول لـە چـۆمان، ناوچـەی باڵەکایـەتی دانیشـتم لەسـەر کورسـی و مێزێکـی قوتابخانەیـەکی چـۆلکراوی ئامـادە کـراو بـۆ ئێمـەی پێشـمەرگەی تـازەو دێرینەکان کە هەر یەکێکمان سەر بە شارو شارۆچکەیەکی کوردستانەوە بـووین لـەو شـوێنەدا شۆڕشـی کـورد کـۆی کردبووینـەوەو بـە یـەکترمانی ناساند، دانیشتمو ئەوەی لە تەنیشتمەوە بوو ناوی مۆفق بکر کۆیی بوو، پێشـتـر هـاوڕێ بـووین، هـەروا عەبدولواحیـد عـەزیز دیبەگـەیی خـزمو ناسـیاوم بـوو جگـە لەوانـە کەسـانی تـر هـەبوون خـەڵکی هـەولێر بـوونو دەمناسین، ئەو قوتابخانەیە لەسەر ئەو شەقامە بوو لـەو چەمو ڕووبـارەی چۆمانی جیا دەکردینەوە کە بە ژێـر ئـەو پـردە ئاسـیننەی بەرامبەرمانـەوە خوڕەو هاژەی نەپساوەی بەردەوام بوو، هەروا کەوتبووە دامێنی هەورازی مـەمی خـەلان کـە ئێزگـەی دەنگـی کوردسـتانی عیراقـی لـە خـۆ دەگـرت، لا باڵێکیشـمان کـە هەمیشـە ئاوڕمـان لێ دەدایـەوە کێـوی هـەڵگورد بـوو ئـەو قوتابخانەیە هەم بۆ خوێندنو هەم بۆ خـەوتنی هـەمووان ئامـادە کرا بـوو، بـیرم نـەماوە لـە ئاسـتی چـل کـەس دەبـووین، ئـەو هۆڵـە لاکێشـەیەی بـەو کورسـی و مێـزە دارینانـەی پـڕ کرابوونـەوەو هیچـیان بـەتاڵ نـەمابوون، قوتابیـانی سمێڵ بـابڕو پێشـمەرگەی کـۆنو تـازەی لەسـەر دانشـتبووین،

هەموومان لە قۆناغەکانی خوێندن دابڕاو بووین لەبەر باری سیاسیو کوردایەتیو هەر هۆیەکی تر بوو بێ، لەو پەیمانگەیەدا گیرسا بووینەوە، ڕاستە ئەو شوێنە بە پەیمانگە ناودار بوو بەڵام لە حەقیقەت دا دەورە بوو بۆ ماوەی سێ مانگ خوێندنو پێگەیاندنو بوون بە مامۆستای شۆڕش بۆ وانە گوتنەوە لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستاندا، بەڵام ئاستی خوێندنەکە زۆرقورسو جدی بوو.

مامۆستایانی وانە وتنەوەی ئەو پەیمانگەیە بریتی بوون لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو مەکتەبی تەنفیزی یان کادیرانی پێشکەوتوو لە پارتی دیموکراتی کوردستان کە وانەکانیان پێ دەگوتین بە رۆشنبیرێکی فراوانو هەروا چاندنی رۆحی شۆڕشگێڕیو بەرەنگاریو دان بەخۆ داگرتنو زاڵ بوون بە سەر خودو ئیرادەی کەسێتی.. هتد.

مامۆستاکانیشمان بریتی بوون لەو بەڕێزانە: (د. محموود عوسمان – جەرجیس فتح الله –رەمزی قەزاز – مامۆستا محەمەد ئیسماعیل – محەمەد فاتح رەسووڵ – هاشم عەقراوی – د. فازل – مامۆستا لەتیف نادر – مامۆستا محەمەد عەلی مستەفا)

ئەو وانانەی پێمانیان دەگوت بریتی بوون لە: (زانستی کۆمەڵایەتی – زانستی دەروونی – سەرەتاکانی زانستی رامیاری – شۆڕشی هاوچەرخی کورد – شۆڕشەکانی گەلان – لاپەڕەکانی مێژووی کورد – فێربوونی شێوازی رێنووسی لاتینی.. هتد)

ئەو پەیمانگەیە جگە لەوەی بۆ ئامادە کردنی مامۆستایێتی بێ بۆ قوتابخانەکان، کەچی وانەکان، هی دەورەی کادیرانی سیاسی بووو زۆر سوودبەخشو گرنگ بوو بۆ فراوانکردنی ئاستەکانی رۆشنبیری لە زۆر

رووەوە بۆ زیاتر قوڵبوونەوەو تێگەیشتن لە ژیانو سیاسەتو مێژووی کوردو کوردستان بە ماناکانییەوە.

لەو تەمەنو قۆناغە هەستیارەدا کە تەمەنم (١٧)ساڵان بوو، وەرگرتنو داکردنی جوانییەکانی سروشتو وانەکانی ژیانو ئەو وانانەی دمانخوێند، یەکێك لەو دەستکەوتانەی وەدەستم هێنا (شیعر) بوو کە بە شادەماری رۆحمدا گوزەری دەکرد لە کاتێکدا (ئەدگار ئالان پۆ) ی شاعیر دەڵێت: (جوانی تاکە گۆڕەپانی شیعرە) بەندە بەرامبەر بەو شاخە سەرکەشو سیحر ئامیزە جوانانە کە هەموو بەیانیەكو ئێوارانێکی لە خۆ گرتوو چاوانمی دەڕشت، ئەو چەمو رووبارەی لەبەر دممدا بە بەردەوامی ئەو سێ مانگەی دەورەکەمان مۆسیقای دەژەنی بە خوڕەو هاژەی نەپساوەیو رۆحمی بەراو دەکرد، ئەوەتا (لۆرد بایرۆن)یش دەڵێت: (مۆسیقا هەیە لە وژەی قایشدا، مۆسیقا هەیە لە خوڕەی جۆگەڵەدا) بەڕاستی یەکێك لەو خزمانەی کە لەو پەیمانگەیە هەمیشە پێکەوە بووین وەك دوو هاوڕێو دوو برا کە ئەوسا زانیاری ئەو لەسەر هۆنینەوەی شیعر هەبووو شیعری جوانیشی بەرهەم هێنا بوو خوالێخۆش بوو (عەبدولواحید دیبەگەیی) بوو هاوەڵو هاندەرم بوو بۆ بەردەوامبوونم لەسەر هۆنینەوەی شیعر، ئەمە لایەك، لە لایەکی دی لە تەنیشت ئەو پردە ئاسنینەی بەرامبەر نیشتەجێیمان لەسەر چەمی چۆمان چایخانەیەك هەبوو هی (فاتح ئاڵتونچی) کە خەڵکی کەرکوك بوو، ئەم چایخانەیە وەك بنکەیەکی رۆشنبیری بوو جگە لە چایەو ساردی، ئێواران تەشریبی گۆشت مریشکی بە زەردە چوو ساز دەکرد، زۆربەی ئەو بێژەرو نووسەرو رۆشنبیرو کارمەندانەی لە ئیزگەو چاپخانەی خەبات بوون لەبەرزایی (مەمی خەلان) کاریان دەکردو زوو زوو شۆڕ دەبوونەوە بە تایبەتی

ئێـواران لـەو چـایخانەیەدا دادەنیشـتن وردە وردە لەگـەڵ زۆربـەیان تعـارفم دەکردو خۆم پییان دەناساند، بەڵێ کەسـەکان ئەوانـەی لـەو چایخانـەیەدا دەمبیـنین وەك ١ – (شـەهید عەبـدولخالق مـەعروف) لـە ئێزگـەی دەنگـی کوردستانی عیراق تەکنیکار بوو، ئیزگەیەکی ناوخۆیشـی دروسـتکرد بـوو چەند کیلۆمـەترێك لـە ناوچەی باڵەکایـەتی پەخشـی گـۆرانیو سـروودی خۆش خۆشی هەبوو بە دوور لە (هانی هـانی)و گێرەشـیوێنی دەنگەکان..
٢ – رەفیق چالاك /ی هەنەرمەند، بێژەر، ٣ – بارزان مەلا خالید (بێـژەر) – دڵشاد مەسرەف (بێژەر) ٥ – عوسمان سەعید (بێژەر) ٦ – محەمەد ئـەمین ئـاکرەیی / ئـاغۆك ٧– ئەحمـەد دەشـتی لـە بەشـی هونـەری ئێزگـە ٨ – عبدالغنی علی یحیا نووسـەر ٩ – سـەعید یحیا (بێـژەر) لە بەشـی عـەرەبی ١٠ – ئەحمەد جەزراوی لە بەشی هونەری ئێزگە بوو، ئەوەنـدەی بە بیرما دەێـت لـەو چـایخانەیەدا ئـەو بەرێزانـەم بینیـووە. جگـە لەمانـەش مـام هەژارموکری شاعیرم بینیوەو قسەم لە گەلیدا کردووە.

– رۆژێکیـان لـەو چایخانەیە دانشـتبووم، وا رێـك کـەوتبوو لای دەسـتە ڕاستم عەبدولخالق مەعرووف بوو، ئەو من ناناسیّ، لە پڕ رەفیق چالاك بـە بـە ژوور کـەوت پێشتـر لەگـەڵ نـاوبرا رەفیـق چـالاك تعـارفم کـرد بـوو دەیناسیم، کاك رەفیق رووی لە عەبدولخالق کردو بە سوعبەت پێـی گـوت ها هەولێرینە لێرەش یەکتریتان گرتەوە؟، عەبدولخالق گوتی لەگەڵ کێتـە؟ کاك رەفیق گوتی لەگەڵ کاك موحسین؟ عبدولخالق گوتی من ئەو کوڕە هەر ناناسم بەڵام علـی عینـاد (–) ئـەوە تـەعارفی لەگـەڵ دەکـەم، دواتـر رەفیـق چالاك چای دەخواردەوە، عبدولخالق ڕووی لـە مـن کـردو تـۆ کێـیو چـیو چـی، دەرکـەوت ناسـیاوو خـەڵکی هـەولێرو یـەك ناوچـەین، لـەو ڕۆژەوە بووین بە هاوڕێو هاودانیشتنو هاوسەفەری هەمیشـەیی تا رۆژی شـەهید

بوونی له هەولێر، دواتر بووینه خزمیش ئێستا خوشکەزاکەی براژنی منه.

هەروەها تەعاروفم لەگەڵ ملازم نەریمان بەکر سامی کرد کە ئەو کات ماڵی هەر لە چۆمان بوو، ناسینی ئەویش لەبەرئەوەی خوشێکیکی خێزانی ئەمیری مەردان ئاغا بوو، ئەمیریش هاوڕێمانو ناسیاو بووو لە گەڕەکەکەی ئێمەدا بوو.

(٢٠)

- ئەو چایخانەیەی فاتح ئالتونچی وەکو چایخانەی مەچکۆ لە هەولێرو چایخانەی شەعب لە سەلیمانیو چایخانەی پەرلەمان لە بەغدا ئەوسا بوو زۆربەی رۆشبیرو سیاسیو ئەدیبو هونەرمەندانی پێشمەرگەو کەسانی هەموو ناوچەکانی کوردستان، چایەك یان نانێکی ئێوارانی لەو چایخانەیە نۆش کردووەو وتووێژو دیدارو لێك تێگەیشتنێکی تیایدا ئەنجام دراوە، لەو چایخانەیەدا جارێکیان چاوم بە مام هەژار موکریانی شاعیرو مامۆستا سەعید ناکام کەوتووە بەڵام هێمنی شاعیرم نەبینیوە رۆژێکیان لە مەمی خەلان کە لە دەزگای خەبات بوو دابەزیٚ بۆ ئەو چایخانەیە تەنیا ناوم بیستبوو، ناویان دەهێنا، لەو تەمەنە زۆر بزیوو هەڵمەقۆی دیدارو خۆ نزیك کردنەوە بووم کە شیعری کرچو کاڵم هەبوو، حەزم دەکرد نیشانی ئەو نووسەرو بێژەرو رۆشبیرانە بدەم تا لە ئاستی شیعرەکانی خۆم بگەم بە تایبەتی نیشانی بێژەرو هونەرمەند رەفیق چالاكو بارزانی مەلا خالیدم داوە، ئەوان روویان نەدەشکاندم هەر چەندە شیعرەکەی منیان بە کرچو کالٚ دەزانی، شیعرەکانی (عەبدولواحید دیبەگەیی)یان پیٚ باشتر بوو کە پێکەوە لەو پیمانگەیە دەمانخوێند، بەڵام زۆرم سوودم لە رێنمایەکانی رەفیق چالاكو بارزان مەلا خالید وەرگرت بۆ پەرەپێدانی شیعرەکانم، هەروا عەبدلواحید دیبەگەیی هاورێشم، لە بیرمە لە گۆڕەپانێکی چۆمان هەر لەو ساڵە ١٩٦٩ شانۆیەك دانرا، رەفیق چالاك رۆڵی سەرەکی تیا دەدیت هەر لە نووسینو دەرهێنانو نمایشکردنی شانۆیە شۆڕشگێڕیەکە

چەند دێڕێك لە شیعرێكی عەبدولواحید دیبەگەیی خوێندەوە كە دوو دێڕی سەرەتاكەی لە یادم ماوە (شیخ مەحموو.. شیخ مەحموو... هەڵسە لە خەو ئاسۆ پشكوو) جا پیتی (د – ت)ی لەو دوو دێڕەدا قوتدا، خوێندنەوەی ئەم شیعرەی هاوڕێم بە دەنگە خۆشەكەی رەفیق چالاك، بۆ من هاندەرێك بوو، تۆ بڵێیی رۆژێ ئاوا ناوی منیش بێت ببم بە شاعیر؟

هەر پشوودانێك ببوایەو كتێبێكو نامیلكەیەكو بڵاوكراوەیەكی ناو شۆڕشم دەست كەوتبووایە لە ئاوایی چۆمان دەردەچووم بە تەنیا لە دەم رووبارو لە ژێر دار كرۆسكێ دادەنیشتمو دوای ئەوەی كرۆسكێكم دەخوارد ئیتر دەستم دەكرد بە خوێندنەوەو چاكردنەوەی شیعرە سەقەتەكانم، یادی ئەو رۆژانی ژێر ئەو (دار كرۆسكە)ی دەم رووبارەكەی چۆمانو ئاساوەری لە شیعرێكمدا سەری هەڵداوە لە ژێر ناونیشانی (وەیلێ زاڵم) كە لە كۆمەڵە شیعری چاپكراومدا (چۆڕاوگە) لە لاپەڕە (٢٧) دا هاتووە لە ساڵی ١٩٧٩ نووسراوەو لە رۆژنامەی هاوكاری ژمارە (٤٥٧) لە هەمان ساڵدا ١٩٧٩ بڵاوبۆتەوە كە تیایدا دەڵێم:

كێ دەڵێ تۆم خۆش ناوێ؟
ئەی تۆ ئەو دار كرۆسكە نی...
هەر كە ئاسۆ چاو هەڵدێنێ
دەشنێیتەوە، لەگەڵ دەسترێژی هەتاوا
منیش دەبمە، سێبەری ژێر نیگاكانتو
بە دەورەی قەدی جوانیتا دەسوڕێمەوە
تا خۆرئاوا؟!!

لە نێوەندی ئەو سێ مانگەی لەو دورەیەدا، ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندیەکانمو ناسینی برادەرو خزمو ناسیاوەکانم فراوانتر دەبوو لە پاڵ گەڕانو سووڕانەوەم لە کاتی پشوودان بۆ گوندو ناوچەکانی ئەو دەڤەرەی بالەکیان، جار جاریش کە دەچووینە دەربەند رایات کە وەك ناوچەیەکی هەڵکەوتەی گەشتیاری بوو لە ناو شۆڕشی ئەیلوول، جا لەوێدا سەرتاشێك هەبوو ناوی عەبدۆ باوە بوو بەردەوام مەستو سەرخۆش بوو، هەر کە دەبووە سەعات (١٢)ی نیوەڕۆ هەر پێشمەرگەیەك یان هەر کەسێك لەبەر دەستی بووایە کە پرچی بتراشێ یان تراشی بکات ئەگەر نیوەیشی مابووایە کە دەبووە سەعات دوانزەی نیوەڕۆ دەیگوت (تایم تەواو) بۆ سەعاتێك نان خواردنو پشووە، ئێمەی گەنج چەند برادەرێك کە لە دەربەند بووایـن ئەو حاڵەتەمان دەزانی چاوەڕوانمان دەکرد چ نەزانێك پێش سەعات دوانزە تووشی ئەم بەڵایە دەبێت، جا هی ئاوا هەبوو بەشیکی تراشی بووو ئەوەیتری مابوو دەیگوت تایم تەواو لەگەڵ پیاوەکە دەبووە کێشەیان دەیانگوت چۆن بەم حاڵە بچینە دەرو بمانبینن، ئێمەی گەنجانیش لە دەرەوەی دوکانەکەیدا دەتریقاینەوەو پێدەکەنین، ڕۆژێکیان سەعات دوانزە (٥) دەقیقە کەمتر بوو پێشمەرگەیەکی ماندوو پێدەچوو لە دوورەوە هاتبێ، بە جەمانەکەیەوە دیار بوو هی ناوچەی شارەزوورو ئەو ناوە بێ، کلاشنکۆفەکەی لەسەر کورسیەك داناو سەری خستە بەر دەستی عەبدۆ باوەی سەرتاش، سەیرمان دەکرد نیوەی لایەکی سەری هەڵپاچی بوو، هێشتا لایەکی مابوو، سەیری سەعاتەکەی کرد گوتی تەواو تایم تەواو، پێشمەرگەکە گوتی یانی چی تایم تەواو، عەبدۆ باوەی سەرتاش گوتی تا سەعاتێکی تر کار ناکەم، پێشمەرگەکە گوتی بۆ من فیلم دەردەهێنم ئاوا بچمە بازاڕو ناو خەڵك تا سەعاتێکی تر؟ نابێو چەندو

چوون، پێشمەرگەکە ڕایکیشایە کلاشینکۆف گووتی بە فەخری عالەم، ئێستا لێرەدا نەك تایمەکەت، تۆش تەواو کەم، عەبدۆ باوە گوتی باشە بابم باشە با بۆت تەواو کەم بەلأم ئەمڕۆ تایمەکەت لێ تێکدام.

یەکێك لە هاوڕێکانم کە پێکەوە بووین ناوی (بروسك حەسەن نۆ پل) بوو، باوکی شوفێر بوو، ترومبێلێکی دۆجی هەبوو لە نێوانی هەولێرو چۆمان هاتوو چۆی دەکرد، حیسابێکی دوو سەرەیی هەبوو هەم جێگای متمانەی ڕژێم بووو هەم لە ناو شۆڕشی ئەیلوول روخسەتی هاتووچووی هەبوو سوودی لێ وەرگیراوە، لە ڕێگای بروسك، بە (حەسەن نۆ پل)ی باوکی دوو جار نامەم بۆ ماڵەوەمان نارد، لە ماڵەوە پیان گوتبوو بۆ شیعرێك لە ئێزگە ناخوێنێتەوە گوێمان لە دەنگی بێت، منیش شیعرێکم نووسیبوو بە ناوی سروودی پێشمەرگە زۆر بە دڵم بوو، ڕۆژێکیان بە بارزان مەلا خالیدو ڕەفیق چالاکم نیشان دا پیان جوان بوو بەلأم کەم‌و کورتی‌و ناتەواو بوو، بۆیان دەسکاری کردم، بوو بەو شیعرەی ئیمزای لەسەر کرا لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق بخوێنەوەو هەر خۆی بارزان مەلا خالید پێشکەشی کردم، ئەو شیعرەم خوێندەوەو بە باوك‌و دایکم‌و خوشك‌و براکانم لە هەولێر بە بیستنی دەنگەکەم هەنێکیان گریاون، زۆریان پێخۆش بووە ئێستایش ئەوانەی ماون بە شانازییەوە باسی دەکەن، ئەمەیش شیعرەکەیە:

(سروودی پێشمەرگە)

هاوژینەکەم

دڵدارێکم بۆیە ئەڵێم

ئەمڕۆ لێرەم، سبەی لەوێم

نیشتمانم، شوێنم، شارم

دڕك‌و داڵە

تەندروستیم بێ هەواڵە

ئیش‌و کارم، زام‌و خوێن‌و ئارەقەیە

جێگای گۆڕم ناو سەنگەرە

مۆسیقام گرمەو تەقەیە

بەلاٌم تەنیا هێندەم بەسە

ئەگەر لە باوکم بپرسن

دەڵێ کوڕم پێشمەرگەیە

***

هەگبەی بیرم، پەنگری نێو ئاگردانی

دڵ‌و مێشکی چەوساوەیە

تاوانی هەزار زوحاکە

قینی تەقیوی کاوەیە

***

ئەڕۆم... ئەڕۆم

لەسەر سینگی ناسنامەکەم

تۆمار دەکەم

نیشتمانم کوردستانە

نیشتمانم کوردستانە

***

هەر لەو ساڵەدا ١٩٦٨ لە مانگی ئاب بوو هەواڵێکی دڵتەزێن بلاٌو کرایەوە لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراقدا کە (خەڵکی گوندی دەکان خۆیان لە ئەشکەوتێك شاردۆتەوە، سەربازەکانی ڕژێم دەنگیان داوە، لە ترسان

نەهاتوونەتە دەرو ئاگریان تێبەرداون، مانگێك پاش ئەو كارەساتە گوندی (صـــۆریا)ش پـــەنجا كەســـێكەو قەشـــەی گوندەكـــەیان كـــۆ كردۆتـــەوەو گوللەبارانیان كردوون، جا كاریگەری ئەم هەواڵە تراژیدیە وێنە شیعرێكی پیێ دارشتم كە لە گۆڤاری (بۆ پێشەوە ژمارە (٢) لە ١٩٧٣ بلاوم كردەوەو لە دیوانە چاپكراوەكانیشمدا هەیە كە دەڵێم:

لە گەشتەكەی ئەو دوایەمدا لە كوردستان
لە منالو ژنو پیاوانی صۆریەو دەكان
بیستم وتیان
لە ولاتی هیندستان
هەر ئادەمیزادیێ كە مرد
دەستو برد
لە ئەلقەی گەماڕۆی دەدەن
كە دەهێنن
وەكو زیندووەكانی ئێمە دەیسوتێنن

هەڵبەتـە ئـەو تاوانـە گەورەیـە زۆری پـیێ نەچـوو لـە تۆڵـە سـەندنەوەیدا پێشمەرگە نەبەردەكانی شۆڕشی ئەیلوول دەستێكی قورسیان لەسەربازو هێزە تایبەتیەكەی كۆماریو ڕژێم وەشاند بـە دەیـان كوشـتارو برینـداریان لێ كەوتـەوەو ژمارەیـەكی زۆریـش لـە چـەكو تەقەمـەنی دەسـتكەوتیان وەدەستكەوت.

## (٢١)

لەو ڕۆژانەی دەورەکەمان نزیك بوو ئەزموونەکانمان دەست پێبکات، چوار هاوڕێی دەورەکە بووین بە دەم خوێندنەوەی ڕزمەی وانەکانەوە دەمەو عەسر بەریَ کەوتین لە چۆمانەوە بە نیازی ڕۆیشتن تا گەلاڵە بە دەم خوێندن و دەورکردنەوەی وانەکانمان کە بریتی بووین لە بەندەو موفق بکر کۆیی و ئەکرەم خۆشناو و عەبدولواحید دیبەگەیی، کە کاتی پشووی دانی پەیمانگەکە بووو بە هەڵمان زانی بە دەم خوێندنەوە بەرەو گەلاڵە بچین و لەوێش هەندێك پێویستمەندی بکرین چونکە دواتر بەرەو ناوچەو گوندە جیاجیاکان دابەش دەکراین بە سەر قوتابخانەکان، بەڵام دنیا هەندێك تاریك داهات، بڕیارماندا لە ناوپردان کە مێوانخانەی پێشمەرگانی لێ بوو ئەو ئێوارەیە روو لەوێ بکەین و نانی ئێوارە لەوێ بخوین و شەویش لێی بخەوین، ئێوارە هەر یەکمان ئەستتورکێکی تەنوورو چایەك لە قۆغەیەکی ژەنگاوی نۆشمان کرد، کە شەویش داهات لە هۆڵێکی لاکیشەیی گەورە، فەرموون ڕاکشێن بێ چراو ڕووناکی بۆ خۆپاراستن لەبەر هێرشی فڕۆکەکانی ڕژێم و هەروا لەبەرئەوەی پێشمەرگەکانی ماندوو کە لەبەرەکانی شەڕەوە هاتوون یان لە ناوچە دوورەکانەوە تا بە ئارامی بخەون، ئێمەش گەنجی خوێن گەرم و زۆر بڵێ چۆن ئاوا زوو خەومان لێ دەکەوێ؟ ئەوەی دەمەوێ بیڵێم تا درەنگانی شەو قسەو نوکتەو سەربردەمان دەگێڕایەوە، لەو گفتوگۆیەدا بووین و

ژوور تاریکە، یەکێك دوورتر لە ئێمە گوتی (ئیهی ما خرا بەو تاریکستانە غەرەتانیش ناکەن) وەك ئەوەی بڵێیت لە تاریکیدا قسەکان ناگەن‌و یەکتر نابڕن.

بۆ بەیانی بەرەو گەلاڵە بە قوتە لاندرۆڤەرێکی بە کرێ سوار بووین چووینە گەلاڵە، چەند پیویستمەندیەکی ویستمان کڕیمان‌و نیوەڕۆ لە ماڵی خاڵم سابیر کاکەشین نانمان خواردو لە گەرماوەکەی گەلاڵە خۆمان شوشت بۆ ئێوارە گەڕاینەوە پەیمانگەکەمان لە چۆمان.

سەرەتای پایزو مانگی کانوونی یەکەم ١٩٦٩ بوو، لە هەرەتی لاویەتیدا بووم بە فەرمانی (م. س. پ. د. ك)و پەروەردەی گشتی نێو شۆڕشی ئەیلول بڕوانامەی مامۆستای شۆڕش‌و دامەزراندنم وەرگرت لەگەڵ چەند لە هاوریانم کە لە دەورەکە پێکەوە بووین‌و ئەوانیش زۆربەیان خەڵکی شەقلاوەو ناوچەی خۆشناوەتی‌و هەولێر بوون، تفەنگ‌و فیشەکمان وەرگرت بە جلی خاکی‌و چەك‌و فیشەنگدانەوە کۆڵە پشتمان بەست‌و بەرەو هیران بەرێ کەوین کە کە بنکەی سەرەکی پەروەردەی ناوچەی خۆشناوەتی بوو، بەرێز تاهیر عوسمان گۆمەشینی، یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەو سەر پەرشتیاری قوتابخانەکانی دەڤەری لقی دوو بوو لە هیران، ژمارەمان زیاتر لە پانزە نەفەر دەبووین‌و دڵمان خۆشەو دەورەکەمان تەواو کردووەو ئەو دەڤەرە جێدێلین‌و لە جێنزگەو ناوچەکانی خۆمان نزیك دەبینەوە، کاتمان دیاری کرد بوو هەمووومان لای پردی (حافیز) کۆبینەوە لەوێوە رێگای ئۆتۆمبیل نەدەما‌و بە پای پەتی سەرەتا بەرەو دەرگەڵەو شاخی کارۆخ‌و دواتر بەردەوام بین لە رۆیشتن تا نێو هیران کە لەوێوە دابەش دەکرێن بە سەر ناوچەکانی خۆشناوەتی، بەڵێ بە ئامادەبوونی هەموومان لە پردی حافیزەوە کە تازە خۆر گزنگی پەرش دەکرد بەڕێ کەوتین بەرەو دەرگەلەو لەویوە ڕۆیشتین لە کویستانی

کارووخ هەر یەکێکمان لەسەر بەردێك دانیشتینو پشوێ بدەین کە هێشتا کاروخ بەفری بە سەر شانەوە مابوو، دەمەو عەسر بوو دیمەنەکەی هێندە جوانو پاكو فێنك بوو (تاگوور دەڵێت: تەنانەت چۆلەکەکانیش ناتوانن لەسەر داری وشك بوو بخوێنن) بەڵێ جریوە جریوو چریکە چریکەی چۆلەکەو باڵندان ئێستایش لە گوێمدا نەپساوەتەوە کە یادی ئەو شوێنە دەکەمەوە بۆ یەکەمجار دیومە بە تەرێتی دارو بەردو ژینگە جوانەکەی، ئەوەی شایەنی گوتنە هەڤاڵەکانم بەردێکی (سپی) یان لەسەر شاخی بەرامبەرمان کردە نیشانە بەو تفەنگانەی وەرمان گرتبوو، هەر چەندە باوکم سوارچاكو نیشانچی بووە کە لە گوندەکان لە گەڵیدا بوومەو لە بۆنەکان نیشانەیان دادەنا باوکم بە سەریا تێپەڕ نەدەبوو نیشانەیەك نەپێکێ هەر پێکاویەتی بەلاّم من بە ژیانم هیچ چەکێکم نەتەقاندووە، جا هەموو لە هەڤاڵەکانم هیچ یەکێکیان نیشانەکەی نەپێکا، منیش تفەنگەکەم سوار کردو قسەکەی باوکم هاتەوە بیرم گوتی ئەگەر سێرەت لە تفەنگەوە گرت هیچ پشوێ مەدەو جولە مەکە پلی پێوە نێ، نیشانە دەپێکی، هەر وام کرد، نیشانەم شکاندو تۆزێکی سپیم لەبەردی سپی نێو بەفر هەستاند، هەڤاڵەکانم هاواریان لێ هەستاو دەستخۆشیان لێ کردم، بەلاّم حەپەسانو پلاریان زۆر بوو، منو کوڕی شاری یەکەمجارە چۆن دەبێ نیشانەی هەمووان ببەزێنم، سوێندیان دام کە جاری تر نیشانەت گرتووە، گوتم ئەوە یەکمجارەو قەت تەقەیەکم نەکردووە بە هیچ چەکێك، بەلاّم ڕێنمای باوکم جێبەجێ کرد، پاش پشوێ بەڕێ کەتین بە نێو ئەو تەنکە بەفرەی لەو کوێستانەی کاروخدا هێشتا هەر مابوو، تا کاتی خۆر ئاوا بوون کە لە دوورەوە ئاسۆ سوورو خوێناوی بوو، ئەوەتا کاریگەری دیمەنی ئەوسا لەو شیعرەمدا ڕەنگی داوەتەوە بە ناوی چوار وەرز لە

گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٠ – ٤١)ی ئاداری ١٩٧٧ دا بلأوم کردۆتەوە تیایدا دەڵێم:

دەنگ دێ کێیە، منم زستان
ڕەوانەم کرد، گومرگی پێکەنینی خۆر
لە چاوی ئاسۆ وەرگرێ
ئێوارەیە، شەو پەنجەکانی لە خوێن دەگرێ

لەسەر بەرزاییەك وەستا بووین ئەو هەڤالأنەی کە پێشمەرگەی کۆن بوون و شارەزای ڕێگاکان بوون گوتیان، ئێستا لێرەدا شۆڕدەبینەوە تا دەگەینە گوندی سەران لەو گوندە دابەش دەبین بە سەر ماڵەکان، شەو دەمینێنەوە و بەیانی زوو بەڕێ دەکەوین، منی شارستان فیلمی هیندیم زۆر دیبوو لە سینەمەکان، رووەو نشێوو بەرەو خوار لاسایی (شامی کابورم) دەکردەوە بە خشۆك و گلۆر بوونەوەو دڵ خۆش بووم، پلاری یەکیك لە هەڤالأنم، ئای ئاوارە دایکت لە کوێیە ئاوا بتبینێ، ناوی دایکم و غوربەت و دوورییەکەی خورپەیەکی لە دڵم هەستاند، ئیتر ڕاست بوومەوەو تاسام بۆ ماوەیەك و بەردەوام بووم بەرەو خوار، تا گەیشتینە ناو گوندی سەران تازە تاریك دادەهات لەبەریی گوند کورێکی جحێل چاوی بەو ڕەوە گەنجانە کەوت، گوتی بە خێر بێن، بەر لەوەی بچنە مزگەوت و بە سەر مالأن دابەش بن، سێ کەستان وەرنە ماڵی من، یەکێکیان لە هەڤالەکانمان ڕێبەرمان بوو، من و ئەکرم خۆشناو سابیرخەجە شەقلاوەیی و عبدلواحید دیبەگەیی چووینە ئەو ماڵەو ریبەرەکەمان گوتی بەیانی زوو سەعات شەش لەبەر دەمی مزگەوت ئامادە دەبین و دەڕۆین و ئەوەی دوا کەوێ جێیی دەهێڵین.

(٢٢)

بەڵێ لە گوندی سەران، شەو لەوماڵە خەوتین کە سێ نەفەر بووین وەك لە ئەڵقەی پێشوو ئامارەم پێکرد بووو بۆ بەیانی لەگەڵ گەردی بەیاندا خانەخوێ هەڵساون و ئاوەدانی کەوتە ماڵ و ژن و کچێکی جوانکیلەیان لەبەر نانی بوون نانیان دەکرد، ئێمەش هەڵساین و دوای ماوەیەك نانی گەرمی بەیانیان و چاوو ماستیان بۆ دانابن دواتر چەند نووردووە نانێکیان پێدابن لە ڕێگادا ئەگەر برسی بووین بیخۆین، چوینە بەر دەم مزگەوت کە بە پێیی وادە سەعات شەش بە ئامادەیی هەموومان کەوتینەوە ڕێ تا کاتی نێوەڕۆ لە گوندی (مەلەکان) خۆمان بینییەوە، هەندێك گوێزمان وەرگرت بە نیازی کڕین و پارەیان لێ وەرنەگرتین لە گەل ئەو نوردووە نانەی پێمان بوو لە دەرەوەی گوند لە ژێر درەختێك و لەسەر کانییە ئاوێك دانیشتین و نۆشمان کرد، نکوڵی لەوە ناکرێ بە تایبەتی ناوچەی باڵەکیان و خۆشناوەتی بۆ مێوانداری و ڕاگرتنی ڕێبوارانی شەوو خزمەتکردنی پێشمەرگان هەمیشە دڵ فراوان و ڕووخۆش و جوامێر بوونە، ژنەکانیان شەرەف و گەورەیی و نەزاکەت و نەفس بەرزی و خزمەتگوزاریان لێ دەڕژا، ماندووو نەساوە بوون، ناکرێ ئەو گوندنشینانە فەرامۆش بکرێن و بە سەر نەکرێنەوە.

ڕۆیشتین و ڕۆیشتن، یەکەمجار بوو گوێم لە وشەی کەپکی بێشیخ و گەرووی دەرەشیرو ناوی ئەو شاخ و گەرووە تەنگەبەرانە بێت کە بە نێو

بەردەڵان و شاخی ڕك و ڕێچكەو هەورازو نشێوان بە پا، بە بێ پسانەوە ڕۆیشتین لە پاڵ جوانی ڕاكشاوی سروشتی دڵڕفێنی ئەو بەرزاییو نزمانەدا، هەموومان گەنج و لە تافی لاوییەتی بووین هەروا بە نێو گوندو دەرەوەی گوندێكی زۆر تێدەپەڕین ناویان دەهێنا ئەمە بالیسانە ئەوەیتر چیوەی سەروو و چیوەی خوارو كاموسك و زۆر ناوی تر كە لە یادم نەماوە پاش سێ ڕۆژو دانێك بە پا ڕۆیشتن ئێوارە بوو بە نێو پەرژینەكانی باخە باخەڵ پڕەكان و بە سەر جۆگەلەی ئاوی سازگار بازمان داو گەیشتینە دەوروبەری هیرانی جوان ئەو كات ئێمەش جوان و جحێڵ بووین (كۆنفۆشیوس) دەڵێت: (بە پیری جوانیت دێتەوە بیر، كە جوانیت ڕۆیشت نابێتەوە گیر) (براون جاكسۆن)یش دەڵێت: چاوەڕوانی ئەوەت نەبێ ژیان هەمیشە لەسەر پاژنەیەكی باش بۆت بسوڕێ.

تاریك و روون بوو گەیشتینە ناو هیران چووینە لقی دوو، بەڕێزان خورشید شێرەو عەبدولڕەحمان گۆمەشینی لێبوو، لیستی ناوەكانمان دانێ و گوتیان ئەم شەو بخەون لەو قوتابخانەیەی ناوچەی هێزی سەفینی لێیەو هەندێكیش لێرە لە لق و جێگای ترو بەیانی كاك تاهیر گۆمەشینی فەرمانتان بۆ دەردەكات و دابەشتان دەكات بە پێی پێویست بوونی قوتابخانەكانی ناوچەی خۆشناوەتی كە مامۆستا تاهیر سەرپەرشتیاری پەروەردەی ناوچەی خۆشناوەتی بوو لە هیرانیش جێنشین بوو... بەیانی لە قوتابخانەكەی هیران كۆبوینەوە كە ناوچەی هێزی سەفینی لێبوو، مامۆستا تاهیر گۆمەشینی هەر شەو بڕیاری ئامادە كرد بوو بە دابەش كردنمان بۆ قوتابخانەكانی گوندەكانی ناوچەكانی خۆشناوەتی و ناو هیرانیش، دوای ئەوەی ناوەكانی خوێندەوە من لە نێو لیستەكان بۆ مەلەكان دانرا بووم، سەرەتا بێدەنگ بووم دواتر بە تەنیا قسەم لەگەڵ

مامۆستا تاهیر کرد گوتم من هەمیشە ڕۆڵی لێپرسراوەتیم هەبووە لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان هەروەها وەك كادیرێكی پێشکەوتووی پارتی، پێویستە لە قوتابخانەیەی هیران جێگیرم کەی‌و ڕۆڵم لێرەدا زیاتر دەبێت‌و من ناچم بۆ قوتابخانەی مەلەکان، گوتی ئەوە بە کەیفی تۆ نییەو بریارەو دەبێ بڕۆیتە ئەوێ، گوتم وا باشە ئێستا بۆم بکەیت باشترە، گوتی ناکرێ، گوتم دواتر پەیوەندیت پێوە دەکەم، ڕۆیشتم بەڵام پشتم بەو نامانە قایم بوو، نامەیەکم پێ بوو کە خالم سابیر کاکەشین بۆ بەڕێز (محەمەد مەلا قادر) ی نووسیبوو کە ئەو کات مامۆستا محەمەد کارگێڕی لقی دوو بوو لە هیران، هەروا نامەیەکی دی بۆ بەڕێز (عەلی هەژار) بوو کە لێپرسراوی ناوچەی جوتیارانی دەشتی هەولێر بوو ئەو کات ئەو ناوچەیە لە هیران بوو، نامەکەی ترم لە لایەن بەڕێز فەرەنسۆ هەریری بوو بۆ بەڕێز مقدم عەزیز ئاکرەیی کە ئەوکات ئامر هێزی سەفین‌و لێپرسراوی یەکەمی لقی دووی پارتی بوو، بۆ ئەوەی ئاگایان لێم بێت‌و یارمەتیم بدەن تا لەوێم، جا مەبەستی سەرەکیم کە لە هیران بم بۆ ئەوەی پەیوەندیم بە ماڵەوە هەبێ‌و ئاگام لە دەنگوباسیان بێت، ئیتر هەر ئەو کاتەی مامۆستا تاهیرم جێهێشت چوومە لقی دووی پارتی لای مامۆستا محەمەد مەلا قادر گوتیان بۆ ماوەی چل ڕۆژ معایەشەی هەیە لەسەر چیای، وا بزانم ناوی چیاکە گلەزەردە بوو، جا ئەو نامەیەم فت، بام دایەوە چوومە ناوچەی جوتیاران پرسیاری مامۆستا عەلی هەژارم کرد، لەوێ کادیرێکی هاوڕێم کە لە شار یەکترمان دەناسی کاك جەبار کارەبا ئاوا ناودارە پرسیارم لێ کرد گوتی مامۆستا عەلی هەژار بە جەولە دابەزیوە بۆ شاخە پیسکەو دەشتی هەولێر، ئەو نامەیەشم فت، لێتان ناشارمەوە هەڵسام بە هەمان ئیمزاو شێوازی نووسینی خاڵم سابیر کاکە شین نامەکەم گۆڕی بۆ بەڕێز

(عەبـدولڕەحمان گۆمەشـینی)م نووسـی کـە هـەم خزمـی مامۆسـتا تـاهیر گۆمەشینی بوو هەم ئەندامی لقی دووی پارتی بوو لە هیران، دوای ئـەوەی لـە لـق نامەکـەم دایـە دەسـت عەبـدولڕەحمان گومەشـینی و خوێندییـەوە، گوتی تەواو لە قوتابخانەی هیـران دەوام بکە، نیوەڕۆ لێرە نـان بخۆ دواتـر مامۆستا تاهیر قسەت لەگـەڵ دەکات و هـەر ئیشـێکت هـەبوو لەبـەر خـاتری مـام سـابیر وەرە لای مـن و بـۆت جێبـەجێ دەکـەم، هـەر لـەو ڕۆژدا لـەو قوتابخانەیەی هیران لە لای هاوڕێکانم بووم مامۆستا تاهیرهاتە ئەوێ گوتی کـوڕە عینادەکـە ئـەوە لێـرەی، گـوتم بـەڵێ، گـوتی ئـەو قرەوێڵەیـە هـی مامۆستاکانی پێشـووی ڕژێمـن لـە گـەڵ ئـەو یاتاغـە کـە لێیـان جێمـاوە لـەو هۆڵـەدا لەگـەڵ ئـەو هەڤاڵانـەت لێـرەدا دەخـەون، هـەر لـەو قوتابخانەیـەدا وانەکانتان دەڵێنەوە دواتر فەرمانێك دەردەکەین کێتان بەڕێوەبەرو جێگرو مامۆسـتای وانـەکان کـە بـە ڕۆژو بـە شـەو دەوام دەسـت پێدەکات بـە پێـی گونجانی ڕۆژەکان ئەگەر هێرشی فڕۆکەکانی ڕژێم بوارمان بدات چونکە بـە ڕۆژ مەترسـی فڕۆکـەکانی ڕژێممـان لەسـەرە، هـەر لـەو قوتابخانەیـە ئـەو ژوورەی تر هەڤاڵانی ناوچەی هێزی سەفینی تیایە، دواتر تعارفیان لەگەڵ ئێوە پـێ دەکـەین و ئاگایـان لـە ئێوەش دەبـێ، بـەڵێ لـەو قوتابخانەیـەو لـە هیران جێگیر بووم، بـەڵام ئـەو کـات شـەڕو پێکـدادان لـە زۆربـەی بـەرەکانی نێـو کوردسـتان لـە نێـوان ڕژێمـی بـەعس و (پیشـمەرگە) هـەبوو بۆیـە فڕۆکەکانی ڕژێمیش بە وەفا بوون بەیانیان زوو کـە لـە خـەودا بووین یـان نیوەڕۆیان کاتی نان خواردن سەردانیان دەکردین.

(٢٣)

دوای ئەوەی لە شارۆچکەی هیران جێگیر کرام وەك مامۆستای شۆڕش بۆ وانە وتنەوە لە قۆناغی سەرەتایی لەو شارۆچکەیەدا لەگەڵ مامۆستایانی دی کە بریتی بوون لە (کانەبی مستەفا - ئازاد حەمە گەمحان - ئیبراهیم عبدولواحید - نوری متی - محەمەد ئەحمەد بەگ - محمود حەمەدەمین) لەو بنایەی قوتابخانەی سەردەمی ڕژێم کە مامۆستاکانیان گەڕابوونەوە بۆ نێو شارو ئیدارەی رژێم، جا خەوتن و خواردن وانە وتنەوەمان هەر لە قوتابخانەیە بوو، جگە لەوەی ژوورێکیش لیژنەی ناوچەی هێزی سەفینی تیا بوو ئەو هەڤاڵانەی لە خۆ گرتبوو (ئیبراهیم کاکۆ / قادر حەمشین / حوسێن باداوەیی / ئەحمەد زەخۆ / حاکم سابیر ئاکرەیی / سمکۆ بارزانی / دکتۆر ساڵح / عەبدولقادر مەلا سادق) هەروا لە هیران لیژنەی ناوچەی جوتیارانی دەشتی هەولێری لێ بوو کە مامۆستا عەلی هەژار لێپرسراوی ئەو ناوچەیە بوو، کارگێڕو ئەندامانی بریتی بوون لەبەڕێزان سەلیم ئاغۆك - مەلا عومەر چڵ هەوێزەیی - مەلا بەهرام گەلاڵی - مەلا حەمید - سادق عەیشێ.. هتد) جا لە هیران لقی دووی پارتی لێ بوو ئەو کات مقدم عەزیزئاکرەیی هەم ئامر هێزی سەفین بوو هەم لێپرسراوی لقی دووی پارتی بوو جێگرەکەی لە لق بەڕێز ئیسماعیل مەلا عەزیز کاکی هیرانی بوو - جگە لە کارگێڕو ئەندامانی ئەو لقە کە بریتی بوون لەبەڕێزان محەمەد مەلا قادر - خورشید

شـــێره - عەبـــدولرحمان گۆمەشـــینی - عەبدولواحیـــد خۆشـــناو کـــە عەبدولواحید لە ئاقوبان جیگیر کرا بوو بۆ سەرپەرشتی ناوچەی ئاقوبان) سـیٚ کارمەنـدی لێبـوو بـە نـاوی (سـەلام گۆمەشینی - بهـرام مەغدیـد - کەیفی کۆیی، هەروەها کوڕێکی جوان و ڕوح سوك كە جێگـری ئامر هێـزی سەفین بـوو زیـاتر لـە هـیران دەبینـدرا لـە گـەڵ مقدم عـەزیز ئاکرەیی نـاوی ملازم فازڵ تالەبانی بوو، دوای ئەوەی لە قوتابخانەکەدا دەستمان بە وانە وتنەوە کرد هەندیٚ ڕۆژ ئەگەر ترسی فڕۆکەکانی رژێممان لەسەر نەبووایـە وانە وتنەوەمان لە پۆلی یەك تا پۆلی شەش وانەمان هـەبوو، بـە شـەویش بـۆ گەوران و پێشمەرگەو پیاوانی دانیشتوانی هیران وانەمان پێیـان دەوتـەوە، ئـەوەی شـایەنی وتنـە مـن هـەر لـە هـیران بـووم ئـەو دەنگوباسـە خۆشـەیان پێڕاگەیاندین واتـە هـەر لەبـەرواری ١٩٦٩ بـوو لـە مـانگی كانوونی یەکەم، دەنگوباســەکەش ئەمــە بــوو (دوو فڕۆکــەی مێــك (١٧) لــەو کاتــەی کــە بــەردوومانی چـیاکانی (ســەفین)یان دەکــرد کــە هێــزی پێشــمەرگەکانی سـەفینی لێبـوو یـەکێکیان لـە فڕۆکـەکان لـە نـازنین کەوتـە بـەر دۆشـکەی پێشمەرگەیەکی لقی هێزی دەشتی هەولێر کە ناوی پێشمەرگەکە (عـەریف ئەبوزێد) بوو، جا فڕۆکەکە کەوتە خوارەوە، فڕۆکەوانەکە بە ساغی بە دیل گیرا، موصلاوی بوو ناوی (حەمید ڕەشید) بوو، دوو کۆپتـەر زۆر هـەوڵیان دا رزگـاری بکـەن بـەلام بـە دۆشـکەو ڕەشـاش و قازیفـەی پێشـمەرگەکان بەرنگاریان بوونەوە نەیانتوانی رزگاری بکەن) جار جـار مەترسـی هێرشـی فڕۆکەکانی ئەلیۆشن هەبوو کە جارێکیـان بـە هـۆی هەڵدانی ناپاڵمێك لـەو قوتابخانـەی ئێمـەدا لێیـی بـووین، پێشـمەرگەیەك بـەوە ڕانەگەیشـت لـەو بنایـەدا بچێتە دەرەوە هـەر لەبـەر دەرگـەی قوتابخانەکـەدا شـەهید بـوو، جـارێکی دی بـاران نم نم دەبـاری دیسـانەوە فڕۆکەیـەکی ئەلیۆشـن ناپـاڵم

هەڵگر بە سەر هیراندا سووڕایەوە پێشمەرکەگانی سەر دۆشکەکەی بنکەی ملازم فـازڵ تالـەبانی جێگـری ئـامر هیـزی سـەفین، بـەوە ڕانەگەیشـتن مشماکەی لەسەر دۆشکەکە هەڵگرن تەقە لـە فڕۆکەکـە بکـەن، جا فڕۆکەکـە بە ئارەزووی خۆی یـەك ناپاڵمی هەڵدا بـە ئاڕاستەی ئـەو بنکەیـە، مـن بـە مامۆسـتاکانم گـوت بـا ڕاکـەین لـەو بنایـە نـەمینین بـەرەو نـاو ڕەزەکـەی بەرامبـەرمان لـە نێـو دێراوێکیـدا خۆمـان درێـژ کـرد، ناپـاڵمی نەعلـەتی لـە خوار بنکەی پێشمەرگەکان و لە نزیك ئێمەوە ڕمبەی هات، دواتر مـن و ئـەو مامۆستایانەی لە گەڵمدا بوون لە ژێـر خـۆڵ و دوکـەڵی ڕەش هەڵسـاینەوە و سـەلامەت دەرچووین، جا هـەر بـەو (بـا)یـە بەهێزەکـەی ناپاڵمـە تەقیوەکـە چێشتلێنەری لقی دوو بە نـاوی واحیـد باینجـان، هەڵیـدا بـوو، بـەڵام هـەر سەلامەت دەرچوو بریندار نـەبوو، دەتـوانم ئەوەش بڵێم ئـەو فڕۆکەوانـەی ئـەو سـەردەم هەنـدێك بـە ویـژدان بـوون، دەنـا ئارەزوویـان بکردایـە هـەموو هیرانیان ویران دەکرد بە ناپاڵمەکەیان، چونکە دوورتـر لـە ئاوایی و خـەڵك بۆمباکانیـان بەردەدایـەوە، تـەنیا مەبەسـتیان دۆشـکەو بارەگاکـانی پێشـمەرگەو چـەکداران بـوو نـەك هاوڵاتیـان و دانیشـتوانی گونـدو شارۆچـکەکان جـا ئـەو بـەروارەی مـن باسـی دەکـەم سـاڵی ١٩٦٩ یـە، دەگەڕێمەوە سەر ئەو چیرۆکە کۆمیدییەی (واحید باینجان) بگێڕمەوە:

واحید باینجان چێشتلێنەری لقی دووی پارتی بوو لـە هیران، پیاوێکی خـۆش و پـاك و دڵسـۆز بـوو، ئەگـەر نـاوی باینجانـت بهێنابـا دەسـتی بـە جوێندان دەکرد و تووڕە دەبوو، لەو ڕۆژەوەی هەر بە بای بۆمبا ناپاڵمەکەی کە خۆی دەیگوت هەڵیدا بووە دوورترو بریندار نەبووە، بەڵام چەند ڕۆژێك کەوتبووە نێو جێ و ترسی لێ دەر نەچوو بوو، جا مقدم عەزیز ئاکرەیی جگـە لـەوەی ئـەو کـات ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی پـارتی و ئـامر هێـزی

سەفین و لێپرسراوی لقی دووی پارتی بوو، پیاوێکی ئازاو نەبەردو جوامێر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خاکی و خۆش مەسرەف و دەم بە پێکەنین و سادەو خۆشەویست بوو، ڕۆژێکیان چەند پێشمەرگەیەك لە پاسەوانەکانی تایبەت بە خۆی بە دواوەی بوون ڕۆژەکەیش سارد بوو تەنیا شەروارێکی خاکی نێوەی دۆخینی بە دەرەوەیدا شۆڕ ببۆوەو یەك تیشێرتی سەوزی سەربازی لەبەر هەڵکشاو زگی رووتی دیارو ڕەنگە یەکێك نەیناسیبا دەیوت ئەو شێتە کێیە؟ ئیتر عەزیز ئاکرەیی بەم شێوەیە بەرەو ماڵی واحید باینجان ڕۆیشت و لەوێ بە واحیدی گوتبوو هەڵسا با بڕۆینەوە بۆ لق و خەریکی چێشت لێنانەکەی خۆت بە، ئەوە چەند ڕۆژە پاڵ کەوتووی بەسە، ئەویش دەڵێت ناوك و هەناوم کەتووەو جارێ لێم گەڕێ نایەم، مقدم عەزیز پێی دەڵێت ئەگەر نەیەیێ خراپت بە سەر دێنم هەڵسە، دەڵێ نایەم، جا مقدم عەزیز باینجانێك لە گیرفانی دەردەهێنێ لە چۆکی واحید دەدا، جا لە مقدم عەزیز ڕاکردن و پاسەوانەکانی بە دواوەی بوون، واحید باینجانیش بە دوایدا ڕایدەکرد جوێنی ناشیرینی پێدەدا، ئەو خەڵکەش بە پێکەنین و دڵخۆشییەوە سەیریان دەکرد، تا گەیشتنەوە ناو لقی دوو، مقدم عەزیز پێی گوت ئاوا دەتهێنمەوە بەر چێشتلێنان و وا چاکم کردیەوەو ترسم لێ دەرکردی،

دەبێ ئەوەش کە دەڵێم مقدەم عەزیز ئاوا خاکی و سوعبەتچی بوو بەلاّم وەك باسیان دەکرد بەرامبەر بە دوژمن هێندە توندو تیژو ترسناك بووە گوایە ڕۆژێکیان سیخورێکیان بردووتە لای یەك قەمپاڵی لەسەری سیخورەکە داوە پرچ و چەرمی سەری هەڵگرتووە، لێی دەگێڕنەوە زۆر ئازاو چاو نەترس بووەو هەمیشە لە پێشەوەی بەرەی جەنگدا، هەر بە دەستی خۆی تۆپی گرێ دووی دەتەقاند روو بە رووی دوژمنان.

عەسرانێك، رۆژێكی فێنكو خۆش بوو لە هیرانەوە بەرەو خوارتر بە تەنیا ڕۆیشتم لە چولەوانیەكەدا كتێبێكم بە دەستەوە بوو وردە وردە پەڕەكانم ئاودیو دەكردو دەمخوێندەوە كە لە كاتی خۆی ئەو كتێبەشم لە چۆمان لە هاوڕێیەكم وەرگرتو پێشكەشی كرد بووم، لە پڕ سەرم هەڵبڕی بەڕێز عەزیز ئاكرەییو چەند پێشمەرگەیەگی بە دواوەوە بوون سەر دەكەوتنەوە بۆ ناو هیران، گوتی سلاو كوڕی جوان، ئا بزانم چ كتیبێك دەخوێنییەوە، منیش یەكسەر ئەو نامەیەم بیر كەوتەوە كە لە گیرفانم بوو بەڕێز فەرەنسۆ هەریری بۆی نووسیبوو كە ئاگای لێم بێت هەر یارمەتێكم پێویست بێت، جا كتیبەكەم دایە دەستی لەسەر ژیانی گیڤارا بوو بە زمانی عەرەبی، سەیری كرد، گوتی تۆ لە كوێ كار دەكەی، گوتم من مامۆستای شۆڕشم لێرەو ئەو نامەیەشم پێیە بۆ بەڕێزت، كتابەكەی هەر لە دەست بووو نامەكەیشی خوێندەوە گوتی بگەڕێوە لەگەڵ مندا با بچینەوە بەرەو لقی دوو، دەی وردە وردە باسی خۆتم بۆ بكە، منیش هەندێك بە شەرمو ئەدەبەوە باسی خۆمم دەركردو گوێی لە قسەكانم گرتبوو، تا چوینە نێو لقی دوو، لەوێش عەبدولڕەحمان گۆمەشینی لێبوو.

(٢٤)

دوای ئـەوەی لـەو ژووره دانیشـتم مقـدم عـەزیز ئـاکرەیی رووی لـە عەبدولڕەحمان گۆمەشینی کردو گوتی ئەو گەنجە جوانەمان میوانە لەو قوتابخانەیەی هیران مامۆستای شۆڕشە، بەو تەمەنە رۆڵی لێپرسراوەتی هەبووە لە شارو لەوەش جوانتر شاعیرە و، ئەو کتێبەم بە دەستەوەی دی لەسـەر ژیـانی گیڤارایـە بـە دەم ڕۆیشـتنەوە دەیخوێنـدەوە، هەڵبەتـە ئـەو جـۆرە پێشـمەرگەیە لـە نـاو شـۆڕش لێیـان سـوودمەند دەبـین، جـا کـاك عەبـدولڕەحمان گۆمەشـینی گـوتی خـاڵ نامەیـەکی بـۆ مـن هێنـا بـوو ئـەوە خوارزای سابیر کاکە شینە بۆ ئەوەی لـە هـیران جێگیری بکەین و مامۆسـتا تاهیر نەیناسی بوو بریـاری وا بـوو بـۆ مەلـەکان بیگوازێتـەوە دواتـر مـن بە کاك تاهیرم گوت لێرەی هێشـتەوە، مقدم عـەزیز رووی لـە مـن کـردو گـوتی ئـەو ئێوارەیـە لێـرە نـان بخـۆو بە مـام حەسـەن و واحیـدی چێشـتلێنەریش دەڵـێن هـەرجارەی لاتـدا ئێـرە چ نیـوەڕۆ بـوو یـان ئێـوارە لێـرە نـان بخـۆو کراوەیە بـۆ تـۆ ئیرە، گـوتم سوپاسـی بـەڕێزتان دەکـەم، دواتـر مقدم عـەزیز گوتی ئەو کیتابەش بۆمن بەجێ بهێڵە کە خوێندمەوە بۆتی دەگەڕێنمـەوە، منیش گوتم با پێشکەشی جەنابت بێ، گـوتی نـا هـەر بـۆت دەگەڕێنمـەوەو پـێم خـۆش بـوو کـە خوێندنـەوەت هەیـەو دەسـتی نووسینیشـت هەیـە، سەردانی قوتابخانەکەشتان دەکـەم و چیتان پێویسـت بـێ بۆتـان جێبـەجێ دەکـەم، ئەگـەر مجـاڵم هـەبوو چـەند وانەیـەك لەسـەر فێربـوونی ڕێنووسـی

لاتینی پێتان دەڵێمەوە، گوتم زۆر سوپاس هەر چەندە لەو پەیمانگەیەی پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕش چەند وانەیەکمان پێگوتراوە لەسەر فێر بوونی ڕێنووسی لاتینی بەلاّم بە تێرو تەسەڵی نەبووە لێی فێر بین جێگای شانازییە تۆی بەڕێز بۆمان تەواوی دەکەیت بە چاکی فێر بین، گوتی ئینشاالله، ئەو ئێوارەیە لەویّ نانم خواردو گەڕامەوە نێو مامۆستاکان وانەی شەوانە دەستی پێکرد، جا ئەو ماوەیەی لە هیران بووم تا ڕێکەوتنامەی ١١ی ئادار /١٩٧٠، کە گەڕاینەوە شار، پشتو پەناو پەیوەندییەکانم لەگەڵ بەڕێز مقدم عەزیز ئاکرەیی و ملازم فازڵ تالەبانی و مامۆستا ئیسماعیل عەزیز کاکی هیرانی و هەموو کارگێڕو ئەندامانی لقی دووو ناوچەی جوتیارانی دەشتی هەولێرو ناوچەی هێزی سەفین بتەوو بەهێز بوو، بە ماوەیەکی زۆر کەم کەسایەتی خۆم وەدەرخست، بۆ ڕێکخستنی حزبایەتیش واتە (پارتی) لە ناو شۆڕش، منیان کردە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی مامۆستایانی شۆڕش لەو دەڤەرە، بۆ ئەوەی ڕۆڵی مامۆستایانی شۆڕش لە هیران زیاتر نیشان بدەم کە نەك هەر وانە وتنەوەیەو بەس بگرە پێویستە کاری ڕۆشنبیری و وشیار کردنەوەش هەبێت بۆیە یەکەم کارم لەم ڕووەوە شانۆنامەیەکم نووسی و لەگەڵ مامۆستاکان کۆبوونەوەم کردو گوتم ڕەزامەندی لقی دوو وەردەگرم شانۆیەك لە نێوەندی شارۆچکەی هیران دروست دەکەین لەو شانۆنامەیە ئێوە تیایدا ئەکتەر بن لەگەڵ چەند قوتابیەکی زیرەك راهێنانیان پیّ دەکەین ئیتر ئەم پرۆژەیەمان پەسند کرد، بۆ خۆشبەختی هونەرمەندێك خەڵکی شەقلاّوە بوو لە دانشتووی بەغدا شەو مێوانی ئەو هەڤالآنە بوو ناوی نەجات کۆڕیە بوو، شەو هەمووومان مامۆستاکان دانیشتین هەڤاڵ ئەحمەد زەخۆو محەمەد ئەحمەد کە هەردووکیان ئەندامی ناوچەی هێزی

سەفین بوون دانیشتنێکی چاخواردنەوەو خۆشەویستیانە ئامادە بوون، داوایان لە هونەرمەند نجات کۆرپە کرد ئامێرە مۆسیقاکەی دەرهێنیٚو خەمەکانمان بڕەوێنێتەوە، ئەوکات زانیم ناوی ئامێرەکەی (کلارێنت) بوو، دەمێکی خۆش فوی لیٚ کردو ئاوازی خۆشی لیٚ هەڵساند، دواتر پێمان گوت دەتوانی بەشداریمان لەگەڵ بکەیت شانۆنامەیەك پێشکەش دەکەین لەگەڵ چڕینی سروودی قوتابییەکانمان تۆش بە ئامێرەکەت دەوڵەمەندی بکەیت، گوتی نەك هەر خۆم وا دەکەم بۆ ئەو رۆژی کەمان ژەنێك و عود ژەنێك لە شەقلاوەوە داوەت دەکەین بێن و دەماماکی خۆیان بدەن کەس نەیاناسیٚ و دواتر دەگەڕێنەوە، بەڵیٚ پڕۆژەکەمان سەری گرت، ئاهەنگێکی زۆر خۆشمان سازدا بە ئامادە بوونی لێپرسراوەکانی نێو شارۆچکەی هیران و خەڵکەکەی ئەویٚ ئەو شانۆ نامەیەش نمایش کرا جێگای رەزامەندی ئامادە بووان بوو، وێنەیەك لەو تابلۆیانەی کە لە شانۆیەکەدا نمایش کرا لە یادم ماوە بەم شێوەیە بوو (مامۆستایەك لە گوندێکی دوورە دەستدا لە قوتابخانەکەیدا لە نێو هۆبەکەیدایەو وانە بە قوتابیان دەڵێتەوە بەیانییەو زۆر بیٚ تاقەتە هەتا جلی نەگۆڕیوەو بە بێجامەوە وانە دەڵێتەوە، لەو کاتەدا لە پەنجەرەوە سەیر دەکات سەرپەرشتیاری پەروەردە جەنتا بە دەست بە دیار دەکەوێت، هەندێك پەشوکاو دەبێت پاشان بیر لە چارەیەك دەکاتەوە، روو لە قوتابیان دەکات و پێیان دەڵێت ئێستا ئەفەندیەك بە چاکەت و پانتۆڕ لەو بەرەوە دێتە ئێرە، هەر لە دەرگەوە بەدیار کەوت ئێوە هەمووتان ڕاکەن و من پێتان دەڵێم بگەڕێنەوە، گویٚ مەدەنە قسەکەی من و هەر هەمووتان بڕۆنەوە ماڵی خۆتان، جا سەرپەرشتیار دەرگەی هۆبەکە دەکاتەوەو قوتابیان تێکرا دەست بە ڕاکردن دەکەن و مامۆستاکەیان پێیان دەڵێت کوڕینە، بگەڕێنەوە، قسەی

ماموٚستاکەیان ناشکێنن کە پێشتر پێی گوتبوون ناگەڕێنەوە، سەرپەرشتار روو لە ماموٚستاکە دەکات، وای وای ئەو گێرەشێوێنیە چیە لەم قوتابخانەیە روو دەدات، ماموٚستاکەش دەڵێت جەنابی سەرپەرشتیار ئەو قوتابیانە لە چاکەت و پانتوٚر دەترسن، ئەوە نییە بە بێجامەوە وانە دەڵێمەوە؟ جا ئاهەنگەکەمان سەرەتا بە سروودی ئەی رەقیب و کلارنێت و عود و کەمان چەند سروودێکی نیشتمانی و شوٚڕشگێڕی و ئاهەنگێکی زوٚر سەرکەوتوو بە ئەنجام گەیشت لە پاڵ ئەو شانوٚنامەیە کوٚمیدیە، دڵی هەمووانی خوٚش کرد، ئێستاش نەمانزانی ئەو دوو موٚسقا ژەنە دەمامکدارانە کێ بوون، بەلاٚم بوٚ خوٚم درەنگ هەستم پێکرد کە هەردوو هونەرمەند (رزگار خوٚشناو و رەنجبەر خوٚشناو) بن.

– بیرەوەریم لەو ماوەیەی لە هیران بووم زوٚرن جگە لەو پەیوەندیانەی کە بە فراوانی پەیدام کرد بوو لەگەڵ خەڵك و لێپرسراوانی ئەو دەڤەرە هەندێك لەو نمونانە:

١ – (روٚژێکیان لە ناوچەی جوتیارانی دەشتی هەولێر بووم کە لە هیران بووم، لیژنەیەکیان پێك هێنا بوو بە سەروٚکایەتی مەلا عومەر چل هەوێزەیی کارگێڕی ناوچەکە بوو، پیاوێکی قسە خوٚش و سیاسی بوو، لیژنەکە بوٚ ئەوە بوو سیخورێکی کورد سەر بە رژێم دەستگیر کرا بوو لێکولینەوەی لەگەڵ دەکرا، منیش چوومە ئەوێ بوٚ لای سەلیم ئاغوٚك کە هاورییەتیمان پەیدا کرد بوو، وا رێکەوت بوو هەڤاڵ (سەلیم)یش ئەندام لیژنەکە بوو، منیان دانیشاند دوورتر لەو لیژنەیە، تا دواتر سەلیم ئاغوٚك ببینم، دوور بە دووری گوێم لە کفتوگوٚیان بوو، کابرای سیخوڕ زوٚر بە ترسەوە سوێند لە دوای سوێندی دەخوارد بە شەڕەفم ئاواو بە شەڕەفم

وا، مەلا عومەر پێی گوت ئەوە چیتە بە شەڕەفم بە شەڕەفم، تۆ سوێند بە شتێك بخۆ كە هەتبی[٢]؟!!

٢ – هەر لەو ساڵەی ١٩٦٩ دا كە لە هیران بووم مۆڵەتی حەت رۆژم وەرگرت لەگەڵ چەند هاوڕێیەك بەرەو گەلاڵە هەڵكشاین ئەو كات ئەو شارۆچكەیە وەك پایەتەختی شۆڕش بوو، ئوتێل و گەرماو و چێشتخانەو چەندەها دوكان و پڕ لە كەل وپەلی ئێرانی بوو هەر لە شیرنەمەنی و قوماش و جل و بەرگ و هەموو پێداویستیەكی ژیان، لەویش خارە (سابیر كاكە شین)م هەر لەوێ بوو هێشتا نەگەڕابۆوە بۆ دەشتی هەولێر لە ماڵی ئەودا ئەوچەند رۆژە مامەوە، لە گەڕانەوەمدا كە هەڤاڵ واحید خۆشناوم دەناسی و كۆنە هاوڕێی براكەم (جەلال) بوو یادیان بە خێر لێپرسراوی ناوچەی ئاقوبان بوو كە ئەندامی لقی دووی پارتیش بوو، چووم و لە ئاقوباندا لە لای ئەو لاماداو مێوانی ئەو بووم بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ هیران، ئەوەی شایانی وتنە من ئەوەندەی لە ناو شۆڕش بوومە قەت نەمزانیوەو ئیستایش نازانم جەمەدانی ببەستم، هەروەها قەرەوێتەش چۆن جەمەدانی بە ئامادەكراوی لەسەرم دەنێم كە بۆمیان بەستاوەو نەكرێتەوە ئاوا قەرەوێتیش، ئێستاش لەگەڵ دابی بۆم دەبەستن و نایكەمەوە بە بەستراوی لە ملمی دەكەم، بەڵام قسە خۆشەكە لێرەیە كە بۆ كاك واحید خۆشناوم گێڕایەوە، كە بە نێوی گوندی ئاقوبان دەڕۆیشتم لەبەرئەوەی جەمەدانیم لەسەر نەبوو هەر چەندە قەیتانە سمێلیكم هەبوو، كەچی چەند مێرد منداڵێك وەستا بوون دەتریقانەوە پێم پێدەكەنین و دەیان وت ئەها عەلممۆدە هاتن عەلمۆدە، نازانم ئەو وشەیە لە كوێ فێر ببوون چونكە وشەیەكی شارستانیەنی نێو هەولێر بوو هەتا گەرماوێكیش لە هەولێر هەبوو بە ناوی گەرماوی عەلمۆدە، خۆ جارێكی دی لە دوای

راپـەڕین و باشـووری کوردسـتانێکی ئـازاد، ڕۆژێکیـان لـە دیوەخـانی خـوا لێخۆشبوو خاڵە سابیر کاکەشین دانیشتبووم، یەکێ لەو پیرەمێردانەی هەر خزمیش بوو لـەوێ بوو نامـەوێ نـاوی بهێنم، ڕووی تێکردم و گـوتی، تـۆ کوڕی فلانت پێ دەڵێن، باوك و باپیرانت زۆر خۆشەویست و پیاو بوون، کە باسی تۆش دەکەن چوویتەوە سەر ڕێچکەی ئەوان، بەڵام یەك عەیبت هەیە بریا ئەوەشت نەبووایە، گوتم عـەیبی چی؟ گوتی سمێڵت نییـە و سمێڵت دەتراشی، منیش پێم گوت و ڕووم لـە دانیشـتوانی نێو دیوەخانەکە کرد و گـوتم (ئـەی ئـەوە نییـە ئێمـە هـەموومان لـەو کوردسـتانە لـە ژێـر چـەترو پاراسـتنی بـێ سمیڵـەکانین کـە دمانپـارێزن بـە تۆشـەوە مـام (؟) هـەموو لەوانەی دانیشتبوون گوتیان قسـەیەکی جوانت کرد، ئەوە راستییەکەیە، زەمەن تێپەڕی کوڕێکی ئەو مام خزمەم چووە ئەڵمانیا و لـەوێ پەناهەنـدە بوو، ڕۆژێکیان بە هاوڕێیەکی نامەو وێنەی ڕەوانە کرد بۆوە بۆ ماڵەوەیان، وێنەکەم دەستکەوت، ناوبراو کە لێرەوە بوو قانێك سمێڵی پێوە بوو، لـە وێنەکە بە بێ سمێڵ و سمێڵی تراشیبوو لەوێ، بۆ من هەڵێك بوو لە هەمان دیوەخانـدا وێنـەی کورەکـەم نیشـانی مـام (؟) دا گـوتم ئـەوەتا کوڕەکەشـت سمێڵـی بـەر جـادەی ئـەڵمانیا کـەوتووە، هیچـی پـێ نـەما بـە سـوعبەت و خۆشەویسـتییەوە گـوتی ئـەوەش وەك تـۆ.. دەمویسـت شـتێك بڵـێم بـەڵام ئـەوە نـەمگوت، جـا بـوو بـە پێکـەنین و گوتیـان گوتـت و تیگەیشـتین چـیت لەسەر زمان بووە و گێڕاتەوە.

(٢٥)

* له درێژه پێدەری بیرەوەرییەکانم کە لە ١٩٦٩ دا لە هیران بووم.

- یەکێك لەو کەسانەی کە پێشمەرگەکان دڵیان پێیی خۆش دەبوو وەك ئەوەی نێرگزی تازەی بەهاران ببینن کە دەردەکەوێ (عەبدالْ ئاکرەیی) بوو بەرپرسی دارایی هێزی سەفین، جەنتایەکی مام ناوەندی نە گچکەو نە زۆر گەورەو قەبەی بە دەستەوە بووو دوو پێشمەرگەی پاسەوانی بە دواوەوە بوو، پیاوێکی تێکسمراوی سوورەی جوان، جەنتاکەی پارەی تیا بوو، ئەویش بڵێم موچەی مانگانە یان یارمەتی یان زیاتر لە ٣٠ ڕۆژو نادیار ناوی موچە بوو، گرنگ بە دەر دەکەوت و موچەی هێناوە، موچەی پێشمەرگە ئەو کات (٣) دینار بوو، هی کادیران و مامۆستایانی شۆڕش (٥) دینار بوو، ئەوەی شایەنی وتنە چ بزانم رێکەوت وا دەکەویتەوە لەساڵی (٢٠١١)دا، کچەکەی ئەو عەبدالْ ئاکرەییە هاوسەرگیری دەکات لەگەڵ برازاکەم (شەماڵ) کوڕی ڕەوانشاد جەلالی برام.

***

تشرینی دووەمی ١٩٦٩ بوو، لەو بنایەی قوتابخانەکەمان، ناوچەی هێزی (سەفین)یشی لێبوو، یەکێك لە پێشمەرگەکان هات و گوتی مامۆستا هەتا لای ئەو هەڤاڵانەی ناوچە وەرەو ئیشیان پێتە، کە چووم حوسێن بادوەیی و سمکۆ بارزانی لێبوو ئەندامانی ناوچەی هێزی سەفین بوون، بەڵام کوڕێکی گەنجی لێبوو قاتێکی خاکی لەبەر بوو، دانیشتم و

بەخێرهاتنیان کردم، سمکۆ بارزانی گوتی تەوقەیەك لەگەڵ ئەو کوڕە گەنجە بکە، دەستم خستە ناو دەستیو بەخێر هاتنم کرد، سمکۆبارزانی گوتی ئەوە (محەمەد موکری) چیرۆکنووسو ئەدیبە، بە ئەویشی گوت ئەوەش موحسین ئاوارەیە شاعیرە، زۆر پێخۆشحاڵ بووین، جا زەمان تێپەڕیو لەو رۆژەوە لەگەڵ محەمەد موکری یەکترمان ناسیو لە زۆر بۆنەکانا دانیشتمان پێکەوە هەبووە، جگە لەو سەفەرانەی بە کۆ لەگەڵ نووسەرانی دی چوین بۆ میسر/ قاهیرە / ئەلمانیا / جۆرجیا / ئوردن / سوریا.. هتد.

لە ساڵی ٢٠٠٧ بوو، لە ڤیستڤاڵی گەلاوێژدا، کاتی پشوودان بوو لە گۆڕەپانی بینایەکەدا وەستابووین لە گەڵ بەڕێز مەلا بەختیارو محەمەد موکریو چەند شاعیرو نووسەرێکی دی، مەلاَ بەختیار بۆ سوعبەتو خۆشی رووی لە من کردو گوتی تۆ ناوت لە خۆت ناوە ئاوارە، خۆ رۆژێکیش ئاوارە نەبووی، محەمەد موکری بواری ئەوەی نەدام من وەلاَمی بدەمەوە، بە مەلا بەختیاری گوت ئەی ئاوارەیی چییە من لە ساڵی ١٩٦٩ تەعارفم لەگەڵ ئەو کاك (موحسین)ە کردووە لە هیرانو ناوچەی هێزی سەفین کە زۆر گەنج بوو لەو تەمەنە، شاری جێهشتبووو ئاوارەی دەرەوەی شار ببوو، مەلا بەختیار گوتی ئەوەم نەزانیبوو، باش بوو زانیم.

٣ - ئێوارەیەکی زۆر ساردو بەفرێکی زۆر بە سەر خاكو شاخەکانەوە بوو لە نێو دالآنەکەی قوتابخانەدا وەستا بووم، بەروار کانونی یەکەم /١٩٦٩ بوو، پیاوێك کورتەكو شەروار لەبەر هاتە پێشمو دیار بوو پێشمەرگەیەك ئاماژەی بۆ من کرد بوو، دەمامکی کردەوە، ئاه- ئاه- ئەوە تۆی یەکترمان ماچ کرد، شەهید نوری نانەکەلی بوو، ئەوە لە کوێ بۆمن پەیدا بووی، زۆر دلخۆش بووم، وەرە با بچینە ژوورەوە، زۆر غەریبی

ماڵەوەم دەکرد زوو پرسیاری دایکم‌و باوکم‌و خانەوادەکەی خۆم لیٚ کرد، گوتی هەموو باشن‌و ئاگام لێیان هەیە، ئەی هاتووی ببیت بە (پ. م) گوتی نەخێر بە ئیش‌و کاری قوتابیان‌و حزب هاتووم‌و دەگەڕێمەوە ناو شارو کەسیان لەوانەی لەگەڵ تۆن با ناوم نەزانن بە ناوێکی تر منیان پیٚ بناسێنە، ئێوارە برنجە سوورەکەمان لێنا، ئەو ڕۆژی نۆبەی مامۆستا (کانەبی مستەفا گەلیاوەیی) بوو خواردنی ئێوارە ئامادە بکات، شەهید نوری لە شارەوە بە نهێنی بە نێو هەڵەت‌و پەڵەت‌و بەفر ئەو هەورازو نشێوانەدا هاتبوو، پێیەکانی ئەستوور ببوون بە حاڵ لە پێڵاوەکانی دەر هاتن، مەنجەلێك ئاوم بۆ گەرم کرد، ماوەیەك پێیەکانی لە ناو ئەو ئاوە گەرمدا مایەوە تا ئارام بۆوە، ئەو شەوە لە لای ئێمەدا خەوت، بەر لە خەوتن لە دەرەوەی ژوورەکەدا پێی گوتم لێپرسراوانی لق‌و ناوچەی جوتیاران‌و خاڵ عەزیز ئاکرەیی‌و هەمووانم بینیوەو ئیشەکانم تەواو بووە، بەیانی لە سەعات شەششەوە دەبیٚ بڕۆم تا دەگەمە زیارەت‌و لەویوەوە تەتەرێکی شارەزا هاوڕێم دەبیٚ تا دەگەمەوە ناو شار.

٤ – هەستکردنم بە خۆڕاگری‌و جەربەزەیی‌و دڵسۆزی پێشمەرگەکانی بەرەکانی جەنگ‌و لە خۆ بردووییان بۆ کوردو کوردستان‌و مافە ڕەواکەیان وای لیٚ کەوتەوە لە ك ٢ /١٩٦٩ لە هیران ئەو شیعرە بنووسمەوە (لە یاداشتی پێشمەرگەیەکدا) هەر هەمان شیعرم لە ساڵی ١٩٨٤ بە ناوێکی نهێنی (چیا) ڕەوانەم کرد بۆ بارەگای یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ کە ئەو کات لە هەولێر بووم، لە ژمارە (٩) ك ١ی ١٩٨٤ لە گۆڤاری نووسەری کوردستان بلاٌوکرایەوە.. ئەمەش دەقی شیعرەکەیە:

(له یاداشتی پێشمەرگەیەك) دا

له نێو شەوێکی زستانا

له ئامێزی کوردستانا

هەور زگی نۆ مانگان بوو

چاوی له زەوی دەبڕی

بۆ ورشەی (با) چاوەنواڕ بوو

به بارانیٚ دامانگری

***

سەرما چییه؟ له ناو سەنگەری پڕ ئاو بووین

سەرما چییه؟ لەگەڵ لوولەی تفەنگەکان، راوه چاو بووین

سەرما چییه؟ سوێندو بەڵێنی جەنگاوەر

چەکی دەستمان، بیرو باوەڕ

گەرممانی دەکردەوه

***

سەرما چییه؟ تا بەیانی... تا بەیانی

جەنگاین لەگەڵ چاوەڕوانی

چاوەڕوانی شالأومان کرد

چاوەڕوانی بارانمان کرد

٥ – لەو مامۆستایانەی که پێکەوه بووین، ئازاد حەمە گەمحان و ئیبراهیم عەبدوالواحید کۆیی بوون جا له مانگی ت١ بوو واته ١٩٦٩ / ئازاد پێی گوتم له کۆیه قاورمەی زۆر خۆشمان هەیه و لەگەڵ ئێمه وەره که کۆمەڵه گەنجێکی کۆیین دەچینه ناو کۆیه و سیٚ رۆژان له ماڵی ئێمه به،

هیچ مەترسە ڕێپیشاندەرێکی شارەزامان لە گەڵدایە، منیش گوتم باشە، گوتی ڕوخسەتم وەرگرتووە ناوی تۆش لەگەڵ دایە، ئەوەی ڕاستی بێت ئازاد حەمە گەمحان چەند جارێك بۆ ئەنجامدانی چالاکی لەگەڵ واحید کۆیی و گرووپەکەی، بە واحید تەخریب ناسراو بوو دەردەچووو پەیوەندی بە مقدم عەزیز ئاکری هەبوو، ئازاد گوتی من و کاك واحیدو گرووپەکەی و ئیبراهیم عەبدولواحیدو تۆو دکتۆر مشیر کۆیی و کەماڵ عەبدولکەریم (کەمال پیرە) کۆیی چەند هەڤاڵێکی تر هەن تۆ نایاناسی بەیانی زوو دەردەچین، منیش گەنج و خوێن گەرم و سادە، یەکسەر ڕەزامەندیم نیشان دا، بەیانی دەرچووین بۆ نیوەڕۆ لە نازنین لای (عەبدە خەوە)کە مامۆستای شۆڕش بوو لە نازەنین نانمان خواردو دواتر رۆیشتین تا لە (جەلی) پشوێکمان دا، لە نزیك حەمامۆك بوو بە شەوو کاك واحید ڕێچکەی چوونە نێو کۆیەی بۆ دیاری کردین و ئازادیش شارەزایی هەبوو، واحیدو هەڤاڵەکانی گەڕانەوەو گوتیان لەو دەڤەرانە چالاکی خۆمان هەیە ئێوە خوا حافیزتان بێت، ئیتر بە سەلامەتی لە کۆیە دابەش بووین، سێ رۆژ لەگەڵ ئازادو قاورمەکەشمان خوارد لەماڵیاندا، ئەمدی حەمە گەمحان باوکی ئازاد بەیانیان کتێبی لینین و مارکسی دەخوێندەوە، ئەوەو بۆ ڕۆژی سێیەم بەیانی دنیا تاریك و روون بوو ئەو شوێنەی دیاریان کرد بوو لێی کۆبوینەوە بە هەمان ڕێچکە ڕێ گەڕاینەوە تا لە ئیوارەیەکی درەنگ لە هیران گیرساینەوە، عەقڵیەتی گەنج، یەکەم مجازەفە بوو کە کردم.

(٢٦)

- هـەر لـەو هیرانـەی سـافی هیرانـی و پیـاوە تێكۆشـەرو جـوامێرە جوانەكانی ئەو بنەماڵەیەو لەگەڵ خەڵكە باش و مرۆڤدۆستەكانیان و ڕەزو باخ و سـێوە لا سـوورو هـەنارە شـەقبووە دەم بەخوێنـە دەنكـە برۆنزیـە بریسكدارەكانیان، دیارە بەخت وای هێنا بوو لەگەڵ ئارەزووەكەم یەكیان گرتبۆوە لە هیرانەدا جێگیر بووم، وەك لـە ئەلقەی پێشتـر ئامـاژەم پێكـرد لەگـەڵ دوو لـە هاوڕێكـانم كـە بـە یەكـەوە مامۆسـتای شـۆڕش بـووین لـە هیرانـدا، ئیـبراهیم عبدلواحیـد كـۆیی و ئـازاد حەمـە گـەمحان و پۆلێـك پێشـمەرگە مجازەفەیەیـەكی گـەنج ئامێزیمـان كـردو چـووینە نـاو كۆیـەو دوای سـێ ڕۆژ مانـەوەمان و پشـوودانێك بـە سـەلامەتی گەڕاینـەوە هـیران، پـاش گەڕانـەوەمان یـەكێك لـەو مامۆسـتایانەی شـۆڕش كـە نـاوی محەمـەد ئەحمـەد بـەگ و خـەڵكی شـەقڵاوە بـوو پێـی گـوتم پـاش دوانـزە ڕۆژی تـر جەژنـە ئێمـە گروپێكـی زۆریـن لـە پێشـمەرگەكانی ئـەو ناوچەیەو خـەڵكی شەقڵاوەیەن دوو ڕۆژ بەر لە جـەژن دەكەوینـە ڕێ و دەچینەوە شـەقڵاوە بـۆ سەردانی كەس وكارمان بۆ ئەو چەند ڕۆژەی جـەژن، جـا تـۆش لەگـەڵ مـن وەرەو لە ماڵی ئێمە بەو بنێرە بە دوای دایك و باوكت و خوشك و براكانـت با جەژنەكە لە لای ئێمە بەرێ بكەن و بە دیداری تۆش شاد دەبـن، هـەر زۆر دڵخۆش بووم، چونكە زۆر غەریبی دایك و باوكم و خوشك و براكانم دەكـرد چاوم پێیان بكەوێت، بەڵێ بە هەمان كاتی دانراو دوو ڕۆژ مابوو بۆ جـەژن

دوای ئەوەی ئەحمەد زەخۆ کە کارگێڕی ناوچەی هێزی سەفین بوو لەگەڵ محەمەد ئەحمەد خەڵکی شەقڵاوە بوون‌و زۆر جار بۆ بە ئەنجام گەیاندنی چالاکی پارتیزانی دەچوونە شەقڵاوەو دەگەڕانەوەو شارەزاییان هەبوو لەو ڕێگاو بانانە و، ڕەزامەندی مقدم عەزیز ئاکرەیی ئامر هێزی سەفینیان وەرگرت، ئیتر بڵێم ئەگەر لە یادم نەچوو بێ زیاتر لە (٣٠) پێشمەرگەی چەکدار بووین، بەیانی زوو، دوو ڕۆژ بەر لە جەژن بەڕێ کەوتین بەرەو شەقڵاوە، ئەو ناوانەی لە یادم ماوە جگە لە ئەحمەد زەخۆو محەمەد ئەحمەد کە ڕابەری گروپەکە بوون، کانبی مستەفا مامۆستای شۆڕش بوو خەڵکی گەلیاوە بوو، ئەوانی تر شەقلاوەیی بوون محەمەد ئەحمەد بەگ، ڕوار مام برایم، عەلی سید مستەفا، حوسێن سید تالیب، نبی سەر ئاسن‌و نوری متی...هتد، بەروارەکەی مانگی کانوونی دووەم ١٩٦٩ ئیتر بە پای پەتی بە دەم ڕۆیشتنەوە ڕۆیشتین تا ئێوارە بە درەنگەوە گەیشتینە نزیک چنێران‌و ئەلوەستیەکمان کردو تا دنیا تاریک داهات ئینجا ڕابەری سەفەرەکەمان ڕێنمایی کردین چۆن بە ڕیز دەڕۆین‌و بە پارێزەوە، لایەکی کێوی سەر سەفین ڕەبایەی سەربازانی تیا بووو بەرەکەی دی ڕەبایەی جاشەکان بوو، بەو نێوەندەدا ڕۆیشتین هیچ تەقەو ڕەقەیەك نەبوو، تا گەیشتنە ناو شەقڵاوەو دابەش بووین، من لەگەڵ محەمەد ئەحمەد بەگ بووم تا ناو ماڵەکەیان، باوك‌و دایك‌و براو خوشکی بە دیداری شاد بوون‌و زۆر بە ڕێزەوە بەخێر هاتنی منیشیان کرد، بۆ بەیانی بە پانتۆڵ‌و پاڵتۆیەکەوە باوکی محەمەد منی بردە لای جمیل کاوێس ئاغا کە چێشتخانەی هەبوو، هەموو ترومبێلەکانی تاکسی کە هامشۆی نێوانی هەولێرو ڕەواندزیان دەکرد لەو چایخانەیە پشوویان دەدا یان نانیان نۆش دەکرد، ئەحمەد بەگ بە جمیل /ی گوت ئەو کوڕە گەنجە لە لای تۆ بێت،

ناسیاوی سایق پەلیك ناوێکە کە لە هێڵی نێوانی هەولێرو ڕەواندز بە ترومبێلە نەفەر هەڵگرەکەی هاتوچوو دەکات، بەڵکو ببیبێنیّو پێی بڵێت خانەوادەکەی لەگەڵ خۆیدا بیهێنێو تۆش بیانهێنە ماڵی ئێمە، جمیل کاوێس گوتی زۆر باشە با لەو ژوورەی پشتەوەی چایخانەکە دانیشی زۆری پێ ناچێ ئەو پەلیکە هەموو ڕۆژێك لێرە دادەبەزێ خۆیو نەفەرەکانیو نانی بەیانیش لێرە دەخون ئەوجا بەرەو ڕەواندز بەڕێ دەکەون، بەڵێ سەعاتێکی پێ نەچوو جمیل کاوێس پەلیکی هێنایە ژوور یەکترمان ماچ کرد، پەلیك هەم دراوسێو ناسیاومان بووو دەیزانی کە چووەتە ناو شۆڕش، شوفێرەکان ناویان نا بوو پەلیك لەبەرئەوەی هەمیشە تیژڕەو بوو لە لێخوڕینی ترۆمبێلدا، پێم گوت ئێوارە کە گەڕایتەوە بۆ هەولێر بە باوکم بڵێ بەیانی خۆیو دایکمو خوشك براکانم لەگەڵ تۆدا بێن بۆ ئێرەو کاك جەمیل دەیانهێنێتە ئەو ماڵەی من لە لایانم لێرەوە نزیکەو دوو ڕۆژ لە لام دەمێننەوەو دواتر دەگەڕێنەوە بۆ هەولێر، پەلیك گوتی بە سەرچاو، جەلالی برات ئەویش بە بۆنەی جەژنەوە هاتۆتەوە هەولێر، بەڵێ جەلالی برام ئیداریەن سزا درا بوو لە لایەن ڕژێمەوە کە فەرمانبەر بوو لە دادگای هەولێر بۆ ڕەواندز گوازرابۆوە لە دادگای ڕەواندز دەست بە کار بوو، جا ڕۆژی پاشتر بەیانیەکەی پیان گوتم ئەوە خانەوادەکەت لەگەڵ کاك جەمیل هاتوون، سەرەتا دەستی باوکم ماچ کردو ماچی کردم، دایکم یادی بەخێر لە ماچ کردنی فرمێسکە گەرمەکانی بە سەر گۆناکانم ڕێچکەی کردو دەکەوتە خوار، دواتر براکەم جەلالو تەحسین ماچیان کردم لەگەڵ دوو لە خوشکەکانم کە فرمێسك لە چاوەکانیان گیر نەدەبوو، سەیر لەوەیە دوای ساڵانێکی زۆر بە سەر ئەم بەروارە تێپەر بوو، ئەوەتا ئێستا وا دەینووسمەوە چاوەکانم لێڵ بوونەو

تژیه له فرمێسكو چووزانەوەی ناخم، باوكو دایكو برا گەورەكەم جەلال، رۆحیان شاد بیّو كۆچی ئەبەدیان كردووە، بەڵیّ دڵخۆش بووم كە هاتبوون هەر لە گۆشتو ئازووقەو دیاریّكی زۆریان لەگەڵ خۆیان بۆ ئەو ماڵە هێنا بوو، هەر چەندە ماڵی ئەحمەد بەگ ناگوزورو نەبوویی نەبوون بەلاّم من زیاتر پێی دڵخۆش بوومو جگە لەوەی بە دیداری خانەوادەكەم شاد بووم، ئیتر دوای دوو شەو مانەوەیان باوكم هەندێك پارەی دامیّو گەڕانەوە بۆ هەولێر، رۆژی پاشتر لەگەڵ ئەحمەد زەخۆو محەمەد ئەحمەد رابەرانی سەفەرەكەمان بە هەمان رێگای جاران كە شارەزا بوون شەو بۆی دەرچووینو بە درەنگانێكی شەو گەیشتینەوە هیران، یادیان بەخێر چەند ناوێكم هێنا كە لە گەڵمان بوون لەو سەفەرە، محەمەد ئەحمەد بەگ لەبەر هەر هۆیەك بێت لە ناوەڕاستی هەفتاكان خۆی كوشتو لە هەشتاكانیش براكەی كە ناوی سابیر ئەحمەد بەگ بوو رژێمی بەعس لە سێدارەی دا هەروا عەلی سید مستەفا رژێمی بەعس لە سێدارەی دا، سابیر خەجەخێل ماوەیەكی زۆر لە بەندیخانەی ئەبوغرێب بەند بوو بە لێبوردنێكی گشتی ڕژێم لە هەشتاكان ئازاد كرا.

(٢٧)

دوای ئەوەی ئەو ترس و تەڵەسمەی لە گیانمدا نەما بوو وەك گەنجێكی لە خۆبایی و چاو كراوە بە تایبەتی پاش چوونم بە نهێنی و گەڕانەوەش بە سەلامەتی بۆ كۆیەو شەقلاوە كە لە ئەلقەكانی پێشو بە درێژی باسم كردووە، جگە لەوەش دەبێ نهێنیەكی تایبەتیم هەیە بیدركێنم ئەوەش لار دەبێتەوە بۆ لایەنی دەروونی و بڕوا بوون بەو شتەی بە پیرۆزمەندی دەزانم ئەویش ئەوە بوو لەو بەروارەی ١٩٦٩ كە لە ئەڵقەكانی پێشتر باسم كردووە چۆن رەوانشاد باوكم لە رواندز بەڕێیی كردم بۆ ناو شۆڕش، كە ماچی كردم زۆر بە پارێزو نهێنییەوە نوشتەكی دامیێ گوتی كوڕم ئەو نوشتەیە (گوللە بەندە) لە لای خۆت بیپارێزەو لای كەس باس نەكەی ئەو گوللە بەندەت پێیە خوا بتپارێزیّو ئاگات لە خۆت بێت، لەو رۆژەوە جۆرە ئازایەتی و چاو نەترسیەكی تەواوم لە دڵو دەروون گیر ببوو هەتا لە فڕۆكە جەنگییەكانی ڕژێمیش زۆر ترسم نەبوو كە دەهاتن بۆ بەردوومانكردن، بەڵام بە داخەوە لە ساڵی ١٩٧٥ كە جارێكی دی شەڕ دەستی پێكردەوەو لە ناو شۆڕش بووم هەر لەو ساڵەدا رۆژێكیان ئەو جلەی لەبەرم بووو هەموو جلەكانم پشكنی ئەو گوللە بەندە چۆن لێم بزر بوو ئێستایش لەگەڵ دا بێ نەمدۆزییەوە، زۆر پێ نیگەران بووم تا ئاستی گریانێكی بە كوڵ لەبەرئەوەی یادگاریەكی باوكم بووو بۆنی ئەوی لێ دەهات، ئیتر ئەگەر بڵێم دوای بزر بوونی ئەو گوللە بەندە، كاتێ فڕۆكە

جەنگیەکان دەهاتن کون نەدەما خوی تیا بنێم هێندە دەترسامو ورەم دابەزی بوو،

***

دەبا بگەڕێمەوە سەر موجازەفەیەکی دی کە گەنج عەقڵی پیش سۆزداری دەخات ئەمجارەیان پێشمەرگەکانی سەر بە شاری هەولێر کە لە ناوچەکانی خۆشناوەتی بوون کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی بچینە ناو هەولێرو سەردانی خانەوادەکانمان بکەین، چەند هەڤاڵێك کە ناسیاوم بوون پەیوەندییان پێمەوە کرد کە ئامادەم لەگەڵ ئەو گروپو مەفرەزەیە بچمە ناو هەولێر بۆ ماوەی سێ ڕۆژو دواتر بگەڕێینەوە هیران، بێ سێ ودوو ڕەزامەندیم نیشان دا، دوای ئەوەی بۆم روون بۆوە کە زۆربەی کەسەکان ناسیاو برادەر بوونو سووکە مفاوەزاتێکیش هەبوو لە نێوانی سەرکردایەتی پارتیو رژێم، ریٚ نیشاندەرو شارەزاو هاوسەفەرمان لە گەڵدا بوون، دوو هاوڕێم کە کاتی خۆی لە شاریش بووین هامشوی یەکترمان کردووە ئەوانیش مامۆستای شۆڕش بوون لەگەڵ ئەو گروپە بوون، جا لە ناوەڕاستی مانگی شوبات ١٩٦٩ (٣٢) پێشمەرگە بووین، لە هیرانەوە سەر لە بەیانی ئامانجمان هەولێرە بە پای پەتی بە رێچکە ڕیٚو رێگای بەردەلاٚندا رۆیشتین تا دنیا تاریك داهات لە گوندی (ناودارۆکان) لامان داو شەو ماینەوە بە سەر ماڵەکانی گوند دابەش بووین، ناخۆشترین شت لەو شەودا کە میزم دەهات سەگێکی زۆر دڕیان لە حەوشە بوو، نەدەوێرام بچمە دەرەوە، پێم وا بوو یاتاخەکەشیان ئەسپێی زۆری پێوە بوو، بە خوراندنی هەموو لەشم رانەدەگەیشتم چ لایەکی بخورێنم، بەلاٚم قەت پیاوەتیو گەورەیی ئەو خانەوادەیەم لە بیر ناچێت ئێمەیان لە ژوورێك دانا بوو لێی خەوتین کەچی ژنو منداڵانی خۆیان لە حەوشیەکی

به نایلۆن و بەتانی گیراو بەو سەرمایە لەوێوە خەوتبوون، بە راستی ئەو جوامێرانە شازادە بوون بۆ مێوان راگرتن، بەیانی راست بووینەوە خۆمان بەستاوەو دوای خواردنی نانی بەیانی بەڕێ کەوتینەوە تا دنیا تاریك داهات لە کەسنەزان بووین، باق و بریقی گلۆپەکانی ناو شار خورپەی لە دڵم هەستاند ئای هەولێرەکەم ئەوە منم دیمەوە لات، دنیا تاریك داهات، رێبەری شارەزا لە پێشەوەو ئێمەش یەك لە دوای یەك بە چەکەوەو بە بێ دەنگی و بە پارێزەوە لە دواوەوەی بووین، لە کەسنەزانەوە ئەو کات تا ناو هەولێر ئەمبەرو ئەو بەری گردو بەرزایی بوو، رەبایەی سەربازی و جاشەکانیشی لێ بوون، لە نێوەندی ئەو دوو گردو کەندەڵانانە دەرۆیشتین ئەگەرچی مجازەفە بوو، بەڵام پێدەچوو رەبایەکان نەیاندەویست خۆیان تووشی بەڵای پێشمەرگەو تۆڵە سەندنەوەو ناڕەحەتی بکەن، بۆیە خۆیان نەبان دەکرد بوو گوایە هیچیان نەبینیوە، سەعات (١٠)ی شەو گەیشتینە ناو گەڕەکی سێتاقان، بە سەر سێ ماڵدا دابەش کراین بەڵام من لەگەڵ ئەکرم خۆشناو کە ماڵی خزمێکیان نزیکی ئەو سێ ماڵە بوو چووینە ئەو ماڵە چەك و تفاق و جلەکانمان لەوێ جێهیشت و کۆنە پانتۆڵ و کراس و چاکێتێکی شڕم لەبەر کرد پێناسی قوتابخانەی ئامادەیی هەولێرم پێ مابوو، ئەکرم خۆشناویش هەر ماڵیان لە گەڕەکی سێتاقان بوو، زۆربەی ئەوانەی کە پێکەوە بووین ماڵیان لە سێتاقان یان لە سیداوە بوو، ئەو سەردەم دڵسۆزی و متمانەو کوردایەتی زۆر بەهێز بوو، بە دەگمەن سیخورو زمانلێدەر هەبوو، پارەو موڵك و دنیایی زۆر گرنگ نەبوو، ئازایەتی و پیاوەتی سەرپشك بوو، سەعات - دەو نیوی شەو بوو، ئەکرم گوتی تۆ شۆڕبەوە بۆ گەڕەکی عارەبان زۆرجاران هاتوومەتە ماڵی ئێوە، سێیەمین شەو دێمە لات و دێینەوە ئەو

ماڵە خزمەو جلەکانت بگۆڕەو لەگەڵ مەفرەزەو گرووپەکەی خۆمان بە هەمان شێوە بەڕێ دەکەوینەوە بەرەو هیران، گوایە قوتابیەکەی جارانم بە ناو بازاڕ تا هاتمەوە ناو گەڕەگی عارەبان و کەسم نەدی بمناسێ، سەعات یانزەی شەو بوو، لە دەرگەی ماڵەوەی خۆمانم دا، باوکم دەنگی دا کێیە؟ گوتم منم بابە، کە دەرگەی کردەوە هاتمە ژوور بێ ئەوەی ماچم بکات یەکسەر بە تووڕەیی گوتی خۆ نەهاتییەوە ناموسمان ببەیت و شەرمەزارمان بکەیت و تەسلیم بییەوە، گوتم نا نا بە سەردان هاتووم و دەگەڕێمەوە، ئەوجا ماچی کردم و دواتر دایکم (ئەی بە قوربانت بم ئەوە کوڕە جوانەکەی خۆمە؟) بە گریانەوە ماچی کردم، کە چوینە ژوورەوە پێش هەموو شتێك جلەکانم داکەناند کە جلەکانی ژێرەوەمی دایە بە رووناکی (ئەسپێ)کان رێچکەیان بەستبوو، دایکم دەستی بە گریان کرد گوتی ئەوە کو ماوی کوڕم؟ باوکم گوتی لێیگەڕێ با قایم و خۆڕاگر بێ کوڕەکەمان، شەو بە ئارامی خەوتم، بەیانی ناردم بە دوای هەندێ لە هاوڕێکانم و چەند خزمێك چاوم پێیان بکەوێت، لەوانە حەسەن حەمەد کە پێشمەرگەیەکی ناوخۆی هەولێر بووو کوڕە پور بوون لەگەڵ باوکم، هەر سێ رۆژ جێیی نەهێشتم لەو ماڵەماندا یادی بە خێر ڕۆحی شاد بێت جگە لە مام و برام کە لە لام بوون، ئەو هاوڕێ و برادەرانەشم هاتن و بە دیداریان شاد بووم لەوانە سەردار ئەبوبکر حاجی عەزیز خەرابەدراوی و ئەسعەد محەمەدو بهرام کاکل و شەهید نوری نانەکەلی و ئیسماعیل حوسێن و نشأت عەبدولڕەحمان و تاریق جامبازو نەوزاد رەفعەت بە تایبەتی هەندێك لەو ناوانە وەکو لێپرسراو یان لە یەك شانەی رێکخستنی یەکێتیی قوتابیان و حزب پێکەوە بووینە لە نێو شار بەر لە چوونم بۆ ناو شۆڕش، دوای سێ رۆژ مانەوەم لە ماڵ (شەو) ئەکرەم خۆشناو هات و بە ترومبێلی خزمێکمان

ڕۆیشتین و لەو ماڵە خزمەی ئەکرم جلەکانم گۆڕی و بە هەمان شێوەو هەمان گرووپ ڕێچکەمان بەست و چۆن هاتبووین و بە هەمان ڕێ بە سەلامەتی گەڕاینەوە هیران.

شەو لە هیران، ئێمەی مامۆستاکانی شۆڕش لەو هۆڵە گەورەیەی جێی خەوتن و حەوانەوەمان بوو گوێگر بووین (ئێرە ئیزگەی دەنگی کوردستانی عیراقە بە دەنگە زولالەکەی بارزانی مەلا خالید، ئەم هەواڵەی خوێندەوە (لە شەوی ١ لەسەر ٢ی ئاداری ١٩٦٩ پێشمەرگەکانی کوردستان توانیان بە تۆپ و ڕۆکێت و هاونەکانیان بیرە نەوت و پالاوگەکانی کەرکوک خاپوور کەن (١٠) پالاوگە بە تەواوەتی خاپور بووەو ئاستی هەناردەی نەوتی کەرکوک دابەزیوەو ئەو زەرو زیانە دەنگوباس و سەداکەی لە ناوخۆو جیهاندا بە فراوانی بلاو بۆوە، وا کەوتەوە ڕژێمی بەعس بیر لەوە بکاتەوە بە زووترین کات دانووسان لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی نەمر بکات بۆ چارەسەری کێشەی کوردو کوردستان لە عیراقدا کە ڕێکەوتنی ١١ی ئاداری لێ کەوتەوە.

(٢٨)

ئیواره بوو له نێو شارۆچەی هیراندا مقۆ مقۆیەك هەبوو، دوو دووو سیٚ سیٚ بە دەمێکی خەندەبارو روویەکی گەشەوە هەواڵی خۆشیان بە ڕووەوە دیار بوو، هەڵبەتە کورد نهێنی قسەی شاراوەی پیٚ راناگیریٚ، لە پڕ (قادرحەمشین) لێپرسراوی ناوچەی هێزی سەفین گەڕایەوە بۆ ناوچەو ئێمە مامۆستایانی شۆڕش بە پیلیەوە چووین پێمان گوت کاك قادر هەست دەکەین دەنگوباسێکی خۆش هەبیٚ ئێمە نازانین چیە، گوتی پێتان دەڵێم بەلاٚم ئەو هەواڵە جاریٚ هەر لە لای خۆتانەوە بێت مەیدرکێنن، ئەویش ئەوەیە: دیارە سەدام حوسێن نوێنەری سەرۆك کۆماری عیراق لەگەڵ شاندێکی بالاٚ بەرز چووەتە لای سەرۆك بارزانیو دان بە مافی کورد دەنێن، صدام حوسێن ئەو کات جێگری سەرۆك کۆماری عیراق بوو، بۆ رۆژی دواتر رێکەوتنامەی ١١ی ئاداری / ١٩٧٠ راگەیاندرا لە هەموو کەناڵەکانی راگەیاندن بە رادیوو تەلەفزیونو رۆژنامەکانەوەو دانان بە ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عیراقدا نرا، هەروەها لە ئێزگەی دەنگی کوردستنان عیراق ئەو موژدەیەو بەندەکانی رێکەوتنامەکیان خوێندەوە، گرنگترین بەیاننامەی سەرۆك مستەفا بارزانی کە لێبوردنی گشتی بۆ کوردانی دابڕاو لە شۆڕشی ئەیلول هەتا بۆ ئەو جاشانەی کە تاوانی گەورەیان ئەنجام نەداوە ئیتر لە بەغدا خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانیو بەڕێزان مسعود بارزانیو دکتۆر محمود عوسمانو چەندێك لە ئەندامانی

مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی پارتی لە نێو جەرگەی بەغد لەگەڵ لێپرسراوە بالاکانی عیراق لە ئاهەنگێکی شکۆداری جەماوەری فراوان ئامادە بوون و چەند وتارێکی خۆش هەواڵیان خوێندەوە، لە دروشمەکانی کوردانیش (کێ بوو خۆی کرد بە شەکر.. کاك ئەحمەد حەسەن بەکر) لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنانی دنیا دەرکەوت سەرۆك کۆمار ئەحمەد حەسەن بکر باوەش بە بەریزان ئیدریس و مسعود بارزانی دەکات و ماچیان دەکات، هەروا لە گشت شارەکانی عیراق بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق ئاهەنگی گەورە گێڕدرا، هەموو کوردانی چوارپارچەی کوردستان و لە هەر شوێنێك هەبوون دڵخۆش و گەش بوونەوە ئەگەر بە نهێنیش بوو بێ ئاهەنگێکیان لێرە و لەوێ ساز کردووە هەتا ئەوانەی لە هەندەراند بوون، ئەمجارەیان بە ئازادی و بێ ترس گەڕاینەوە و سەردانی کەس وکارمان کرد، لە ٢١ی ئادار / ١٩٧٠ بە بۆنەی نەورۆز کە لە هەموو کوردستاندا بە ئاهەنگی گەورە و هەڵکردنی ئاگر ساز کرا، ئەوە بوو بە ئامادە بوونی ئامر هێزی سەفین و ئامر بە تالیۆن و سەر لق و سەرپەل و پێشمەرگەیەی زۆر لەگەڵ لێپرسراوانی لق و ناوچەی هێزی سەفین هەروەها مامۆستایانی شۆڕش لە هیران و ناوچەکانی تری خۆشناوەتی لەگەڵ خەڵکی شەقلاوە وخەڵکانێکیش لە شارەکانی تری کوردستان هاتبوون لەو نەورۆزو ئۆتۆنۆمیەی بۆ کورد و کوردستان رۆژێکی خۆشنوود بوو ئاهەنگێکی گەورە بەو بۆنەیەوە سازکرا لە نێو جەرگەی شەقلاوە لەسەر گردی زیوەر دا، ئاهەنگێك بە وتاری لێپرسراوان و گۆرانی و سروودی نیشتمانی و مۆسیقا و شیعر، ئەوەی شایانی باسە منیش شیعرێکم ئامادە کرد بوو، مقدم عەزیز ئامر هێزی سەفین بانگی کردم گوتی تۆ بە شیعر لە هیران سەرقاڵمانت کرد بوو، بۆ ئەو ئاهەنگە

هیچت پـیٚ نییـه؟ گـوتم بـه‌ڵیٚ پیٚمـه، پیٚشـمه‌رگه‌یه‌کی ڕه‌وانـه کـرد بـۆ لای حسن ناویٚك دیـار بـوو ئـه‌ویش یـه‌کیٚك بـوو له‌وانـه‌ی به‌رنامه‌که‌یان بـه‌ڕیٚوه ده‌بـرد، حه‌سـه‌ن هاتـه لای خـاڵ عـه‌زیزو پیٚـی گـوت (موحسـین ئـاواره)ی پیٚشکه‌ش بکه شیعریٚك ده‌خویٚنیته‌وه، به‌ڵیٚ، یه‌که‌مجاره ده‌چمه سه‌ر شانۆ بەڵام هیٚنده متمانه‌م به خۆم هه‌بوو به‌رامبه‌ر به جه‌ماوه‌ر وه‌ستاوم به جلـی خاکی‌و ده‌مانچه‌یه‌کم له قه‌دی خۆم به‌ستاوه له هه‌ڕه‌تی گه‌نجیه‌تیم، به بـیٚ وه‌رقه ئه‌و شیعرم له هیران ڕیٚکخستبوو له‌به‌رم کرد بوو، ده‌سـتم پیٚکـرد بـه خویٚندنه‌وه‌ی شیعره‌که‌م ئیٚستایش چه‌ند دیٚڕیٚك له‌و شیعره‌م دیٚتـه‌وه یـادم (ئـه‌وه بـه‌فر بـوو توایـه‌وه سـه‌ر گۆنـای بـه‌هار... وا لـه سـایه‌ی شۆڕشـه‌وه، نه‌وروٚزیٚك ساز ده‌که‌ین له شار)... هتد، که هه‌مووی به ده‌نگی به‌رزو نه‌وی ودروشمـی زۆری لـه خـۆ گرتبـوو بـه چـه‌پڵه ڕیٚـزان‌و پیٚشـوازیه‌کی زۆره‌وه خۆشحاڵی جه‌ماوه‌ری وه‌ده‌ست هیٚنا که له‌سه‌ر شانۆ هاتمه خواره‌وه مقدم عه‌زیز ئاکریی پـه‌نجه‌ی ئۆکـه‌ی بـۆ کـردم هـه‌روا بـه‌ڕیٚزان خورشـید شـیٚره‌و مامۆسـتا محه‌مـه‌د مـه‌لا قـادرو عه‌بـدولڕه‌حمان گۆمه‌شـینی‌و تـاهیر گۆمه‌شـینی‌و زۆرانـی تـر ده‌ستخۆشـیان لیٚ کـردم، ئـه‌وه یـه‌مجاره‌م بـوو بـۆ سه‌ر شانۆو شیعر خویٚندنه‌وه، بۆ من بووه هۆکارو پاڵنه‌ریٚك به ده‌یان جار له کۆڕو فیستیڤاڵ‌و زانکۆکان‌و بۆنه‌کان به متمانه‌و بیٚ شه‌رم کردن شیعر بخویٚنمه‌وه تا ئیستایشی له گه‌ڵدا بیٚت، دوای تـه‌واو بـوونی ئـه‌و ئاهه‌نگـه خـۆر ئـاوا بـووو ورده ورده شـه‌قلاوه تاریـك داهـات، زۆریٚـك لـه ناسـیاوو هاوڕیٚیـانم بینیـه‌وه‌و پیٚکتـر شـاد بووینـه‌وه کـه هاتبوونـه شـه‌قلاوه، هـه‌تا عاره‌به‌کان له خوارووی عیراقه‌وه هاتبوون له شه‌قلاوه دابـه‌زیبوون، ئـه‌وه‌ی شایانی باسه خه‌ڵکیٚکی نـه‌ناس‌و لـه دانیشـتوانی شـه‌قلاوه زۆر تـه‌کلیفیان لیٚم ده‌کرد که شـه‌و میٚوانیـان بم، پیٚشـمه‌رگه زۆر زۆر ڕیـزی لیٚ ده‌گیـرا وه‌ك

کەسێکی پیرۆزمەند سەیر دەکرا، دواتر وا کەوتەوە (نوری متی) کە ماڵیان لە بێترمە بوو لەگەڵ ئێمەش لە هیران ماموستای شۆڕش بوو، زۆری کردو شەو لە ماڵی ئەوان خەوتمو ئەو بیرەوەریەو یادگارەی ئەو نەورۆزەم هیچ لە یاد ناچیٚ هێندە چێژدار بوو، بۆ رۆژی پاشتر گەڕاینەوە هیران و زۆری پیٚ نەچوو لقی دووی پارتی گەڕایەوە ناو شاری هەولێر، ماموستاکانی سەردەمی رژێم کە گەڕابوونەوە شار پێشتر لە هیران بوون، گەڕانەوە نێو هەمان قوتابخانەو لەگەڵ ئێمەی ماموستایان شۆڕش، دەورو تەسەلیمان کردو گەڕامەوە شارەکەمو ماڵی خۆمان لە هەولێر، ماموستایانی شۆڕش ئایندەیان چی دەبێت بەو پێیەی خوێندنیان لە دەست داوەو چوونەتە ریزی شۆڕشی ئەیلول، ماموستا محەمەد ئیسماعیل کە لێپرسراوو بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە بوو لە ناو شۆڕش لەگەڵ سەرپەرشتیاران لەتیف نادرو محەمەد عەلی، لێپرسراوەتیەیان پیٚ سپاردرا بوون بۆ دامەزراندنی ماموستایانی شۆڕش وەك ماموستا کەچی لە ژێر ناوی مرشد بڕیاری لیژنەی سەلاّم دەرچووو لە وەزارەتی پەروەردەی عیراق لە بەغدا جێبەجیٚ کرا، هەروا ئەوەی ئارەزووی گەڕانەوەیان هەبوو خوێندن تەواو بکەن ساڵی چوونیان بۆ ناو شۆڕش بە دابڕان حیساب نەکرا گەڕانەوە بەر خوێندن، دەورەیەکی فێرکاری بۆ ماوەی شەش مانگ کرایەوە بۆ ئەو ماموستایانەی شۆڕش ئەوەی ئارەزووی لیٚ بێت دواتر بە ماموستا دادەمەزرا، من بۆ خۆم هیچ بڕیارێکم نەدا تا ئەو کاتەی چوومە لای مقدم عەزیز ئاکرەیی کە لێپرسراوی لقی دووی پارتی و بەشی سەربازی و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بوو ئەو کات، پێیی گوتم، سبەی وەرەوە لام کارێکم دەستنیشان کردوە بۆ تۆ.

(٢٩)

تازه لقی دوو پارتی له هەولێر / تەیراه / له خانوێکی گەورە جێگیر ببوو لەسەر شەقامی (٣٠) مەتری له نزیك گازینۆی کوردو عەرەب کە ئێستایش ئەو گازینۆیه هەیه بە هەمان ناو، ئۆتۆنۆمی و رێکەوتنی ١١ی ئادار تازەیەو خەڵکی دڵسۆزو هی تریش له هامشۆو جێم کەو رێم کە، گرمەی دەهات بارەگای لق، چوومە لای مقدم عەزیز ئاکرەیی، چایەکم خواردەوە پێی گوتم لەگەڵ هەڤاڵانی لقی دوو (پ. د. ك) بڕیارمان داوه تۆو چەند هەڤاڵێك لەوانە (کەیفی کۆیی)و (سەلام گۆمەشینی) (ئازاد حەمە گەمحان) له بەشی عەسکەری لقی دوو کاری تەسریح بوونی پێشمەرگەکان دەکەن، بەم شێوەیه دەبێ، هەر پێشمەرگەیەك نووسراوێك له لایەن ئامر بەتالیون و سەرلق و هێزەکەی خۆی دێنی، ئیستمارەیەکمان هەیه بۆ تەجنید ناوەکانیان لێی دەنووسن و وێنەیەکی لێ چەسپ دەکەن مۆری دەکەن و پاشان کە خۆم لێرە بووم یان یەکێك لە کارگێڕانی لقی دوو ئیمزای لەسەر دەکات و دەیبەن بۆ تەجنیدەکانیان و لەسەربازی تەسریح دەبن بە پێی فەرمانی لیژنەی ئاشتی بەغداو رێکەوتنیان لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول، جا دەست بەکار بووین، چەند رۆژێك کارەکە بە رێك و پێکی دەڕۆیشت، بەڵام برادەرایەتی و دەعوەت و خزم خزمانێی تێکەوت هەبوو پێشمەرگەش نەبوو بەو رێگا چەوتەوە تزکیەی دەهێنا گوایە پێشمەرگەیه، تەسریح دەبوو، بویە بڕیارێك لە لایەن لیژنەی (سەلام)ەوە بە سەرۆکایەتی مورتەزا حەدیسی هات بۆ سەرکردایەتی

شۆڕش و لقەکان کە ئەم تەسریح بوونە راگرن، لەبەرئەوەی لە لیژنەی سەلام لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی وا رەزامەندی لەسەر دراو بوو کە پێنج هەزار پێشمەرگە تەسریح بکرێت کەچی گەیشتە ژمارەی پانزە هەزار، زۆرێك لە پێشمەرگەی حەقیقی لێی بێبەش بوون و خاوەن واسیتەو ماستاوچی و بەرژەوەند خواز تەسریح کران بە ناحەق، یەکێك لەوانەی مایەوە من بووم تەسریح نەبووم، موختاری گەڕەکەکەمان وازی لە ماڵی ئێمە نەدەهێنا و پێی رادەگەیاندن دەیگوت کوڕەکەتان لەسەربازی (متخلف)ەو بچێتە تەجنید، ئەوجا وەرە تێکەو فڕکە ئەوەش کاری کورد، ناچار نووسراوێکم بۆ کرا لە لایەن لقی دووی پارتی بۆ مەکتەبەی سیاسی لە لایەن مقدم عەزیز ئاکرەیی ئیمزا کرا بوو، وەزعی منی تیا نووسرا بوو، گوایە من ئەو ئیستمارانەی پێشمەرگەو خەڵکانی ترم چیٚ کردووە کەچی خۆم ماومەتەوە، چوومە ناوپردان، مەکتەبی سیاسی پارتی لیٚ بوو، چاوم بە نووسەرو رۆشنبیری گەورە جرجیس فتح الله کەوت گۆپاڵێکی بە دەستەوە بووو منداڵێکی پارچەلەی لە گەڵدا بوو دەمزانی کوڕە خوشکێتی چونکە بەر لە رێکەوتنامەی ١١ی ئادار ئەمدی ئەو، ئەو منداڵەی هەر لە گەڵیدا بوو، بەڕێز جرجیس فتح الله منی ناسییەوەو مامۆستای دەورەکەمان بوو دەورەی ماموستایانی شۆڕش وانەی پیٚ دەگوتینەوەو منیش بە عارەبیەکی ڕەوان قسەم لە گەڵیدا دەکرد بەو پێیەی ماڵمان لە گەڕەکی عارەبان بووەو خوێندنیشم بە عارەبی بووە ئەویش نەیدەزانی بە کوردی قسە بکات، نێوانمان خۆش بوو، پێشوازیەکی گەرمی لیٚ کردم، ها چی دەکەی لێرەو کەی هاتی، وتم کتابێکم بۆ مەکتەب سیاسی پێیە لەسەربازی تەسریح نەبوومە، گوتی وەرە لە گەڵم تەنیا دکتۆر مەحموود عوسمان لێرەیە، کە چاوم بە دکتۆر

عوسمـان كـەوت، بـە زمـانی عـەرەبی بـە دكتـۆری گـوت ئـەو پێشـمەرگە گچكەیە دەناسی، سـەری هـەڵبڕی گوتی نـازانم كێیە، جرجیس فتح اللـە گـوتی تەلەبـەی خۆمـان بـوو لـە دەورەی دووەمـی مامۆسـتایانی شـۆڕش، بـەخێر هـاتنی كـردمو نووسـراوەكەم دایـە دەسـتی سـەرێكی باداو گـوتی كوڕی خۆم تۆ بگەڕێوە بۆ هەولێر، وا لیستەكەمان بوو بە شەسـتو چوار كـەس بـۆ هـەمان حاڵـەت، پەیوەنـدیمان بـە بـەڕیز سـەیدا ساڵح یوسـفی كردووەو ناوەكانی بۆ دەنێرینو لە بەغدا پەیوەندی بە مورتـەزا حەدیسـی دەكـات بڕیارێك بـۆ ئەو كۆمەڵـە پێشمەرگەیە دەربكـات تایبـەت بكـرێن بـە تەسـریح كردنیـان، ئـیتر گەڕامـەوە هـەولێرو ماوەیـەكی زۆری پـێ نەچـوو بڕیـارێكی تایبـەت لـە لیژنـەی سـەلام بـە ئیمـزای مورتـەزا حەدیسـی رەزامەنـدی لەسـەر ئـەو لیسـتەی مەكتـەبی سیاسـی درا، بـەڕێز خورشـید شێرە موژدەی دامێ وەرە ئەو فەرمانەی لیژنەی سەلام ببە تەجنیدو نـاوی تۆی تیایەو خۆت تەسریح بكە، زۆر دڵخۆش بـووم وەك ئـەوەی بـاڵ بگـرم، بۆ بەیانی چوومە تەجنید كە دەفتـەر خدمـەیان لـێ وەرگـرتم نایـب زابت عەبـدوڵلاّ دەیناسـیم پێـی گـوتم ئـەو تەسـریح بوونـە بـۆ تـۆ نـابێ چـونكە تەمەنت حەڤدە ساڵەو ئەو تەسریح كردنە بۆ تەمـەنی هـەژدە سـاڵو بەرەو سـەرەوەترە، گـوتم ئـەی چـی بكـەم؟ گـوتی بـڕۆ لـە دادگـای هـەولێر سـكالاّنامەیەك بـەرز كـەوە داوا بكـە تەمـەنت گـەورە بكـرێو دواتـر دەتنێرنەوە بۆ لیژنەی تەجنید كە دكتۆرو چەند ئەفسـەرێكن بریـار لەسـەر بەرز كردنـەوەی تەمـەنی تـۆ دەدەن ئەگـەر قەناعـەتیان پێـی بێـت، ئەوەشـم كردو رۆژی دانیشتنی لێژنەكە لـە تەجنیـد ئامـادە بـووم، هێنـدە ڕاڕاو لـە وەزعێكـی دەروونـی خـراپ بـووم، ئـەو رۆژ ئەگـەر بڵێم وەك كەسێكی پیـر

دیار کەوتم، ئیتر ئیمزایان لەسەر داواکەم کردو لە تەمەنی ١٩٥١/٧/١ کرا بە ١٩٤٩/٧/١ بۆ ڕۆژی پاشتر تەسریح کرام.

هەر لە دوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئادار لە ناوپردان هۆڵێکی فراوان بە حەسیرو ڕایەڵی دارو چرووو بنیات نرا بوو لەو هۆڵەدا لەبەرواری ١٩٧٠/٧/١ کۆنگری ٨/ی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی نەمر مستەفا بارزانی ئەنجام درا.

لە ١٩٧٠/ ٧/١٥ کۆنگرەی (٦)ی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەو هۆڵە دەستکردەی ناوپردان کە کۆنگرەی پارتی تیا ئەنجام درا بوو، کۆنگرەی یەکێتیی قوتابیانی تیا ئەنجام درا، ئەوەی شایانی باسە منو ئیسماعیل حوسێن کە ناوبراو لێپرسراوی لێژنەی شار بوو لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بەڵام ببوو بە پێشمەرگە، هەروها سمکۆ بارزانی کە هەمان حاڵەتی هەبوو منیش ئەندامی لێژنەی شاری هەولێر بووم لەو یەکێتیەی قوتابیان لەبەر بوونم بە پێشمەرگە، جا لە لێژنەی باڵای سەرپەرشتیارانی کۆنگرە پێیان ڕاگەیاندین ئێوە ئێستا قوتابی نینو ناتوانن بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکەن، ناچار منو ئیسماعیل حوسێنو سمکۆ بارزانی چوینە مەکتەبی سیاسی پارتیو فەرمانێکمان وەرگرت کە مافی ئەوەمان هەیە لەو کۆنگرەیە بەشدار بین بە دەنگدانو خۆ پاڵاوتنو هەموو مافێکەوە.

لە ٩٧٠/١١/١١ بە مرشد دامەزرامو تەنسیب کرام لە خۆیەتی ئیدارەی خۆجێیەتی هەولێر، پاش چەند مانگێك لەسەرداوای خۆم گوازرامەوە بۆ بەشی ژمێریاری پەروەردەی هەولێر ماوەیەك دەست بە کار بووم پاشان چالاكیم زۆر بوو لە ریزی ڕێکخستنی پارتی، تەفرغ پێ کرام وەك کادیرێك لە ناوچەی هەولێر کار بکەم کە بەڕێز عەلی ڕەسوول لێپرسراوی ناوچە بوو.

(٣٠)

بەڵێ کۆنگرەی شەشەمی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لە ١٩٧٠/٧/١٥ دەستی پێکرد لە ناوپردان لەو هۆڵە دەستکردەی بە حەسیرو رایەڵی دارو بە چروو داپۆشراو کە دیمەنێکی سروشتی جوانی هەبوو، بەر لەو گۆنگرەیە، کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستانی تیا ئەنجام درا لە ١/ ٧ / ١٩٧٠دا کۆنگرەکەی قوتابیان سێ رۆژی خایەند، لە دانیشتنی یەکەمدا دوای وەستان دەقیقەیەك بۆ شەهیدانی کوردو کوردستان وتاری بەڕێز مستەفا بارزانی نەمر لە لایەن مقدم عەزیز ئاکرەیی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان خوێندرایەوەو دواتر دکتور محمود عوسمان ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، وتاری پارتی خوێندەوە، ئەوەی شایانی باسە چەندین کەسایەتی سیاسیو رێکخراوەییو بیانیو ولاٌتانی عەرەبی ئامادە ببوون لەو گۆنگرەیەدا بە وتارەکانیان رۆڵی تێکۆشانو خەباتی قوتابیانیان نرخاند، هەروا لەو کۆنگرەیەدا بەڕێزان رشید سندیو فەرنسۆ هەریریو شەکیب ئاکرەییو محەمەد ئیسماعیل ئامادە بوون، لە رۆژی دووەمی کۆنگرەدا، راپۆرتێکی فراوانی چالاٌکیەکانو رۆڵو خەباتو تێکۆشانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە لایەن سەرۆکی لێژنەی ئامادەکاری کۆنگرە بەڕێز فەرهاد عەونی خوێندرایەوە، جا بەر لەوەی ئەو کۆنگرەیەی یەکێتیی قوتابیان دەست پێ بکات، ململانێو هاودژیو ناکۆکییەکی زۆر

هەبوو کەڵەکە ببوو، واتە دەبووایە لە ناو گۆنگرەدا ساغ بکرێنەوە ئیتر کوردەو هەر بێ کێشە نابێ، تا رۆژی سێیەم گفتوگۆو دەردەشەو چەندو چوونی تیا هەبوو تا ساغ کرایەوەو دواتر هەڵبژاردن و دەنگدان دەستی پێکردو دوای جیا کردنەوەی دەنگەکان، ئەو بەڕێزانە بوون بە لێژنەی جێبەجێکارو سەرکردایەتی قوتابیان بەم ناوانەوە (عادل موراد – ئەنوەر عەبدوڵلا – رەنج نوری شاوێس – عەبدولقادر حمدامین – فەرهاد عونی – عارف تیفور – جرجیس حسن – نوری ئاکرەیی – صباح عوبید – سعدی خلیل – عادل لیلانی – ئەکرم مەنتك – جلال خۆشناو – محەمەد حاجی شێروانی – یوسف مەولود قەساب – عوسمان خۆشناو – وزیرە پیرداود – حاجی محەمەد کریت – شیرکۆ رەشید سندی – جواد محەمەد شێروانی – عەبدوڵلا محەمەد)

ئەگەر قۆناغی دوای ریکەتنامەی ١١ی ئادار باس بکەین لە ١٩٧٠ تا ١٩٧٤، دەتوانم بڵێم چۆن دوا لاپەڕەی رۆژنامەکان ویستگەی پشوودان و هەناسە خواردنەوەیەکە ئەو رێکەتنامەیەش پیشوودانێك بوو بۆ پێشمەرگەو دڵسۆزانی کوردو رێکخستنەکانی حزب و نیشتمانپەروەران، هەروا ئاشتبوونەوەیەکی گشتی لێ هاتە بەرهەم بە گەڕاندنەوەی گشت جۆگەکان بۆ نێو یەك رووباری زیندوو، بە دەر کردنی لێبوردنی گشتی لە لایەن رژێمی بەعسی ئەوسا بۆ پێشمەرگەو سەربازانی فیرارو متخلف و تەسریح کردنیان و لەسەرەتادا ئازادیەکی کراوە بۆ رێکخستنەکانی پارتی و هاوپەیمانەکانی و کردنەوەی بارەگاکانی حزب و گشت رێکخراوە جەماوەرییەکان بۆ هەموو چین و توێژێك و کارکردنیان و بەستانی کۆنگرەو بە ئازادانەو یاد کردنەوەی بۆنەو مێژووەکانی نیشتمانی و کوردستانی، ئاهەنگ گێران و دروشم هەڵواسین و نمایش کردن و سەفەرو

بەشداریکردن لە فیستڤالەکانی جەماوەری و بۆنەکانی ولاتانی بیانی و عەرەبی و دروست بوونی پردێك بۆ پەیوەندییەکان لە نێوان ولاتانی دەرەوەو هاتنی وەفدیان و ئالْو گۆر کردنی بیرو بۆچوون و تێگەیشتن لە کرۆکی شۆڕشی کوردو مافە ڕەواکەی، هەروا لە لانی رۆشنبیری و ئەدەب و هونەرو وەرزش پێشکەوتن و داهێنانی تازەی بە بەرەوە بوو لە ١٩٧٠/٢/١٠ یەکێتیی نووسەرانی کورد مۆڵەتی وەرگرت و دانی پیانرا وەکو رێکخراوێکی سەربەخۆو لە شارەکانی کوردستان بارەگاو مەڵبەندی گشتی و لقەکانی دامەزرێنیْ و گۆڤاری دەرکردو هەڵسا بە ئەنجامدانی فیستڤالْو کۆڕو سیمنار لە ناوەوەو بەشداریش لە زۆر بۆنە ئەدەبییەکانی دەرەوەی ولاْت، هەروا بەستانی گۆنگرەو هەڵبژاردن لە لقەکان، لەو ماوەیەدا رۆژنامەی خەبات و برایەتی لە بەغدا دەردەچوو بە کوردی و عارەبی و زمانانی دی، سەرنجی هەموو سیاسی و ئەدیب و رۆشنبیرانی کوردو عەرەبی ڕاکێشا بوو بە گۆتنی ڕاستی و ئازایانە، هەر لەو ماوەیەدا چەندین نووسەرو هونەرمەندو رۆژنامەنووس وەدیار کەوتن بەرهەمەکانیان بە چاپ گەیاند، لەو ماوەیەدا (روانگە، کە بزووتنەوەیەك بوو بە ناوی بزووتنەوەی نوێخوازی، بانگەوازی بلاْو کردەوە بە ناونیشانی – لە روانگەی ئەدەبی کوردی نوێمانەوە کە شاعیرو نووسەرانی ناودار واژوویان کرد بوو، بریتی بوون لەبەرێزان – شێرکۆ بێکەس – حوسێن عارف – جەلالی میرزا کەریم – کاکەمەم بۆتانی – جەمالْ شارباژێری – کەمال رەووف محەمەد، ئەم بانگەوازەش بۆ یەکمجار لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٥) لە ٢٥/ ٤ / ١٩٧٠ بلاْوکرایەوە، دواتر چەندین شاعیرو نووسەرو هونەرمەندانی تر هاتنە پالْ ئەم بزوتنەوەیەو کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو شەپۆل و تەوژم و هەڵچوونە کە دروشمیان

(بیری نوێ – وتەی نوێ – کرداری نوێ) بوو، مەبەستی سەرەکی گۆڕانکاری کردن و تەکانی نوێ و یاخی بوون لە دوێنێ و تێکشکاندنی قاڵبە سواوە کلاسیکییەکەو پەیڕەو کردن لەسەر شێوازو ناوەڕۆکێکی مۆدێرنیزم بە ستایلێکی تازەو هونەر ئامێزانە، ئەگەرچی کێشەی زۆری نایەوەو بەربەست بوونی بۆ دروست بوو بە تایبەتی لە لایەن پیاوە ئاینییەکانەوە کە هەندێك لە نووسینەکانیان بە کوفر لە قەڵەم دەداو شکات شکاتکاری تێکەوت گوایە دژ بە داب و نەریت و رەسەنایێتی و ئاین و عوورفە جوانەکانە، بەڵام بۆ سەردەمی خۆی و ئێستایشی لە گەڵدا بێ کاریگەری بەجێماوە) هەروا لەو نێوانەدا پێشمەرگەو کەسانی حزبی و رێکخستنەکانی ناو شار کە دابڕا بوون و بێ کار مابوونەوە یان زیندانی سیاسی بوون بەر لێبووردنی گشتی رژێم کەوتبوون، هەندێکیان دامەزران یان گەڕانەوە بۆ سەر وەزیفەکانیان، لەو ماوەیەدا کەناڵی تەلەفزیۆنی کرکوك بەرهەمی هونەرمەندانی کوردستانی پەخش دەکرد بە زمانی کوردی جگە لەبەرنامەی رۆشنبیری و ئەدەب و ئەلقەکانی نواندنی دراما و تەمسیلەکان، هەروا شاعیران و نووسەران مێزگرد و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکرا، یەکێتی نووسەرانی کورد هەفتانە بەرنامەیەکی هەبوو بەندە یەکێك بووم لەوانەی لەو ساڵدا گفتوگۆیەکم لەگەڵ ئەنجام درا کە خوالێخۆشبوو کەریم شارەزا کۆڕەکەی دەگێرا، کەناڵەکە رەش و سپی بوو، ئەوانەی لەو کەناڵەی کرکوك کاریان دەکرد بریتی بوون لەبەڕێزان (سعید زەنگەنە – ئیسماعیل گەیلانی – هاشم علی مەندی – شەوکەت رشید) دەستکەوتەکان زۆر بوون بۆژانەوە ی زۆری بە بەرەوە بوو لە رووی گوزەران و بە دامەزراوەیی کردن و بەرز کردنەوەی ئاستی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و کوردایەتی و ئابووری و

پەیوەندیـــەکان..هتــد هــەروەها ئــەو گەشــت وگــوزارەی کوردســتان کــە بوژانەوەی بە خۆوە بینی بوو بەو پێیەی ئاشتی لە کوردستاندا بەر قەرار بوو جا پەیوەندی باشووری کوردستان و ناوەندو باشووری عیراق واتە نیـوانی کـورد عـەرەب ژیـا بـۆوە بـە جۆرێـك گەشـتیارانی عـەرەب بـە خاوخیزانەوە تا سەر سنوورەکان دەبیندران بە تایبەتی کە دەهاتنە گەلاڵە کـە وەك پایەتـەختی شۆڕشـی ئـەیلوول بـوو لـەو سـەردەمدا، کـالاّو شیرنەمەنی و کەل و پەلی ئێرانی لێ بوو، ئەو گەشتیارانە زۆر عەودالّی بوون وەك (قوماشی ئەنگۆرەو چەمی ڕێزان و کوێستانان خالّ خالّو قەنادی و خەنەو دەمانچەی لامەو ویلتـەر... هتـد، ئـەوەی لێـوەوەی دوایـن لایەنـە ئیجابی و گەشـەکەی بوو، لـە ئەلقەی داهـاتوو دێینـە سەر لایەنە سلبی و تاریکەکەی.

(٣١)

له ئەلقەی پێشوو لایەنە ئیجابیەكانی رێكەوتنەكەی (١١ی ئازار)مان باس كرد دواترلایەنە خراپەكانێتیی رژێمی بەعس دژ بە كورد بە نهێنیی و بە ئاشكرا پەیرەوی دەكرد كە ناومان نا (١١ ئازار) نەك (١١ی ئازار) ئەگەر له ئازارو ئێش و ئاكامەكەیەوە چەند خاڵێكی بە نمونە بخەینە روو.

١ – له نێوانی ئەم چوار ساڵەدا ١٩٧٠ – ١٩٧٥، رژێم بە بەرنامە لە هەوڵ و تەقەللای بەردەوامدا بوو بۆ بە شكست پێهێنانی كوردو دڵ رەنجاندنی پێشمەرگەو دڵسۆزان بەرامبەر بە لێپرسراوان و سەركردەكانی كوردو چاندنی گلەیی و بێزاری و نارەزایی و هەستكردن بە مەغدوری و پەراوێز كردنیان كە بڵێن كاریان پێمان نەماوەو بەرەللایان كردووین، ئیتر لەوە پاش بۆ كێ خۆمان بە كوشت بدەین تەنیا كاسەلێس و ماستاوچییەكان سوودمەند بوونە ئێمەش بچینەوە مەیدانی كارو رۆژێك بە ئیش و سێ رۆژ بێ كار بگەرێینەوە ماڵ، ئەمە وتەی زۆربەی پێشمەرگەرگەو دڵسۆزان بوو، ئاسەوەری ئەم وتانەش لە ساڵی ١٩٧٥ بە دیار كەوت كە شەر لە نێوانی شۆرش و رژێم هەڵگیرسایەوە زۆربەی پێشمەرگەكان لەبەرەكانی جەنگدا خۆیان دەدزییەوە نەدەهاتنە بەر ئامادە بوون و خۆیان بە كوشت بدەن واتە حەماسەتی جارانیان نەما بوو.

٢ – له هەوڵەكانی رژێمی بەعس لەبەر یەك ترازاندنی خێڵ وعەشیرەت و كەسایەتییە ناودارەكانی كوردو كرینی خەڵكانی نەفس نزم، ژێرەو ژێر

چــەكدار كردنـــی جــاش‌و دوور خســـتنەوەیان لـــە شـــۆڕش‌و ڕۆحـــی كوردایــەتی‌و بــە دژ یەكــەوە نــان‌و نانــەوەی پشــێوی‌و ســەرقاڵ كردنــی سەركردایەتی پارتی‌و شۆڕشەكەی بە كێشەی لاوەكی بۆ پەراوێز كردنی بڕگە بنەڕەتییەكانی ڕێكەوتنامەی ١١ی ئادار، بۆ نمونە هەر لە ماوەی ئەو چوارساڵەدا شەڕی عەشایر السبعە كورد بە كوردی داگیرساند چەند پێشمەرگەیەكی تیا شەهید بوون یەكێك لەوانە خاروانی من بوو گەنجێكی جوان شەهید (عەونی سابیر كاكەشین) بوو.

٣ - ناردنی چەند مەلایەكی عەرەب ملغوم كرا بوون بۆ بارەگای مستەفا بارزانی نەمرو لەوێدا خۆیان تەقاندەوەو هەپروون بە هەپروون بوون خوا كرد مستەفا بارزانی نەمر تیادا سەلامەت دەرچوو.

٤ - لــە نێــو جەرگــەی بەغــدای پایەتەختــدا دەســتڕێژی ترومبیلــی خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی كرا كە بە سەلامەتی لێی دەرچوو لەو پیلانە نەگریسە، ناوبراو بەڕێز حمید بەرواری كە لە نێو ترومبێلەكە بوو بریندار بوو.

٥ - بارەگای حزبی بەعس لە شارەكان دانران‌و كاریان كرینی نەفس نزمە كوردەكان‌و ڕێكخستنی حزبی بەعس‌و فراوانكردنی بوو، هەروا دروستكردنی حزبی كارتۆنی‌و كردنەوەی بارەگاكانیان سەر بە دایرە سیخورییەكان بوون، جگە لەوەی بۆ بەكار هێنانیان دژ بە شۆڕشی كورد‌و فراوانكردنی چالاكیەكانی دەزگای ئەمن‌و هەواڵگەری كە كاریان تۆقاندن‌و هەڕەشە بوون بۆ كوردستان، هەروا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد كردنی هێزی سەربازی‌و فراوان كردنی سەربازگەكان لە شارو شارۆچكەكاندا.

٦ - لەبەر دەم دەرگای دادگای هەولێر سیخوڕەكانی دایرەی ئەمنی هەولێر توانیان یەكێك لە كادیرە پێشكەوتووەكانی پارتی كە كارگێڕی

ناوچەی پارتی بوو لە هەولێر (محەمەد حاجی) شەهیدی بکەن، پشێوی و نائارامیەکی زۆری نایەوە شار خرۆشا و لە هەمان کاتدا نزیکتر لەو شوێنەی شەهید محەمەد بۆ تۆڵە کردنەوەی ئەو شەهیدە سیخورێکی دایرەی ئەمنیان دەستگیر کردو کوشتیان. ئەوەی راستی بێت خەڵکی هەولێر بە شەهید کردنی محەمەد حاجی زۆر نیگەران و زامدار بوون، من یەکێك بووم ئەو کات لەگەڵ شەهید لە ناوچەی پارتی کارم دەکرد کارگێڕی رێکخراوی خەبات بووم، ئەو کات لە هەموو هەولێر یەك ناوچە هەبوو بە سەر چەند رێکخراوێك دابەش کرا بوون بۆ کاری رێکخستنی ناو شار، ئێستایش وێنەی شەهیدم لەبەر چاوە، رەسووڵ هەمزاتۆڤ-ی داغستانی راستی فەرمووە (پیاوی ئازا، یان لەسەر زینە یان لە ژێر زەوی) بەڵێ ئەو شەهیدە یەکێك بوو لە پیاوە دڵسۆزو ئازاکان و چاونەترس و بە هەڵوێست بوو.

٧ - رژێمی بەعس توانی حزب شیوعی عیراقی لێژنەی مەرکەزی لە خشتە بەرێ کە ساڵانێکی زۆر لە پاڵ سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بوون و پێشمەرگەی ئازاو جەربەزەیان لەبەرەکانی شەڕ لە کوردستان هەبوو و رۆڵی قارەمانانەو لە خۆبردوویان هەبووە کە کێوی هەندرێن بۆ نموونە شایەدیان بۆ دەدا بەر لە رێکەوتنامەی ١١ی ئادار، کەچی چوونە نێو (جبهە) (بەرەی نیشتمانی) لەگەڵ رژێمی بەعس و لەبەر چاوی کورد رەش بوون کە ساڵانێکی نەخایاند رژێم وردە وردە هەڵسا بە کڕینی ئەندامەکانیان و چوونە ریزی بەعس، یان گرتن و تەسفیە کردنی کادیرو ئەندامانی ئەو حزبە، هەروەها بە لاوازکردن و نانەوەی بێ متمانەیی و کیشەی زۆرو لەبەر یەك ترازاندنیان، کە لەگەڵ پارتی بوون بە هاودژو تا ئاستی دوژمنایەتی کردنی یەکتر.

٧ - لەو ماوەیەی (١٩٧٠ - ١٩٧٥) کە وەزعەکە بە باری لایەنی کێشەو بێ متمانەیی و فڕو فێڵ پیلان و گۆبەندەکانی بەعس داکەتبوو، نارەزایی دڵسۆزان و کورد بە گشتی، نووسەرو شاعیرو هەرمەندو ڕۆژنامەنووسان قۆڵ و قەڵەم و باسکیان لێ هەڵکرد بوو، بە شیعرو نووسین و هونەرەکانیان هەر لە ڕۆژنامەکان و گۆڤارو کۆڕو سمینارو ڤیستڤاڵەکاندا بە ڕەمزو پەردەپۆشی و ئاشکرا دژ بە ڕژێمی بەعس و نارازی بوون لەو ڕێکەوتنەو هەتا لەسەرکرایەتی پارتی، دەربڕینەکانیان توندو تیژو بابەتەکان شۆڕشگێری و بەرگری و بەرەنگاری و ئاگراوی بوون، بە تایبەتی دوای ئەو پیلانەی ڕژێمی بەعس بۆ تیرۆر کردنی مستەفا بارزانی نەمر بۆیان نەچووە سەر، زۆرێک لە شاعیران شیعریان بڵاو کردەوە کە هەست و خۆشەویستیان بەرامبەر بە سەرۆک و شۆڕشەکەی ئەیلول نیشان دەدا واتە شیعر بۆ بارزانی نەمر بۆ نموونە شێرکۆ بیکەس و عەبدوڵلاّ پەشێو شاعیرانی دی بە خوێندنەوەیان لە کۆڕی شیعرداو بلاو کردنەوەیان لە گۆڤارو ڕۆژنامەو چاپەمەنیەکانیان، بەندە یەکێك بووم لەو ساڵدا لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٤٣) ١٩٧٣ ئەم شیعرم بڵاو کردەوە:

کام..؟

کام ڕابەرە... کام سەنگەرە
بۆ هەناسە دانی نەوەکەمان
داستان و مێژووی بە بەرە؟
بۆ ئارەقەی نێوچەوانمان وەك سێبەرە
بۆ شۆڕشمان تەقەی شەڕە

بۆ رەش و رووتی شارەکەم

جل و نان و ئاو و کارە

بۆ باری خواری کاروانمان دەستبارە

لە ئاوێنەی پڕ لە وێنەی

چاوی ئەم چەند پرسیارانە

بارزانیم دی، لە سایەقەی سامالّی ژین

خونچەی هیوا دەپشکوێنیٚ

بۆ نەورۆزی کوردستانم، لە شوێن ئاگر

تەمەنی خۆی دادەگیرسێنیٚ

(٣٢)

وەك لە پێشدا ئاماژەم پێکردووە هەر لە دوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ کە لە بەشی سەربازی لقی دووی پارتی کاری تەسریح کردنی پێشمەرگانم پی سپێردرا، دواتر لە هەولێر یەك ناوچەی پارتی هەبوو چەند ڕێکخراوێکی لە خۆ دەگرت هەر یەکەو بە ناوێکەوە وەك ڕێکخراوی رزگاریو خەبات.. هتد کە بە پێوانەیی گەڕەکەکان دابەش کرا بوونو یەکسەر سەر بە ناوچە بوون، هەر یەکێك لە ئەندامانی ناوچە سەرپەرشتی ڕێکخستنی ڕێکخراوەیکی لە ئەستۆ بوو، لە ١٩٧٢ کاری لێپرسراوەتیم پیٚ سپێردرا دوای ئەوەی هەلبژاردنێك کراو دەنگم هێنا بووم بە کارگێڕی ڕێکخراوی خەبات کە ڕێکخستنی گەڕەکی عارەبانو تەعجیلو قەلاتی لە خۆ گرتبوو، هەر ئەندام ڕێکخراوێکیش چەند ئەندمێکی پیشەیی هەبوو، تا ئاستی ئەندامو پالێوراوو لایەنگیرو دۆست ڕێکخستنەکان دەکرانو پەیوەست بوون بە یەکەوە، بەندە جگە لەوەی لە وەزیفەش (تفرغ)م پێکرا بوو بۆ کاری حزبیو ڕێکخستنەکانو چاپ کردنی راپۆرتە نهێنیەکانی بەشی تایبەت لە ناوچەی هەولێر وەکو متمانە پێکردنم لەم رووەوە لە ناوچە دەوامم دەکرد، ئەوکات لەو ناوچەیە بەڕێز (عەلی رەسوولٚ لێپرسراوی یەکەمی ناوچە بوو، سەلیم ئاغۆكو محەمەد حاجی بەر لە شەهید بوونی کارگێڕانی ناوچە، بەڕێزان قانعو خالد مەلا نعمان مامۆستا عەبدوڵلاٚ ئیسماعیلو یوسف حاجی عوسمان، خالد

حوسێن ئەندمانی ناوچە، دوای تێکەڵ بوونەوەی باڵی مەکتەب سیاسی، بەڕێزان (فاروق جمیلو پوشۆ دزەیی و عەبدولڕەحمان رووتەو ماموٚستا صەبری ئامێدی) بوون بە ئەندمی ناوچە، ماوەیەك فاروق جمیل لێپرسراوی رێکخراوی خەباتیان پێ سپاردو منیش کارگێڕی ئەو رێکخراوە بووم، ماوەیەکیش پوشۆ دزەیی بوو بە لێپرسراوی ئەو رێکخراوەو منیش کارگێڕی رێکخراوەکە، لە پاڵ کاری رێکخستنی پارتی لە راگەیاندنی نەقابەی کرێکاران بووم بەو پێیەی زمانی عەرەبیم دەزانی و هاو پەیوەست بوون لەگەڵ نەقابەی کرێکارانی گشتی بەغدا، ئەوکات محەمەد عایش یەکێك بوو لەسەرکردایەتی ناوەندی بەعس و بەرپرسی یەکەمی نەقابەی گشتی کرێکارانی عیراق و جەبار کارەبا جێگری بوو وەك نوێنەری کورد لە بەغدا، نەقابەکانی کرێکاران بالاّ دەست بوون بەو پێیەی حزبی بەعس لەبەرەی سۆشیالست و هاو ڕای یەکێتی سۆڤیەت بوو، بەندە لە کاری نەقابی بەشداری کۆنگرەو بۆنەکان دەبووم و وتاری نەقابەم بە زمانی عەرەبی دەخوێندەوە بە تایبەتی لە بەغدا، ئەوە بوو لە ١٩٧٤ دانرام بۆ دەورەیەکی نەقابی لە یەکێتی سۆڤیەت، بۆ ماوەی (١٠) مانگ لە دەورە بمو بخوێنم پاش ئەوەی سەرۆکی نەقابەکانی هەولێر (قادر حمشین) گەڕایەوە لە دەورەی یەکەمدا لە مۆسکۆ بۆ هەمان بابەت کە ١٠ مانگی خایەند، من پاسپۆرتم وەرگرت ڤیزەکەی ڕەزامەندی دایرەی ئەمنی هەولێری دەویست بۆ سەفەرەکەم کە بە دەستی ئەنقەست تاخیریان کرد بە درنگەوە ڤیزەکەی لێدراو بێبەش بووم لەو سەفەرە، بۆ دەورەی سێیەم دانڕامەوە کە خۆی بریتی بوو لە سێ دەورە، کەچی شەڕی ١٩٧٤ /ی بە سەر داهات و بوومەوە بە پێشمەرگەو ئەو سەفەرەم لە دەست چوو لەگەڵ ئەو پارچە ئەرزەی لە گەڕەکی رووناکی کە ٦٠٠ م بوو کارتەکەیم

وەرگرتبوو بە ناوی نەقابەی مامۆستایان دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول ١٩٧٥ پاش چەند مانگێك كە لە ئێرانەوە گەڕامەوە هەولێر وەختی كارتەكەی ئەرز وەرگرتنەكەم بردە شارەوانی هەولێر گوتیان ئەرزەكەی تۆمان بەخشیە كەسێكی یەدەگ ئەو ئەرزەش ڕۆیشت ئێوە خۆش، هەر لەو دەورە رۆشنبیری و ڕێكخراوەییەدا، بەڕێز كاك كۆسرەت رسوولْ عەلی، كە بۆ ماوەی (١٠) مانگ بە ناوی كۆمەڵەی ڕێكخراوی كشتوكاڵی هەولێر چووە (بولگاریا)دوای تەواو كردنی دەورەكەی كە شەڕی ١٩٧٤ لە كوردستان بەرپا بۆوە، لە چۆمان كاك (كۆسرەت)م بینی و دوای چاك و چۆنی گوتی تۆش بە رێی ئێرانەوە لە یەكێتی سۆڤیەت گەڕایتەوە؟ گوتم نەواللە كاك كۆسرەت دایرەی ئەمنی هەولێر درەنگ لەسەر ڤیزەكەم ڕەزامەندی نیشان دا بۆ ئەوەی دابڕێم لەو سەفەرە بەڵام بۆ دەورەی سێیەم دانرام كەچی شەڕ دەستی پێكردەوە ئەوەتا لێرەدا دەمبینی، گوتی ئەو شیعرەی رەحیماوە وای كرد دایرەی ئەمنی هەولێر ئاوا مامەلەت لە گەڵدا بكات، جا چیرۆكی ئەو شیعرە لەسەر رەحیماوە بەم شێوەیە بوو:

دوای ئەوەی لە بلاْوكراوەیەكی پارتی دیموكراتی كوردستان بۆ هەموو بارەگاكانی ڕێكخستنی پارتی بلاْو كرایەوە كە بڕیار دراوە لە لایەن حوكمەتی بەعس لە بەغدا ناوی گەڕەكی رەحیماوە لە كركوك بكەن بە (حی الاندلس) هەروا لە خانەقین بۆ چاوپێكەتن لەگەڵ ئەو كەسانەی بە ئامانجی دامەزراندنیان لە كۆمپانیای نەوت لەو چاوپێكەتنانە لەگەڵ ئەو كوردانەی بە تەمای ئەوە بوونە بە كرێكار دامەزرێن لە موقابەلە كردندا لێژنەكە كە عارەب و بەعسی بوونەو بە مەزاق و گاڵتە پێكردنەوە پرسیاریان لە كوردەكان كردووە پیواز چەند پەلكی پێوەیە، جا بە بۆنەی ١٨/ی شوباتی ساڵرۆژی دامەزراندنی یەكێتیی قوتابانی كوردستان و

مەقەست لێدان لە شریتی کردنەوەی پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە هەولێر جەماوەرێکی زۆر لە نووسەرو رۆشنبیران و خەڵك و لێپرسراوانی حزبی و حکومی لە باخەکەی ئەو پەیمانگەیە ئامادە بوون ئاهەنگێکی گەورە ساز کرا، بۆیە کاك کۆسرەت لە چۆمان ناوی رەحیماوەی بیر هێنامەوە چونکە ئەو کات ئەویش لەو ئاهەنگە ئامادە بوو، ئەوە بوو، شەهید عەلی هەژارو شەهید کاردۆ گەلالی داوایان لێم کردم ئەو شیعرەی لەسەر رحیماوە نووسیوومە لەگەڵ ئەو شیعرەی گاڵتە پێکردن بە کرێکارانی کورد کراوە کاتی دامەزاندیان لە کۆمپانیەی نەوت لە خانەقین لەسەر شانۆ بخوێنمەوە، بەڵی شیعرم خوێندەوە لە نێو ئاپۆڕەی هاندان و چەپڵە لێدانێکی زۆرو دووبارە کردنەوەی شیعرەکان و وروژاندی جەماوەری ئامادە بوو، ئەوەش بەشێك لەو شیعرانەی خوێندمەوە:

رەحیماوە

کە ئەمجارە گەڕامەوە شاری کەرکوك
لە بازگەدا ڕایان گرتم
کارتێکیان نایە دەستم
لێی نووسرا بوو، بەڵێ کورد نیم
کە چوومە ناو گەڕەکی دەمارو خوێنم رەحیماوە
بینیم، عەگالێکی (حی الاندلس)یان لەسەر ناوە
***
کە شەو داهات
گڵۆپەکان هەر دانەگیرسان
پرسیم هەواڵ، وتیان دەمێکە شکاون

وتم ئێوه بەردەقانی منداڵەکان بشارنەوە
پیان گوتم، ئەی نازانی، کاتێ پیاوەکانی شارەکەمان
لە ستونگەکانی شەقام بەسترانەوە
لەگەڵ دەستڕێژی گوللەی سوور
گڵۆپەکان کوژانەوە؟

سەبارەت بە (خانەقین) شیعرەکە بەم شێوەیە بوو:

سەدە، سەدەی ئەتۆم و مانگی دەستکردە
سەدە، سەدەی تەکنیك و هەڵبڕینی
دوا مۆدێرنی سەر بووردە
سەدە، سەدەی بنیادنانی ساختمانی
سەر بە هەورە
سەدە، سەدەی تیژڕەوانی باڵندەی گەورە
ئاخمان لە دەست ئەم سەدەیە
بۆ نان و وەڵامی زگیش بەم شیوەیە
دەبێ ببین یە فاڵچیەك
تا بزانین پیواز چەند پەلکی پێوەیە؟

(٣٣)

له ١٩٧٢ بووم به ئەندامی یەكێتی نووسەرانی كورد، ئێواران هامشۆی بارەگای یەكێتی نووسرانی لقی هەولێرم دەكردو بەشداری چالاكیەكانی دەبووم لە كۆڕە ئەدەبی و ڤیستڤاڵو سەفەرو بۆنەكانیان، لە كۆنگرەی سێیەمی یەكێتیی نووسەران مەڵبەندی گشتی كە لە بەغدا بەسترا لە هۆڵی مستنصریە، من وەك ئەندامێكی كارا بەشدار بووم، گۆنگرەكە سێ رۆژی خایاند، ئەوەی شیاوی باسە لە كۆتایی گۆنگرەكە یادی بەخێر د. عزالدین مستەفا رەسووڵ لەبەردەم مایكرۆفۆندا فەرمووی دوو شت رادەگەێنم، یەكەم لەسەر داوەتی بەڕێز ئیحسان فوأد بەڕێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیری لە بەغدا هەموومان ئەندامانی گۆنگرە دەچینە چێشتخانەی (لوء لوء)ە لە باخچەی زورا ء شۆربایەكی دەروێشانە دەخۆین، دووەم (ئەحمەد شوكری) كە بە (دكتور شۆ) ناسراوە، بڕیارمان دا پلەی بەرز كەینەوە لە پرۆفیسۆرو ناوەكەی دەبێتە (پرۆفیشۆ) بۆیە داوای لێ دەكەین بێتە سەر شانۆ وتەیەكی هەبێت (ئەم مەسەلەیەی ئەحمەد شوكری هەر بۆ خۆشی و گاڵەتو گەپ بوو) ئەحمەد شوكری بە جدی وەریگرتبوو پیاوێكی بە تەمەن بوو بەڵام خۆش مەشرەب، هاتە سەر شانۆ هاواری دەكرد:

ئیتر بووم بە پرۆفیشۆ

ئەوەی بێتە بەر دەمم

ئەیدەمە بەر قاشۆ
شەقی دەکەم وەکو گۆ...هتد

بەڵی چووینە ئەو چێشتخانەیە کە دوو هۆڵی گەورەو ریزێکی گەورەی مێز لە پاڵ یەك دانرا بوو جیگای پێنج سەد کەسی لە خۆ دەگرت، لەبەرایی مێزەکەدا وزیری رۆشنبیری شفیق کەمالی و شەهید سالح یوسفی و جەواهیری شاعیرو شەهید علی هەژارو خوالیخۆشبوو محەمەد مەلا قادرو سەعید یحیا لێپرسراوان و ئیتر ئەدیبانی کوردو چەند ئەدیبێکی عەرەب و بیانی لەوێدا ئامادە بوون، دوای هەڵدانی چەند پێکێك مەی بوو بە ژاوەژاوی شیعر تێکگرتن لە نێوانی حەمە صدیق و محمود زامدارو مستەفا رابەر کە شیعرەکانیش بە جنێوی ئەدەبی بێ ئەدەبی تەنز بوون، دیار بوو سەیدا سالح یوسفی بە سەعید یحیای ڕاگەیاندو کاك سەعید هات گوتی سەیدا سالح دەڵێت با ئەو گەنجانە بچنە ئەو هۆڵەی دی لەوێ ئازادی خۆیان وەرگرن، ئەو شەوی شەوێك بوو لە شەوە خۆشەکانی بەغدا، لە یادم ناچێ لەگەڵ زۆربەی ئەدیبانی هەموو شارەکانی کوردستان عیراق پێکەوە بووین کە بە داخەوە ئێستا هەندێکیان کۆچی ئەبەدیان کردووەو رۆحیان شاد بێت.

لە ١٩٧٠ تا کۆتایی ١٩٧٤ کە ئازادی و ئاشتییەك هەبوو لە کوردستان شیعرو نووسین و هونەرو رۆشنبیری بە گشتی لە پەرەپێدان و بەرەو پیشکەوتن بوو کۆڕی ئەدەبی و پیوەندییەکانی نووسەران و چەندو چوونیان و چاپ بوونی گۆڤارو کتێبی تازە بە دوا داچوون و خوێندنەوەی رۆژنامەکان و رەخنەی ئاڕاستە کردنی یەکتر جار جار لە لایەن رەخنەگرو شاعیران بۆ نموونە ئەوەی بە ئەلقە دادەبەزی رەخنەی توندی مامۆستا

کەمال غەمبار لەسەر عبداالله پەشێوو هەروا وەڵامدانەوەی لە لایەن پەشێو، یان ڕەخنەی کاك ئازاد عبدالواحید لەسەر شیعرەکانی پەشێو بە هەمان توندی وەڵام دانەوەی پەشێوو بە دواداچوویی خوێنەرانیش، جگە لەوەی خوێندنەوەو بە دوا داچوونی هەموو عیراقیەك بۆ ئەو ڕەخنانەی سیاسی لە یەکترو بە تاوان کردنی یەکتر لە لایەن ڕۆژنامەی خەباتو ڕۆژنامەکانی بەعس، کە زۆر جاریش فەلەکەدین کاکەیی بە ناوی (ألف پرشەنگ) دینووسییەوە بۆ هەمان مەبەست، جا ئەو ڕۆژنامانە ڕیزیان بۆ دەگیراو بە ئاسانی دەست نەدەکەوت چ لە شارەکانی کوردستانو لە بەغداو هەموو عیراق بە گشتی بە تایبەتی ئەوانەی دژ بە بەعسو دەسەلادارەکەی بوون کە نەدەوێران نقەیەك بکەن پیان خۆش بوو کە ڕۆژنامەی خەبات پەردە لەسەر کەموکوڕیو عەیبو عارەکانی بەعس هەڵدەداتەوە ئەو بێدەنگی شکاندنە وتەیەکی (کافکا)ی ڕۆمانووسی بیر هێنامەوە کە دەڵێت: (نووسین جیا بوونەوەیە لە ڕیزی مردووەکان، گوتار هەموو کات ئی زیندووانەو بێدەنگی ئی مردووانە)

لەو شوێنانەی ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبی لێ دەفرۆشرا ئەوسا لە هەولێرچەند دانەیەك بوون بۆ نموونە (پەرتوکخانەی تأمیم) کە کوشکێك بووو لقێك بوو لە پەرتوکخانەی سۆلاڤ- لە هەولێر، لەبەر دەمی یانەی فەرمانبەران بوو خاوەنەکەی ناوی جومعە ئاکرەیی بوو یادی بە خێر، ئێواران ریزێکی زۆر لە ئەدیبانو ڕۆشنبیرو جەماوەر لەبەر دەم ئەو کوشکە دەوەستان تا ڕۆژنامەکان دەهاتن بە تایبەتی خەبات تا دەستیان بکەوێ بیخوێننەوە سەبارەت بەو چەندو چوونەی لە نێوانی پارتیو حوکمەتی بەعس لە ئارادا بوو، چالاکی هەموو ریکخراوەکان بە هەموو

چین و تویژەکانییەوە هەروا باری کۆمەلاّیەتی و نەتەوایەتی و سیاسی و ئابووری لە گەشە سەندن و بوژانەوەدا بوو.. هتد

بەندە جگە لەوەی بە توندی کاری سیاسیم دەکردو رۆڵی لێپرسراوەتیم هەبوو لە نیو پارتی، بەلاّم زۆر بە پەرۆشی شیعرو خوێدنەوەو بلاّو کردنەوەی شیعرو بابەتە ئەدەبییەکان و ئاهەنگەکان بووم و لەگەڵ پەیوەندی کردنم بە نووسەران و کۆڕو دانیشتنەکان و سەفەر کردندا، زوو زوو ئاهەنگی هونەری و نیشتمانی و ئەدەبی لە (هۆڵی گەل) هەولێر، قاعە الشعب ئەنجام دەدراو ئامادە دەبووم، چەند شوێنێك هەبوو کە لە گەل نووسەران یەکتر بگرینەوە بە تایبەتی یەکێتیی نووسەرانی کوردو یانەی فەرمانبەران لە هەولێر کە ئیستا بووە بە بازاڕی نیشتمان و هەروها یانەی مامۆستایان هەبوو لە باغی شار بوو کە ئێستا بووە بە باغی خانەنشینان و بەرامبەر یانەی فەرمانبەرانی ئەوسا، جار جاریش چایخانەی عەبۆ قاوەچی و حاجی مستیل و مەچکۆو عوسمان دەرگەلەیی هەبوو بۆ شەوانیش یانەی فەرمانبەران و مامۆستایان لەسەر مێزێك و یان زیاتر سەرمان پێکەوە دەنا، ئەوسا من وەك خۆم لەگەڵ ئەو نووسەرو برادەرە خۆشەویستانە دادەنیشتم (سەعدللاّ پەرۆش - جوهر کرمانج - سامی شۆڕش - فرید زامدار - ئەکرەم خامۆش جارجار سعدون یونس و نزار جرجیس لەسەر مێزەکەدا بوون...هتد، هەندێ شەوانیش لە ژوورێکی لاپەڕ لەگەڵ هەمان هاوڕێیان لە یانەی مامۆستایان لە باغی شاردا دادەنیشتین کۆڕێکی چەند کەسی دەڕەخسا تیایدا باس لە ئەدەب و شیعرو سیاسەت دەکرا کە عبدالخالق سەرسام و شێخ معتصم بەرزنجی و ئازاد عبدوالواحیدو مەولود ئیبراهیم لە گەڵدا بوو لە دانیشتنەکاندا بە بیرو بۆچوونە جوانەکان کۆڕەکە خۆش و بە سوود بوو تا ئاداری ساڵی

١٩٧٤، جگە لەو نووسەرانەی ناوم هیناون هەر لەو یانەی فەرمانبەراندا لەگەڵ چەندین لە نووسەران و هونەرمەندانی هەولێر ئاشنایەتیمان پەیدا کرد بوو، بۆ نموونە لەوانە (د. مارف خەزنەدار - حەمە کریم هەورامی - عەزیز گەردی - محەمەد مەنگوڕی - یوسف دەرگەلەیی - ئەحمەد شەریف - کەریم شارەزا - عەبدوللاّ پەشێو - محەمەد مەلود مەم - محمود زامدار - مدحت بیخەو - جمیل رەنجبەر - پیربال مەحمود - کاکەمەم بۆتانی - ئازاد جوندیانی - جوهەر غەمگین - هیوا سەرهەنگ.. هەتا

- هەندێك لە شەوەکان وا رێك دەکەوت بەیەکەوە لەگەڵ بەڕێزان (نازم باجەلان و مامۆستا حەسەن عوسمان دادەنیشتین لە یانەی مامۆستایان لە باغی شاردا کە هەردوو بەڕێزان ئەندامانی رێکخراوی پارتی بوون لە هەولێر هەروا لەگەڵ مامۆستا حەسەن برادەرێکی لەگەڵ بوو مامۆستای ئینگلیزی بوو ناوی ئیبراهیم بوو، ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیڵێم قسەیەکی نازم باجەلانە کە لە ١٩٦٩ لە بەندیخانەی (قصر النهایە)ی رژێمی بەعس بووەو بە هۆی لێبووردنی رێکەوتنامەی ١١ی ئادار ئازاد کراوە، جا ئەم چیرۆکە تراژیدیەی ئەو بەندیخانەیەی بۆ گێڕاینەوە بەم شێوەیە بوو (گوتی بەیانیان نازم گزار کە یەکێك بوو لەو سەردەمدا وەك جەلادێکی درندەی بەعس دەهات (تاهیر یحیا)ی سەرۆك وەزیرانی عیراقی لێکەوتوو دەهێنایە ناو حەوشەی ئەو بەندیخانەیە قصرالنهایەو ئێمەش زیندانی بووەکان لە نێوان شیشەکانی پەنجەرەکانەوە سەیرمان دەکرد بە تاهیر یحیای دەگوت لەسەر دەست بڕۆ و هاوار کە (أنا گواد بربع دینار) واتە هاوارکەو بڵێ من گەوادم بە روبعێك دینار، جا نازم گزار یەك شەقی

لێدەداو پێی دەگوت (گواد گول دینار.. دینارین ربع شنو؟) واتە گواد بڵێ دینارێك‌و دوان یەك رویع چییە؟

ئەمەش یەك لە ڕەوشت‌و کردارەکانی ڕژێم بوو، جا (نازم گزار) بەڕێوبەری ئاسایشی گشتی بوو لە حکومەتی عیراق، پلانی دارشت کۆدەتایەك ئەنجام بدات لە عیراق، سەرەتا لە فرۆدگای بەغدا کەمینی دانا بوو کە سەرۆك کۆماری عیراق ئەحمەد حەسەن بکر لە دەرەوەوەی ولات دەگەڕێتەوەو تیرۆری بکات پاشان پیلانەکەی جێبەجێ بکات بەلام سەرۆگ کۆمار سێ سەعات لە کاتی خویدا دوا کەوت بگاتە فرۆدگا، کۆدەتاکەی کەشف بووو نازم گزارو هاوەلەکانی لە سێدارە دران، ئەو کات دەنگ وا بوو گوایە خستوویانەتە نا حەوزی تیزاب.

***

کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی کە بەشی وێژەیی تیا بوو لە هەولێر بارەگاکەی نزیك دەرگای بازاڕی گەورەو لە تەنیشت چایخانەی قەرزاران کە ئەو چایخانەیە بەو ناوە ناوی ڕۆیشتووەو ئێستایش هەر بەو ناوەیەو لە لایەن پاریزگای هەولێرەوە نۆژەن کرایەوە، جا ئەو کۆمەڵەیە کە ئەو کات لە ١٩٧٣ دا هونەرمەند تەلعەت سامان سەرپەرشتی دەکردو هونەرمەندان خلیل یابەو مستەفا رابەرو تەلعەت شێخ محەمەدو صلاح شفیع‌و سەعدوالله شێخانی‌و عدنان نایلۆن لە دەستەی بەرێوەبردنی بوون، هەر هەموویان زۆر دڵسۆزو کوردپەروەر بوون، کە داوایان لە ئێمەی شاعیرانی هەولێر کرد لەوێدا ببین بە ئەندام لە بەشی وێژەیی کار بکەین بە سوپاسەوەیش بە دەنگەوەیان چووین، ئەو ناوانەی لە یادمە کە لەوێدا لە بەشی وێژەیی بووین‌و هەندێکمان لە دەستەی بەرێوە بردنی‌و چالاکیشمان هەبوو، بریتی بووین لە (فرید زامدار – سەعدوللا پەرۆش –

جەوهەر كرمانج – موحسین ئاوارە – مومتاز حەیدەری‌و تاریق جامباز – كاردۆ گەلالی – رەهبەر جەلال) داوای لێبوردنیش لەو برایانە دەكەم كە ناوەكانیان لە یادم نەماوەو لێرەدا تۆمارم نەكردوون، جا لە ١٩٧٣ گرۆپێ بووین لە شاعیرو هونەرمەندان چووینە (كۆیە) كە لەوێش كۆمەڵەی هونەرو وێژەی كوردی لێ بوو، بەڕێزان رەوانشاد حاجی مستەفا رەسوڵ كە رێكەوت وا بوو لە ١٩٨٣ بوو بە خەزوورم‌و كچەكەی ئەو هاوسەرمە هەروەها لەو پێشوازییەدا ڕوان شاد عەبدولڕەحمان ڕووتەو مامۆستا هۆشمەند هەورامی برای شەهید ئازاد هەورامی بەخێر هاتنیان كردین كە دەستەی بەڕێوەبردنی ئەو كۆمەڵەیە بوون لە كۆیەو لە شوقەیەكدا بوون، شەو لە ماڵی رەوانشاد عەبدولڕەحمان رووتە خوانێكی تەڕی كۆیانەیان بۆ ساز كردبووین، مامۆستا هۆشمەند بە گیتارەكەی‌و دەنگە بە سۆزەكەی هەموومانی مەست‌و دڵخۆش كرد، گرووپەكەی ئێمەش بریتی بووین لە (سعدالله پەرۆش – جەوهەر كرمانج – موحسین ئاوارە – مستەفا رابەر – خلیل یابە – صلاح شفیع – تەلعەت شێخ محەمەد) بۆ بەیانیش لە ئامادەیی كۆیە رەوانشاد مجید ئاسنگەر بەڕێوەبەری ئامادەییەكە پێشوازی لێ كردین‌و كۆڕێكی شیعرخوێندنەوەی لە هۆڵی قوتابخانەكەی بۆ ئاماد كردین كە لە كۆڕەكەدا ئەم شاعیرانە شیعریان خوێندەوە (مامۆستا مجید ئاسنگەر، سعدالله پەرۆش – جەوهەر كرمانج – موحسین ئاوارە – رۆستەم تاپۆ) جێگای دەستخۆشی‌و ڕەزامەندی جەماوەرو دانیشتوان بوو كە بە سەرێكی بەتاڵ ڕەوانە نەكرانەوە.

جا لە دوای نسكۆی ١٩٧٥ دا نووسەران‌و شاعیران لەو هەولێرە بە دوای پەنجەرەیەك دەگەڕاین دەنگمانی لێ هەڵبڕین هێندە دڵ پڕ بوین‌و ئازارەكانمان لە دڵ‌و سەرمانەوە هەڵدەقوڵاو دادەڕژا هەر وەكو هەموو

کوردێکی کوردپەروەرو دڵسۆز لە کوردستاندا، جا هەڵێکمان بۆ هەڵکەوت ئەندامەتیمان نویٚ بکەینەوە لەو کۆمەڵەیەدا بۆ ئەوەی چەند چالاکییەك ئەنجام دەین، ئێستایش پسولەی (وەصل)ی ئەو بەشدار بوونەم ماوە کە مانگانە داومانەتە کۆمەڵەکە بەم شێوەیە بوو (١٩٧٦/ ٢٥٠ فلس -١٩٧٧ /٥٠٠ فلس - ١٩٧٨ /٥٠٠ فلس واتە مانگانە) ئەگەر باسی یەکێك لەو چالاکیانەش بکەم: ئەوە بوو لەبەرواری گەلاوێژی / ١٩٧٦ کۆمەڵەی ناوبراو ئاگاداری کردینەوە کە بەیانی سەعات شەش ترومبێلێك هەژدە نەفەری (نێرن) لە پێش بارەگای کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی دەوەستیٚ بۆ ئەوەی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لە هونەرمەندانو ئەدیبان ئەوانەی ئارەزوویان هەیە گەشتێك دەکەین تا دەربەند ڕایاتو شەو دەگەڕینەوە بۆ هەولێر، ئەوەی ڕاستی بێت پاشخانو باکگڕاوندی سەفەرەکە بە تەکبیری پێشینە بوو بۆ ئەوەی ڕۆحی بەرخودانو خۆشەویستی نێوان دڵسۆزان بە هێزو خۆڕاگرتر بکەینو بۆ ماوەیەکیش دەردە دڵو ناخۆشییەکانمان بڕوێنینەوە ئیتر ئەو ناوانەی لە یادم ماوە کە پێکەوە بووین لەو سەفەرە، ئەگەرچی ڕەنگە هەموویانم لە یاد نەبیٚ بریتی بووین لە: (نووسەرانو هەنەرمەندان، رەوان شاد محەمەد جەزا - ڕزگار خۆشناو - رەنجبەر خۆشناو - شێرزاد سەرسپی - ئەکرم خامۆش - خلیل یابە - مامۆستا چەتۆ حەسەن - رەهبەر جەلال - سعدالله پەرۆش - جوهەر کرمانج - موحسین ئاوارە - فرید زامدار - مەولود ئیبراهیم - زاهیر جۆخین) هەڵبەتە لە هەولێرەوە بە گۆرانیو سروودو چەپڵە ڕێزانو سەمای چۆلەکەیەکی سەر براو، رۆیشتین ناوە ناوە لێرەو لەویٚ دەوەستاین تا گەیشتینە دەربەند ڕایات لەویٚ نان خوراو لە پاڵ دەمەتەقەو ژەنینی مۆسیقاو جار جار گۆرانی، لە گەڕانەوەدا دەمەو

ئێوارە لاماندایە لای مستەفا رابەر کە بەڕێوەبەری پۆلیسی چۆمان بوو، دوای چا خواردنەوەیەك، مستەفا چووە دەرەوەو هاتەوە، تومەز ئاگاداری پۆلیسی خۆی کردووە بێتە ژوورو بڵێت کامەتان محەمەد جەزایە، جا پۆلیسەکە هاتووو محەمەد جەزای لەگەڵ خۆی بردو خستییە نێو بەندیخانەکەی بەڕێوەبەرایەتیەکەی پۆلیس و دەرگای بە سەردا قفڵ داو محەمەد جەزا لە پشت شیشەکان وەستا بوو، مستەفا رابەر ئێمەی بانگ کرد گوتی وەرن سەیری کەن، پۆلیس فەرمانی پێ کراوە، چ بزانێ ئەوانە شەڕە جنێویان هەی برادەرن، محەمەد جەزا رووی لە مستەفا رابەر کرد بوو دەیگوت وەرە هەی گەواد بە پۆلیسەکە بڵێ ئەو قفڵە بکاتەوە، مستەفایش دەیگوت بڕوانن جەماعەت هەتا نەڵێ من گەوادم فەرمان بە پۆلیسەکە ناکەم دەرگای لێ بکاتەوە، تا ماوەیەکیش ئەو دەمەتەقەیە بە خۆشی رۆیشت، ئنجا گەڕاینەوە تا گەیشتینە مەسیف سەلاحەدین (پیرمام)، پاش مەغریب بوو لە ئوتیل پیرمام لە باخەکەی دەرەوەدا دانیشتین بۆ نان خواردن، دەوروبەرمان چەندین مێزی تری لێ بوو زیاتر خاوخێزان و خەڵکی دی لێ بوون، کە بینیان محەمەد جەزاو ئامێری مۆسیقا و هونەرمەندان و نووسەرانن، یەکێك هات ڕانکۆ چۆغەیەکی لەبەر بوو پێدەچوو تێرو پڕو دەوڵەمەند بێ، گوتی هەرچی لێرەدا دەخۆن و دەخۆنەوە ئێوە داوەتی منن، ئەگەر گۆرانیەکی خۆشیشتان گوت ئەوە مەمنوونین، بەڵێ شەو داهات و مۆسیقا لێدرا گۆرانی خۆش خۆش گوترا، دەوروبەریش جار جار بە چەپڵەو هەر بژیت، دڵخۆش ببوون، ئیتر شەو درەنگ هاتینەوە ماڵەکانمان لە هەولێر، ئەمەش بیرەوەریەکی تر.

(٣٤)

وەك لە پێشدا باسم كردووە لە دوای ڕێكەوتنامەی ١١ی ئادار كە دەسكەوتێكی مێژووی بوو بۆ كوردستانو گڕو تینو خۆ ڕێكخستنەوەو پێشكەوتنو بنیاتنانو ناساندنی كورد بە جیهانو برەوی پەیوەندیەكانو ژیانێكی تازەتر بۆ كورد دەستەبەر بوو لە زۆر ڕووەوە لە لانی سیاسیو ئابووریو كۆمەڵایەتیو كەلتوری هەروا بناغەو كۆڵەگەیەك بوو بۆ مافە ڕەواكانی ئایندەیش، بەندە لە ١٩٧٣ كە لە ناوچەی پارتی كارم دەكردو متفرغ بووم بۆ كاری سیاسیو نقابی لە مانگی ت ١ /ی ١٩٧٣ دوو كچی دەرچووی ئامادەیی كە ناسیاوو دراوسێمان بوون هاتنە لامو پێیان گوتم تۆ بە پێی شوێنگەی كاری حزبیو ناسینی لێپرسراوانی پارتی، دەمانەوێ كارێكمان بۆ بكەی ئەویش ئەوەیە ئێمە نزیكەی تا ئاستی پەنجا كچ ئیمزامان كۆ كردۆتەوە كە لە دەرچوانی ئامادەیین لەبەرئەوەی زۆربەمان لە خانەوادەی هەژارین یا لەبەر باری كۆمەڵایەتی ڕێگامان پێنەدراوە بچینە بەغداو موصل بۆ ئەوەی لە كۆلێژو پەیمانگاكان بخوێنین، لە هەولێریش نەك كولێژێك نییە بگرە هیچ پەیمانگەیەكیش هەر نییە تا بەردەوامی بە خوێندنەكەمان بدەین، ئامادەین ژمارەیەكی زۆر بێین بە كۆ قسە لەگەڵ هەر لێپرسراوێكی باڵا بكەین لەم بارەیەوە، گوتم من بۆتان ئەو كارە دەڕخسێنم چونكە متمانەم بە خۆم هەبوو داواكانم لە لای لێپرسراوان بایەخی پێ دەدرێت، بۆیە بۆ ڕۆژی پاشتر سكاڵانامەی ئیمزا كراوی ٣٢ لەو قوتابییە كچانەی دەرچووانی ئامادەیی لەسەر بوو،

نیشانی بەڕێز (عەلی رەسولّ)م دا کە لێپرسراوی ناوچەی پارتی بوو لە هەولێر، ئەویش پێی باش بوو جا نووسراوێکمان بۆ لقی ۲ /ی پارتی کرد کە هەر خۆم چاپم کرد چونکە ئەو کارەشم لە ناوچەدا دەکرد هەر نووسراوەیەکی نهێنی هەبووایە من چاپم دەکرد، ئیتر بەڕێز عەلی رەسولّ نووسراوەکەی ئیمزا کردووو رۆژی دواتر لەگەلّ سێ لەو کچانە چوومە لقی ۲ چاومان بە بەڕێز عەلی هەژار کەوت ئەندامی لق بوو نووسراوەکەی ناوچەو بە هاوپێچراوی داواکەی کچەکانمان دایە دەست عەلی هەژارو کچەکانیش ناوەڕۆکی داواکەیان روونکردەوە، ئەویش گوتی داواکەتان رەوایە کتابێك بۆ مەکتەبی سیاسی دەکەین با کاك موحسین هەر خۆی بیبات و وەلاٌمیشمان بۆ بهێنێتەوە، ئیتر هەر وا کەوتەوە نووسراوی لقی ۲ پارتی بردمە ناوپردان بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان کە دیسانەوە بەڕێز دکتۆر مەحموود عوسمان لەوێ بوو ئەمجارە منی ناسییەوە دوای چاك و چۆنی گوتی ها تەسریح بوونەکەت لە عەسکەری سەری گرت؟، گوتم زۆر سوپاس دوای نووسراوەکەی بەڕێزت بۆ بەغداو سەیدا سالّح یوسفی بە لێژنەی سەلامی راگەیاندو بریارێکی تایبەت بۆ کەسانی وەك منو هی دی کە مابووینەوە دەرچووو تەسریح بووین، دواتر نووسراوی لقی ۲ /ی پارتیم دایە دەستی خوێندییەوە، گوتی داوایەکی رەوایە، جا نووسراوێك بۆ بەڕێز سالّح یوسفی وەزیری دەولەت دەنووسم، ئەگەر شارەزای بەغدا بی و لە خۆت رادەبینی هەر خۆت بیبە بەغدا سێ نوێنەریش لە کچەکان ئەگەر هاتن بیانبەو برۆ بۆ لقی ٥ /ی پارتی لەوێ بتبەن بۆ لای سەیدا سالّح دلّنیام کارەکەیان جێبەجێ دەبێت، گوتم کاکە دکتۆر من زۆر باش بە عەرەبی قسە دەکەم بە دەیان جاریش چوومەتە بەغدا زۆر شارەزام، لەوێش لە لقی ٥ بەڕێزان کاك عەبدولرەحمان گۆمەشینی و نەوزاد محەمەد عەلی موختار هاوڕێ و

ناسیاومن، بانگی پێشمەرگەیەکی کرد لەبەر دەرگا بوو سمێلێکی قەبەی تا بنا گوێی گرتبوو ناوی بروسك بوو، گوتی هەر ئێستا ئەم نووسراوە چاپ کەن، پسولەیەکی دامێ گوتی برۆ لە بەشی دارایی ئەو پارەیەش وەرگرە بۆ مەسرەفی خۆت و بە زیادەوە نووسیوومە، پیاسەیك بکەو وەرەوە ئێرەو نووسراوەکەشت ئامادە دەبێت، بەڵێ هەر لە دارایی مەکتەبی سیاسی لە ناوپردان مەبلەغێکی باش بوو وەرم گرت و لە پرسگەی ئەوێش نووسراوم وەرگرت بۆ بەڕێز سالح یوسفی نووسیبووی، گەڕامەوە لقی٢ گوتم خۆم ئەو نووسراوەی مەکتەبی سیاسی دەبەم بۆ بەغداو رەنگە نوێنەری ئەو قوتابیانەش لەگەڵ خۆمدا بیانبەم بۆ ئەوێ، جا پەیوەندیم بەو دوو کچە ناسیاوانەی خۆم کرد، گوتیان وەڵامت دەدەینەوە ئێمەش دێین لەگەڵ تۆ بۆ بەغدا، دوای دوو رۆژ وەستام گوتیان ئێمە زیاتر لە ١٢ کچین ئامادەم بێین بەڵکۆ فشارێکی ئەوتۆ دروست بکەین و کارەکەمان جێبەجێ بێت، وادەکەیان هێنایە جێ، ئەوسا سیارەی نێرن هەبوو بە کرێمان گرت و هەر لە گەڵماندا بێت بۆ بەغداو گەڕانەوەش، کرێیی سیارەی نێرنەکەو سوکە مەسرەفێکیشم لە دارایی لقی ٢ وەرگرت و بەرەو بەغدا بەرێ کەوتین و لێپرسراوەتی دوانزە کچم لە ئەستۆ دایە خوا روحمم پێ بکات، ئێوارە لە ئوتێل اربیل دابەزین، خاوەنەکەی کورد بووو خەڵکی شەقلاوە بوو زۆریان خزمەت کردین و نیوەی کرێی ئوتیلی وەرگرت گوتی با نیوەی کرێی دیاری من بێت بۆ ئەو گرۆپە، بەیانی چووینە لقی ٥ /ی پارتی هەر لە بەغدا، بە ژوور لق کەوتین و ئیتر بەخێر هاتنی گەرم و گوڕیان لێ کردین، گوتم دەمەوێ بەڕێزان عەبدولڕەحمان گۆمەشینی و نەوزاد محەمەد عەلی موختار ببینم، بەڵێ هەردوکیان لەوێ بوون و کتابەکەی مەکتەبی سیاسی پارتیم نیشان دان کە بۆ سەید سالح یوسفی نووسراوە، گوتیان زۆر باشە بانگی ئەندامێکی

لقیان کرد لەوێ بوو ناوی (مونزر نەقشبەندی) بوو پیان گوت تا زووە تاخیر نەبن لە گەڵیاندا برۆ بۆ لای جەنابی وەزیری دەولەت ساڵح یوسفی، هەر بە هەمان سیارەی نێرن رۆیشتین، ئەوەی لە بیرم ماوە بەڕێوەبەری مەکتەبی جەنابی وەزیر برای عبدالوهاب ئەتروشی بوو، جا بەڕێوەبەری مەکتەب لەگەڵ مونزر نەقشبەندیو بەندە چوینە لای ساڵح یوسفی، نووسراوەکەی مەکتەبی سیاسیم دایێ وتم دوانز قوتابی کچیش کە داواکەیان هەیە لەگەڵ مندا هاتوون، گوتی سێ کەسیان بێن ئەوانی دی چاوەڕوان بن، نووسراوەکەی خوێندەوەو گوێی لە قسەکانی کچەکان گرتو باسی وەزعی خویان کرد، گوتی ئاسانە کارەکەتان چێ دەبێت ئینشاالله، دەستی دایە تەلەفۆنو گوتی ست (سعاد) وەزیری تعلیم عالی بۆم وەرگرن، هەر کە بۆی وەرگیرا لە پێش ئێمە بە عارەبی وەزعەکەی قوتابیانی هەولێرو شارەکانی کوردستانی تێگەیاندو گوتی هەر نا جارێ پەیمانگەیەکی پێگەیاندنی مامۆستایانیان بۆ بکرێتەوە، دیار بوو وەڵامی وەزیری تعلیمی عالی ئۆکەی بوو گوتبووی (سار)، بە دڵ خۆشی گەڕاینەوە لقی ٥.. نیوەڕۆ بوو دوای داوەت کردنمان لە لایەن هەڤاڵانی لقی ٥و سەرف کردنی برێك پارە بۆ گرۆپەکەو بۆ ڕۆژی پاشتر گەڕاینەوە هەولێر دوای چەند مانگێك ئەو پەیمانگەیەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە هەولێر ئەگەر لە یادم مابێ لە ت١ /١٩٧٤ دەست بە کار بوو. ئەوەی ڕاستی بێت مامۆستا شێخ خالص بەرزنجی ڕۆڵێکی باشی بینی بۆ بە دوا داچوونو جێبەجێ کردنی کارەکانی هاتنە کایەی ئەو پەیمانگەیەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە هەولێر.

(٣٥)

هەر لە دوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئادارەوە تا ١٩٧٤، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا چالاك بووم لە کاری حزبایەتی لە پارتی دیموکراتی کوردستان لە پاڵ نووسین و کاری ئەدەبی، بەو پێیەی لە شیعر نووسین و بلاّوکردنەوە بەردەوام بووم، جا کاری حزبایەتیم تەڕترو ئاوێتە بوو بە ڕۆشنبیریەکی فراوانتر جیاواز لە ئاستی کادیرانی ئاسایی بۆیە هەر زوو پلەی حزبیم لەبەرەو بەرز بوونەوەدا بوو، ئەوەتا (تاگوور) دەڵێت: (تەنانەت چۆلەکەکانیش ناتوانن لەسەر داری وشك بوو بخوێنن) لە نێوانی ئەو چوار ساڵەدا حزبایەتی یان بڵێین پارتی و پارتایەتی زیاتر جەماوەری بوو لەوەی حزبێکی بتەوو دیسپلین ئامێز بێت چونکە خەڵکانێکی زۆرو بۆری بەرژەوەند خوازی تێکەوت و مافی کەسانی بە بڕوا و تێکۆشەرانی خوارد بۆ نموونە لە ١٩٧٣ بەندە کارگێڕی ڕێکخراوی خەبات بووم لە ناوچەی هەولێر، کەسێك بە ماڵ و وەزیفەوە گواسترابۆوە بۆ هەولێر، کورد بوو، بۆ لای منیان نارد کە پسولەی گواستنەوەی لە لقی پ. د.ك دهۆکی بۆ کرا بوو بۆ ئەوەی لە لای خۆمان لە شانەیەکا جێگیری کەین و بەردەوامی بە کاری ڕێکخستنی خۆی بدات لە هەولێر، لە نووسراوەکەیدا پلەی حزبی نووسرا بوو کە پالێوراوە، منیش ویستم پرسیاری لێ بکەم بزانم ئاستی ڕۆشنبیری تا چ ئاستێکە؟ پێم گوت تۆ پلەی حزبیت چییە؟ گوتی پلە یانی چی؟ گوتم یانی دەرەجەی حزبایەتیت چییە؟ گوتی نازانم چۆن،

گوتم لە حزب دەرجات هەیە وەك دۆست، لایەنگیر، پالێوراو، ئەندام...هەتا، هەر وەك لە عەسکەری دەرەجەی جندی، نائب عریف، عریف... هەتا، گوتی ئیٚ من بنووسە عریف، گرژیمەوە لە دڵی خۆمدا گوتم هێنای، راست وایە پالێوراو لە حزبو عەریف لە عەسکەری وەکو یەکن... بە بەڕێز عەلی رەسوڵم گووت کە لێپرسراوی ناوچە بوو، ئەوەیە رێکخستنی ناو پارتی، نووسراویان بۆ ئەو پیاوە کردووە کە حزبیەو بە پالێوراو نووسراوە نازانی پلەی حزبی مانای چییە، ئیتر بەم شێوەیە رێکخستن شێوابوو لەو سەردەمدا، ئەگەرچی پارتی زۆر فراوانو گەورەش ببوو چونکە زیاتر بە لای جەماوری داشکا بۆوە نەك رێکخستنێکی بتەو.

ئەو مەسەلەیەی عریفو نائیب عریف، بابەتێکی خۆشی بیر هێنامەوە: جارێکیان لەگەڵ زۆر بەڕیز (محەمەد صۆفی) باوکی پارێزەر سەردار صوفی بەزاز، کە کادیرێکی پێشکەوتووی پارتی بووو متفرغ بوو بۆ ناوچەی هەولێر، چووینە ناو فیتەران بە مەبەستی چاکردنی کەمو کوڕی ئەو ئۆتۆمبێلەی جۆری جێب کە بۆ ناوچە تەرخان کرا بوو، لەوێدا لەبەر دەمی دوکانێکی فیتەرێکدا کوڕێکی گەنج ناو لەپی رەش دەچۆوە، هەر کە چاوی بە من کەوت وتی خارە ئەوە تۆی، هاوین بوو منیش کراسێکی سپیم لەبەر بوو، هێندە بە پڕ تاوی هاتو بیری لەوە نەکردەوە دەستی بسڕتەوە لەگەڵ قۆڵی گرتمو گوتی ئای خارە چۆنی، ئەوە چ دەکەی لێرانە، وەختێك دەستی لە قۆڵم کردەوە، چوار خەتی جوانی چوار پەنجەکەی دەرچوو بوو، وتم خارەی چی من هێشتا سەربازیم نەکردووە ئەو منت کرد بە رئیس عورفا چوار خەتت دامیٚ، ئەو خزمەم هێندە شەرمەزار بوو، نەیدەزانی چ بڵێتو چۆن داوای لێبوردن بکات. پێم گوت

گوێیی مەدەرێ، تۆ هێندە بە پەرۆشی وخۆشەویستییەوە بۆم هاتی لە بیرت چوو دەستت بسرِیەوە، گوتی واللە دەق وا بوو.

***

هەر وەك (پەرمۆدا بەتری) دەڵێت: (كەشتیەكان زۆربەی كات لە كەنارو لەنگەرگەدا وەستاون، بەلاّم لە راسیتیدا بۆ وەستان دروست نەكراون) بڕوام بەم وتەیە هەبووەو هەیە بۆیە من وەك مرۆڤێك هەر لە تەمەنی هەرزەكارییەوە تا ئێستاش لە كار كردن نەوەستاوم بۆ گەیشتن بە ویستو ئارەزووەكانم ئەگەرچی هەر هەمووشیان بۆم نایەتە دی بەلاّم كۆڵم نەداوە، ئیتر جگە لە كاری سیاسی، ئەدەب بە گشتیو شیعر بە تایبەتی سەر مەشقی یەكێك لە كارە بنەڕتییەكانم بووە، لە ت ١ /ی ١٩٧١ كە تەمەن ١٨ ساڵاّن بوو، لە یانەی فەرمانبەرانی هەولێر دانیشتبووم لەگەڵ شاعیر فرید زامدارو جەوهەر كرمانج پیاوێكی جوان سلاّوی لێ كردینو دوای تەوقە كردن گوتی ئیشم بەو كوڕە گەنجە هەیە، مەبەستی من بوو، گوتم فەرموو، گوتی من پیربالْ محموودم، گوتم بەڵێ دەتناسم، گوتی با دوو بە دوو لەسەر مێزێكی دی بۆ ماوەیەك دانیشین، گوتم فەرموو با بچین، دانیشتین، هەر زوو پێم گوت تۆ زیاتر لەو هۆڵەی تر لەو تەنیشتەمانەوە لەگەڵ محەمەد مەولود مەمو د. مارف خەزنەدارو كەریم شارەزاو عەبدوللاّ پەشێوو عەزیز گەردیو حمە كەریم هەورامی دادەنیشی، گوتی بەڵێ وایە ئێمە تا دنیا تاریك دادێو كاتێ خواردنەوەی مەی لەو یانەیە دادەنیشین دوای ئەوە هەندێكمان بەرەو ماڵەكانمان دەبینەوە ئەوەی حەزی لە خواردنەوەش بێت ئەوە دەمینێتەوە، دواتر گوتی من چەند وێنەو كۆپلە شیعرەكانی تۆم خوێندۆتەوە پێم جوان بوونە، ئێمە لە شارەوانی هەولێر گۆڤارێكمان هەیە كە منو محەمەد

مەولود مەم سەرپەرشتی لایەنی ئەدەبەکەی دەکەین بۆیە داوات لێ دەکەم شیعرێکم بۆ بهێنی لەو گۆڤارە بلاوی بکەینەوە، گوتم بە سوپاسەوە بۆت دەهێنم، ئەوەبوو لەو (گۆڤاری هەولێر ژمارە / ٢و ٤)ی ١٩٧١ بلاوکرایەوە، کە من لە / مانگی ئاب/ی ١٩٦٩ کە لە هیران نووسیبووم ئەمەش شیعرەکەیە:

(بۆی گێڕامەوە)

لاوێ بووم

ڕۆژێ قۆڵبەست کرام

وەك لاپەڕەی پەڕاو لوول درام

کاتێ خۆم دی، ڕاستە بە ئاگام

بەڵام ئەوە منم.. منی هێور

بێ هیچ تاوانێك دەنێو گەردەلوولی گڕ؟!!

دەمسوتێنێ.. ڕەشم دەکات

– بە گوێمدا ڕەتبوو، وتیان

ئەوەتە سوتانیان

لەبەرخۆوە سوتاو؟

هاوارم کرد ئاو.. ئاو.. ئاو

بەدیم کرد خوشکەکەم قیژانی

ئای براکەم

براکەم

براکەم

کوانێ.. کوانێ

به هەڵکروزاوی، بەو بێ ڕەنگی بۆما
لەسەر حاڵی خۆما
چاوم پێی کەوت
لە ئاگرەکەدا زیاتر بووە نەوت
بۆ کوڵنەدانم
بۆ پێداگرتنم لەسەر بیرو باوەڕەکانم

-هەر چەندە ئەم شیعرەم لەو قۆناغداو بە کەم ئەزموونیمەوە ڕەنگە کەمو کوڕی تیا بێت بەڵام لە دوای ئەو شیعرەم (سروودی پێشمەرگە) بە سەرەتاکانی نووسینەوەی شیعرەکانم دادەنێم، لەو ساڵانەی دواییانمدا کە لە کۆڕێكو دووانو زیاتر دوای خوێندنەوەی شیعرەکانم قسەی لەسەر کراوە، بۆ نموونە لە لایەن بەڕێزان عباس عەبدوللاّ یوسفو دکتۆر عادل گەرمیانی زیاتر ڕژد بوون لەسەر بۆچوونەکانیان کە گوایە زۆربەی شیعرەکانم چیرۆك ئامێزین، ئەو شیعرەی سەرەوەیش لەو قۆناغیش کە هی سەرەتاکانم بووە، سەیر دەکەم وەك شیعرێکی چیرۆك ئامێزە، مانای وایە ئەم هەستە هەبووەی منو داڕشتنەکەم دیارە لە بنەڕەتدا هەمان حاڵەتی تایبەت بە سایکۆلۆژیەتی منو نووسینەوەم بە ناهۆشیاری (لا وعی)وەیە.

هەڵبەتە شاعیر کە تێپەڕ دەبێ بە نێو دەهالیزەکانی ژیانو وێستگەکانی هەمە جۆر، دەبینێ، گوێ دەگرێ، بۆن دەکا، لە ڕێگای هەستەوەش تا ئاستی هەستی شەشەمەوەو پاراسیکۆلۆژی کاریگەری دەوروبەر، ئەزموون پەیدا دەکاو شیعرەکانیشی لە ڕەحمی ئەو ئەزموونانەوە سەرچاوە دەگرێ، جا منێك لە نێو ڕووداوەکانو

گۆڕانکاریەکاندا چ بە بیستن و بینین و بۆنکردن کە ڕاستەوخۆ بەشداریم تیایدا هەبووەو ئاساواری بە شیعرەکانمەوە دیار نەبی و بە بۆنی نەکەوتبن بۆ نوێبوونەوەو بەرەو پێشەوە چوونیان دیارە تەجربەیەکی ناوێزەیە، چونکە بڕوام بەوە هەیە لە داڕشتنی خۆڕسکەوە یان وڕینەوە وەك بابەتێکی دەڵەمەو خاوو خامە، ئیتر بە ئیشکردن و چڕ کردنەوەی بۆ باری لانی دووەم لایەنی تەکنیکی و هەونەری بەرەو داهێنان بردنی دەبات.

(٣٦)

قسـەم لەسـەر ئـەو قۆناغەیـە کـە لـە دوای ڕێکەوتنامـەی ١١ی ئـاداری ١٩٧٠ دەست پێدەکا تا ئاداری ١٩٧٤، چوار ساڵ بۆ منو هەموو کوردێك هەم سەردەمێکی هەنگوینیو هـەم ژەهـراوی بـوو، وەك ئـەو پەنـدەی ڕۆژێ لەسەر زینو ڕۆژێ زین لەسەر پشت، لـەم ڕاکیش ڕاکێشـەی گوریسـی ئـەو چوار ساڵەدا لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ گوریس پسا و شەڕ لە نێوانی ڕژێمی بـەعسو سـەرکردایەتی کـوردو پێشـمەرگەو کـوردی کوردسـتانی عـێراق دەستی پێکردەوەو ڕژێمی بەعس بە مۆدێرنترین چەکی قوڕسو فڕۆکـەی مێكو تۆپۆلیڤو سۆخۆی ڕووسی هێرشی بێ بەزەییانەی ئەنجام دەدا کە لـە ئەلقـەی دواتـر بـە دوورو درێـژی بـاس لـەو سـاڵە شـەڕاوییە دەکـەم لـە ١٩٧٤ تا ١٩٧٥ تـا نسـکۆی شۆڕشـی ئـەیلول دوای ڕێکەوتنـە شـوومەکەی جەزایر لە ٦/ی ئاداری ١٩٧٥ دا کە ڕێکەوتنەکەیش کۆدەتایـەکی دی بـوو لەسـەر کـورد بـە ئیمـزای صـدام حوسـێنو شـای ئێـرانو سـەرۆك ڕژێمـی جەزایر هاواری بۆمیدیان، کە نسکۆی شۆڕشی ئەیلولی لێکەوتەوە.

– لە دایرەی پـەروەردی هـەولێر فەرمانبـەر بووم، بـەڵام متفـرغ بـووم بـۆ کارو باری حزبی لە ناوچەی پارتی لە هـەولێر دەوامـم دەکـرد هـەروەها لـە ئێوارانیشــدا، لــە ڕاگــەیانی نەقابــەکانی هــەولێرو هامشــۆی یــەکێتی نووسەرانی کورد / لقی هەولێریشم دەکرد. سەبارەت بە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر کە جار جار سەردانێکم دەکرد بە تایبەتی کاتی موچە

وەرگرتنکە جا بیناکەی لە تەنیشت سینەمای صلاح الدین بوو، خۆشترین گەص کە دەتوانم بلێم هەر ئەو گەصە هەبوو لە هەولێر لەبەر دەمی سینەماکە ئەویش (گەصی مام ئەلیاس) بوو، کە دەبووە سەعات ۱۰ بە دواوە بە هەموو موراجعەکانی پەروەردە بە (نێرو مێ) یەوە لەگەڵ کارمەندانی ئەو دایرەیە لەبەرامبەر مام ئەلیاس و گەصەکەی دەوەستان تا لفەکەی خۆیان وەردەگرت.

لە نێوەندی ئەو چوار ساڵەدا کە بەیانیان لە ناوچەی پارتی لە هەولێر دەوامم دەکرد هەندێ جاران وا رێکدەکەوت نێوەڕۆیان لەگەڵ بەڕێز عەلی رەسوڵ و چەندێك لە ئەندامانی ناوچە دەچووینە چێشتخانەی بەیان (فجر) کە بەرامبەر باغی نیشتمانی ئێستا بوو، واتە بەرامبەر گەراجی جەلال خەلیل و چایخانەی عەبۆ قاوەچی ئەوسا کە لە تەنیشت چێشتخانەکەش گەراجێك هەبوو بۆ وەستاندنی ترومبێلان جا لە کۆی شاری هەولێردا یەك ناوچە هەبوو، جێبێکی لاندرۆڤری لە خزمەتدا بوو، ئەوەی مەبەستمە بیلێم رۆژێکیان لەگەڵ بەڕێز کاك عەلی رەسووڵ لێپرسراوی ناوچەو قادرحمشین کە سەرۆکی نەقابەکانی کرێکارانی هەولێرو لەگەڵ بەڕێزان ئەندامانی ناوچە (مامۆستا صەبری و قانع و سەلیم ئاغۆك) بەو جێبەی ناوچە چوینە نێو گەراجی تەنیشت چێشتخانەی (بەیان - فجر) بۆ ئەوەی نانی نێوەڕۆ لەو چیچشتخانەیە بخۆین.. دوای ئەوەی لە جێبەکە دابەزین، یەك دوو ژنە سوالکەری دۆم پێشیان لێ گرتین یەکێك لە ژنەکان کە منداڵێکی ساوای لە باوەش گرتبوو رووی لە من کردو گوتی (خاڵە بە قوربانی ئەو سمێڵەت بم خێرەکم پێ بکە خوا بتپارێزێ) ئەو هەڤاڵانەی لە گەڵیاندا بووم دایانە قاقای پێکەنین، رووم لە ژنەکە کردوو وتم دەزانی ئەوانە بۆ پێکدەکەنن؟

یەکەم من بە تەمەن و قەلافەت لە هەموویان بچووکترم تۆش رووت لە من کردووە پێم دەڵێت خاڵە، دووەم ئەو زەلامانە هەر یەکێکیان قامکێك سمێڵیان پێوەیە خۆ تەنیا من سمێلم نییەو تراشیومە بە من دەڵێت خاڵە قوربانی ئەو سمێڵەت بم خێرێکم پێ بکە، بەڵێ ئێستایش لەگەڵ دابێ ئەو هەڤالانەی بە ژیانەوەن کە دەگەینە یەك و چاك و چۆنیەك دەکەین بە پێکەنینەوە دەیلێینەوە (خاڵە بە قوربانی ئەو سمێڵەت بم خێرەکم پێ بکە)

لە ١٩٧٣ لە پەروەردەی هەولێر بووم بۆ ئەوەی موچەکەم وەرگرم، لەو ساڵدا مامۆستاو فەرمانبەرانی قەومی و شیوعی عەرەب و ئەوانەی لەگەڵ حزبی بەعس نەبوون لە ناوەڕاست و باشووری عیراق ژمارەیەکی زۆریان گواستبوونەوە بۆ کوردستان، دوو کوڕی گەنج لەو مامۆستایانەی عەرەب بەرەو رووی یەك هاتن دوای تەوقە کردن و یەکتر ماچ کردن کە لە نزیك ئەوانەوە وەستا بووم، لە یەکتریان پرسیار دەکرد یەکێکیان بەوەی دی گوت (انت وین؟) واتە تۆ لە کوێی؟ وەلامی وا بوو (انا بل بوّل) بوّل واتە میز بە عارەبی دیارە لە گوندی (بۆڵێ) مامۆستا بووە، ئەوەی دی بە پێکەنینەوە لێی پرسی (لعد انت وین؟) واتە تۆ لە کوێیی وەلامی وا بوو (ولك ما تشوف انا وین انا بل خره) واتە تۆ نازانی من لە کوێمە من لە ناو پیسایی دامە (خره) بە عارەبی پیسایی مەبەستیشی گوندی (خرێ) بوو.

لێیان راست هاتم زۆر باش زمانی عەرەبیم دەزانی قسەی پێ بکەم بە عارەبی پێم گوتن ئێوە شەرم لە خۆتان ناکەن نان و نمەکی ئەو دوو گوندەتان خواردووە خزمەتی ئێوەیان کردووە ناوی ئەو دوو گوندە بەو شێوەیە دەهێنن ئێستا وا بکەم لێرە قۆڵبەستتان بکەن تەمبێتان بکەن، داهاتنەوەو قۆندەرەم ماچ بکەن گوتیان بە عارەبی ناوەکان وا کەوتۆتەوە، دەنا ئێمە قوربانی هەموو گوندو کوردستان و رۆڵەکانی دەبین، ئەوەتا رژێمی بەعس ئێمەی هەڵداوەتە ئەو گوندە دوور دەستانە نازانین

چارەنووسی خۆمان و خیزانەکانمان چۆن دەبێ، هەزار جار داوای لێبووردن دەکەین مەبەستمان ئیهانەو خراپی نەبووە بەڵام ناوەکان وا رێکەوتبوون لەگەڵ زمانی عەرەبی، قورگیان پڕ گریان بوو، ئیتر وازم لێیان هێناو ڕۆیشتم.

دەگەڕێمەوە سەر باری ئەدەب بە تایبەتی شیعر کە لەو نێوەندەی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ زۆر لەم لایەنەوەش چالاکیم زۆر بوو چ بە بڵاوکردنەوەی شیعرەکانم لە گۆڤارو رۆژنامەکان، بەشداری کردنم لە کۆڕو سیمینارو ڤیستڤاڵەکان و شیعر خوێندنەوەم بە تایبەتی لە بۆنە نەتەوەیەتیەکان، لە (١٩٧٤)دا لە چوارەم کۆنفراسی لقی هەولێر خۆم هەلبژاردو دەنگم هێناو بووم بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری لقی هەولێر هەر وەك لە کۆنووسی خوالێخۆشبوو کەریم شارەزادا هاتووەو لەو گۆڤارەی بەڕێز عەبدولڕەحمان فەرهادی ئامادەی کردووە لە ژێر ناوی یەکێتیی نووسەرانی کورد لقی هەولێر لە دامەزراندنەوە تا ئێستا بەم شێوەیە نووسراوە:

–چوارەم کۆنفرانسی لقی هەولێر رۆژی ١٩٧٤/٢/١٥ لە هۆڵی یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان /لقی هەولێر بە سەرپەرشتی دادوەر عبدولقادر نوورەدین رەشید ساز دراو دەستەی تازەی بەڕێوەبردن هەڵبژێردراو لە نێو خۆیاندا کارەکانیان بەم شێوەیە دابەش کرد:

محەمەد حەسەن مەنگوڕی سەرۆك،

حەمەکەریم هەورامی جێگری سەرۆك

مومتاز حەیدەری سکرتێری کارگێڕی

ئەحمەد شەریف سکرتێری رۆشنبیری

یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی ژمێریار، مەغدید سۆران ئەندام

موحسین رەشید ئاوارە ئەندام

(٣٧)

(١٩٧٤ –١٩٧٥)

ئەمەیش قۆناغێکی دی لەبەرواری ١١ی ئاداری ١٩٧٤ جارێکی دی شەڕێکی توندو کارەساتبار ئامادە کراو لە نێوانی کورد لە کوردستانی عیراق و ڕژێمی بەعس لە عیراق دوای کۆتایی هێنان بە ڕێکەوتنی ١١ی ئادار، کە لەو بەروارەدا بە ژمارەی ملیۆنانی کورد بە هەردوو ڕەگەزییەوە بە شاخ هەڵشاخان، ئیتر شارەکانی کوردستان تا ئاستی چۆڵکردن چۆڵ کراو پێشمەرگەو چەکدارانی کورد دامەزران لە دەرەوەی شارەکانداو سەنگەرەکانیان قایم کرد، داگیرکەرانی ڕژێمیش بە سەربازو جاشەکانییەوە بە هێزێکی بێ شمارەوە بە مۆدیرنترین چەك و تفاق و زرێپۆش وتانك و تۆپ و ئاگرو ئاسنییەوە ئامادە کرا بوو بۆ ئەو شەڕە نەگریسە، بەندە لەو ڕۆژدا لەگەڵ ناوچەی پارتی لە هەولێر ڕوومان لە دەرەوەی شار کرد بە هەورازو شاخان هەڵشاخاین هەر یەکێکمان بۆ سەر کارێك کە شۆڕشی کورد پێمان دەسپێری، جا هەڤالانی ناوچەی هەولێر لەگەڵ لێپرسراوی ناوچە کاك عەلی ڕەسووڵ سواری جێبە لاندرۆڤەکەی بوون، منیش لەگەڵ حاتم باجەلان کە کارمەندی تەندروستی نشینگەی هەولێر بوو سواری لاندرۆڤێکی نوێ کرام، تازە بۆ ئەودایرە تەندروستییە هاتبوو واتە ئەسپێکی ڕەسەنی ناو دارو بەردوی نێو ڕێچکەو ڕێگاکانی شاخان دەبێت هەروا هەڤاڵ نازم باجەلانی برای حاتم کە هاوڕێم بوو

رۆژانێکی زۆر لە رێکخراوی خەبات رۆڵی هاوبەشی لێپرسراوەتیمان هەبوو ئەویش بووە سوار چاکی ئەو لاندرۆڤەرە، بە هەزاران رۆڵەی کورد بە خاوخێزان لە رێگا بوون بە پای پەتیو بە ترومبیلّ، جا هەردوو جێب لاندرۆڤەر کاتیّ گەیشتینە دێگەڵە لەوێوە بووینە پیادە بە گەرووی شاخەوە هەڵشاخایان بۆ ئەوەی باری جێبەکان قورس نەبیّ ئەوانیش هەردوو جێب رێچکەو رێگا ی تریات هەڵبژارد، ئیتر بە پای پەتی گەیشتینە سماقوڵیو جێبەکانیش گەیشتنە ئەویّ، ئەوەی شیاوی باسە کاك عەلی رسوولّ لە سماقوڵی بە حاتم باجەلانی گوت لەبەرئەوەی جێبەکەی ئێوە نوێیەو خورتە لەگەلّ تۆو حازمی براتو کاك ئاوارە، ئەو دوو بەڕێزانەش کە بە تەمەنن لەگەلّ ئێوە بن تا دەگەینە رانیەو قەلاّدزە، ئەو دوو نەفەرەش یەکێکیان کانبی ئاغا دزەیی بوو ئەو کات جێگری پارێزگای هەولێر بوو، ئەوەی دی بەڕێز موحسین قۆجە قەساب بوو، یاریدەدەری پاریزگای هەولێر بوو بۆ کار وباری ئیدارەی خۆجێی هەولێر، گرنگ چ بە پیادەیی یان بە سواری جێبەکان تا گەیشتینە قەلاّدزیّ، بەلاّم ئەو هەموو کوردە بە ژمارەی ملیۆنی بەو شاخانەوە هەورازو نشێو دەبوونەوە، هێشتا سووکە پەیوەندیو گفتوگۆیەك لە نێوانی شۆڕشی ئەیلوولو رژێمی بەعس هەبوو، هێرشی ئاسمانیو زەوی تەقەی لێوە نەهاتبوو، رژێمی بەعس لە عیراق پێدەچوو حەزی دەکرد هەموو کورد دەرچنو ببنە بارگرانی بە سەر شۆڕشی کوردو پشێویەکی زۆر بنێنەوەو ژیانو بەڕێوە بردن قورس بێت بە سەر سەرکردایەتی شۆڕشو سەریان لیّ بشێویّو ئەو خەڵکەیان پیّ کۆنترلّ نەکریّو دایانمەزرێنن، لەسەرەتادا هەر واش کەوتەوە، من لە قەلاّدزەوە خوا حافیزیم لە هەڤالاّن کرد گوتم دەچمە ناوپردان بۆ ئەمانەتی گشتی رۆشنبیریو راگەیاندنو

لای نووسەران، چونکە وای لێهات هەر یەکێکمان لەوانەی بە کۆ بە یەکەوە بووین بیر لەو شوێن وەزیفەو ئەو کارە بکاتەوە کە بۆی دەگونجێ بۆیە پەرت و بلاوەمان لێ کرد بەو پێیەی شۆڕش هەموو دام ودەزگاکانی دامەزراند لە جیاتی ناوی وەزارەت ئەمانەنی گشتی راگەیاند کە ئەمین عام و جێگرو بەڕێوەبەری گشتی و شوێنی تایبەتیان بۆ تەرخان کرا بوو لە هەموو رووێکەوە بگرە بۆ نمونە، پەروەردەو تەندروستی و دارایی و دادگاو راگەیاندن و زانکۆ.. هەتا، جگە لە سوپاو هێزی پێشمەرگەو هەموو پێداویستی و پەیوەندییەکانیان و ئامرو لێپرسراوەکانیان، بەڵێ گەیشتبوومە وەرتێ بەرەو گەلاڵە بڕۆم لە رێگادا ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراقەوە ئەم هەواڵە دڵ تەزێنەی ڕاگەیاند کە رژێمی بەعس لە ١٩٧٤/٤/٢٤ کۆمەڵکوژی ئەنجام داوە بە بەردوومانکردنی شارۆچکەی قەڵادزێ بە بۆمبای ناپاڵم، جا لە قەڵادزێ زانکۆ کرا بۆوەو قوتابیانی زانکۆ دەستیان بە خوێندن کرد بوو لە نێو چەقی قەڵادزەدا، رژێمی تاوانباریش مەبەستی بووە دەستوەشاندنێکی جەرگبڕ بوەشێنێ جا ئەوسا لەو بەروارەدا ئەو شارۆچکە جوانەی وێران کردو زۆرێك لە قوتابیانی زانکۆ بوونە قوربانی کە زۆربەیان قوتابیانی زانکۆی سەلیمانی بوون، دواتر زانرا کە لەو بۆردمانەدا (١٦٤) شەهیدو (٣٥٠) بریینداری لێ کەوتەوە، ئیتر لە هەموو بەرەکانی شەردا پێشمەرگەی کوردستان جەنگی مان و نەمانی دەکرد لەگەڵ ئەو سوپایە درندەیەی رژێم کە بە مۆدێرنترین چەکی سووك و گران و فڕۆکەکانی ئێف ٢١و سۆخوی و تۆپۆلیڤی یەکێتی سۆڤێتی ئەوسا لەبەرەنگاری و تێکشکاندنی سوپای رژێم گیانیان لەسەر دەستان دانا بووو داستانی سەرسوڕهێنەریان تۆمار دەکرد.

بەنـدە هـەر وەك لـە ئەلقـەكانى پێشـوو روونم كردبـۆوە چـۆن (فەرنسـۆ هـەريرى)م ناسـى و زۆريـش يارمـەتى دام لـە ١٩٦٩ دا كـە پەيوەنـديم بـە شـۆڕش كـرد و بووم بـە مامۆسـتاى شـۆڕش تـا رێكەوتنامـەى ١١ى ئـادار، بۆيـە بـيرم لـەوە كـردەوە بچـمە گەلاڵـەو لاى كـاك فەرنسـۆ تـا ئـەمجارەش جيگايەكم لە ناو شۆڕش بۆ تەرخان بكات و لێى دامەزرێم، ئێوارە بوو كە گەيشتمە گەلاڵەو چاوم بە كاك فەرەنسۆ كەوت، مێوانى زۆر بوون، دواى ئەوەى چايەكم خواردەوە گوتى بەخێر بێت با دوو قسانيش لەگەڵ تۆ بكەم، گوتى بە تەماى چى؟ گوتم حەز دەكەم لە نووسەران دانەبڕێم و لە بەشى ئەمانەتى رۆشنبيرى و راگەياندن كار بكەم، پێى گوتم، نا من پێم خۆشە لە بەشى ئەمانەتى بەشى زانيارى واتە پەروەردە لە لاى بەڕێز مامۆستا محەمەد ئيسماعيل دامەزرێى كە دەتناسىٚ و جێگرى ئەمين عامى بەشى زانياريەو (دكتۆر دارا) ئـەمين عامـە مـن قسـەيان لەگـەڵ دەكـەم ئاگايان لێت بىٚ، هەروەها زۆربەيان ئەوانەى لەوىٚ كار دەكەن برادەرو ناسـياوى تۆنـە، منـيش گـوتم هەميشـە يارمـەتى منـت داوە لـە قسـەت دەرناچـم، هـەر واش كەوتـەوە رۆژى پاشـتر كـە چـوومە لاى دكتـۆر دارا و مامۆستا محەمەد ئيسماعيل زۆر رێزيان لێنـام , بڕيـارى دامەزراندنيان بۆ دەر كردم، شوێنى خەوتن و حەوانەوەشمان خێوەتێك بوو لەگەڵ بەڕێزان حەمە كەريم هەورامى و عەبدولواحيد عەزيز ديبەگەيى، زۆر ئاسوودە بووم واتـە لەگـەڵ نووسـەرێك و هاوڕێيـەكى دێـرينم شـاعير لـە خێوەتێكـدا لـە ناوچەى ئازادى ڕايات لە دامێنى (زينو)دا جێگير بووم، هەر زوو متمانەم پێكرا، بووم بە رازگرى قەڵەم لە كارى رۆژانە لەگەڵ بەڕێز شێخ مەسعود بـەرزنجى هەڵەجـەيى لـە خێـوەتێكى دى كارمـان پێكـەوە دەكـرد زيـاتر خۆشحاڵ بووم لەو ئەمانە عامەيە كە شێخ عەزيز بەرزنجى براى شيخ

مەسعود زۆر هاوڕێم بوو لوێدا کارمەند بوو، هەروا بەڕێزان مامۆستا پیرۆت و کەمال /ی برای و کاك جەمال حەلاق و سەعدون/ی ئامۆزای مامۆستا پیرۆت بوون هەر وا وشیار ئەتروشی هاوڕێم و زۆری تر لەو شوێنە کارمەند بوون

(٣٨)

هەر وەك لە ئەڵقەی پێشوودا باسم کردوە دوای ئەوەی لە ئەمانە عامەی بەشی زانیاری لە ئازادی دەربەند جێگیر بووم بە پلەی رازگری قەڵەم و جێگای متمانەیان بووم، ئەمانە عامەی زانیاری ئەوسا لەوێ واتە (پەروەردە) بەلاّم بە زانیاری ناوی لێنرا بوو، دەست و دایرەو بەڕێوەبەرایەتییەکەی پێك هاتبوو لە چەندەها خێوەت، مێزو کورسی و پێداویستیەکانی تیا بوو، کارەکان بەڕێوە دەچوون و لە سەعات هەشتی بەیانییەوە تا سێیی پاش نیوەڕۆ، نانی نیوەڕۆ لەوێ دەخورا شێو لێنەرەکی رێك و پێکی هەبوو ناوی ئەنوەر بوو رۆژانە برنج و شلەو هەفتەی دوو جارانیش گۆشتی لەگەڵ بوو، بە پیتی (ئێڵ) لە ناوەڕاستی ئەو ئەمانە عامەیە قوڵت لێدرا بوو بۆ خۆ پاراستن لی هێرشی فڕۆکەی ڕژێم و رۆژانە بێ دەم و جەم بەو ناوچانە دەسوڕایەوە بە تایبەتی کاتی نێوەڕۆیان کە لەسەر نان خواردن دەبووین دەبوایە بە راکردن بچینە نێو ئەو قوڵتانەوە، ئەو شایەدیە دەدەم کە یەکێك لەوانەی کاتێ فڕۆکە دەنگی دەهات نەدەهاتە نێو ئەو قوڵاّتانەو خۆی حەشار نەدەدا پێمانی دەگوت ئێوە ڕاکەن و منیش گۆشتەکەی سەر برنجەکانتان دەخۆم ئەویش (شێرکۆی کوڕی مام هەژاری شاعیر) بوو، هەموو جارێکیش ئەو فڕۆکانە هێرشەکانیان زیاتر بۆ بەرەکانی شەڕو پێشمەرگە بوو بەلاّم لەو ناوچەیەی ئەمانە عامەکانی لێبوو بەسەر ئەو ناوچانە دەسوڕایەوە

زیاتریش ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراقی مەبەست بوو لە مەمێ خەلان‌و بۆمبابارانی بکات، بەلام جێی داخە جاریکیان زۆر بە دڕندانە لە دامێنی گەلالەدا کە چەند دوکانێکی فیتەرو وەستانی ترومبێلان‌و خەلکێکی زۆری لێ بوو، بۆمباکانی بە سەر ئەو شوێنەدا داباراند بە دەیان گەنج‌و پێشمەرگەو خەلکی لە خوێن گەوزاندو شەهید بوون، جا لەو ماوەیەدا فڕۆکەیەکی میگ ٢١ بەر دۆشکەی پێشمەرگە کەوت کەوتە خوارەوە هەر لە ناوچەی بالەکایەتی‌و فڕۆکەوانەکەش بە زیندووی دەستگیر کرا ناوی (سەفاح شەلال) بوو، هەندێك قەرەبووی زامەکانی قوربانیەکانی بۆ کردینەوە، ڕێکەوتیش وا بوو ڕۆژێکیان چووم لای هاوەلی هاو خەباتم ئیسماعیل حوسێن کە لە گوندی خەلان بووبە خاو خێزانەوە دوای نان خواردنی نیوەڕۆ، گوتی با بچینە بەندیخانەی خەلان لەوێ دوو کەست نیشان دەدەم‌و قسەیان لە گەلدا بکە، گوتم خۆ لێپرسراوی ئەو بەندیخانەیەش دەناسم کاك خالد ئاشگەیی چونکە ماوەیەك ئامۆزایەکی باوکم سادق ئۆمەر کە سەرپەل بوو لە دەشتی هەولێر گوایە جاشێکی بە عەزاب کوشتووە ئەوەندەی بە گۆپالان لێیداوە بە ناڕوایی لە قەلەم درا کارەکەی، لەوێ بەند کرا بوو منیش سەردانم دەکرد تا لەوێ بوو لەگەل خالد ئاشگەیی دۆستایەتییەکمان هەیە، گوتی باشتریش، کە چوینە بەندیخانەکە لەوێ کوڕێکی ڕەشتالەی گەنج زیندانی بوو هێنایان زۆر بە گەرمی تەوقەی لەگەل ئیسماعیل حوسێن کرد بە عارەبی قسەی کرد، دواتر تەوقەی لەگەل من کرد کاك ئیسماعیل گوتی ئەوە (سەفاح شەلال)ی فڕۆکەوانەکەیە کە فڕۆکەکەی پێکراو بە پەڕەشووت خۆی هەلدایە خوارەوە بە زیندووی گیرا، کاك ئیسماعیل گوتی ئەها ئەوە دیسان دەلێت تۆ بلێی نەمکوژن، زۆر دەترسێ‌و منیش

دڵم داوەتەوەو هەموو جارێك پێم گوتوە مەترسە ئێمە دیل ناكوژین ڕەنگە بە گۆڕینەوە لەگەڵ چەند دیلێكی خۆمان كە زیندانین لە لای ڕژێم بتانگۆڕنەوە، دواتر چووینە لای زیندانییەكەی دی ئەویش پیاوێكی لوبنانی بوو ناوی (جمیل محوّ) بوو زۆر شتی جوانی لە دار تاشی بوو وەكو دارجغارەو قەڵەمدانو بوكەڵە.. هتد، جمیل محوّ دارجغارەیەكی پێشكەش كردم بە نەخشو نیگارو ڕەنگاو ڕەنگ زۆر جوان بوو، گوتم من جگەرە ناكێشم گوتی بۆ یادگاری لە لات بمینیّ كەی كورد ڕزگار بوو لە ماڵی خۆتدا لە گۆشەیەكا هەڵیواسە، بە داخەوە بە نسكۆی ١٩٧٥ داكەوتین، دوای ئەوەی هەواڵی هەردوو بەند كراوم بیست، فڕۆكەوانەكە ئازاد كراو گەڕایەوە بەغدا، (جمیل محوّ)یش ئازاد كرا بوو، با بگەڕێمەوە سەر خەتو لەو ئەمانە عامەیەی لێی بووم لە لایەن ئەمین عامو جێگرەكەی زۆر متمانەیان پێم دەكردم بۆیە بۆ ماوەی پانزە ڕۆژان منیان ناردە فێرگەیەك لە پشت گوندی ناوپردان لەویّ ڕاهێنان بكەم لەسەر فێر بوونی جوفرە بۆ ئاڵ گۆڕ كردنی نامە نهێنیەكانی نێوانی ئەمین عامو جێگرەكەی لەگەڵ سەركردایەتیو دەزگاكانی سەرەوەتر، دوای تەواو بوونی دەورەكەم ئەو كارەشم بە ئەنجام دەگەیاند كە ڕاستەو خۆ پەیوەست بووم بە ئەمین عامو جێگرەكەی جوفرەكانم وەردەگرتو دەقەكەیم دەنووسییەوەو ئەگەر وەڵام دانەوەی بویستبووایە ئەوە دەمكردە جوفرەو دەنێردرا بۆ شوێنی مەبەست، دوای تەواو بوونی دەوامی نیوەڕۆیانیش بەندە لەگەڵ نووسەر حەمە كەریم هەورامیو شاعیرو نووسەر عەبدولواحید دیبەگەیی دەچووینەوە هەوراز كە خێوەتەكەی خەوتنو حەوانەوەمان لە دامێنی گوندی زینویّ بوو لەگەڵ چەند خێوەتێكی دی لەو كارمەندانەی كە زۆربەیان مامۆستای

قەتابخانەکان بوون لە شارەکانی کوردستان هاتبوونە نێو شۆڕش لە هەمان شوێنی کاردا لەگەڵ ئێمەدا بوون، جا زۆربەی ئێوارانێك هەر جارەی بە تەنیا بام یان لەگەڵ یەکێك لە هاوەڵەکانم دەچووینە گوندەکانی دەوروبەر وەك زینویێ و خەلان یان بۆ چۆمان و دەربەندی رایات و گەلاڵە.. هتد، چ بۆ کڕینی میوەو هەر پێداویستێك و هەر وا بینینی دۆست و هاوڕێیان بە تایبەتی نووسەران، جا بارەگای مەڵبەندی یەکێتی نووسەرانی کورد لە دربەندی رایات بوو، سەرۆکی نوسەران شەهید سەیدا ساڵح یوسفی بوو، شەوانیش لە دەرەوەی خێوەتەکاندا لە ناوچەی ئازادی رایات لەگەڵ دۆست و برایانی نێو ئەم خێوەت و ئەوەی دی لەسەر زەویەکی راکشاو دادەنیشتین دوای گوێگرتن لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق و دەنگوباسەکان، ئیتر بە دەم قسەو باس و شیکردنەوەی وەزعی سیاسی و چا خواردنەوە، تا کاتی خەوتن ئەو شەومان بەڕێ دەکرد، زۆرجاران هاوڕێ و نووسەران لە ئیوارانـدا سەردانیان دەکردین بۆ نموونە شاعیران نەوزاد رەفعەت و نژاد عەزیز سورمێ بە تایبەتی کاك نژاد کە تسجیل و رادیوی پێ بوو چاوپێکەوتنی لەگەڵ نووسەران دەکرد بۆ ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق زۆر مانـدوو دیار بوو کە زۆربەی شوێنەکانی کوردستانی ئازاد لە ناو شۆڕشا بە سەری دەکردەوە، خۆشترین یادەوەریم لەو خێوەتەدا کە لەگەڵ مامۆستا حەمەکەریم هەورامی و عەبدولواحید دیبەگەیی بووین کە خەوتن و نان خواردنی ئێواران و بەیانمان پێکەوە بوو، مامۆستا حەمە کەریم زۆر چوست و چالاك بوو، بەیانیان شەرمەزاری دەکردین چونکە بەر لە ئێمە زوو هەڵدەستا و ئاو رشێنی دەوروبەری خێوەتەکەی دەکرد و دەچووە زینویێ ماست و پەنیرو نانی دەکڕی و دەهاتەوەو چایەی لێدانا و ئینجا

بانگی منو عبدلواحیدی دەکرد (ئەفەندینە ئەوجا هەڵناستن) ئێمەش زۆر تەمبەڵو خەواڵو بووین کە هەڵدەستاین وەك ماسی لە بن لێفەکانمان دەر دەرهاتین تا بۆ شەوی پاشتر بخشینەوە نێو لێفەکان، مامۆستاش بەر لە هەڵستانی ئێمە یاتاغەکانی خۆی بە جوانی قەد دەکردوو بە جێی دەهێشت، بە ئێمەشی دەگوت تەمبەڵو تەوەزەلینە هەر هیچ نەبێ ئێوە شاعیرن یاتاغەکانتان قەد کەنو ئاوا جێی مەهێڵن بە وەزنو قافیە داینێن خۆ ئەوەشتان بۆ ناکەم، زۆر شەرمەزاری دەکردین بەو تەمەنەی خۆی، مامۆستا زۆر پیاوێکی دڵسۆزو پاكو کوردپەروەر بوو، دەمەو عەسرێك بوو مامۆستا حەمە کەریم ئەو قاتە خاکییەی لەبەری بوو شوشتیو گوتی با هەوراز بینەوە بچینە زینوێ لە چایخانەکەی ئەوێ ئێستا سۆپەیان داگیرساندووە بەڵکو چایەکی بە قەند دەخوینەوەو ئەو قاتە جلەشم لەبەر سۆپاکە وشك دەکەمەوە، جا بەندەو مامۆستا حەمەکەریمو عبدالواحیدو شێخ عەزیز بەرزنجی هەڵەجەییو وشیار ئەتروشی رۆیشتین، بۆ گوندی زینوێ کە لەسەر سنووری ئێران بوو، ئێواران چەندەها ولاّخی بارکراویان دادەگرت یان باریان دەکرد کە قاچاغچیانی ئەمبەرو ئەو بەری واتە کوردستانی عیراقو کوردانی رۆژهەلاّت لەوێ دەبینران لەو چایخانە گەرمو گوڕەدا ئیستراحەتیان لێ دەکردو خواردنیان دەخواردو چایەی بە قەندیان نۆش دەکرد، لە دەرەوەی چایخانەکەشدا چەندین ئاژەڵ دەبینڕان کە بار بەست دەکران یان بارەکانیان لێ دادەگرتن ئەم گوندە بۆ ئێمە دیمەنێکی ئەفسووناوی هەبوو بە تایبەتی کە کوردانی رۆژهەلاّتمان ئەدیو بە شێوەزاری ئەوێ دەدوانو قسەو خۆشەویستیو سۆزی کوردایەتی لەو نێوانەدا هەڵدەقولاّ چونکە ئەو کات هێشتا ئێرانمان نەبینیبوو، بەڵی دوای ئەوەی مامۆستا جلەکانی لەبەر سۆباکەی

چایخانەکە وشك کردەوەو گوتی با ئەو قاتەی بەرم لەو پەناگەیە داکەنمو ئەو قاتە وشکبووە خاوێنەش لەبەر دەکەم، وای کرد، ئیستراحەتێکمان کردو چایەمان نۆشیو هەڵساین بەرەو خوار بینەوە بەرەو شوێنگەکەی خۆمان، بەهارێکی تەڕ بوو، هێشتا ئەو ئەرزو مێرگانە تەڕێتی بارانی چەند ساتێکی بەر لەو کاتی هەر مابوو، کزبایەکی ساردیش دەهات، هەر بە دەم ڕێگاوە بینیمان شوانێك دوورتر لە ئێمە چەند سەرە مەڕو کارو بزنێکی داوەتە پێش خۆی بەڵام نەیبینیوە لە تەنیشت ڕێگاوە کە زەنەکێك هەبوو کارێك بەجیٚ ماوە بە سەر لا تەنیشتێکەوە کەوتووەو قاچەکانی لە هەواوە دەکوتیٚ ناتوانیٚ ڕاست ببێتەوە، مامۆستا حەمەکەریم هەورامی بەو سۆزداریەو ڕۆحە مرۆڤایەتیە جوانەی خۆیەوە کە چاوی پێکەوت، ئێمەی وەستاند گوتی وەیش ئەو کارە لە ران دابڕاوەو شوانەکە پێی نەزانیوە با راستی کەمەوەو بڕواتەوە ئەویٚ، کە هەنگاوی نا شوێنەکە زەنەك بوو مامۆستا هەڵخلیسکاو قوناو قون کوتە سەر لیتاوی زەنەك، گوتی با ئەوجا بە جوانی دانیشم قاتە جلم نەشووشتو وشکم نەکردەوە؟ دەبا بە قوربانی سۆزداریەکەی خۆم بێت، هەر چۆنیٚ بێت بە قونی قوڕو لیتاویەوە (کار)ەکەی هەڵگرتەوەو بەڕەڵڵای کردو کار رای کرد بەرەو رانو مێگەل ئەمەش ڕووداوی ئەو ڕۆژمان بوو،

مامۆستا حەمە کەریم هەورامی، لە کاتی خەوتندا دیار بوو غەریبی منداڵەکانی دەکرد، بە دەم ئاهو هەناسەی گەرمەوە دەیگوت (ڤیان گیان) ڤیان کچی بوو، ڕۆژەکیان ئێوارە هەواڵی ئەوەیان پێڕاگەیاند کە ماڵو منداڵەکانی لە لایەن ڕژێمەوە گیراونو لە دەرەوەی شار نزیك لە هێزی حمرین بەڕەڵڵایان کردوون پیان گوتوونە بڕۆنە لای خاوەنەکانتان (متمردین) لە شاخ، ئەم کارەش ڕژێم ئەنجامی دەدا تا خاوخێزانی

ئەوانــەی هاتوونەتــە نێــو شــۆڕش ســەرقاڵیان بکــات لــە هــەمان کاتــدا قورســاییەك بخەنــە ســەر شــۆڕشو باریــان گــرانتر بکــات، ئــیتر ئــەوە بــوو خێــزانو منداڵــەکانی گەیشــتنە لای ئێمــە لــە خێوەتــەکانی داوێــن گونــدی زینوێ، منو عەبدولواحید یاتاغەکانمان گواستەوە بۆ نێو خێوەتی ئەو مامۆستایانەی دەوروبەرمان، مامۆستا حەمەکەریمو خاو خێزانەکەی لە خێوەتەکــەی ئێمــە شــوێن خۆیــان کــردەوە تــا دوو رۆژان پاشــان بــەرەو ئۆردووگاکانی ئێران رەوانە کران لەگەڵ دەیان خاوخێزانی دی کە ئاوارە کرا بوون.

(٣٩)

هەر لە ساڵی ١٩٧٤، وەکو نووسەرو رۆشەنبیرانیش کە بەشدار بوون و هاتنە ریزی شۆڕش، لەبەرواری ١٨/ ٤ / ١٩٧٤ لە ناوپردان لە (قصر السلام) ئەندامانی یەکێتی نووسەرانی کورد بە هەموو لقەکانی و مەڵبەندەی گشتی کۆبوونەوەو چەند بڕیارێکی تیا درا کە ژمارەی نووسەرەکان (٣٣) نووسەر بووین، بەندە یەکێك بووم لەو دانیشتنەدا بەشدار بووم، جا لەو کۆبوونەوە گشتییەدا، دەستەی بەڕێوەبردنی مەڵبەندی گشتی هەڵبژێردرا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ - ساڵح یوسفی ٢- محەمەد رەسوڵ هاوار ٣ - سەعید ناکام ٤ - ئەنوەر شاکەلی ٥ - محەمەد موکری ٦ - ئەحمەد شەریف ٧ - جەلال میرزا کەریم ٨ - شێرکۆ بێکەس ٩ - مستەفا ساڵح کەریم ١٠ - کاکەمەم بۆتانی ١١ - محەمەد بدری، ئەو بەڕێزانەش لە نێو خۆیاندا بەم شێوەیە کارەکانیان دابەش کرد:

ساڵح یوسفی - سەرۆك / سەعید ناکام جێگری سەرۆك / مستەفا ساڵح کەریم سکرتێری بەڕێوەبردن / محەمەد رەسوڵ هاوار سکرتیری رۆشنبیری / ئەحمەد شەریف ژمێریار /

ئەو بەڕێزانەش وەك ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبردن (کاکەمەم بۆتانی - جەلال میرزا کەریم - شێرکۆ بێکەس - محەمەد موکری - ئەنوەر شاکەلی - محەمەد بەدری.

جـا ئـەو ئەندامانـەی لـەو کۆبوونـەوە گشـتییە بەشـدار بـوون و ئـەو هەڵبژاردەنەی تیا ئەنجام درا بریتی بوون لـەو بەڕێزانـە: (ساڵح یوسفی - سـەعید ناکـام - فەلەکـەدین کاکـەیی - مسـتفا سـاڵح کـەریم - جـەمال شارباژێڕی - حوسێن عارف - ئەحمەد شریف - جەلال میرزا کەریم - عەبدوڵڵا ئاگرین - سەباح غالب - شێرکۆ بێکەس - کاکەمەم بۆتانی - محەمەد موکری - ئەنوەر جاف - ئەنوەر شاکەلی - موحسین ئاوارە - محەمەد رەسوڵ هاوار - ئەحمەد سەلام - محەمەد حەسەن مەنگوڕی - عەبدوڵڵا عەباس - جەوهەر کرمانج - لەتیف هەڵمەت - محەمەد بەدری - یوسف دەرگەڵەیی - تاهیر ساڵح سەعید - رەئووف بێگەرد - محەمەد رشید فەتاح - مەجید هێرش - ئەحمەد بێکەس - ئەمین میرزا کەریم - عەبدولخالق سەرسام - سەلام مەنمی - عومەر عەلی ئەمین.

*مانگی ئاب بوو زۆر عەوداڵی ئەوە بووم سەفەرێکی ئێران بکەم و ئەو وڵاتـە ببینـم کـە زۆر باسـی خۆشـی و جـوانی ئـەو وڵاتـەیان دەگێڕایـەوە ئەوانـەی بـۆ ئێـران چـوو بـوون، جـا سـەردانێکی بـەڕێز (عەبـدولخالق مەعروف)م کرد هەر بە یادی ساڵی ١٩٦٩ کە پێکەوە لـە چایخانەی فاتح ئالتونچی دادەنیشتین لە ئەلقەکانی پێشوو باسم کردووە چۆن بووین بە هاوڕێ و پەیوەندییەکانمان بتەو بوو، ئێوارە لـە چۆمان بینیم و پێکەوە سووکە پیاسەیەکمان پێکەوە کرد، پێم گوت تۆ بەڵکو بە مامۆستا محەمەد ئیسماعیل بڵێیت زۆر میانەتان خۆشە بە هەر ناوێك بێت چەند رۆژێك بمنێرێتە ئەو دیو واتە ئێران، مامۆستا محەمەد جێگری ئەمین عامی زانیاری بوو کە منیش لەوێ کارمەند بووم، کاکە عەبدولخالق تێمگەیشت، گوتی ئاسانە من خۆم لەو رۆژانە بۆ کڕینی چەند پێویستمەندیەکی ئێزگە دەچمە ئێران و لـە شوێن کارەکەی خۆتدا مۆڵەتت بۆ وەردەگرم و لەگەڵ

مندا وەرە دەچین بۆ ئەو دیو، واتە ئێران، دوو رۆژی پێ چوو بە قووتە جێبێك هاتە لامان‌و چووە لای مامۆستا محەمەد ئیسماعیل‌و ئیزنی بۆ وەرگرتم پێی گوتم خۆتە ئامادە کە هەر ئیستا بڕۆین، وەرقەی دەرباز بوونیش لە شیوەڕەش لە مەکتەب سەفەر لە کاك عەبدولڕەحمان وەردەگرین هاوڕێمە دەیناسم، هەر وا کەوتەوە، بە جێبەکەی ئەو پێکەوە چووینە مەکتەب سەفەر ئەو دیوەی کوردستانی عیراق، عەبدولڕەحمان بە (ئەبو عوف) ناودار بوو لێپرسراوی ئەو مەکتەبە بوو مەکتب سەفەر کە لە دەمی سەعید یەحیا بیستبوومە بۆ بزەی سەر لێوان دەیگوت (مەرکەب سەفەر)، گەیشتینە شێوەڕەش لای عبدالرحمان ئەبو عوف، دوای چاك‌و چۆنی منیش دەمناسی‌و هەروا هاوڕێیەکی ترم بە ناوی بورهان عەلی کۆنە دراوسێمان بوو هەر لەوێ لە مەکتەب سەفەر کارمەند بوو، پسولەی مۆر کراومان وەرگرت بۆ ماوەی یەك هەفتە لە ئێران بمینێینەوە، کە رۆیشتین کەوتینە دیوی ئێران، هەستم دەکرد وا بەرەو بەهەشتێك دەچم، زیاتر لە چاوێکم پێوە بوو بۆ بینین، سییەکانم فراوانتر ببوون بۆ هەڵمژینی هەوای ئەو دیو، چیژو هەستێکی خۆش لە بیرو پێشوازیمدا بوو، لەگەڵ عەبدلخالق کە هەمیشە دەم بە پێکەنین‌و خۆش سەفرو خۆش مەشرەب‌و دانیشتنەکان بووە تا گەیشتینە (شنۆ)یێ‌و نانێکمان لەوێ خواردو بەرەو (ورمێ / رەزاییە)بەرێ کەوتین، لە رێگادا نوکتەی خۆش خۆشم بۆ دەکردو ئەویش دەیدایە قاقای پێکەنین‌و جێبەکەی لێ دەخوڕی تا لە ئوتێل گاڕوون گیرساینەوە، سێ رۆژ لەوێ ماینەوە ئەوسا سەردەمی شاهنشاهی تەنیا باسی سیاسەتت نەکردبا ئازادیەکی تەواو هەبوو بۆ غەریبان‌و گەشتیاران، ئەو کات سەر دەریاچەی بەندێ شوێنێکی گەشتیاری هێندە خۆش بوو دڵ لێی بەجێ دەما، دواتر چوینە

مهاباد، لەویٚ دۆستو برادەری هەبوو دەعوەت دەکراینو پاشان چوینە سەقزو سنەو گەڕاینەوە بۆ نەغەدەو شنوو ئەو دیوەی خۆمان، ئەوە یەکەم سەفەرم بوو بۆ دەرەوەی وڵاتیٚکی دی کە دیمو چیٚژیٚکی رادەبەدەری بیرەوەری ئامیٚزم لیٚ وەرگرت.

لەو ماوەیەدا لەگەڵ نووسەران پەیوەندیو هامشۆ کردنم هەبوو و یەکترمان دەدی، زۆر جاران دەچووومە ئەمانەی گشتی رۆشنبیریو راگەیاندن چاوم بە نووسەرانو هاوریانم دەکەوت، ئەوەبوو پیان گوتم تۆش بۆچی شیعریٚکی شۆڕشگیٚڕانە لە ئیٚزگەی دەنگی کوردستانی عیراق ناخویٚنیەوە، گوتم بۆ نا.. ئامادەم، رۆژی پاشتریان بۆ دانام کە جیٚبیٚکی لاندگرۆڤەر دانرا بوو بۆ گواستنەوەی کارمەندانی ئیٚزگەو ئەوانەی هەر بابەتیٚکیان هەبیٚت لە ئیٚزگەدا بخویٚننەوە ئیتر ئەوە بوو لەگەڵ ئەو جیٚبە بەرەو (مەمی خەڵان) چووم لە لە ناو جیٚبەکەدا بەڕیٚز عومەر عەلی ئەمینو گەزیزەی کچی لە ناو جیٚبەکەدا بوون کە ئەوانیش بەرنامەیەکیان هەبوو لە ئیٚزگەدا، ئەوکات خوشکە گەزیزە فەراقە بوو واتە کچۆلەیەك بوو تازە هەڵی دەدا قوتە قسەکانی خۆش بوون، بەڵیٚ گەیشتینە مەمی خەڵانو ئیزگەی دەنگی کردستانی عیراق، دەوروبەری بە دۆشکەی فڕۆکەشکیٚنو سەنگەری پیٚشمەرگە دەورە درا بوو، بۆ پاریزگاری کردنی ئیزگەو کارمەندانی، چاوم بە بەڕیٚز بارزان مەلاخالید کەوت لە نزیك چاڵیٚکی بازنەیی بەژنیٚك قووڵ دوای ئەوەی چاكو چۆنی، گوتی وەرە وەکو ئەوانە کە لەسەر لیٚواری ئەم چاڵە دانیشتوونو قاچیان شۆڕ کردۆتەوە دانیشە ئەگەر دەنگی فڕۆکە هات بۆخۆ پاراستن بڕۆ بۆ نیٚو ئەو چاڵە، پاش کەمیٚکی دی دیٚمە دواتو دەچینە نیٚو ستۆدیوی ئیٚزگەو پیٚشکەشت دەکەمو شیعرەکەت بخویٚنەوە، هەر وا کەوتەوەو لەو ماوەیەش دەنگی

هـیچ فڕۆکەیـەکمان نەبیسـت چۆنکە فڕۆکـە جەنگیـەکانی ڕژێمـی بـەعس وازی لەو ئیزگەیە نەدەهێنا هێرشەکانیان بەردەوام بوو، بەڵی چەند کۆپڵـە شیعرێکی شۆڕشگێڕانەم هەڵبژارد بوو، بـارزان مـەلا خالیـد بێـژەری دەنـگ زوڵاڵ پێشکەشـی کـردم (ئێـرە ئێزگـەی دەنگـی کوردسـتانی عێراقـە، ئێسـتاش لەگـەڵ شـاعیری لاوو پێشـمەرگە فـەرموون بـۆ گوێبیسـتنی شیعرەکەی) جا یەکێك لەو کۆپڵە شیعرەی لە دووتوێی چەند کۆپڵەیەکدا کە خوێندمەوە بۆ نموونە دەیخەمە بەر چاو:

وتیان دوێنێ پێشمەرگەیێ
لە هێزی بەمۆی ئاگرین
بریندار بوو
بەڵام برین، زامی هار بوو
تا ئەمڕۆ مرد
بە زامی خۆی، بۆ زامی کورد
دەمی زەوی کرایەوە بۆ لاشەکەی
هیچ نەگریاین، تێکڕا وتمان بژی سبەی

بۆ بەیانی هەینی بوو لەگەڵ (شیخ عـەزیز بـەرزنجی هەڵەجـەیی) هـاوڕێم چووینە دەربەندی رایات بۆ ئەوەی نانێك لـەوێ بخـوین و پیاسـەیك بکـەین، ڕێکـەوت شـەهید (محەمـەد سەرسـپی)مـان بینـی کـە خـزمو هـاوڕێی مـنو هەروا هـاوڕێی شـیخ عـەزیز بـوو، پێکـەوە نـانمان خـواردو لـە چایخانەیەك دانیشـتین کـاتێ باسـی سـەفەری ئێـرانم بـۆ کـردن، ئـەوانیش زۆر بـە پەرۆشـەوە بـوون سـەفەرێك ئەگـەر ڕێـك کـەوێ، گـوتم پسـولەی مەکتـەب

سەفەر عائیدی من بیٚ هاوڕیٚمن پیٚکەوە دەڕۆین‌و زمانی توركی دەزانم‌و شارەزاییەکم پەیدا كردووە لەو دیودا، بەلاٚم ماموٚستا محەمەد ئیسماعیل جیٚگری ئەمین عامەکەمان رازی بیٚ موٚڵەتم پیٚ بدات، هەردوکیان گوتیان ئەوەیان ئیٚمە بوٚتی جیٚبەجیٚ دەکەین تەواو ریٚکەوتین، بوٚ بەیانی هەر سیٚکیان شیٚخ عەزیزو شیٚخ مەسعودی برای شیٚخ عەزیزلەگەڵ محەمەد سەرسپی چونە لای ماموٚستا محەمەد ئیسماعیل‌و پیان گوتبوو موحسین ئاوارەو شیخ عەزیز فەرمانبەرن لە لای توٚ، هاتووین نووسراویٚکیان بوٚ بکەیت بوٚ مەکتەب سەفەر تا بچنە ئەو دیو واتە ئیٚران بە ناوی کڕینی پیٚداویستی بوٚ ئەمانە عامەکەمان کە هەندیٚك بهەسیٚنەوەو پشوویٚك بدەن هەر چەندە بوٚ موٚڵەتدانی من پیٚی خوٚش نەبووە بەلاٚم دواتر رازیان کردووە، جا بوٚ بەیانی من‌و شیٚخ عەزیزو محەمەد سەرسپی چوینە مەکتەب سەفر پسوولەی موٚرکراوی موٚلەتی (١٠) روٚژمان وەرگرت‌و بوٚ ئەودیو شوٚڕ بووینەوە، لە ناو پاسیٚك بووین، لەبەرئەوەی جلی خاکی پیٚشمەرگایەتیمان لەبەر بوو، هەموو کوردە دڵسوٚزو گیان گرگرتووانی روٚژهەلاٚتی کوردستانی ئیٚران بە سوٚزو خوٚشەویستییەوە سەیری ئیٚمەیان دەکرد، کە پاسەکە وەستا لە (نەغەدە) زوٚربەی کوردەکانی ناو پاسەکە روویان لە ئیٚمە کردو داوایان لیٚمان دەکرد میٚوانیان بین، کچیٚکی نەشمیلاٚنە زوٚر بە پەروٚش‌و خوٚشویستنەوە وازی لیٚ نەدەهیٚنایان (غوربانتان بم، دەبیٚ میهمانی ئیٚمە بن) دیار بوو نەك بوٚ مەجامەلە بیٚ بەڵکو دڵسوٚزی کوردانەی لە ناخەوە پاڵی پیٚوە نا بوو کە دەربڕینیٚکی راستگوٚیانەی هەبوو لەم رووەوە، بە سوپاسیٚکی زوٚرەوە داوای لیٚبووردنمان لیٚ کرد وگوتمان وادەمان هەیەو دەبیٚ بڕوٚین، ئەو کات زوٚر کەم پیٚشمەرگەیان بە جلی خاکییەوە بینیبوو تەنیا دەنگوباسی

قارەمانێتی پێشمەرگەکانیان بیستبوو، من ناتوانم هیچ پێوانەیەك بۆ ئەو رۆحە گەورەیە جوانانەی کوردانی رۆژ هەلات دانێم کە هێندە زۆر زۆر دڵسۆزو کورد پەروەر بوونو ناخیان کوانووی داگیرساوو پڕ لە پۆلوی گەش گەش بوو بە خزمەتکردنی ئێمەمانان پێیان وا بوو هەندێك قەرەبووی ئەو بۆشاییە دەکەنەوە کە گیانیانی داگیر کرد بوون، خۆ هەمان حاڵەتمان بینی هەر لە گەراجی سەقز دابەزین، ئێوارە بوو، پیاوێکی جوان جلی کوردی لەبەر بوو، هاتە پێشمانو تەوقەی لەگەڵ کردین گوتی من خەڵکی (بانە)مو شانازی بە ئێوە دەکەم حەز دەکەم لەگەڵ ئێوە بم کە لەو شارەدا نەشارەزان، ئێوە بۆ کوێ دەچن گوتمان بۆ ئوتێلێکی خاوێن، گوتی ئەمشەو منیش لە ئوتیل دەخەوم بەیانی کارێکم لەو شارە هەیە فەرموون لەگەڵ من وەرن، چووین، ئەو بۆ ژوورێكو ئێمەش لە دوو ژوور، دوای هەسانەوەیەك پاش ئەوەی دنیا تاریك داهات هاتینە خوارەوە، بینیمان ئەو پیاوە چاوەڕوانمان دەکات، گوتی ئێوە هیچ وادەو شوێنێکتان هەیە بچن بۆ ئەوێ، گوتمان نەخێر، گوتی حەز دەکەم ئەمشەو لە خزمەتی ئێوەدا بم چونکە ئێوە ئەو قاتە خاکییە پیرۆزەتان لەبەرەو پێشمەرگەنو جێگایەکی ئەوتۆش ناناسن رووی تێکەن، ئەوەی ڕاستی بێ متمانەمان پێی بوو کە کوردێکی دڵسۆزەو لە گەڵیدا چووینە دەر دوای هەندێك گەران ئێمەی بردە بارێك کە مەشرەبو چێشتخانەش بوو هەڵبەتە کە سەردەمی شاهنشایی بوو ئاسایی مەی خواردنەوەو ئەو جۆرە دانیشتنانەی لێ بوو، پاش ئەوەی گەنجەکان بە تایبەتیو ئەوانەی دی کە لەوێ دانشتبوون یەك یەك دەهاتنو بەخێرهاتنیان لێ دەکردین بە جۆرێك هەندێکیان دەچەمانەوە بە وتەی غوربانی ئێوە بین، هەڵبەتە لەبەر ئەو جلە خاکیانەی لەبەرمان بوو نەك بۆ ئێمە، یەك سەعاتی پێ نەچوو گەنجەکان

کە (مەی)یان نۆش دەکرد، پێکەکانیان لێك دەداو نۆش، دواتر بوو بە دەنگ هەڵبرین و گۆرانی گوتن و پاشان هەڵدانی دروشمی کوردایەتی و سروودی ئەی ڕەقیب و بژی کوردو کوردستان و پێشمەرگە، ئەو برا کوردەی خەڵکی بانە کە لە گەڵماندا بوو گوتی با بڕۆین نە ئەو گەنجانە توشی گرتن و کێشە بن نە ئێمە، ئەوەندەی هەوڵمان دا نەمانتوانی ئەو برایە رازی بکەین کە پارەی خواردن و خواردنەوەکەمان نەدات، بەڵام پارەکەی داو ڕۆیشتین، پێی گوتین ئەوەتا کوردانی ئێرە هەر کامێکیان دەگری ناخیان بۆ کوردایەتی گڕی گرتووەو دڵسۆزن، ئەو کوردە (بانە)ییە بە ڕاستی شەرمەزاری کردین بەوەی کە لە ئوتیل دەرچوین بینیمان پارەی ئوتێلیشی داوە، پێمان گوت زۆرمان پێ ناخۆشە بۆ ئەو هەموو مەسرەفەت کرد، گوتی منیش وەك ئێوە کوردم، ئێوە ماڵ و خێزان و وەزیفەو هەموو بەرژەوەندیەکی خۆتان لە ژێر پێ ناوەو دەربەدەر بوونەو نازانن دوا رۆژو ئایندەو ژیانتان چۆن دەبێ، دەژین یان شەهید دەبن، منیش هەر کوردم بەو خزمەتە بچووکەی کردوومە کە ناکاتە دەنکێك لە تەغارێکدا ئاخر چیم کردووە؟ قەرزاریشی کردینەوە ئەوەش دڵسۆزی پیاوێك، بێ ئەوەی ئێمەی ناسیبێ تەنیا رۆحە جوانەکەی نەبێ ئەویش کوردایەتی بوو.

دوای ئەوەی حواحافیزیمان لێ کرد بە تەمای ئەوە بوو لە گەڵماندا بێت بۆ گراج کە دەچوینە (کەرمانشا) لەوێش کرێی پاسەکە بدات بەڵام بە سوێندو زۆرەملێ وازی هێنا رۆیشتە کاری خۆی و ئێمەش بە تاکسییەك چوینە تێرمینالی کەرمانشا و سواری پاسێك بووین، بەڵام هەر لە پاس دابەزین تاکە کارمان لە کەرمانشا ئەوە بوو هەر یەکەمان پانتۆڵ و کراسێکمان کڕی کە لە ئوتێل خۆمان بگۆڕین و ببین بە ئەفەندی، لەو

کاتەدا ئەو نوکتەیەم بیر کەوتەوە بۆ هاوسەفەرانم گێڕامەوە: (مامۆستا لە قوتابی پرسیار کرد، چوار کراس و چوار پانتۆڵ و سێ جووت پێڵاو چەند دەکات؟ قوتابیەکە گوتی دەکاتە - چوار ئەفەندی یەکێکیان پێخواس (پێخاوس)

ناوی ئەو ئوتێلەم لە بیر نەماوە کە بۆی چووین کە ئەویش تایبەت بووو تەرخان کرا بوو بۆ پێشمەرگەو کوردانی کوردستانی باشوور لێی دابەزن، بەڵێ هەر پێمان خستە سەر پەیژەی ئوتێل سەرم هەڵبڕی یەکێك بەرەو رووم هات، ئەویش خزمێکی خۆم و خزمی محەمەد سەرسپی بوو هەروەها لەگەڵ شێخ عەزیزیش یەکتریان دەناسی، ئەو کەسەش (کانبی ئۆمەر چۆپ دەربەندی سیان) بوو کە ئەوکات ئەندامی لقی پێنجی پارتی بوو، هاتبووە کەرمانشا، دوای ئەوەی یەکترمان ماچ کردو چاك و چۆنی گوتی یەك سەعات ماوەتان دەدەمێ ئیستراحەتێك بکەن و خۆتان بگۆڕن و دەتانبەم بۆ جێگای خۆش خۆش، پاش سەعاتێکی دی لە خوارەوەی ئوتێل چاوەڕوانتان دەکەم، ئیتر لەسەر وادەی خۆمان شەهید کانەبی یادی بەخێر ئۆتۆمبێلێکی قۆڵگەی رووسی پێ بوو یەکەم شوێن کە چووین (تاق بووستان) لەوێش جوجە کەبابی و خواردنی تری داوا کرد، سێ رۆژ ئێمەی فەرامۆش نەکردو هەر لە گەڵماندا بوو، شێخ عەزیز دەیگوت بزانە شێختان لەگەڵ دایە بۆ هەموو شوێنێك یاوەرو یارمەتیدەرمان بۆ دەرەخسێ. دواتر شار بە شار تا گەڕاینەوە ئەو دیوەی کوردستان شوێنگەی کار کردنمان.

(٤٠)

دوای ئـەوەی مامۆسـتا حەمـە کـەریم هـەورامی لەگـەڵ خاوخێزانەکـەی چـووە ئێـران و لـە ئۆردووگایـەکی ئـاوارەبووان جێگیریـان بکـات، مـن و عبدولواحید دیبەگەیی لە یەك لە قوتابخانەکانی ئازادی نیشتەجێ کراین کە لەوێدا کارمەندانی دی ئەمانەتی زانیاری واتە پەروەردەی لێبوو لەوانە شێخ عەزیز بەرزنجی هەڵەجەیی و وشیار ئەتروشی کە زۆر هاوڕێ بووین بەو شوێنە دڵخۆش بووم کە لە نێو خێوەتدا لەو چۆڵەوانیدا بچینە ناو بنایەو ئاوەدانی، ئەوەی وێنەیەکی شیعری بۆ بەرهەم هێنام، ئەوە بوو لە کاتی هەڵتەکاندنی خێوەتەکەمان و ڕاکێشانی یەك لە ستوونگەکان خۆڵ پشتەوشکێن بووو ئاساوەری ئەم وێنەیە لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئـەیلول لـە ئاداری ١٩٧٥ دا لـە قەسـیدەیەکمدا بـە نـاوی شـەوارە کـە لـە دیـوانی (شـەوارە)دا لـە ١٩٧٨ بـە چاپ گەیانـدووەو بـڵاو بۆتـەوە تیایـدا دەڵێم:

هەڵتەکاند ئەو رەشماڵەی
لە ئاوایی چەقی سینگما هەڵتدا بوو
دەرت هێنا ئەو سنگ و ئەستوونگانەی
رەگی نووکیان لە ناو دڵما داکوتا بوو
لەو رۆژەوە کۆنە قۆلتی شوێنەواری نووکەکانیان

بوونەتە زام
ئەو زامانەی بە دارۆچکەی یادەکانت دەکولێنەوە
شەوان خوێنیان لەبەر دەڕواو
بۆ بەیانیش بە سەر شەقامی تیشکا دەگەڕێنەوە

هەر لەو ماوەیەی لەو ئەمانە عامەیە بووم وا ڕێکەوت هاوڕێیەکم پێی گوتم یەکێك هەیە مامۆستایە خەڵکی هەولێرە ناوی (نامیق)ە دەچێتە هەولێرو دەگەڕێتەوە بە نهێنی ئیش بۆ شۆڕش دەکات جێگای متمانەیە ئەگەر دەتەوێ نامەیەك بۆ ماڵی خۆتان بنووسە ئەو دەیبات و وەڵامەکەشت بۆ دەهێنێتەوە، زۆرم پێخۆش بوو شەو نامەکەم نووسی، بەر لەو نامەیە خزمێکی خۆم نامەیەکی لە ماڵەوەمان بۆی هێنا بووم تیایدا نووسرا بوو کە (جەلال)ی براکەت خوای گەورە کوڕێکی پێ بەخشیون حەز دەکەین تۆ ناوێکی بۆ هەڵدەی، بۆیە لەو نامەیەی مامۆستا نامیق دەیباتەوە بۆ هەولێر تیایدا نووسیم ناوی لێبنێن (هەڤاڵ) ئێستا هەڤاڵ خاوەن ژن و منداڵە، بەڵام بە داخەوە کە مامۆستا نامق وەڵامی نامەکەمی بۆ هێنایەوە جگە لەوەی تیایدا نووسیبوویان خەمی ئێمەت نەبێ باشین و نازانین کەی دەربەدەرو ئاوارەمان دەکەن بەردەوام خۆمان حەشار دەدەین و ئاگامان لە خۆمان هەیە بەڵام بە داخەوە، (حەیدەر)ی ئامۆزات برای عەلی سیان و جمیل سیان کە پێشمەرگە بوو بە نهێنی هاتبووە هەولێر لە ناو شاردا دەستگیر کراو ڕەوانەی زیندانی موصل کرا، ئێمەش چووینە موصل و لەوێ فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو بوو، بەر لە سێدارەدانی لەگەڵ دایکی و ژن و منداڵەکانی لەوێ بووین چاومان پێیکەوت، زۆر خۆ ڕاگر بووو ورەی بەرنەدا بوو دەیگوت قوربانیەك بێت

لــە پێنــاوی کــوردو کوردســتانەکەم دەبــێ پێیــی دڵخــۆش بــێن نامــەوێ فرمێسکێك بە چاوتانەوە ببینم، ئیتـر تەرمەکەمان هێنایەوە بۆ هەولێر، جا هـەر ویسـتمان ئاگـادار بیـتو نەکـەی ڕێگـا داگـری بـە سـەردان بێیتـەوە چونکە دایکت دەڵێت ئەوەمان لێ بینیوە کە لـە ١٩٦٩ مامۆسـتای شۆڕش بـووی لـە هـیران بـە نهێنـی جارێکیـان بـۆ شـەقڵاوەو جـارێکیش کویـەو جـارێکیش بـۆ نـاو هـەولێر بـە نهێنـی هاتییـەوە مـاڵ، بـەڵام ئێسـتا وەکـو ئەوسا متمانە نەماوەو سیخوڕو چەکدارانی ڕژێم هەموو سنووڕو بازنـەی هەولێریان ئابڵوقە داوە.

وردە وردە بـەرەو مانگـەکانی نیسـانو مـایسو حـوزیران دەڕۆیشـتین، ڕۆژو مانگـەکان ئـاوا دەبـوون دەڤەرەکـەیش گەرمتـر دەبوو، ئەگەرچـی بە داخــەوە شــەڕی بــەرەکانی جــەنگ لــە نێــوانی پێشــمەرگەو ســوپای کوردستانو سـوپای ڕژێمـی بـەعس بـە هاوکـاری جاشـە کـوردەوە گەرمتـر دەبوو، ئەمان دی ڕژێمی شاهنشای ئێرانی ئەوسا بۆ ئـەوەی پێشـمەرگەو کوردان زیاتر بە کوشت بدەنو هـەروەها سـەربازانی عیراقیش، چەند جار بە شەو کاروانێك لەسەربازانی سوپای ئێرانی بە تـۆپو ئـەو جێبانـەی بـی ١٠ /ی (بـی عشـرە)یـان پـێ دەگـوت لەگـەڵ تەقەمـەنیو ئازووخـەی دی، بـەرەو بـەرەکانی جـەنگ دەڕۆیشـت بـۆ هاریکـاری پێشـمەرگەکان چـونکە سوپای عیراق بە دڕندەترین هێرشو هێزی کۆماندۆی ڕاهێنـراوو جاشـە بــەکرێ گیراوەکــانی بــە چــەکی قــورسو مــۆدیرنی ســۆڤیێتیو فڕۆکــە جەنگییـەکانی وێرانکـەر لـە هـەموو لایـەکی کوردسـتانی عـیراق هێرشـیان دەکـرد، بـە هـەموو شـیوەیەكو تەرازوومەندیـەك ئاسـتەکان جیـاواز بـوون سەبارەت بە هێزو توانای سوپای عیراقو هێـزی پێشـمەرگە قاڕەمانـەکانو بەرگریـەکانی، هـەواڵی سـەرکەتنەکانی پێشـمەرگەمان دەبیسـت لـە هـەموو

بەرەکانی جەنگدا، بە داخەوە ڕۆژێکیان تەرمێکی زۆری پێشمەرگەکانم بینی لە بەتانیان وەرپێچا بوون لە پشتەوەی دوو جیب، یەکێك لەو پێشمەرگانەی لە ناو جێبێکیان بوو قسەی بۆ هەڤاڵێکی خۆی دەکردو گوێم لێبوو دەیگوت، ئەو شەهیدانە سەر بە هێزی هەڵگوردن و لەبەرەکانی شاخی سەرتیز ٣٢ پێشمەرگەیان بە تۆپ و هێرشی فڕۆکەکان شەهید بوون و برینداریشیان هەیە، هەروەها شەڕ زۆر گەرمە لە چیای زۆزك و گۆرس و هەندرێن و هەموو بەرەکانی ناوچەی بالەکیان بە گشتی، من بەو هەواڵەو وەزعە زۆر پەریشان بووم، هەروەها زۆر ڕاڕاو نائارام بووم کە ئامۆزایەکی باوکم (عەلی حەمەد)ی ناو بوو پێشمەرگە بوو، ڕۆژێك پێشتر لە چۆمان بینیم جێبێکی پێبوو کە تۆپی بی عشرەی لەسەر بوو، گوتی دەچم بۆ بەرەی جەنگ بۆ (سەرتیز) و ئەو ناوچانە، یەکترمان ماچ کردو ڕۆیشت بۆیە هەر لەو بەیانییەدا خۆم بۆ نەگیراو بەرەو خوار بوومەوە لەبەرەکانی ئەو ناوچانە نزیك ببمەوە کە جەنگی تیایدا، تا گەیشتمە پردی بەرسرین و حافیز، لرمە لرمی تۆپ و هاشەی فڕۆکە جەنگییەکانی ڕژێم زۆر زۆر بوو، یەك لەو بازگانەی پێشمەرگەکان پرسیاری ئەوەم لێکردن لەو شەهیدانەی کە ئێوە پێی دەزانن هیچ پێشمەرگەی سەر جێبەکانی (بی عشرە)یان لەگەڵ بووە، گوتی نەخێر کەسیان لەوانە شەهید نەبوونە وەك بزانم، ئیتر تا ئاستێك دڵم ئارام بۆوە، هەر چەندە بۆ من هەموو پێشمەرگەکان بە کەس و کاری خۆمم دەزانی، بەلاّم ئەو ئامۆزایەم دوو خێزانی بە سەرەوە بوو کوردێکی زۆر دڵسۆزو ئازا بوو جگە لە خزمایەتی هاوڕێش بووین، گەڕامەوە شەو گوێم لە هەواڵی سەرکەوتنەکانی پێشمەرگەکان بوو لە زۆربەی بەرەکانی جەنگدا، باسی شەڕی ماکۆکی کرد کە لەوێدا بەتالیۆنی سەید کاکە ڕۆڵێکی کاریگەری

بینیوه له قڕ كردنی هێزی تایبەتی گاردی كۆماری بەعس و بە دیل گرتنی دەیان كەسیان بە چەك و تەقەمەنییەكی زۆرەوە، جا یەكێك لە خاروانەكانم سابیر كاكە شین كە سەرلق بوو لە بەتالیۆنەكەی سید كاك هەر وا زۆربەی خزمەكانم كە لەو لقەی خارە سابیر بوون واتە لەو بەرەی شەڕدا لە گەڵدا بوونە دەبێ چەندیان شەهید یان بریندار بووبن؟ ئەوەش وای لێ كردم ئەو شەو نەخەوم و بەیانی بە دوای سۆراغی ئەو خزمانەوە بكەوم و پرسیار بكەم.

پێشمەرگەیەك لە عەشیرەتی زراری بوو خزمی سەلیم ئاغۆك تعارفمان كرد بوو پێشتر، هەڵبەتە لە ئەلقەكانی پێشوو زۆر ناوی سەلیم ئاغۆكم هێناوە چ لە ١٩٦٩ لە هێران لە ناوچەی جوتیاران بووو هاوڕێم بوو، دواتریش لە ناوچەی پارتی لە هەفتاكان لە هەولێر كە زۆر بە یەكەوە بوین، جا ئەو پێشمرگەیەی هاتە لام زۆر ماندووو سەرو سیما شێواو بوو، لە چۆمان نانێكمان پێكەوە خوارد، لەبەرەی جەنگێك هاتبۆوە، بە دەم چا خواردنەوەچیرۆكێكی تراژیدیو كۆمیدی بۆ گێڕامەوە:

گوتی " ئێمە وەك پێشمەرگە كە زۆربەمان خزم و كەس و كاری یەكتر بووین لە عەشیرەتی زراری لەگەڵ سەر لق (عەلی میرۆ زراری) لە پشتەوەی بەرەكانی جەنگ سوڕاینەوە بۆ جەرگەی نێوەندە بۆشاییەكانی سەربازگەكانی رژێم بۆ ناو قووڵایی گەلی عەلی بەگ، بۆسەمان دانایەوە كاروانێك لە هێزە تایبەتیەكانی سەربازی رژێم لە سێ قۆڵەوە كەوتنە نێو كەمین و بۆسەی ئێمە، ژمارەیەكی زۆریان كوژران و زیاتر لە بیست سەربازیان بە دیل گیران كە لە نێویاندا پلەداری تیا بوو، چەك و تفاقەكانمان لێ وەرگرتن بە تایبەتی ئێمە لەگەڵ ئەو سەركەوتنەدا زیاتر دڵمان بەو كلاشنكۆفە بێ قۆنداخە رووسیانە خۆش بوو كە

دەستکەوتمانەو دابەشی دەکەین لە نێوانی خۆماندا، ئەها ئەوە یەکێکیانە لەو کلاشنکۆفانەی وەرم گرتووەو تازیەو تەقەی پێ نەکراوە، بەلاّم چیرۆکە سەیرەکە لێرەدایە دوای ئەوەی سەربازو پلە دارەکانمان چەك کرد هەموویان لە لایەك وەستێندرا بوون لە پڕ گرووپێکی زۆری پێشمەرگەکانی عەبدوللاّ پشدەری سەر بە هێزی باڵەك لێمان پەیدا بوون و گوتیان ئێمە بەشدارین لەو دەستکەوتووانە چونکە لەبەری پشتەوەی ئێوە یارمەتی دەربووین بۆ ئەو سەرکەتنە، سەرلقمان عەلی میرۆ پیانی گوت ئەو چالاکییە بە بێ ڕێکەوتن لەگەڵ ئێوەو بە بێ ئاگاداری ئێوە ئێمە پێی هەڵساوین هیچ مافێکی ئەوتان نییە داوای دەسکەوتەکان بکەن، ئیتر ئەوەبوو لەو کلاّشنکۆفانە روو هاتن و هەڵیگرن و بیبەن، بوو بە راکێش راکێش لە نێوانی ئێمەو پێشمەرگەکانی هێزی باڵەك، نادەین و دەیبەین، لەو نێوەندەدا دیلەسەربازەکان لە ترسانا دەلەزین و دەترسان نەوەك ببێتە شەڕ لە نێوانمان ئەوانیش تیا بچن، گوێم لێ بوو یەك لەسەربازە پلەدارەکان دەیگوت (عینی علی کیفکم اتفقو أحسن) واتە (چاوەکەم لەسەرەخۆ رێك کەون باشترە) دواتر سەرلق عەلی میرۆ و سەردەستەیەکی پێشمەرگەکانی هێزی باڵەك هەندێك وەزعەکەیان هیور کردەوە بە دانانی ئەو کلاّشنکۆفانەی لە نێوانی دوو پێشمەرگەکان راکیش راکیشیان بوو، بینە دەیبەم و نایبەی، رێکەوتن چەند چەکێك وەك دیاری بدەن بە پێشمەرگەکانی عەبدوللاّ پشدەری ئامر هێزی باڵەك و بەو نێوەندگیریە کۆتاییان بەو کێشەیەش هێنا، ئەی ئەوە تراژیدی و کۆمیدی نییە کە ئەو پێشمەرگەیە بۆی گێڕامەوەو راستیشی دەکرد، بە شێوە گشتییەکە ئەمە واقعی کوردە.

- یەكێك لەو یادانەی شیاوی وتنە هەر لەو ساڵدا ١٩٧٤، دوو رۆژنامە نووسی فەرەنسی لە دەربەند رایات كە قوتابخانەیەكی خوێندنی سەرەتایی لێبوو، چەندێك لەو قوتابیانەو مامۆستاكەیان و وەرگێڕێك دوای خۆیان داو چوونە نزیك ئەو كونە شاخەی لە پشت قوتابخانەكەدا بنكۆڵ كرا بوو بۆ خۆ حەشاردانی قوتابیان لەو كاتانەی كە فڕۆكەكانی ڕژێم بۆردومان ئەو ناوە دەكەن، جا بە قوتابیەكانیان گوت ئێستا هەمووتان غار دەدەنن بۆ نێو ئەو ئەشكەوتە منیش وێنەتان دەگرم، مەبەستیان بوو جارێ وێنەی ئەو قوتابیانە بگرن گوایە بۆ خۆ حەشاردان را دەنكەنە ئەو حەشارگەیە، دواتریش بۆ خۆیان وێنەی ئەو فڕۆكانەیان هەیە پێشتر بە ئاسمانەوە بوونە، دواتر دۆبلاجیان دەكەن، وا رێكەوت لەو كاتەی بە قوتابیەكانیان گوت دەی غار دەن، بە حەقیقی فڕۆكە لە ئاسمانی ئەو دەڤەرە دەنگی هاتو پەیدا بوو، ئیتر بە مامۆستاو وەرگێڕو رۆژنامە نووسەوە هەر هەموویان رایان كردە نێو حەشارگەكە.

(٤١)

هەر لە نێوەندی ئاداری ١٩٧٤ تا ئاداری ١٩٧٥ دا، لەو ماویەدا شەڕ و پێکدادان لە نێوانی بەرەی سوپای عیراق‌و جاش‌و بەکرێگیراوەکانی لەگەڵ بەرەی پێشمەرگە وشۆڕشی کورد بەردەوام بوو، بۆ بەرز کردنەوەی ورەی جەماوەرو پێشمەرگەکان‌و بەرەنگار بوونەوەی دوژمن، قسەی بن لێوانی لێپرسراوان بڵاو دەکرایەوە گوایە هەتا فڕۆکەی جەنگیمان هەیەو جگە لە موشەکی فڕۆکە شکێن‌و زرێپۆش‌و چەکی قورس، پێشمەرگەیەکی ناودار کە ناوی (جەوهەر هیرانی) بوو لە چۆمان کە بڵند گۆی پێبوو بۆ هەر باسێکی هەنوکەیی ناوخۆیی کە هەبێت‌و پێویست بە بڵاو کردنەوە بێت ئەو پێی هەڵدەستا، ئیتر جەوهەر هیرانی دەیگوت نەکەن چاوی خۆتان کوێر بکەن تەقە لە فڕۆکەکانی خۆمان بکەن لەو ڕۆژانە بە سەر ئاسمانی چۆمان‌و ناوچەکانی دی دەبیندرێن.

مانگی ئابی / ١٩٧٤، پەیوەندیم بە (بورهان عەلی) کرد کە هاوڕێ‌و کۆنە دراوسێ بووین لە هەولێرو کارمەند بوو لە مەکتەبی سەفەر پێم گوت حەز دەکەم لێرە لەو مەکتەبەی سەفەر کار بکەم وەك کارمەندێك تۆ دەڵێیت چی؟ گوتی من زۆریشم پێ خۆشە، بەڵام ئێرە زۆر تایبەتەو شوێنێکی هەستیارە جگە لەوەش چۆن لە ئەمانەی گشتی زانیاری ڕەزامەندی بۆ گواستنەوەت دەدەن، لە لایەن منەوە بە لێپرسراوەکەمان دەڵێم‌و تەکلیفی لێ دەکەم‌و ئەویش تۆ دەناسێ بەڵام ئەوەی تر

دەمێنێتەوە سەر خۆت چیت پێ دەکرێ، گوتم من پێم دەکرێ، گوتی دەی، هەر چۆنێك بێت پەیوەندیم کرد بە کەسانێك کە لێپرسراوی بالاّ بوون لە ناو شۆڕش و کارەکەم هەر زوو جێبەجێ بووو لە (مەکتەب سەفەر) لە هەواری شیوەڕەش دەستبەکار بووم وەك کارمەندێك، ئیتر بووین بە سێ کارمەند، لێپرسراوی ئەو مەکتەبەش کاك عەبدولڕەحمان بوو بە (ئەبو عۆف) ناودار بوو، ئەو مەکتەب سەفەرە چەشنی (قونصلیە)یەك بوو کە پێشمەرگەو لێپرسراوەکان سەفەریان دەکرد بۆ ئێران دەبووایە پسولەیەکی چاپکراو کە ناوو کارو هۆی سەفەرەکەی تیا نووسرا بوو مۆری مەکتەب سەفەری لێ بدەین و ئیمزای بکەین ئەوسا لە بازگەکەی سەر سنوور دەرباز دەبوون بۆ ئێران، ترومبیلێك جۆری جێب لاندرۆڤەر بۆمان تەرخان کرا بوو، زۆر جاران ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یان لێپرسراوێکی بەرزی ناو شۆڕش کە دەچوونە ئەودیو بۆ ئێران دەبووایە یەکێکمان تا سەر سنوورو بازگەکە لە گەڵیاندا بڕۆین و ئەو کەسانە بە ئەفسەرانی بازگەکە بناسێنین بۆ ئەوەی زوو بەرێ بکرێن و راگیریان نەکەن، زۆر جاریش ئەگەر بەڕێوەبەرانی ئەمانە گشتییەکان بۆ کرینی پێداویستی دایرەکەیان دەهاتن بچن بۆ ئێران جا ئەوانەی منیان دەناسی وەك خزم یان هاوڕێ و هاوخەبات، بەو پێیەی زمانی تورکی دەزانم و لە (ورمێ – رەزاییە)و (تەبرێز) کارەکانیان ئاسان دەبێ ئەگەر هاوسەفەریان بم، داوایان لێم دەکرد لەسەر گیرفانی دایرەکەیان منیش لەگەڵ خویاندا ببەن بۆ ئەو سەفەرە، وا رێکەوت سێ سەفەری لەو شێوەیەم بۆ رێکەوت جا ئەو شوێنە خێری پێوە بوو بۆ من کە دەمتوانی چاکەو ئاسانکاری بۆ زۆر کەسانی شیاو بکەم و ئیشەکانیان زوو جێبەجێ بکەم، هەروەها بۆ خۆشم لەو جێگایە سوودمەند بووم.

رۆژێكیان دابەزیم بۆ چۆمان بە نیازی ئەوەی لەوێ گەرماو (حمام)ی لێ بوو خۆم بشۆمو لە نزیكی ئەو گەرماوەبووم، فڕۆكەی رژێمی بەعس لەسەر ئاسمانی چۆمان پەیدا بوو، فڕۆكەی جوهەر هیرانی نەبوو، بوو بە گرمو لرمی دۆشكەو پاشان بە بەر چاومانەوە موشەكێكی سام بۆی چوو وەك پۆلیە ئاگرێك پێوی نووساوو پارچە پارچەی كردو كەوتە خوارەوە ئیتر تەقەی خۆشی ئەو هەوارەی تەنی بۆیە بەو چاوانەوە دیم هەندێك لەوانەی لە گەرماوەكە بوون بەوە رانەگەیشتبوون جلەكانیان لەبەر كەن بەڵكو لە خۆیان ئاڵاندبوو هاتبوونە دەرەوە بزانن چی قەوماوە، گوتم سوپاس بۆ خوا نەگیشبوومە بەر دەرگای گەرماوەكە دەنا ڕەنگە بەو حاڵەوە منیش دەبیندرام، چونكە منیش یەكێك بووم لەوانەی لە فڕۆكە دەترسام، جا ئەو فڕۆكەیەی كەوتە خوارەوە جۆری (تۆپۆلیڤی رووسی) بوو مۆدیرنو پێشكەوتوو، سیاسەتمدارەكانی ناو شۆڕش بۆچوونیان وا بوو كە لە دوای هەڵدانی ئەو موشەكە سامە فڕۆكەشكێنە، صدام حوسێن بیری لەوە كردەوە كە چۆن تنازل بۆ شاهنشاو رژێمی ئێران بكاتو چارەسەریەك بدۆزێتەوە رێكەوتنامە شوومەكەی جەزایری لێ كەوتەوە.

هەر بۆ بزەی سەر لێو دوای ئەوەی لە ئاداری ١٩٧٤ بە ملیۆنان كوردانی دڵسۆز، ماڵو بەرژەوەندییەكانیان جێهێشتو هاتنە ناو شۆڕش، هەبوون لە جێگایەك جێنشین كرا بوون رێزیان لێ دەگیراو ژیانیان بۆ دابین كرا بوو، یەكێك لەو كەسایەتیە كە نامەوێ ناوی بهێنم لە دەربەند رایات لە دامێنی شاخدا كونە تەیارەیەكی تاك نەفەری دروست كرد بوو ئەگەر دەنگی فڕۆكە بهاتبووایە دەچووە نێو ئەو كونەو خۆی حەشار دەدا تا فڕۆكەكە دەنگی نەدەماو دەرۆیشت، رۆژێكیان فڕۆكە بە سەر ئاسمانی ئەو دەڤەرە بە دەنگو لرمە لرمی پەیدا دەبێ، ئەو زاتەش ڕا دەكات بۆ لای

کونە تەیارەکەی، سەیر دەکات یەکێك چووەتە نێو ئەو کونە، بەو کابرایە دەڵێت زووکە وەرە دەرێ ئەوە کونی منە، ئەویش دەڵێ کێشە نییە با فڕۆکەکە بڕوات و دەنگی نەمینێ دێمە دەرەوە.

(٤٢)

## قۆناغێکی دی خەمبار و نسکۆ ئامێز

دوای ئـــەوەی لەبـــەرواری ١٩٧٥/٣/٦ لـــە کۆبوونەوەیـــەکی دەوڵەتـــە نەوتییەکان لە لوتکەی ئۆپێك لە جەزایر بەڕێوە چوو، پیلانێکی مێژوویی زلهێـزو هەرێمـەکان هاتـە کایـە بـە ڕێکـەوتنێکی کارەسـاتبار کـە قـوڕێکی خەسـت بـوو بـۆ کـورد گیرایـەوە، ڕێکەوتنەکـەیش لـە نێـوانی شـای ئێـران و سەدام حوسێن بە نێوەندگیری (هەواری بۆمیدیەن)ی سەرۆکی جـەزایر کـە ڕێکـەوتنێك بـوو فـو لـە چـرایە داگیرسـاوەکەی شۆڕشـی ئـەیلول بکـەن و بیکوژێننـەوە و تیایـدا کـورد لـە کوردسـتانی عیراق ڕەنـج بـە خەسـار لێـی دەرچـیّ و هـەموو کـوردانی پارچـەکانی دی کوردسـتانی گـەورە برینـدارو هەناسە سارد بکەن ئەویش بەرامبەر بە پێدانی بەشێکی دەریاچەی شەتی عەرەب و ناوچەیەکی فراوانی عیراق لە خانەقین و زەرباتیە.. هتـد. هەڵبەتـە شـای ئێـران و ڕژێمەکـەی ئەوسـا، کـوردو شۆڕشـی کوردسـتانی باشـووری عـیراق وەك کـارتێکی فشـار لەسـەر عـیراق بـەکاری هێنـا بـووین بـۆ دەسـتکەوتەکانی خۆیـان و بـە هـیچ شـێوەیەك لێنەدەگـەڕان لەگـەڵ ڕژێمـی عیراق ڕێکەوین.

بەڵێ بڕیاری ڕێکەوتنی جەزایر مۆر کراو هیچ بوارێك بۆ سەرکردایەتی شۆڕشـی ئـەیلول نـەما جگـە لـە چـەك دانـان کـە زیـاتر لـە سـەد هـەزار پێشمەرگەی چەکدار نائومیدو دەروونیان زامدار کرا، سـەرباری بـە ملیـۆن

ئـــەو كـــوردە دڵســـۆزانەی باشـــووری كوردســـتانی كـــە ســـەرو مـــاڵو بەرژەوندییەكانی خۆیان خستبووە ژێر پێو هاتبوونە ریزی شۆڕش، هەر چەندە لەسەرەتای ئەو بڕیارە شوومە، پێشمەرگەكان لەبەرەكانی جەنگ شەڕێكی قارەمانانەیان ئەنجام دا كە درێژە بەو بەرخودانییە بدەن بەڵام بێ سوود بوو چونكە كار لە كار ترازا بوو، دوای ئەوەی سەرۆك مستەفا بارزانی سەركردەی پارتیو شۆڕشی ئەیلول بە هاوەڵی دكتۆر محمود عوسمان ئەندامی مەكتەبی سیاسی لەگەڵ شای ئێران كۆبوونەوەو دوای گەڕانەوەیان بۆ ئەو دیوەی باشووری كوردستان لە عیراق كۆبوونەوەیان لەگـــەڵ ئەنـــدامانی مەكتـــەبی سیاســـیو تـــەنفیزیو ئـــامر هێزەكـــانی پێشمەرگەو لێپرسراوە باڵاكان كرد، سەرۆك بارزانی پێیانی راگەیاند دەبێ تەسەلیمی ئەمری واقیع بین، پیلانێكی نێو دەوڵەتییە هیچ چارەمان نییە دەبێ چەك دانێینو شەڕ راگرین، دوو رێگامان لە پێشە یەكێكیان رژێمی بەعس لێبوردنێكی گشتی داوە ئەوەی دەچێتەوە عیراق یان دەچێتە ئێران ئازادە لە بڕیاردانی خۆی، جاری ئەمە چارەنووسمانەو نازانین دواتر چۆن دەبێت بەڵێ، لە هەموو بەرەكانی جەنگ پێشمەرگەكان تووڕەو بێ ئومێدو هەناسە سارد بە چاوانی فرمێسكاوییەوە تفەنگەكانیان لەبەرد دەدا یان هەڵیاندەدایە نێو رووبار یان لەگەڵ تەقەمەنیەكاندا گڕیان تێبەردەدا نەوەك سوپای رژێم سوودی لێ وەرگرێ، ئا.. سەنگەرەكانیان جێدەهێشتو سەرەو هەوراز دەبوونەوە، جا كارەساتی گەورە من بینیم بەو پێیەی لەسەر سنوور بووم لە مەكتەب سەفەر لە شیوەڕەش، وەك كۆمەی داری قەڵاشكەر ئەو تفەنگە دار شووشانەی كە پێشمەرگەكان زۆر عەودالی بوون دەستیان كەوێ هەڵدرابۆوە یان دەیانشكاندن، هەروا بە دەیان كلاشنكۆفی موزەلی بێ قۆنداغو دەمانچەی هەمە چەشن لە تەك

دیـواری بینایـەی ئـەو مەکتـەب سـەفەرە بـیٚ نـازو بـیٚ نـرخ فرێـدرا بـوون، ئەگەرچی دواتر هەندێك لەو چەکانە بردران بیاشێرنەوە بۆ ڕۆژانێکی دی ئەگەر شۆڕش بەردەوام بێت، وەك ئاگادار بووم بردیان بۆ گوندی دەرگەڵە لای بەڕێز عـزت سـەلیمان بـەگ دەرگەڵـەیی کـە لێپرسـراوێك بـوو لـە نـاو شۆڕش.. داخـی گـرانم کـاروانی نەپساوەی ئۆتـۆمبیلان قـەتارەیان بەسـتا بـوو، قەمـەرەو جیـب و تەلنکتـەرو قـەلاب و لـۆری هـەموو جۆرێـك کـە بـارو کـەل و پـەل و بارگـەو مـاڵان و هـەتا پەلـەوەرو ئاژەلانیـان بـار کـرد بـوو، بـە داخـەوە پێشـمەرگەو خـەڵك و خـاوخێزان بـە پـای پـەتی یـان بـە تـرومبیلان ئاودیو دەبوون بۆ ئێران، سەرەتا ئێمە وەك مەکتـەب سـەفەر پسولەمان بـۆ دەکردن دواتر لە رادەبەدەر دەرچوو پسولەیان بۆ بکریٚ، بـۆ ئـاودیو بـوون بـۆ نـاو ئێـران لەسـەر هـەموو سـنوورەکانی باشـووری کوردسـتان جگـە لەوانـەی گەڕانـەوە نـاو عـیراق و خۆیـان دا بـە دەسـت رژێـم و سـوود لـە لێبووردنە گشتییەکە وەرگرن، دەتوانم بڵێم ئێمـەی لـە مەکتـەب سـەفەر لـە دواییـنـەکانی ئـەو کاروانانـە بـووین کـە ئـەو دیوەمـان جێهێشـت و ئـاودیو بـووین بـۆ ئێـران و سـوپای رژێمـی عیراقـیش سـەردەکەوتن تـا گەیشـتنە حـاجی ئۆمـەران و هـەموو سـەر سـنوورەکانی ئێـران دامـەزران و شـۆڕش گوزەشت.

سـەرەتا چـوومە نەغـەدە کـە بارەگـای بـارزانی و سـەرکردایەتی شۆڕشـی ئەیلول خێوەتیان هەڵدا بوو، لەویٚ بە هۆی لێپرسراوێکی باڵا دەنگوباسـی کۆتایم وەرگـرت پێـی گـوتم هـیچ ئومێـدەك نییـە تـۆ ئـەوەت باشـە تـەنیای و خاوخێزانت لە گەڵدا نییە چاوەڕوان بە تـا ماوەیـەك ئەگـەر چـوونە دەرەوە هەبوو بۆ وڵاتان ئەوە وەرەوە لای من کارئاسانیت بۆ دەکەم، هەروەها منی بـردە لای کـاك عـەلی عەبـدوڵڵا کـە ئـەمین عـامی گشـتی دارایـی و ئەنـدامی

مەکتەبی سیاسی بوو لە ناو شۆڕشی پێش نسکۆ، پێی گوت کاک عەلی ئەوە موحسین ئاوارەیە کارمەند بوو لە مەکتەب سەفەر دوو موچەی مانگانەی ماوەو وەرینەگرتووەو تەنیایەو زگورتیە دەبێ لە ئوتێلان بخەوێ جا ئەو دوو مانگەی بۆ سەرف بکەو ئەگەر زیاتریشی بدەیتێ ئەوە خەرمان بەرەکەت، بەڕێز عەلی عەبدوڵلاّ زنجیری جەنتا رەشەکەی کردەوە موچەی دوو مانگ‌و زیاتریشی کەرەم کرد، خوا حافیزیم کردو گوتم باشترە بچمە مەهاباد، بەو نیازەی لە ئوتێلێك دابەزم بزانم دەگەین بە کوێ، بە خۆ جەنتاکەم هەر لە گەراجی مەهاباد دابەزیم چوومە نێو شار بە دەیان پێشمەرگەو خەڵك‌و کەسایەتی شارەکەم شاری هەولێرم ئەدی، چاك‌و چۆنیمان دەکردو هەبوو داوایان لێم دەکرد مێوانیان بم کە پێشتر لەو شارە لە مەهاباد جیٚ‌و رێیان بۆ خۆیان دابین کرد بوو، تا لەبەردەم پەرتووکخانەیەك وەستام‌و دواتر چوومە ژوورەوە سەیرێکی کتیبەکان بکەم، ئۆ کێم دی لەوێدا باوەشیان پیا کردم‌و ماچیان کردم، بەڕێز عەلی رەسووڵ لێپرسراوی ناوچەی هەولێر لەگەڵ بەڕێز نەوزاد محەمەد عەلی موختارو رەسووڵ گەردی هەنەرمەند، گوتیان لێرەش بە خۆو جەنتاکەت هەر بە دوای پەرتووکخانەو کتێبان عەودالی، گوتم ئەی ئێوەش ئەوە نییە لێرەن، خاوەن پەرتوکخانەکەیان پێ ناساندم گوتیان ئەوە (سەیدیانی) بەڕێزە پەرتوکخانەکەشی بە ناوی پەرتوکخانەی سەیدیانە، خاوەن پەرتوکخانەکە تەوقەی لەگەڵ کردم هاواری کرد ئا وەرە بڕۆ (بەستەنیەکی) بۆ ئەو لاوە بێنە، هەر لەو کاتەدا سەیدیان کاسێتێکی خستە سەر تەسجیلەکەی دەرکەوت حەیرانێکی رەسووڵ گەردی بوو، مام رەسووڵ دەستی بە گریان کردو هەڵبەتە هەموو کورد لە هەنجەت بوون بۆ

گریـان، دڵ ناسـك، غـەدرو زوڵـم لێكـراو، نسـكۆی شـۆڕش و ڕەنجـی بـە خەسار، زامدارو بریندار لە ناخەوە.

دواتر گوتم جاریَ من خواحافیز، كاك عەلی رسولّ گوتی وەرە بزانم بۆ كویَ دەڕۆی، گوتم جاریَ دەچمە ئوتێلێك با بزانین چارەنووسمان بە كویَ دەگات، كاك عەلی گوتی لەگەڵ مندا وەرە ئوتێلێكی خاوێن و هەرزان پیَ دەزانم بۆ ئەوێت دەبەم، گوتم باشە، لە ڕێگا جەنتاكەی لیَ وەرگرتم، ئای كاك عەلی چۆن جەنتاكەی من هەڵبگری نابیَ، گوتی تۆ وەرە لێرە لەو ماڵە دەعوەتین نانێك دەخۆین دواتر دەچینە ئوتێلەكە، كە چووینە ژوور هەردوو ژنەكەی رووە رووم هاتن، كاك عەلی پێیانی گوت ئەوەش كاك موحسین بە هەموو عەقڵی خۆی ماڵی ئێمە لێرە بیَ دەیەویَ بچێتە ئوتێل، دەی ئەوە جنتاكەی و لە ژوورەی دانێن و با پێت بڵێم ئەوە (بورهان)ی برام و ئەوە (رشید)ی زاوام خۆی و ژنەكەی ئەوە (نەوزاد)ی برادەری من و تۆ هەمووومان لەو خانووە نان خواردن و خەوتن و حەوانەوەمان و چارەنووسمان بە یەكەوەیە تا بزانین دەگەین بە كویَ، كاك عەلی و خێزانەكەی هەمیشە شەرەف و گەورەیی و پیاوەتیان لی باریوە دڵ فراوان زۆر دڵسۆز بوونە بۆ هاوڕێكانی و دەوروبەرەكەی، نەیان هێشت نوقەیەك بكەم و تەسەلیم بووم، وەك بورهانی برای مامەلەی لەگەڵ مندا دەكرد، ژنەكانیان وەك دایك و خوشكی گەورەم و خوشكی گچكەم كە زۆریش شەرمم لێیان دەكرد هێندە ڕێزیان لیَ دەنام تا ماوم شەرمەزاریانم، بەڵیَ تەنیایم رەوییەوە بە بوونم لەگەڵ ئەو براو خیزانە بەڕێزە هەر چەندە كۆستە گەورەكەی نسكۆی شۆڕش بەردێكی زۆر قورس بوو بە سەر دڵمانەوە بەڵام دانیشتن و خەمی بە كۆ ئازارەكان سووكتر دەكات، لەو خانووەی كاك عەلی بە كرێی گرتبوو خاوەنەكەی كوردێكی خەڵكی

مەهاباد بوو زۆر دڵسۆز بوو وەك ئێمە خەمبارو دڵ سووتاو بوو، نهۆمی خوارووەی خانووەكەی بۆ ماڵی كاك عەلی چۆڵ كرد بوو كە ئێمەی تیا بوو بە حەوشەكەیەوە، لە هەمان ئەو خانووە گەورەیە دوو ژووری لە قاتی سەرەوەدا خۆیان تیا بوون واتە ماڵی ئەو كوردە رۆژهەلاتییە، شەوەكیان بۆ خەمرەوێنی ئێمە دەعوەتی كردین و كاك عەلی دەست والا كرد چەند لە برادەرو ئەوانەی پێی خۆش بێ دەعوتی ئەو شەوەی بكات، جا ئەو پیاوە مەهابادییە دەعوەتی هونەرمەند رەسووڵ نادری كردبوو بۆ چرینی گۆرانی و گوتنی قسەو نوكتەی خۆش، كاك (عەلی رەسوڵ)یش بانگی هەنەرمەند رەسووڵ گەردی كردبوو، ئیتر شەوێكی پڕ لە پێكەنین و گریان و خۆشی بوو، بە تایبەتی كە رەسوڵ گەردی و رەسوڵ نادری بە حەیران و گۆرانی لێكیان وەردەگرتەوە و جارجاریش رەسوڵ نادری خۆش مەشرەب بە قسە تەنز ئامیزەكانی هەموومانی دەخستە پێكەنین و خۆ لە بیر كردنەوە، ئەو كاسێتە تۆمار كراوەی ئەم شەوی ئێستایش لە لای كاك عەلی رەسوڵ ماوە، جا بەر لەوەی باسی چەند سەفەرێك بكەم كە كاك عەلی رسول من و كاك نەوزاد محەمەد عەلی موختاری لەگەڵ خۆیان دەیانبردم بۆ شارەكانی ئێران و پاشان دەگەڕاینەوە بۆ مەهاباد، هەر بۆ ئەوە بوو خۆمان لە بیر بكەین و هەندێك لەو خەمە گەورەیەی نسكۆی شۆڕش و رەنج بە خەساریمان بە با دەین واتە فێلمان لە خودی خۆمان دەكرد بەلام ناچاری بوو، بۆ ئەوە نوكتەیەكی خۆشم بیر كەوتەوە:

(كابرایەك تازە فڕنی دانا بوو دوو رۆژ بوو كەس نەدەهات نانێكی لێ بكرێ، لە پڕ كڕیارێكی لێ پەیدا بوو، پیاوێك بوو گوتی كاكە شەش ئەستووركم دەوێ، كابرای فڕنچی پێی گوت كاكە لە ریز بوەستە، پیاوەكە پێكەنی گوتی من تەنیام لە چ ریز بگرم، فڕنچی گوتی دەڵێم لە ریز

بوەستە، پیاوەکە گوتی باشە ئەوە چوومە ریزو وەستاوم، لەو سەری فڕنچیەکە لێی سوڕایەوەو شەقێکی سرواندە پشتی پیاوەکە، پیاوەکە پێی گوت ئەو شەقە چی بوو، فڕنچییەکە گوتی ئێ فڕنییەو قەڵباڵغەو پیاو شەقەێکیشی پێ دەکەوێ ئاساییە.. جا فڕنچی دەیویست قەناعەت بە خۆی بهێنێ کە فڕنەکەی بە هەڕمێنەو کڕیاری زۆرە، واتە خەمەکەی کەمیك دەڕوێنێتەوە) جا ئێمەش کە کورد جەربەزەیەو بێعارەو فێرە نسکۆو لێقەومان بووە بۆیە ئێمە هەمیشە دوو مرۆڤین لە گیانی یەك مرۆڤیماندا، جا لەو سەفەرانەی کە بۆ شارەکانی ئێران دەچووین هەم بۆ دیدەنی هەم بۆ خەمڕەوێنی لە ئەلقەی دواتر باسی دەکەم.

(٤٣)

ئێران و شارەکانم وا بینی لەو ماوەیەی بە ئاوارەیی تیا بووم لە ١٩٧٥ دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول کە هێشتا حوکمڕانی شاهنشایی بوو، ئازادیەکی تەواو هەبوو بۆ ئەو کەسانەی دژ بە ڕژێمەکەی نەبوون یان لەبەرەی یاخیبووەکانی نەبوون، شارە گەورەکانیان و شوێنگە گەشت و گوزارەکانیان بە ئاست و رادەیەك بوو، من لە دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دا زۆر لە وڵاتانی ئەوروپی و ڕۆژهەڵاتانم دیوە و دەتوانم بڵێم ئێران لەو سەردەمدا هێندە خۆش بووو گەشتیارانی هەموو دنیا روویان تێکردبوو وڵاتێکی دەگمەن و نموونەیی بوو لە جوانی و گەشتیاریدا، جا ماڵی کاك عەلی رەسوڵ ئاوابێ و تەمەنی درێژ بێ بۆ چەند شارێك سەفەرم لە گەڵیدا کرد بە هاوەڵی چەند لە هاوڕیانمان بۆ نموونە بۆ ورمێ / رەزاییە بەڕێز پارێزەر صلاح نەقشبەندی دەعوتی کردین کە خۆی لەوێ نیشتەجی بوو هەر چەندە ئەویش بە ئاوارەیی لەوێ بوو خۆمان ئاسا، بەڵام بەریزان عەلی رەسول و نەوزاد محەمەد عەلی موختار بەندە لەو سەفەرە دەعوتی شەوو رۆژانی بووین و لە دەریاچەی بەندێ کابینەی گەشتیاری بە کرێ گرتبوو جگە لەوەش ئاهەنگێکی گەورە لە فرۆدگای رەزاییە هەبوو کە کارتی ئاهەنگەکەی وەدەست هێنا بوو لەوێش لەو ئاهەنگە تا نیوەی شەو ئامادە بووین کە چێژێکی تایبەتی هەبوو وەك بیرەوەری لە مێشکمدا ماوەتەوە.

باس لە سەفەرێکی دی کە چێژم لـێ وەرگرتبـێ بەرەو ئەو شارانە چووین کە زیاتر تورکە عەجەمەکانی لێ نیشتەجێ بوون ئەویش هەر لەگەڵ کاك عەلی رەسوڵو نەوزاد محەمەد عەلی موختارو کاك قانعو بەندە، یەك لەو شارانەی تورکە عەجەمەکان بۆ نموونە (مياندواو) بوو، زۆرێك لە پیاوەکانیان کورتە بالاو تریاك خۆر بوون، ژنەکانیان بالابەرزو جوان، جا لە شەقامێك لە شەقامە تەسكو تروسکەکانی دەڕۆیشتین، پیاوێکی کورتیلە شەبقەیەکی لەسەر بوو هاتە پێشەوە لێمان هەر سێکیان کاك عەلی و نەوزادو قانع بالابەرز جگە لە من کە بەژنم مام ناوەندی بوو بوون بە تایبەتی کاك قانع زۆر بەرزو هەڵکەوتە بوو، کابرای عەجەم کورتە بالا بوو هەندێك بە تەمەنیش بوو تەوقەی لەگەڵ کردین سەری لە ناو قەدی کاك قانع بوو، هەر دەیویست دەمو چاوی قانع ببینیو قسەی لە گەڵدا بکات، هێندە نەمابوو شەبقەکەی لەسەری بکەویتە خوارەوە لەو سەر هەڵبڕینەیدا، گوتی (ماسلا.. ماسلا) جا یادی بەخێر رۆحی شاد بێ کاك قانع هەتا بە ژیانەوە بوو هەر جارەی ئەمدی کە دەمگوت (ماسلا.. ماسلا) دەیدایە قاقای پێکەنینو دەیگوت هەر باش بوو هەندێك بەو سەفەرانەی لەو کارەساتە نسکۆیەی دیمان، خەمەکانمان دەرەواندەوە.

راپەرینو نائارامیمان واتە دەتوانم بڵێم بە ناوی هەموو کوردان کە نسکۆمان دی قسە بکەم کە یەك پێوانە بوو بە جیاوازی کەمێك ئەمیان لەگەڵ ئەوەی تر چونکە کۆژانەکان هاوبەش بوون ئەگەر فێڵمان لە خۆمان دەکرد دڵدانەوەمان دەکرد، جا سەبارەت بە خودی خۆم کە لەم کورتیلە شیعرەدا هەستی خۆم دەربڕیوە لەو کاتانەی لە مەهاباد بووم نووسیومە لە دیوانی شەوارەمو هەروا لە لاپەڕە (٢٤) لە کۆبەندی کارێزە مەرجان دا لەبەرگی یەکەمدا لە ٢٠١٤ چاپ بووەو هەیە، کە تیایدا هەستی خۆم

دەربڕیوە چۆن هەمیشەو رۆژانە مەقەست لە گوریسەکانی هەستم دەدریٚ و سمۆرەکانی خۆشنوودیم جوانەمەرگ دەبیٚ کاتیٚ دەڵێم:

لەرزم لێیەو
پەناگەی ئەم کەلاوەیە، رووتەو گەرمم ناکاتەوە
تۆو خوا ئەی خۆر
گوریسی تیشکەکانت شۆڕکەوە
با سمۆرەی تەزووی سڕم پێت هەڵگەڕیٚ
بە سەر ئەم پەڵە هەورانە، بازە جلیتە ڕەو مەکە
لە میانی ئەمو ئەویاندا
لەسەرخۆ بڕۆو ڕامەکە
تۆ نازانی ئەم پەڵە هەورانە
چۆن مەقەستیٚ لە گوریسەکانت ئەدەن
سمۆرەکانم جوانە مەرگ دەکەن

***

لەگەڵ نسکۆی شۆڕش ١٩٧٥ زۆرێك لەسەرکردەو کادیرە پێشکەوتووو پێشمەرگەکان تەسەلیم بە رژێمی بەعس بوونەوە وەك (حەبیب محەمەد کەریم کە سکرتێری پارتی بوو، ساڵح یوسفی و دارا توفیق ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی بوون ئیتر بە دوایدا هات کاك عەلی بە من و کاك نەوزاد و کاك رشیدی زاوای و بورهانی برای پێی ڕاگەیاندین کە چیتر چاوەڕوانی نەکەین باشە خۆمان تەسەلیم بە عیراق بینەوە تا لێبووردنی گشتی هەیە، نەوەك ئێران تەسەلیممان بکاتەوە، دیار بوو لەگەڵ گروپێك لەسەرکردایەتی پارتی و کادیرە پێشکەوتووەکانی پارتی رێك کەوتبوون

دوای ئـەوەی سـەیدا سـاڵح یوسـفی پەیوەنـدی پێیانـەوە کـرد بـوو لەگـەڵ لێپرسـراوانی رژێـم زەمینەیـەکی رەخسـاندوو بـوو بـە کـۆ ئـەو گرووپـە بگەڕێنـەوەو لەسـەر سنوور رێزیـان لێ بگیرێـت و لێپرسینەوەیان لـە گەڵـدا نـەکرێ بۆیـە لـە شـەوێکدا چەند کۆسـتەریك گـیرا بـوو ئەوەنـدەی لەسـەر سـنوور خـۆم لـەو نێویانـدا بینیـەوە تیکۆشـەران عەلـی هـەژارو عومـەر دەبابـەو عەلـی عەسـکەری و دکتـور خالـد وسـاڵح شـێرەو شەمسـەدین موفتی و هـەتا نـاوی فارس بـاوەی سەرلەشکری دەشتی هـەولێریان هێنا جگـە لـە سـەدان کـادیرو لێپرسـراوانی بـاڵای پـارتی کـە لەسـەر سـنووری عـیراق ئێـران وەسـتا بـووین وەك خـەڵکانی دەنشـتوانی هـەولێرو شارۆچـکەکانی کـە لـە حـاجی ئۆمـەران ناوەکانمـان تۆمـار دەکـراو ئیـزن دەدراین بەرەو شارو مەنزگاکانی خۆمان بگەڕێینـەوە، بـەڵام چیمان نـەدی بەو بەیانییە زووە سوپای عیراقی لـە حاجی ئۆمەران راهێنانیـان دەکـردو دروشـمـەکانیان وحـدەو حریـەو أشـتراکیەو ئومـە عربیـە واحیـدە.. هتـد، هونەرمەندی حەیرانبێژ رەسوڵ گەردی لـە تەنیشتمەوە بوو، دایـە پرمـەی گریـان گـوتی دەبـا وات لێبـێ عـەنیفۆك، دواتـر زانـیم دیـار بـوو مەبەسـتی عەنیف واتە دایکی، کە هاوڕای کرد بوو بە کوردستان و لێ قەوماویمان، لە ڕێگـا هـۆش و خـەیاڵ وەسـتا بـوو لـە هەسـت و سـەرماندا بـەنج ببـووین لـەو کۆسـتەرەی بـەرەو هـەولێر دەگەڕاینـەوە، من و کـاك نـەوزاد محەمـەد عـەلی موختار لە ناو هەمان کۆستەر لە تەنیشت یەك دانشتبووین کە لە ئێرانەوە شـەو بـەرێ کـەوتبووین و کۆسـتەرەکە ئـەو هـەموو لێپرسـراوو کـادرە پێشکەوتووانەی پارتی لە خۆ گرتبوو، تا گەیشتینە ناو هەولێر لەبەر دەم پارێزگای هەولێر دابەزین نوقەمان لـێ بڕا بـوو، هـیچ قسـەیەکمان بۆ نـەما بوو، وا دیار بوو کەس و کاری گەڕاوەکان ئەوانەی دەگەڕانەوە لە ئێرانـەوە

به ناوی (گەڕانەوە بۆ ریزی نیشتمانی بە پەشیمانی) جەماوەرێکی زۆر وەستا بوون، ئەوەندە دەزانم کە دابەزیم لەو کۆستەرەدا ئێستایش نازانم کێ جەنتاکەی لە دەست وەرگرتم‌و ماچی کردم‌و بەخێر هاتنەوەی کردم واتە کەس‌و کارم بوون، دایکم‌و برام‌و خوشکم لەوێ وەستا بوون لەبەرئەوەی ماڵیشمان نزیکی پارێزگا بوو لە گەڕەگی عارەبان، پیان گوتم هەر ئاوا وەستا بووین گوتمان بەڵکو ئەو هەموو پێشمەرگەو کادیرو خەڵکانە لە کۆسترو ترومبێلان دادەبەزن بەڵکو کوڕەکەی ئێمەش بریاڕی گەڕانەوەی داوە کە لەو بڕوایە نەبووین تۆ بگەڕێیتەوە.

شەو لە ماڵ بووم زۆر لە خزم‌و ناسیاوو هەتا دراوسێیەکانمان هاتنە لام‌و لە دەوروبەرم کۆ ببوونەوە باسی ئەو نسکۆیەو کارەساتی بە سەر هاتوومان دەکرد، دوای ئەوەی درەنگانی شەو دایکم‌و براو خوشکەکانم مابوونەوە، دایکم پێی گوتم خۆزگە هەر لە ئێرانەوە بۆ خۆت بچووبای بۆ هەر وڵاتێك نەگەرابوویتایەوە بۆ ئێرە، ئێمە هەر چۆنێ بێت دەژیاین بە سەربەرزی ئەوە براگەورت جەلال بە ماڵ‌و منداڵەکانییەوە لەبەرامبەر ماڵی ئێمەن‌و هەروا تەحسینی برات لە ماڵە وجاجێڵەو لەگەڵ هەر سێ خوشکت هیچ گرفتێکمان نییە، من لە دایکم ڕا دەبینی وا بڵێت چونکە شەرمی پێ بووە کە کوڕەکەی تەسەلیم بێتەوە، منیش لە لای خۆمەوە وام بیر دەکردەوە باوکم نەماوەو تەحسینی برام قوتابییەو لە قۆناخی ناوەندییەو سێ خوشکم قوتابین، ئێ برا گەورەکەشم فەرمانبەرەو خاوخێزانی بە سەرەوەیە ئەگەرچی باری ئابووری باش بوو، دەنا خۆ هەر زوو لە نەغەدە ئیستمارەی ئەوەم پڕ کردبۆوەو واسیتەشم هەبوو بۆ ئەمەریکا ناویشم دەرچوو بوو لەوێ بە پەناهەندە نیشتەجێ بم‌و خوێندنیش تەواو کەم.

(٤٤)

(١٩٨٠- ١٩٧٥)

لە دوای تەسەلیم بوونەوەمان زۆر پەشیمان ببوومەوە کە گەڕاومەتەوە بەلاّم وەك لە ئەلقەی پیشوودا ئامـاژەم پێکرد ناچار بووم، هەروەها حالّەتێکی کۆو دەستەجەمعی بوو بۆ هەموو کوردانی باشووری کوردستان، جا گەڕامەوە سەر وەزیفەم کە فەرمانبەر بووم لە پەروەردەی هەولێر، بێ سەرو هۆش، رۆژم بەڕێ دەکرد، دووو سێ مانگ بە ئاسایی تێپەڕی، دایرەی پەروەردە لە نزیك سایلۆ بوو کە کاتی خۆی بەشی ناوخۆی قوتابیانی قۆناخی ئامادەیی و دار المعلمین /ی کوڕان بوو، چەند کۆبوونەوەیەکی نهێنی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی لێ دەکرا لە شەستەکان و هەفتاکاندا، جا لەو دایرەیەی پەروەردە رۆژێکیان ئەفسەری ئەمنی دایرە کە جێگری بەڕێوەبەری پەروەردەش بوو (ئەیاد) ناوێك بوو عەرەب بوو بانگی کردم و پێی گوتم ئێستا بڕۆ بۆ دایرەی ئیستخبارات کە ناونیشانەکەی لەو خانووەی کۆنە مالّی (موحسین دزەیی) یە لە هەوراز مالّی بەڕێز رەشاد موفتی یە، مەترسە تەنیا چەند پرسیارێکت لێ دەکەن و وەلاّمیان دەدەیتەوە، گوتم باشە دەچم، هەر لەو ژوورە هاتمە دەر، فەرمانبەرێکمان لە لا بوو عەرەب بوو ناوی (هیشام) بوو بەعسی نەبووو بە سزای ئیداری دوور خرابۆوە لە بەغداوە بۆ هەولێر، ببووین بە هاوڕێ جار جار کتێبم دەدایێ و باسی ئەدەب و رۆشنبیرمان دەکرد، کە منی دی،

گـوتی وەرە، لـە دایـرەی ئیسـتخبارات یـەکێك لەوێیـە ئەفسـەرەو نـاوی (صبحی)یە خزممەو پرسیاری تۆی لە من کردووە ئەگەر بانگ کرای بۆ ئەوێ بە من بڵێ تا تەلەفۆنی بۆ بکەمو ئاگای لێت بێ لەو لێکۆلیەوەی لە گەڵتدا دەیکەن، گوتم ئەرێ وەڵڵە ئێستا دەبێ بڕۆم بۆ ئەوێ بۆ ئەو بابەتەش (ئەیاد) بانگی کردوومە، گوتی باشە تۆ بڕۆو منیش هەر ئێستا تەلەفۆن بۆ صبحی دەکەم، چووم بۆ ئەوێ، کە چوومە ژوورەوە لە پرستگەدا گوتم من فلانم لێرەوە بانگ کراوم، یەکسەر یەکێکی بانگ کردو بە عارەبی پێی گوت بیبە لای (صبحی)دیار بوو لێکۆلینەوەکە هەر لە لای ئەو دەکرا، منیش لە قسە کردنو نووسین بە عارەبی زۆر باش بووم، دوای ئەوەی لە لای ئەو دانیشتم، پێی گوتم مەترسە ئێوە سوودتان لە لێبووردنی گشتی وەرگرتووەو هیچتان لێ ناکرێ، دوێنێ یەکێك وەکو تۆ کە بانگمان کرد بوو ئەویش رۆڵی لێپرسراویەتی هەبووە لە حزبو راگەیاندنو شتی تر، بە دوورو درێژی باسی تۆی کردووە ئیتر پێویست بەوە ناکات هیچ پرسیارێکت لێ بکەم، تەنیا ئەو ئیستمارەیەت دەخەمە بەر دەست (٣٢) پرسیاری تیایە وەڵامەکان بنووسەوە، من دەزانم کوڕەکی باشو نووسەرو بێوەی بووی باسی تۆیان بۆم کردووە مەترسە، هەموو پرسیارەکانم وەڵام داوە بەڵام بە وردی بۆ ئەوەی وەکو کەسی پێش خۆم نەهاتم ناوی کەس بهێنم کەس تاوانبار بکەم، دواتر پەنجەی پێ مۆر کردم بە ئیستمارەکەم وەناو گوتی فەرموو بۆ سەر کاری خۆت بەڵام شتێکت لێ بەدی بکەین سزاکەت قورس دەبێ.

لەوە ماوەیەدا وەکو هەموو کوردێکی دڵسۆز دڵ بە خەمو راڕاو نائارام دەژیامو لە دایرەی پەروەردەی هەولێریش دەوامم دەکردو جار جار ئێواران دەچوومە چایخانەی عەبۆ قاوەچی، تازە جموجۆڵی حزبی

سۆشیالستی دیموکراتی کوردستان دامەزرا بوو بە تایبەتی لە لایەن ئەوانەی دوور خرابوونەوە بۆ شارو شارۆچکەکانی ناوەڕاستو باشووری عیراق کە بەڕێزان عومەر دەبابەو دکتۆر خالدو عەلی عەسکریو ڕەسولْ مامەندو عەلی هەژارو کاردۆ گەلاڵیو مامۆستا سعد عەبدوڵلاو سید کاکەو عەلی ڕەسولْو چەندین کادیرانی ناوداری پارتی تیایدا بەشدار بوون کە شەهید سەیدا ساڵح یوسفی لەگەڵ ئەم ڕێکخستنە بوو، داوای لێبووردن لە دەیان ناوی تێکۆشەرانی دی دەکەم کە بواری ئەو هەموو ناو ریزکردنەم نەبووەو نەکراوە لەو نووسینەدا ناویان بهێنم یان ناوەکانم لە یاد نەماون، هەروا لە شارەکانیش گەلێك لە کۆنە پارتیو هەڤالانی دلْسۆز چووبوونە ریزی ئەم ڕێکخستنە جگە لەوەی کۆمەڵەی ڕەنجدارانی کوردستانیش جموجۆلی پەیدا کرد بوو، لەو ماوەیەدا هاوریەتیو دانیشتنی ئێوارانم بە تایبەتی لەگەڵ شەهید نوری نانەکەلی بوو کە ئەویش هاوسۆز بوو لەسەرەتادا لەگەڵ حزبە تازەکەی سۆشیالستی دیموکراتی کوردستان، پارێزەر بووو لە خانوویەکی بە کرێدا بوون لە شەقامی مزەفەرییە لەگەڵ بەڕێز پارێزەر فارۆق جمیل، زۆر جاریش شەهید کاردۆ گەلاڵی دەهاتە ئەو بنایەو باسی وەزعمان دەرکردو باسی خۆڕاگریو خۆ نەدۆڕاندن، بەلام ئەوەی داوای لێ کردبم بۆ نێو ڕێکخستنی سۆشیالستی هەردوو بەڕێزان مەلا ناصحو سید مجید گردعازەبانی بوو کە لە چایخانەی عەبۆ قاوەچی دادەنیشتن جار جار باسی وەزعی کوردو مەغرور بوونی بەعسو سیاسەتی تەبعیسو تەعریب کردنیانمان دەکرد، ئەوە بوو بەو بارە داکەوتەوە زۆربەی ئەو سەرکردەو کادیرە پێشکەوتووانەی ناوم هێنان چوونە شاخو ناوو ریزی پێشمەرگایەتیان هەڵبژارد، ئەوانەی لە شارەکانیش مانەوە بە

وەڵامی من: بەڕێز من بە پێی خۆم هاتووم، ئەگەر هەر پەیوەندێکم لەو جۆرە پەیوەندیانە هەبووایە نەدەهاتمە ئێرە، دواتر یەکێك وەك بەڕێزت ئێستا لە نێوانی گفتوگۆو قسەکانم تەرجەمەی هەموو قسەو ڕێڕەوو ڕایەڵەکانی دەمو چاوم دەکەیت، تۆ ئەفسەرێکی لە زانستی دەروونیت خوێندووەو زیرەکی، نەك وەك ئەفسەرێکی مەسلەکی کۆن، پاشان با پێت بڵێم خەڵکانێك کە بێرەدا بیانەوێ تێپەڕ بن، دەچن لە کۆڵانی بەرامبەرتان دەڕۆن نەك بە پێش دایرەکەتان، بەڵام من قەت لەو دایرەی ئێوە ناترسم، چونکە منیش فەرمانبەرێکی حکومەتم ئێوەش هەر وا، بەڵام بە پێی موقعی وەزیفی و کارەکان جیاوازی هەیە، ئێرە وەك دایرەیەکی ئاسایی تەماشای دەکەم.

ئەو: بەین نا بەین وەرقەیەکی لەبەر دەم بوو یەك فۆڵسکاپ بوو سەیری دەکردو وەریدەگێڕایەوە سەر مێز پێدەچوو ئەو ڕاپۆرتە بێت کە لەسەرم نووسراوە، لەوەوەش زانیم ئەو ڕاپۆرتە لەبەر ئەو شەوە بووە کە تاریەر تۆفیقم وڕووژاندووە، چونکە گوتی تۆ شاعیری و شیعرەکانت بۆ وڕووژاندی خەڵکە بۆ پاڵ پشت کردنی یاخی بووانی شاخ، لە هەر بۆنەیەك دەتەوێت ئاگرێك داگیرسێنی دژ بە شۆڕش و دەستکەوتەکانی ١٧ی تەممووزو خەڵکێك هان بدەی بۆ ئەو مەبەستە.

وەڵامی من: نەخێر بەڕێز ئەوەی ئەو ڕاپۆرتەی لەسەر من نووسیوە، مەبەستی بووە چالاکی خوی وەدرخات و بە بێ چالاکی نەبێت دەنا ئەو کەسە خزمەتی یاخی بووانی شاخ دەکات نەك من، بەڵام لە پەنای ئەو ڕاپۆرتانە ئیشی خۆی دەکات وەك کەسێکی بەرژەوەندخوازو دوو فاقی.

ئەو: سەیرێکی منی کرد ئەوەندە ئازاو بێ منەت بە عارەبیەکی ڕوان قسە دەکەم و قسەکانم زۆر ڕێك و پێك بوو، هێندەی نەما بوو بڵێت بەخوا

ڕاست دەکەی... دواتر ڕووی تیێ کردمو گوتی کوڕم، من لە سیدەکانی نعێمیم، خوشکی سید غنیو سید غانم کە دراوسیێ بوونە دیوارتان پێکەوە بووە، سید غنی لێرە بوو پرسیاری خاوخێزانی تۆم لێ کردووە، زۆر مەدحی ئێوەی کردووە، تۆ فەرمانبەریو باوکت نەماوەو دایكو خوشكو براکانت بە خێو دەکەی، وا مەکە جارێکی دی بێیتەوە ئێرە، ئەمجارە بە دەستبەستراوی دەتهێنن، وا بە ئاسانی لێرە دەرناچی، ئاگات لە خۆتو نووسینو دانیشتنەکانت بیێ... فەرموو بڕۆوە سەر کاری خۆت.

خۆ من بەو بانگ کردنو چاو سوور کردنەوانە یان هەڕو گیڤو ترساندن، ئەو عیشقە کوردایەتییەی لە گیانمدا کەڵەکە ببوو، پاشەکشەم لێی نەدەکردو نایکەم، ئەوە بوو پاش ئەو بانگ کردنەم هەر لە ١٩٧٩ ئەو شیعرەم نووسی لەسەر شەهید بوونی پێشمەرگەیەك کە پێشمەرگەکانی دی فریای دەکەون لاشە پیرۆزەکەی ڕزگار دەکەن لەگەڵ خۆیاندا دەیبەنەوە دەینێژن، بە شێوەیەکی هێما ئامیزی هۆنیمەوە کە بڵاوی بکەمەوە بەڵام وا دەرکەوت کە چیرۆکەکە ناشاردرێتەوەو بڵاوی ناکەنەوە ناچار بووم لێرەو لەویێ بۆ دڵسۆزانو نووسەرانی متمانە پێکراو بیخوێنمەوە، هەندێك لە برادەران پیان دەگوتم لەسەر مێزی دانیشتن بۆ دەخوێنییەوە هەر نا دەوروبەرت گویان لێ دەبێت، تۆ تازە بانگ کراوی لە دایرەی ئەمن، ماوەیەك ئاگات لە خۆت بیێ.. جا ئەمە ئەو شیعرەیە کە باسم لێیەوە کرد:

**تیشکی شەودڕ**

**کە شەو داهات**

**تاریکییە ستەمکارو خاوەن شکۆ**

بەلاَم ئەستێرەش هەن
دادەگیرسێن وەکو پشکۆ
***
دوێنیٚ شەو، لە پڕ ئەستێرەیەك پڕژا
هێلکەییٚ ئاسا، سیماو قەپێلکی تێکشکا
ئەستێرانی دەورووبەری،
بە تیشکی نووك تیژی خۆیان
لە نێو زگی تاریکی شەودا، گۆڕیاند هەڵکەند
تەرمە برۆنزییەکەیان شاردەوە
بە دەم سروودی بەرەو بەیانی‌و نەمانی تاریکی
بۆ بنکەکانیان گەڕانەوە

(٤٩)

## ١٩٧٥ - ١٩٩١

ئەگەرچی لە ١٩٨٣ تا ١٩٨٤ مفاوەزات هەبوو لە نێوانی یەكێتی نیشتمانی كوردستان و رژێمی صدام بە نێوەندگیری و دەسپێشخەری شەهید عەبدولڕەحمان قاسملو، بەلاّم سەری نەگرت و شەڕی نێوان رژێمی عیراق و كورد ١٩٨٤ دەستی پێكردەوە، جا ئەو حكومەتەی عیراق لەگەلّ ئەوەی پەیوەندی بتەوی لەگەلّ یەكێتی سۆڤیەت و ولاّتانی بیانی و عەرەبی بە هێز بوو نەوتە بە نرخە گرانەكەی و داراییە زۆرەكەی و خەزینەی لەسەری دەڕژایەوە و بە تیكەلّبوونی بەرژەوەندییەكان، هەموو دنیا لەو تاوانانەی دەیكرد بێدەنگی و چاوپۆشیان لیّ دەكرد، بە دەیان فرقەی سەربازی هێنایە كوردستان، هەروەها بە سەدان فەوجی جاشی خەفیفەی دروستكرد، هەلّبەتە كە لە (١٩٨٠)وە شەڕی نێوان عیراق و ئێرانیش دەستی پێكرد و بەردەوامی هەبوو، ولاّتانی عەرەبی و ئەمریكا و ئەوروپا دەستكراوە بوون بۆ یارمەتی عیراق دژ بە رژێمی ئێران، ئەو ئامر فوج و موستەشارە جاشانەی قەید دەكران جگە لەو چەكدارانەی كە دەوامیان دەكرد لە شەڕەكانی باشووری كوردستان بە كاریان دەهێنان ئەمە لایەكیان بوو، لە لایەكەی دی موچەی ئەو جاشانەیان بۆ خۆیان وەردەگرت كە تەنیا دەفتەر خدمەیان بۆ پڕ كردبوونەوە نەدەچوونە ڕاژەی سەربازی لە مالّ دادەنیشتن یان كارو كاسبی خۆیان دەكرد، دەبا نوكتەیەیەكی بە سەر دابكەم، یەك لەو موستەشارە جاهیلانە لە شاری بەغدا لە بارێك دادەنیشیّ چەند جاشێكی لەگەلّ دایە بۆ ئەوەی مەی بخواتەوە، بۆیەكە یان بلّێین گاڕسۆنەكە دیّ و بە عارەبی پێی دەلّیت چیت

بۆ بێنم، موستەشارەکەیش دەڵێت (بیرە) گارسۆنەکە دەڵێت (عدنا، واتە هەمانە / فریدە - شەهرەزاد - لۆلۆە - کەهرمانە) موستەشارەکە دەڵێت (هەسە جیب بیرە بعدین قەحپە) واتە ئێستا بیرەکە بێنە دواتر قەحپە، وا تیگەیشتووە ئەو ناوانەی بۆی ژماردووە، ناوی ژنانە نەیزانیوە ناوی شووشە (بیرە)کانن. هەروەها لە هەولێر بارێك هەبوو بە ناوی (قصر الشمال) موستەشارێك دادەنیشی بۆ ئەوەی خۆی مەست کات، بیرەیەك دەخواتەوە بانگی یەکێك لە بۆیەکان دەکات پێیی دەڵێت (بۆیە.. چاقا من سوور بووینە، بۆیەکە دەڵێت نەخێر، سمیلاً من گڤ- بووینە؟ بۆیەکە دەڵێت نەخێر، هەرە سەباب بیرەکا دی بینە)، یەکێ لە سیاسەتە چەپەڵەکانی دی بەعس ئەوە بوو، شەوکەت و کەسایەتی و هەژموونی گەنجی کورد بشکێنێ دەنا چاك دەیزانی ئەو گەنجانە ناچنە ریزی سەربازیی و بەشداری شەڕەکان ناکەن و دەفتەر خدمەیان بۆ پڕ کراوەتەوە و ئامر فوج و موستەشارەکان موچەکانیان بۆ خۆیان وەردەگرن، ئەوەتا ساڵانێکی زۆریش بە سەر ئەو سەردەمو رۆژگارە تێپەڕیوە، ئەوانەی دەفتەر خدمەکانیان بە جاش پڕ کردۆتەوە هەست بە نقص و حاڵەتی دەروونی و داشکان و شەرمەزاری دەکەن.

- هەڵبەتە ئەوەی نووسەرو هونەرمەند بوو، ئەوەی رۆشنبیرو هەر کوردیکی دی لە هەرچین و توێژێك بوو بێ کە رۆحی کوردایەتی و جوامێری و خۆڕاگری و خاوەن هەڵوێست بوو بێ ئەو ئامادەییەی تیا نەبووە بە ناوی جاش و ئەفواج خفیفە دەفتەر خدمەکەی پڕ کاتەوە یان تەتوع و یان ببێ بە بەعسی جا ئەو جوامێرانە لە وزیفە دادەبڕان یان فەسل دەکران و بە هەژاری و خۆ حەشاردان و پاڕایی بە خوی و خانەوادەکەی بەو ناخۆشییەوە دەژیان، بەڵام هەڵبژاردنەکەیان کارێکی

شەڕەفمەندانە بوو لەو سەردەمو ڕۆژگارەدا، جا (تەحسین)ی برام لە خۆم گچکەتر تەمەنی بیست ساڵان بوو ئەوکات زیاتر هاوسۆز بوو لەگەڵ پارتی لە مانگی ئاب / ١٩٨١ دا چووە ریزی شۆڕشو لەوێش پەیوەندی کرد بوو بە خزمەکانمو لە لای کاك شێخ اللە ئیبراهیم گیرسا بۆوە، ماوەیەك لە (ڕاژان – ئێران) بووە لە بارەگاکانی پارتیو پاشان گەڕاوەتە ئەو دیوەی باشووری کوردستان لە (توتمێ) لە ناوچەی خۆشناوەتی پێشمەرگەیەکی چەکدار بووە هەر لەگەڵ کاك شیخ اللە بووە، جا دیسانەوە دەبێ گوێ لە ناڵەو ئازارەکانی دایکم بگرم بۆ ئەو کوڕە گەنجەیو پێشتریش کەم ئازاری نەکێشاوە بە دەست منو برا گەورەکەم، بۆ نموونە کاتی خۆی کە من لە شاخ بوومە لە ١٩٦٩ ئەو کات تەمەنم (١٧) ساڵان بووە لێیی دەگێڕنەوە کە باران باریوە چووە لەبەر باران دانیشتووە گوتویەتی ئێستا (موحسین) بارانی لێ دەداو سەرمایەتی با منیش لێرە لەبەر باران لەو سەرمایە دانیشم، کەچی ئەو کاتە دڵی دامرکایەوە کە بە نهێنی هاتمە شەقڵاوەو منی دی لە ئەڵقەکانی پێشتر باسم کردووە ئینجا هەندێك خەمەکەی ڕەوییەوە، بەڵام دیسان ئەوە خەمێکی دی سەری هەڵدایەوە بە تایبەتی کە لەو ناوچانەی خۆشناوەتی جگە لە شەڕو کیمیا بارانکردنی ڕژێمی بەعس، ململانێو شەڕی کورد بە کورد، پێشمەرگە، پێشمەرگەی شەهیدو بریندار دەکرد لەبەرئەوەی جیاواز بوون لە بیرو بۆچوونی هەمە جۆر، جا ئەم دایکە کلۆلەم بەو شاخانە دەکەوتو لە زۆر شوێندا بە پای پەتی بە ناو دارو بەرد دەکەوت، خواردنو جلکی پێ بووە تا بگاتە ئەو کوڕەی (تەحسین) لە پاڵ ترسو گرتنو ئەو ڕاڕاییەی هەیبووە، جا منو براکانم ئەو ژیانە پڕ سەروەریمان هەڵبژارد بوو سەربازی بۆ ڕژێم نەکەین، نەبین بە بەعسیو جەیشی

شەعبی و تەتەوعیش نەکەین ئیتر دەبێ لە کوێدا خۆمان بدۆزینەوە، من زیاتر لە ١٠ساڵان لە وەزیفە دابڕام و (تەحسین)یش هەشت ساڵان لە وەزیفە فەسڵ کرا، (جەلال) ی برا گەورەشمان کە لە دادگا فەرمانبەر بوو دەستیان لێیی بەر نەدەبوو چونکە لە کارەکەی زۆر زیرەك بوو، جارێکیان دادپەروەرێك لە رۆژنامەدا نووسیبووی جەلال رەشید واتە قاموسی دادگا، بۆیە لێ نەدەگەڕان فەسڵ کرێ بەلاّم سزای ئیداریان دەدا، چەند ساڵێك لە دادگای هەولێر گوازرایەوە بو دادگای شارۆچکەی رواندزو چەند ساڵێکیش بۆ دادگای شەقلاوە.

بەڵێ دوای ئەوەی بیستمان کە شەڕی قڕناگەو پشت ئاشان و شەری نێوان پێشمەرگەکانی پارتی و یەکێتیی و سۆشیالیست و شیوعی و برا کوژی و ململانەکانی توندو بێ ماناکەی لە شاخدا رەخسا، برادەرانی پارتی لە گوندی توتمێ بەرەو شێرکاوە ڕۆیشتبوون جا (تەحسین) برام لەگەڵ کاك شێخ اللە ئیبراهیم بوو کە لە شێرکاوە گیرسابوونەوە لەو کاتەشدا لێبووردنێك هەبوو ئەوانەی بیانەوێ بگەڕێنەوە ناو ماڵی خۆیان جا لەبەرواری ١٩٨٣/٨/١٨ بڕیارمان دا بچینە شێرکاوە بۆ هێنانەوەی (تەحسین) لەگەڵ برا کوژی نەبین.. بۆ ئەو مەبەستە یادیان بەخێر ڕەوانیان شاد (جەلال)ی برام و (عەلی حەسەن)ی ئامۆزاو بەندە، بە پیکابیکی تویتەی کاك عەلی چوینە رواندز پەیوەندیمان بە کاك صدیق عەلی باویل ئاغا کرد، ئەویش ئێمەی بردە لای ئەفسەرێکی ئیستخبارات ناوی (حوسێن، أبوعلی)یان پێ دەگوت، پێمان گوت کوڕێکی گەنجەمان فیرارێکی سەربازییە لە گوندی شێرکاوە دانیشتووە دەمانەوێ سوود لەو لێبووردنەی حکومەت وەرگری و لەگەڵ خۆماندا بیهێنینەوە، (حوسێن)ناوەکە گوتی من وەرقەتان بۆ دەکەم بیهێننەوە بۆ لای من، بەلاّم

دەزانم چەكدارەو ئاوا دانەنیشتووە كە نەچێنە راژەی سەربازی، هەروەها دەبێت چەكەكەی بهێنێتەوە، گوتمان چەكدار نییە وچۆن چەك بهێنیتەوە، گوتی لەبەر خاتری كاكە صدیق یارمەتیتان دەدەم كە هێناتانەوە لێرە تفەنگێك یا كلاشنكۆفێك بكرن و تەسلیمی منی بكەنەوە لەگەڵ كوڕەكەتان، بەو حاڵە ڕازی بووین و وەرقەی ڕێگا پێدانی بۆ كردین ئێمەش چووین لاشەیەك گۆشتی كاوڕو میوەو برنج و رۆن و چەند پێداویستێكی دی خستمانە نێو پشتی پیكاپ تویتەو ڕۆیشتین بە (دار سلام)و (جوزان) ڕەت بووین سلاۆمان لەو پێشمەرگانەی برایانی شیوعی كرد كە لە گوندی جوزان بوون دواتر گەیشتینە نێو (شیركاوە) لە كاتی نیوەڕۆ ٢١/٨/ ١٩٨٣ بوو، لە بن دارێكدا رەوانشاد مامۆستا محەمەد مەلا قادرو كاك شیخەاللە ئیبراهیمو كاك مغدید كە ناوی باوكی نازانم دانیشتبوون، دابەزین یەكترمان ماچ كردو چاك و چۆنی، كە چاویان بەو خۆراك و كەل وپەلە كەوت گەشانەوەو زۆریان پێخۆش بوو، مامۆستا محەمەد گوتی كوڕە یاخوە بەخێر بێن خۆ ئەمجارەش چاوم بە كاك موحسین كەوتەوە برایان ئێوەش ئازیزن بەلأم لە شەستەكان كاك موحسین تازە مووی لێ دەهات لە هیران لە لای ئێمە مامۆستای شۆڕش بوو، پاشان ڕوومان لە كاك شێخ اللە كردو پێمان گوت هاتووین و لێبووردنێكیش هەیە (تەحسین) ببەینەوە لەگەڵ خۆماندا، كاك شیخ اللەو مامۆستا محەمەد گوتیان بە ڕاستی زۆرمان پێناخۆشە بەلأم ئێوە هاتوون چارمان نییە، بە بێتەڵ لەگەڵ سەر شاخی بەرامبەریان قسەیان كرد با (تەحسین) بێتە خوارەوە كەس و كاری هاتوون، دوای نیو سەعات گەیشتە لامان و ماچمان كرد، ئەو كات ترسی كرۆنا نەبووە ماچ كردن ئاسایی بوو، دواتر كە گەیشتینەوە رواندز لای كاك صدیق علی باویل ئاغا، كلاشنكۆفێكی

هەرزان نرخی بۆ کڕین‌و چووینەوە لای (حوسێن) ناوێك كە لێپرسـراوێك بوو لە ئیستخباراتی عەسکەری لە رواندزو سۆران، (چەك‌و تەحسین)مان تەسەلیم کرد، ئەویش هەندێك فشەی کردو متمرد واو وا.. هتد، پاشان وەرقەی تسەلیم بوونەوەی بۆ کردو گوتی دەگەڕێتەوە سەر وەزیفەی خۆی پێشتر تەحسین فەرمانبەر بوو لە دایرەی تەلەفۆنات بەو پێیەی لە دەرچووانی بەشی ئیتصالات بوو لە پەیمانگەی بەغدا خوێندنی تەواو کردبوو، هەروەها پێی وت دەچییەوە ریزی ڕاژەی سەربازی، ئێ خواحافیزیمان کردو گەڕاینەوە هەولێر، تەحسین بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەسەربازگەی هەولێر دەوامی کرد، جێگاکەی زۆر باش بوو، لێپرسراوەکەی عقید جاسمی ناو بوو، هاوڕێیی دکتۆر نەوزاد خۆشناو بوو، لە رێگای کاك نەوزاد کە بە عەقیدی ناوبراوی گوتبوو ئاگای لە تەحسین بێ، هەر زوو مۆڵەتی حەوت رۆژی پێداو گوتی تا من لێرە بم لێناگەڕێم بۆ هیچ شوێنێك بیگوازنەوەو دوورە لە جەنگ‌و یارمەتی دەدەم، لە بەشی چاك کردنەوەی هێلی تەلەفۆناتی دانا بوو، بەلاّم (تەحسین) هەر زوو ڕۆژێکیان هاتەوەو گوتی تەواو منیش وەك ئەو خەڵکە لە ئێستاوە فیرارم‌و تەواو، ناچار هەولّمان دا لە لای پڕۆژەی پەلەوەری (ئەحمەد ئیسماعیل) دایمەزرێنین کە چەندەها فیرارو یاخی بووانی تیا دەحەوایەوە لێرەو لەوێ، دواتر ئەو هەڵوێستە جوامێرییەی کاك ئەحمەد بە دوورو درێژی باس دەکەم لەم ڕووەوە، جا تەحسین لە پڕۆژەی پەلەوەری کەلەك لە نزیك گوندی چەمە دوبز دامەزرا لە دەرەوەی هەولێرو بەو مەرجەی، سەر لە شار نەدات‌و لەوێ کار بکات‌و خویشی حەشار بدات، تا لە ساڵی ١٩٨٣ لێبووردنێکی گشتی دەرچوو بۆ فیراو یاخی بووان‌و پێشمەرگە.. هتد، تەحسین گەڕایەوە دایرەکەی‌و ئەوکات بریارێك هەبوو ئەوانەی لە

دایرەی تەلەفۆنات کار دەکەن لەسەربازی ببووردێن لە جیاتی سەربازگە لەو دایرە هەستیارە کار بکەن، تەحسین کاری چاکردنەوەی هێڵی تەلەفۆناتی پێسپێردرا بوو، تا ساڵی ١٩٨٥ باش بوو هیچ گرفتێکی نەبوو، دوای ئەو بەروارە داوایان لێ کرد بوو، ئیمزا بکات بۆ (تەتوع)و جلی جەیشی شەعبی لەبەر بکات، ئینتماش بکات بۆ ریزی حزبی بەعس، ئامادەیی نیشان نەداوە هیچیان بکاتو قەبوڵ بکات، بۆیە گواستیانەوە بۆ دایرەی (نقل بری) جا لەوێش گوتیان فەرموو بۆ سەربازی، ماوەیەك بە ناوی (شەرعبیل) دەفتەری راژەی سەربازی پڕ دەکرایەوە ئەوەی نەخۆشی یان کەمئەندام بووایە، لە ڕاژەی سەربازی ماوەی چەند مانگێك دوا دەخرا تا لیژنەی دووەم سەیری دەکردەوەو بۆی درێژ دەکرایەوە یان دەبووایە بچێتەوە بۆ ڕژای سەربازی، هەندێکیش بۆ بابەتی کەمئەندامییەکەیان بە تەواوەتی تەسریح دەکران لە راژەی سەربازی، جا تەحسین هەڵسا بە ئەشیعەی یەکێکی دی بە واستە نیشانی لیژنەی سەربازی دا بۆ ماوەی چەند مانگێك لە ڕاژەی سەربازی دوا خرا.

(٥٠)

١٩٧٥ - ١٩٩١

* سەبارەت بە منیش لەبەرئەوەی کاتی خۆی هەر وەکو لە ئەڵقەکانی پێشوو ئاماژەم پێکردوە بە بڕیارێکی تایبەتی لیژنەی ئاشتیو بە ئیمزای مورتەزا حەدیسی لە ساڵی ١٩٧٠ دوای ڕکەوتنی ١١ی ئادار کە ژمارەمان شەستو پێنج کەس بووین بە بڕیارێکی تایبەت (تەسریح کراین لە ڕاژەی سەربازی) جا هەر مەوالیدێك کە بانگ دەکرا بۆ راژەی سەربازی کاتیٚ دەچوومە تەجنید پێیان دەگوتم ئەو داوایانە تۆ ناگرێتەوە، دیارە بە هاولاٚتیەکی خراپ دەخوێندرامەوە وا لە قەڵەم درا بووینو خێری بە بەرەوە بوو بۆ منو منەکانی دی وەکو من، جا ئەو کات تەمەنم (٣١) ساڵ دەبوو، برادەرانمو خزموماڵەوەمان هەوڵیان لە گەڵم دەدا هاوسەرگیری بکەمو چیتر خۆم تاخیر نەکەم، ئەو کات فەرمانبەر بووم لەبەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر جا با بێینە سەر وێستگەیەکی دی مەسەلەی ژن هێنانو هاوسەرگیریەکەمە.

لە ١٩٨٣/١١/١١ بە ڕێکەوت هاوسەرگیریم کرد لەگەڵ شلێر حاجی، بە شێوەیەکی تقلیدیو خوازبینی چونکە هیچ جۆرە پەیوەندیەکی خۆشویستنو پێشینەی لە گەڵدا نەبوو، تەنیا ئەوەندە بوو جارێکیان هاتە بەرێبەرایەتی پەروەردەی هەولێر کە یاریدەدەری ئەزمونگە بوو لە قوتابخانەی ئامادەیی کۆیەو کاری وەزیفی هەبوو لە ژمێریاری پەروەردەی هەولێر منیش ئەو کات فەرمانبەر بووم لەو هۆبەیەی ژمیریاریو چاوم پێیی کەوت، کچێکی ناسیاومان لەو بەشەی ژمیریاری بوو، گوتی ئەوە شلێرخانەو کچە خاڵی کاکەمەم بۆتانی یە، ئەو کچە

دەیزانی من برادەری دانیشتنی شەوو ڕۆژانی کاکەمەمم، منیش زۆر بە ڕێزەوە بەخێر هاتنی شلێرخانم کردو پێم گوت باوکت دەناسم لەو ڕۆژەوەی لە کۆیە لە ١٩٧٣ لە کۆمەڵەی هونەر ویێژەی کوردی لەگەڵ مامۆستا هۆشمەند هەورامی بوو تەعارفمان کردو کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەمان لە ئامادەیی کۆیە ئەنجام دا چەند شاعیرو هونەرمەندێك بووین لە هەولێرەوە هاتبووینە کۆیەو هەروها من برادەراتیم لەگەڵ زۆربەی خانەوادەکەی ئێوە هەیە بە تایبەتی جگە لە کاکەمەم لەگەڵ خاڵەکانت کاك شێردڵو حاجی ڕۆستەمو کوڕانی ئامۆزاکانت جوامێرو ئاودێری مامە تاهیرو.. هتد، هەر کارێکت هەبیٚ بە سەر چاو تا جیٚ بە جێیی کەم، گوتی سوپاس‌و ڕۆیشت، دواتر ئەو کچە ناسیاوەمان کە برادەری شلێر بوو، پرسیارم لێی کرد، پێم گوت تۆ دەزانی من لە کچێك دەگەڕێم کە لە خانەوادەیەکی تێکۆشەرو ڕۆشنبیر بیٚ، چونکە ئەو کچەی لەگەڵ تۆ بوو شلێر باوکی چەند جار گیراوەو دوا جار لە هیئەی ئەمنی کرکوك لەگەڵ مامۆستا هۆشمەندو کەسانی دی گیرا بووو لەمێژ نییە ئازاد کراوە، هەروەها براکەی شۆڕش حاجی پێشمەرگەیەو ڕۆڵی لێپرسراوەتی هەیە لە دەشتی کۆیەو لە بنەماڵەی عومەر دەبابەیە، تۆش ئێمە دەناسی بە خاوخێزانەوە هەمان وەزعمان هەیە، کچێکی ئاوا نەبیٚ ببێتە هاوسەرم یەکێکی تر ڕەنگە ئەو بارە ڕاڕاییەو وەزعانە قەبووڵ نەکات کە هەمانە، بۆیە تکام وایە بە بنج‌و بنەوانی بکەوەو ئەگەر هیچ پەیوەندی کەسێکی دی لە مێشکیدا نییە قسەی لە گەڵدا بکەو من دەچمە خوازبینی‌و لێم روونە ئەو هاوسەرگیرییە سەر بگریٚ، پاش دوو ڕۆژی تر ئاگاداری کردمەوە کە نیو سەعات لەگەڵ شلێر گفتو گۆیەك بکەین هەر لە پەروەردە بۆ ئەوەی لە یەکتر بگەین هەر وها گوتی ئەگەر پێك ڕازی بوون،

ئەوە ئەو کات بنێرە بۆ خوازبینی، بەوە باش بوو بۆ من (شلێر) بۆ چەند ڕۆژێك لە هەولێر دەوریەکی هەبوو لە ئیشەکەی خۆی کە بۆ کارمەندانی ئەزمونگەی (مختبر)ی قوتابخانەکان کرا بۆوە، ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخسا نیو سەعاتێك لەگەڵ یەکتر قسە بکەین، پاش ئەوەی ئەو کچە ناسراوەمان بە دوورو درێژی ژیان و بژێوی خانەوادەکەی ئێمەی دەزانی و تێیگەیاند بوو، ئەویش گوتبووی مادام ئەو کوڕە شاعیرەو خاوەن هەڵوێستەو نەبووە بە بەعسی و جیشی شەعبی و کۆنە پێشمەرگەیە، بیرو بۆچوون و رابردووی پاکەو کوردپەروەرە، باوکم و ماڵەوەمان هەتا براکانم ڕازی دەبن، چونکە ئێمەش دەمانەوێ یەکێك لەگەڵ ئێمە تێکەڵ بێت کە تەحەمولی خۆشی و ناخۆشییە هاوبەشەکەی هەبێت.

ئیتر سێ ڕۆژ دواتر لەگەڵ کاکەمەم بۆتانی و شەهید عەبدولخالق و شەهید نوری نانەکەلی دانشتبووین پێم گوتن ئێوە هەر دەڵێن بۆ ژن ناهێنی فەرموون بڕۆن بۆ خوازبینی، ئاها دەی دەی کێیە؟ گوتم لە کۆیەیە کچە خاڵی ئەو (کاکە مەم)یە، زۆریان پێخۆش بوو، کاك عبدالخالق ڕووی لە کاکەمەم کردو گوتی هەر بەیانی خۆت ئامادە کە، لەگەڵ کاك نوری دەچینە کۆیە مادام ڕەزامەندی ئەو کچەی وەرگرتووە، ئیتر ڕێکەوتن و چوون لەوێ بە (حاجی رۆستم) خاڵی (شلێر)یان گوتبوو، ئەویش وتبووی من موحسین دەناسم ئەمشەو لەگەڵ دایك و باوکی قسە دەکەم و وەڵامتان دەدەمەوە، دایك و باویکی کەوتبوونە پرسیار کردن لە ژیان و کەس وکاری من و هاتبوونە هەولێرو جا بەو پێیەی ڕەوانشاد عەبدولڕەحمان رووتە ماوەیەك پێکەوە بووین لە ناوچەی هەولێر لە هەفتاکان باوکی شلێر پرسیاری لێ کرد بوو، عەبدولڕەحمان رووتە زۆر مەدحی منی کردبوو، پاشان کاك (فاروق جمیل)و ماڵی حمدامین ئاغای برای کاك فاروق

نێوانیان زۆر خۆش بوو لەگەڵ باوکی شلێر، کاک فاروق جمیل بە کاک حاجی باوکی شلێری گتبوو بە هەموو شێوەیەك من کەفالەتی ئەو کوڕە دەکەم ببێتە زاواتان، هەروەها یادی بەخێر دکتۆر نافع ئاکرەیی خۆیو ژنەکەی چوونە ماڵیان لە کۆیە شەوێك لە لایان مانەوە کە یەکتریان دەناسیو پەیوەندیان هەبوو، هەروەها کاک شۆڕش حاجی برای شلێر لەو نووسەرانەی لە شاخ بوون پرسیاری لێ کردبوون لە بارەی من، وەڵامی بە ڕازیبوون دابۆوە، ئینجا گوتیان وەرنە پێش، ئاسایی ژن چوونو ئیشەکە تەواو بوو، لە ڕۆژی مارە کردن، براکانمو خاڵو مامو ئامۆزاو ئەو برادەرە دڵسۆزانەمو کەسو کارم لە کۆیە ئامادە بوون وەك مام سابیر کاکەشینو علی حەسەنو جەلالو تەحسین /ی برامو بکرمەلا ئیسماعیل نانەکەلی زاوامو چەند کەسایەتییەك هەروەها، کاك فاروق جمیل حاکمی شەریعی کۆیەی هێناو خۆیو عەبدولڕەحمان رووتە بوونە شایەدو هەروەها شەهید عەبدولخالق مەعرووفو نوری نانەکەلیو کاکەمەم بۆتانیو ئیبراهیم دۆغرەمەچیو وەکو برادەرو خزم ئامادە بوون، لە تەرەفی ماڵی ئەوانیش مامو خاڵەکانیو ئامۆزاو کەسو کاری شلێر ئامادە بوون کە شێردڵ عبد ئاغا حوێزی لەو بۆنەیە لەوێ بوو، دوای مارە بڕینو پیرۆزبایی و، نێوەڕۆکەی نان خوراو خوا حافیزیمان لێ کردن.

تا ماومو منەتباری ئەو خزمو برادەرە دڵسۆزانەم کە زۆر پێمەوە ماندوو بوون لەو پڕۆسەی هاوسەرگیرییەدا کە ئەو کات ژن هێانو ڕازی بوون بەو کەسەی دەبێتە زاوایان زۆر ئاسان نەبوو، جا ڕۆژی گواستنەوەی نازانم چۆن سوپاسی خۆم بەرامبەر بەو هەستە جوانە دەربڕم بۆ ئەو خزمو برایانەی کە ئاهەنگێکیان ڕێکخست لەشەودا بە بۆنەی هاوسەرگیریمو بەشداری کردنیان لەبەرێ کردنم بۆ بەغداو خویان

به صاحێب کرد بۆ نموونه: له شەوی گواستنەوەدا کە سەرتای پایز بوو ۱۹۸۳/۱۱/۱۰ لەسەربانی خانووەکەمان کە زۆر گەورەو فروان بوو مەولودێکی لێ خوێنرایەوە بە تایبەتی بۆ خزمان و ناسیاوانی عەشایری و ئاسایی، پاشان لە هۆڵی ماڵەکەماندا لە هەمان شەودا خوانێك و ئاهەنگێکی تایبەتی رێك خرا بوو بە سەرپەرشتی و ریکخستنی لە لایەن شەهید عەبدولخالق مەعرووف و نوری نانەکەلی و فاروق جمیل و ئیبراهیم دۆغرەمەچی کە چەند نووسەرێکیان لە شارەکانی ترەوە داوەت کرد بووو هاتبوون و ئامادە بوون کە هاورێم بوون لەوانەدا ئەوەی لە یادم مابێ، شێرکۆ بیکەس و مستەفا ساڵح کەریم و رووف بیگەرد - محەمەد نوری تۆفیق - حوسێن عارف - تاهیر سەعید - جیهاد دلپاك - محی الدین زەنگەنە - جگە لەو برایانەیش لە هەولێر بوون ئەوەی لە یادم مابێ (عوسمان سەرسۆر دزەیی - کاکەمەم بۆتانی - خالید جوتیار - مامۆستا حیدەر هەمزە - مامۆستا ئیسماعیل خۆشناو - مامۆستا قەرەنی ئەسوەد - محەمەدەمین دهۆکی - نەوزاد محەمەد علی موختار - مامۆستا عادل عبدالصمد - عبدلمجید شێروانی و کاك ئەنوەر جاف خاوەنی کارگەی قەندی هەولێر - صەلاح عومەر...هتد، لەگەڵ چەند لە خزمانی تر.

دوای ئەوەی ئەم شەویش بە گۆرانی و حەیران و خۆشی بەرێ کرا، بۆ بەیانی کاك نوری نانەکەلی ترومبێلەکەی جۆری سوپەر بوو لە گەڵیدا رۆیشتم و چەند ترۆمبێلێکی دی بە دواوەمان بوون لە کۆیە بووکمان هێنا و هاتینەوە دوای ئەوەی لەبەر دەرگای ماڵەوەمان و لە ژوورەوەدا چەند وێنەیەکمان گرت و بەرێ کەوتین بەرەو بەغدا بڕوین، تا سەیتەرەی هەولێر بەرێیان کردین قەت ئەو یادەو هاتنی هاورێیانی نووسەرو ماندوو بوونی ئەو خزم و برایانەی ناوم هێناون کە پێمەوەم ماندوو بوون لە یاد

ناکەم، ئەوانەی کۆچی ئەبەدیان کردووە رۆحیان شادو ئەوانەی ماون تەمەن درێژ بن، ،هەروەها قەت لە یادم ناچیّ کاك نوری نانەکەلی رەوانشاد خۆی‌و هاوسەرەکەی لە گەڵمان هاتن تا لە بەغدا لە ئوتیل دابەزین‌و خویان چوونە ماڵی برادەرێکمان حەمە سەعیدو لەوێشەوە سەریان لیّ نەبڕین، کاك نوری گوتی ئێوە ترۆمبێلتان نییە لە گەڵتان دەبین، بەلاّم من گوتم تۆش خاوەن ئیشی‌و دەشزانی کە من زۆر شارەزای بەغدام‌و ئیوە ئازاد بن‌و ئێمەش ئازادی خۆمان وەردەگرین لەوە زیاتر چیم بۆ بکەن؟

دوو بیرەوەری خۆش باس دەکەم لەو ماوەیەی لە بەغدا بووین:

١ – رۆژی یەکەم ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە بەغدا، بۆ رۆژی دووەم گوتم با سەردانی (کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی) بکەین لەویّ هەندێك لە بردەرە نووسەرەکان دەبینین، شلێری تازە هاوسەرم جلی کوردی لەبەر بوو، سەعات چارەگی دەویست بۆ چوار کە گەیشتینە ئەویّ چەندین نووسەرو خوێندکاری کۆلێژی مستنصریەو ئادابی بەشی کوردی لیّ بوو، کە زۆربەیان کورد بوون لەوانەی کە تەوقەیان لەگەلّ کردین لەوانە رەوانشاد پرۆفیسۆر مارف خەزنەدارو دکتۆر ئیحسان فوئادو محموود زامدارو دکتۆر مەولود ئیبراهیم‌و محەمەد بەدری‌و جەمالّ خەزنەدارو حوسێن جاف‌و مامۆستا عبدالرزاق بیمارو صەلاح شوان‌و عەبدوڵلاّ عباس‌و حەمە بۆرو شێخ ستارو زۆرێك لە نووسەرانی دی، زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردین‌و گوتیان لە کاتێکی باش ئامادە بوون پاش ١٠ دەقیقەی تر کۆڕێك لە زنجیرەی لێکۆلینەوەکان دەست پێدەکات لە وەرزی ڕۆشنبیری دەزگای رۆشنبیری‌و بلاّوکردنەوەی کوری یە، جا لێکۆڵینەوەی ئەمڕۆمان دەربارەی (مستەفا بەگی کوردی) لە لایەن (محەمەد مستەفا حەمە بۆر)وە پێشکەش دەکرێت، چوینە ناو هۆل ئێمەیان لە ڕیزی

پێشـەوە دانیشـاند، کۆڕەکـە دەسـتی پێکـرد، سـەرەتا (مـەحموود زامـدار چووە سەر شانۆو بەر مایکرۆفۆن گوتی بەخێر بێن ئامادە بووان بۆ کۆڕی ئـەمڕۆمان، بـە تایبـەتی بـەخێر هـاتنی کـاك موحسـین ئـاوارەو هاوسـەرە تازەکـەی شـلێرخان دەکـەین کـە بـۆ بـە سـەر بردنـی مـانگی هـەنگوینی هاوسـەرگیرییەکەیان هاتوونەتـە بەغداو ئـەوەتا لـەو رۆژەیانـدا وازیـان لـە ئەدەبو رۆشنبیری نـەهێناوەو هاتونەتـە ئێـرە، زۆر دڵ خۆشـین بـە ئامـادە بوونیان، دیسانەوە پێیان دەڵێین بەخێر بێن... لـە کۆتـایی کۆڕەکـە ئـەوەی نووسـەر بـوو لـەوێ تـەکلیفی دەعوەتیـان لێ کـردین بـە تایبـەتی (دکتـۆر ئیحسـان فوئـاد) بەڵام سـوپاسمان کـردنو رۆیشـتین، بـۆ ڕۆژی پاشتـریش وێنەی خۆمان بینییەوە لە رۆژنامەی هاوکاریو هەتا لـە رۆژنامـەی تـریش بڵاو ببۆوە

٢ – رۆژی سێیەم کە شەو داهات چووینە پێشانگای نێو دەوڵـەتی کـە سـاڵانە لـە بەغـدا ئـەنجام دەدرا، دیسـانەوە شـلێر جلێکـی جـوانی کـوردی لەبەر بوو، لە نێو پێشانگاکە دەسووڕاینەوەو سەیری کـەلو پـەلو هـەموو شتەکانی دانراومان دەکرد، لە گۆشەیەکی پێشنگاکە دوورتـر قەلەباڵغیـەك هەبووو لە نێو هۆڵیکدا دەنگی مۆسیقا دەهاتو جموجۆڵ تیا بوو، منیش گوتم با بچینە ئەو هۆڵە رەنگە ئاهەنگی پێشانگاکەی لـێ ئەنجام بدەن، کـە چوینە ژوورەوە هەمووی ژنو پیاوی بیانی بوونو کۆکتێل وەسـتا بـوون، هەر یەکە پێکـی شـەڕابو وێسکیان بـە دەسـتەوە بـوو بـە یەکـەوە قسـەیان دەکرد لە لایەکی دی هۆڵەکەدا سەماو گۆرانی بوو، ئیتر یەکێك لێمان هاتە پێشەوە بە زمانێك قسەی لەگەڵ کردین، ئێمەش بـە ئامـاژە وامـان نیشـاندا کە تێیناگەین چ دەڵێت، هـەر زوو یـەکێك هاتـە نێوانمـانو بـە عـارەبی پێـی گـوتین ئێـوە کـارتی دەعوەتتـان پێیـە، گـوتمـان نـەخێر بمـانبوورن دەچـینە

دەرەوە، نەمانزانی ئاهەنگێکی تایبەتە، ئیتر چووینە دەرەوەی هۆڵ، هەندێك دوور کەوتبووینەوە لە هۆڵەکە یەکێك بە تەنگەتاوی لە هۆڵەکە هاتە دەرەوەو پێشی لێ گرتین‌و بە زمانی عەرەبیەکی بیانیانە پێیی گوتین کە ئەو ئاهەنگە هی سەفارەی (پۆلۆنی)یە، جا جەنابی سەفیر چاوی لە ئێوە بووە کە گەڕاونەتەوە، فەرمووی بگەڕێنەوە دەعوەتی منن، ناچار گەڕاینەوەو زانیم لەبەر ئەو جلە کوردیە ئاڵ‌و والآیەی هاوسەرەکەم بوو سەرنجی سەفیری ڕاکیشاوە پێیی نامۆ بووە، کە هاتینە ناو هۆڵەکە سەفیر بەرەو پیلمانەوە هات‌و تەوقەی لەگەڵ کردین‌و بە ئاماژە فەرمووی لێ کردین، ئیتر چرکە چرکی وێنە گرتنمان‌و لە هەموو لایەك سەیریان دەکردین، هەر چەندە ئەو ئاهەنگە لەگەڵ میزاجی ئێمە یەکی نەدەگرتەوە بەلآم ناچار بووین هەندێك وەستاین‌و گوێمان لە گۆرانییەکان گرت‌و پاشان ڕۆیشتینە دەرەوە.

(٥١)

١٩٧٥ - ١٩٩١

لـه گـەڕەكی عارەبـان بـووین كـە لـەوێ لـە دایـك بـووین‌و (تەحسـین) هاوسـەرگیری نـەكرد بـوو كەچـی مـن هاوسـەرگیریم لـەوێ بـوو تـا دوو منداڵیشم لەوێ چاویان هەڵهێنا، ڕێبین‌و ڕەوەز، دوای ئـەوەی ئاگاداریـان كردینەوە لە ساڵی ١٩٨٥ كە دایـرەی ئـەمنی هـەولێر لە ڕێگـای موختـاری گەڕەكەكەمان پرسیاری ناونیشانی ئێمەی كرد بوو بمانگرن، موختارەكە نـاوی مجیـد بـوو لـە لای كـوڕە خوشـكەكەی بـەڕێز مامۆسـتا سـید عـەزیز هـاوڕێم بـوو باسـی كـرد بـوو ئـەویش كـوڕیكی دڵسـۆزو پـاك بـوو هـات ئاگـاداری كردمــەوە زوو خۆمـان ڕزگـار كـەین جـا مـن‌و براكـەم خۆمـان شاردەوەو ماڵەكەمان گواستەوە بۆ گەڕەكی ئەنـدازیاران، خانوویكمـان بـە كرێ گرت، باش بوو ژێـر زەمینێكـی هـەبوو، زاوایـەكمان براكـەی ئەنـدزیار فەرهاد دۆغرەمەچی هات‌و نەخشـەیەكی بۆ جێبـەجێ كـردین لەسـەرەوەی خانووەكە دەرگاگەی ژێر زەمینەكەی نەهێشت، لە ژووریكی نووستن كە لە پشـتەوەی ڕێڕەویكـی دەرەكـی هـەبوو لـە پشـت شـوورەی دەرەوەیشـی عەردێكی بەتاڵ شوورەی بۆ كرا بوو جا جامێكی لـە لایـەكی پەنجەرەكـەی لێ كردەوە كە دەمانتوانی لەو پەنجەرەوە بچینە ڕێڕەوەكەو لەوێوە بە پەیژە دەچـووینە خـوارەوە بـۆ نێـو ژێـر زەمینەكـە زۆر گـەورەو فـراوان بـوو، تانكیەكی ئـاویش دەخرایـە سەر كونیلكـەی ئـەو پەیژانـەی كـە بـەرەو ژێـر

زەمینەکە دەڕۆیشتین، واتە ئەو ژێر زەمینە لە نەخشەی سەرەودا سڕا بۆوە، لە ڕێڕەوی دەرەوەیشدا هەست بە بوونی نەدەکرا، ئێمە ئەو چەند ساڵەی لە ناو ئەو ماڵە بووین، ئەگەر بیانگوتبایە مەفرەزو پشکنین هەیە ئەوە دەچووینە ناو ئەو ژێر زەمینە لەو پەنجەرەی ژووری نووستنەوە ئاودیو دەبووین، هەردوو کوڕەکەم ڕێبین و ڕەوەز لەسەر پییان بوون، ڕێبین سێ ساڵ بوو تەمەنی، ڕەوەز دوو ساڵان بوو، کە من و تەحسین ئاودیو دەبووین بۆ ئەوەی بچینە ژێر زەمینەکە، دەبووایە ئەو دوو منداڵە بخافڵێنن نەمان بینن کە بەو پەنجەرەیەوە ئاودیو دەبین، ماشاالله هەردووکیان زۆر بزێو بوون تا لە ناو هۆڵەکە دەبووین دەبووایە هەر پێیان بڵێم (مەکە) (مەدینە)ی تیا نەبوو، جا کە دەچووینە ژێر زەمینەکە هاوین بوو ناوەوەی زۆر فێنك بوو لەوێ کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارمان دەخوێندەوە هەندێ جا دۆمینەمان دەکرد، لەگەڵ ناو ماڵیش پەیوەندیمان دوو گلۆپ بوو تا گلۆپی سوور لە ژێر زەمینەکە بە داگیرساوی بووایە ئێمە لە ژوور بووین کاتی گلۆپی سەوز دادەگیرسا واتە وەرنەوە دەرێ، دواتر نەریمان دۆغرەمەچی ئەویش هاتە لامان بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك لە گەڵمان بوو کە برای زاواکەمان بوو، فیراری سەربازی بوو. لەبەرواری ١٩٨٧/٥/١٥ برای شلێری هاوسەرم (هاوار حاجی) هات و گوتی وا دەچمەوە ماڵ و دەگەڕێمەوە لاتان ئیلتحاق بە ژێر زەمینەکەی ئێوە دەکەم فەرمانی گرتنم دەرچووە و هاوڕێکانم هەندێك گیراون، بەو پێیەی لە ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان ڕۆڵی لێپرسراوەتی هەبوو، هەروەها گوتی بە زووترین کات ئاگاداری کاك (صابیر ئیبراهیم عەزین) بکەن با خۆی ڕزگار کات بەر لەوەی بگیریت، جا (صابیر) برای د. عومەر پەتی بوو هەم خزمایەتیمان هەبوو هەم ماڵی باوکی لە نزیك بوو لە ماڵی ئێمەوە، زوو

دایکم ئاگاداریانی کردەوەو گەڕایەوە، جا ماڵی خەزووریشم کە لە گەڕەکی زراعە بوو لە ماڵی ئێمەوە نزیك بوو، واتە ماڵی (هاوار) وەختێ هاوار دەگاتەوە نێو ماڵ، چ بلاوکراوەو نهێنیەکی هەبووە شاردوویەتیەوە ئێمە چاوەڕوان بووین هاوار بگەڕێتەوە ماڵی ئێمە، کاتێ لە دەرگای ماڵەوەمان درا وام زانی ئەوە کاك (هاوار)ە گەڕایەوە، بەلام بە داخەوە (ئەرخەوان)ی خوشکی بوو چاو بە فرمێسكو دەگریا، گوتی هەموو ماڵی ئێمەیان بە سەر بانو دەوروبەریەوە بە هێزی تایبەتی ئەمن ئابلوقە دراو هاتنە ناو ماڵیش (هاوار) یان گرتو ماڵمانیان پشکنی بەلام هیچیان نەدۆزییەوە، واتە لە رۆژی ١٩٨٧/٥/١٥ دا، گیراو بردرایە قەسابخانەکەی ئەمنی هەولێر ئیتر لەو ڕۆژەوە ژیان لە دایكو باوکیو براو خوشکەکانی تاڵ بوو هەروەها لە ماڵی ئێمەش کە شلێری هاوسەرم خوشکی بوو، خەمێکی تریش رووی تێکردین منو براکەم بە قاچاغ خۆمان حەشار داوەو یاخی لە رژێمو بگیرێین لە سێدارە دەدرێین ئەو کارەساتەیشی هاتە سەر چونکە دەمانزانی کاك هاوار بگیرێ بە ئاسانی ڕزگاری نابێ لە دەست ئەو ئەمنە دڕندانە، زۆر جاران کاك هاوارم ئەدی لە ماڵی خۆیان پشتی رووتو جێی ئەو شوڕکانەی بە دەستی ئەردەلانی براکەی لێی دەدا بە بڕیاری خۆی، پیمان دەگوت ئێ بۆ ئاوا دەکەیت، هاوار دەیگوت با خۆم ڕابێنم ئەگەر رۆژێك گیرام بەرگەی ئەشکەنجە بگرمو دان بە هیچ ناوو نهێنیەك نەنێم وەك ئەوەی لێیی مسۆگەر بێ کە رۆژێك دەگیرێت، جا هەشت مانگان لە ئەمنی هەولێر لە ژێر ئەشکنجەدا بوو، هەر چەندە واسیتەی گەورەو زۆری بۆ کراوو ماڵی باوکی پارەی زۆریان سەرف کرد، تا پاش ئەو چەند مانگە ڕەوانەی (دادگای شۆڕشی ڕژێم) کرا لە بەغدا، بە هۆی ئامۆزایەکیان (نەوزاد کاکە) کە ماڵیا لە بەغدا لەگەڵ ماڵی یەك لە

دادوەری شۆڕش دراوسێ بوون، هەوڵی بۆ دا کە بڕیاری لە سێدارەدان بوو بە زیندانی هەتا هەتایی، هەموو کەس و کاری دڵخۆش بوون کە لە سێدارە ڕزگاری بوو، ئینجا خرایە زیندانی (ئەحکامی قورسی ئەبو غرێب) جا پاش چەند مانگێك ڕێگا کرایەوە کەس و کاری بچنە سەردانی، هەڵبەتە تا لەبەرواری ١٩٨٨/٩/٩ لێبوردنێکی گشتی لە لایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)ی ڕژێمی عیراقی دراو ئازاد بوو، لەو ماوەیە ژیان تاڵیەی ئێمە کە شلێری هاوسەرم لەگەڵ ماڵی باوکی دەچوونە بەغداو سەردانی لە بەندیخانەی ئەبوغرێب، منیش هەر لەگەڵ تەحسین /ی برام لە زیندانیەکەی ماڵی خۆماندا بووم کە نەمدەتوانی جارێك بچمە سەردانی هاوارو چاوم بەو هەموو تێکۆشەرانەی دی بکوێت کە هاوڕێم بوون سڵاوم بۆیان دەناردن بۆ نموونە جگە لە کاك هاوار کە لەوێ بوو، ئەو هاوریانەشم لەو زیندانەدا بوون (محەمەد حەسەن مەنگوڕی - قاسم شێروانی - نصرالدین مامە سامان (باران) لەگەڵ براکەی فەرەیدون سامان، ئاسۆ عومەر سوارە - محەمەد حەمە باقی - بهرام مغدید - صابیر خەجە شەقلاوەیی ..هتد، جارێکیان دایکم لەگەڵ خێزانم و ماڵە خەزورانم ئەویش چاوی بەو بەندیخانەیە یان بڵێم قەسابخانەیە کەوت و چوو بوون بۆ سەردانی کاك هاوار، ئەوەند باسی زیندانی ئەبوغرێبم بیست ئاساوەری وتەکان و بیرەوەری تێکۆشەرانی نێو زیندانەکە بەو شیعرانە داکەوتەوە کە لە دیوانی (عەترێکەو لە نەوەی گولخانە) لە ٢٠١٩ لەسەر ئەرکی ڕێباز فاوندەیشن بە چاپ گەیاندراوە لە لاپەڕە (٩٢)دا لە ژێر ناو نیشانی (گۆڵمێکم لە ڕەوسەی زەمەن هەڵگرت و هەڵمڕشت) کە چەند کۆپلەیەکی لێ دەخەمە ڕوو کە تیایدا هاتووە دەڵێم:

(١)

**بە نۆرە بە سەر شانی یەکتر هەڵدەگەڕان**

**لەو پەنجەرە بەرزەوە**

**کە دەڕوانێتە پانتایی دەشتێکی ڕاکشاو**

**لە نێو ڕایەڵی شیشە ساردو سڕەکانیدا**

**دەستەکانیان دەبردە دەرەوە**

**تا نمەی باران و شنەبای ئازاد بیانشواتەوە**

**یا چۆلەکەو پاسارییەکان**

**لە ناو لەپیاندا هەڵنیشن و فەراهەمیان کەنەوە**

(٢)

لەو کۆپڵەیەدا وام خەیاڵ کردووەو نیشانم داوە کە ئەز یەکێکم لەو زیندانیانە:

**واز لە پەنجەرەکان ناهێنن**

**دەخیلەکانیان پڕ دەکەن لە ڕووناکی**

**دوا سەرنجیان ڕادەخەن**

**بە گومانن لەوەی پەنجەرەکان تەسکتر کەنەوە**

**ماڵدارییەو پاشەکەوتە**

**دەخیلەکانیان بە ڕووناکی تژی کەن**

**ئاسمان و زەویم لێ وێك هاتنەوە**

**لەم شوێن و بەینە تەسکەدا چۆن بژیم**

**بەلاّم کە تۆم هێنایە زەین و بەر چاوم**

**ئاسمان و زەوی لە یەك دوور کەوتنەوە**

**تۆش نزیك**

(٤)

باسی تاریکی مەکە، وازی لێ بێنە

مادامەکێ دەستە رووناکەکانی تۆم گرتووە

دەمێکە تاریکی ڕای کردووە

(٥)

دەستی جوگرافییەی گرتووەو

بە سەر شەقامی مێژوودا گوزەر دەکات

مێوانی پۆلێکە، ڕووەو نەخشەی هەڵواسراو

بۆ فێرخوازان دەدوێ

- خاڵێك بە قەد دەنکە نیسکێك ڕەش کە

ڕەشترو گەورەو گەورەتر

(ئەبو غرێب)ێکی غەریبو گەورەیە

بەندەکانی، چەندو چوونیان

لەگەڵ دەرگاو قەفەزو پەنجەرەیە

لە فەرهەنگی مێشکیاندا، وشەیەك هەیە

کەس وەکو ئەوان لە مانای ناگات

دێو دەچێ وەك داشی شەترەنجە

دەزانن چییە؟.. ئەشکەنجە

(٥٢)

١٩٧٥ -١٩٩١

له باشووری كوردستانی له ١٩٨٨ پرۆسەی ئەنفالْ دەستی پێكرد كه ژمارەكه دیاركراوه سەدو هەشتاو دوو هەزار ڕەوانەی بیابانی عەرعەرو رمادیو نوگره سەلمان شوێنگەی شاراوەی تری كردنو زینده بەچاڵی كردن، له هەموو شارەكانی كوردستانیش بە سەدان گەنجو لاوی كوردی لە بەندیخانەكانی ئەبو غریبو كەركوكو موصڵ له سێداره دران، جگه لەوەی ڕژێم دەستی نەپاراست بە چەند قۆناغێك له كیمابارانكردنی گوندو دێو شارۆچكەكانی كوردستانو هەر لەو بەروارەش له ١٦ / ئاداری / ١٩٨٨ دا كیمیا بارانی هەڵەبجەی كرد بە شەهید كردنی (پێنج هەزار) له پیرو لاوو منداڵ له هەردوو ڕەگەزی نێرو مێو بریندار كردنی (ده هەزار)یش، جا لەو كاتانەدا كه شەڕی نێوان عیراقو ئێران لەو پەڕی توندو ویرانكاری بوو، بە هەموو چەكێكی مۆدێرن لە زەویو ئاسماندا تەخسیریان بە یەك نەدەكرد، منو براكەم تەحسین هەر له نێو ماڵو ژێر زەمینەكه بە بێ موچەو بە كۆڵە مەرگی دەژیان، چیمان هەبوو له ئەرزو زێڕی ژنەكانمان دەمانفرۆشت هێشتا ژیانمان هەر قورس بوو، ڕۆڵی هاوسەرەكەم شلێر بەرامبەر بەو وەزعەی هەمان بوو، بەرامبەر بە خودی منو دایكمو براكەم تەحسینو خوشكێكم رافیده كه هەموومان لەو ماڵه قاچاغه دەژیان زۆر خۆ ڕاگرو لەسەرەخۆ بوو، له وەزیفه بوو

گواستبوویانەوە لە ئەزمونگەی پێگەیاندنی مامۆستایانی سەرەتایی بوو لـە هـەولێر واتـە (مسـاعد مختـبر) کەچـی لەبەڕێوەبەرایـەتی پـەروەردەی هەولێر لە هۆبەی دەرکردەو هاوردە دانرا بوو لەگەڵ دوو ژنـی تـر هاوکوفی خۆی کە یەکێکیان (نیگار ساڵح) بوو خوشکی شـەهید شـەهریار ئـەویش کۆیی بوو، ئەوەی تر (ژیان خان) بوو خێزانـی شـوان فوزی رەشـید نـامیق بوو کە لە بەندیخانەی ئەبوغریب زینـدانی کـرا بـوو واتـە شـوان مێردەکەی ژیان خان، جا ئەو سێ ژنە لە یەك هۆبە دانرا بوون‌و چاودێریش دەکـران، شلێری هاوسەرم چەند دایرەی تـری پێکـراو هـەر لـە ژێـر چاودێری بـووو هەتا دواجار لە دایرەی چالاکییەکانی قوتابخانـەکان گیرسـایەوە کورسـی‌و مێزیــان نــەدا بــووێ لەســـەری دانیشـێ‌و هونەرمەنـد جـەماڵ هیدایـەت بەڕێوەبــەری ئــەو دایرەیــە بــوو کــە ســەر بــە پــەروەردەی هــەولێر بــوو، جارێکیان پێی گوتبوو نهێنیەکت پێ دەڵێم تـۆ وەك خوشـکمی، ئاگـات لـە خۆت بێ بە منیـان گوتـووە کـە چـاودێر بم لەسـەرت لێرەدا، جگـە لـەوەش کاك جەماڵ هیدایەت کە بەڕێوەبەر بوو بۆ ئیجازە پیدانی‌و جار جار زووتر ئیزنی دەداو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوەمان، بەڵێ زۆر یارمـەتی داوە کـە لـە بیر نــەکرێ پیــاوەتی ئــەو بــەڕێزە، ئێمـــەش لای لێپرســـراوانی حکـــومی‌و پێشـمەرگەو حزبـە کوردیـەکان دوای ڕاپـەڕین باسـی ئـەو هەڵوێسـتەمان کـــردووەو بـــۆی قـــەرەبوو بکرێتـــەوەو رێـــزی لێ بگـــیرێ لەگـــەڵ ئـــەو هونەرمەندانەی دی کە لەویدا لەو رۆژگـاری سـەختدا هەڵوێسـتیان جـوان‌و کوردپەروەرانـە بـووە، جـا ڕاڕایـی وەزعـە دەروونییەکـەی هاوسـەرەکەم‌و ترس‌و ئەو گوشارەی لەسەریدا هەبووە لەگەڵ ئەوشدا وەزیفەکەی دەکـرد، هەتا پێم گوت واز لەو وەزیفەیـە بهێنـەو وەك ئێمـە لـە مـاڵ دانیشـە، گـوتی ئەگەر ئەو موچەیەمان هەیـە ئـەویش نـەمینی چۆن دەژیـن، جـارێ ئیـدارە

دەکەین و قسە ناکەم بەرامبەر بە ڕژێم و و بەعس و ئاگام لەخۆم دەبێ، ئەوەندە ئاگای لە من بوو بە جۆرێك کە دوو منداڵ کۆرپەڵەمان هەبوو دەیگوت سێ منالْ بە خێو دەکەم، موحسین و رێبین و رەوەن، نێوەڕۆیان کە لە دەوامی دایرە دەهاتەوە رۆژنامەو گۆڤارو میوەو پێویستەمەندیەکانی ماڵی دەهێنایەوە، رۆژێکیان پێم گوت بۆ ئەمڕۆ رۆژنامەت نەهێناوە، گوتی نەچوومەتە ناو بازاڕ، هەتا ماڵی خوشکت دەچم و دەگەڕێمەوە، کاتێك هاتەوە دەبینم بە تاکسی چووەتە بازاڕو رۆژنامەی کڕیوەو بە هەمان تاکسی گەڕاوەتەوە، گوتی چۆن لێ دەگەڕێم تۆ لە ژووری دانیشتووی دڵت عاجز بیت، ئیتر دڵسۆزم بووە ویاریدەدەرم بوو تا منیش خۆڕاگر بم و خۆم تەسەلیمی ڕژێم نەکەم، هەروا دەفتەر ڕاژەی سەربازی بە جاشایەتی پڕ نەکەمەوە هەر چەندە بە دەر لەوەش من خۆم قەت ئامادەیم تیا نەبووە کۆڵ بدەم و ئەو کارە قێزەوەنە بکەم، هەمیشە شانازیم بە ڕابردووی خۆم و خانەوادەکەمەوە کردووە لەم ڕووەوە،ئەمەو لە لایەن خزم و ناسیاوە دڵسۆزەکانمان هاوکاری زۆر کراوین لەیادیان ناکەم بۆ نموونە:

١- کرێی خانووەکەمان مانگانە لە لایەن زاواکەمان پارێزەر ئیبراهیم دۆغرەمەچی دەدرا تا ساڵانێکی زۆر لەو ماوەیەی خۆمان حەشار دابوو.

٢ - ماڵی زاواکەی ترمان ئەبوبکر مەلا ئیسماعیل ئەویش هاوکاری زۆری کردووین.

٣ - (شەهید کانەبی ئۆمەرە چۆپ دەربەندی سیان) (دەواجن)ی هەبوو بۆ بەخێو کردنی پەلەوەر جگە لە هاوکاری، رەچاوی ئەوەی دەکردم کە لە خۆ حەشاردان و ئەو دانیشتنانەی ماڵەوە ئارام بگرم و لە لایەنی دەروونییەوە بێزار نەبم، ناوە ناوە دەعوەتی دەکردم چ لە ماڵەوەیان لەگەڵ هاوڕێیە نزیکەکانم و خوانی بۆ دەڕازاندینەوە، یان ئەگەر دەعوەتێکی

هەبووبایە کە کەسەکان جێی متمانە بان لە پرۆژەکەی پەلەوەر بەخێو کردنەکەی (دەواجن) دەهاتە دوامو لەگەڵ خۆیدا بۆ دەرەوەی شار دەیبردمو پازگەکانی ڕژێمی دانەخۆرە کرد بوو لێپرسینەوەیان لەگەڵ نەدەکرد، ئێوارەیەکیان هاتە لامو گوتی جلی خۆت بگۆڕەو دەچینە دەرەوە بۆ (دواجن)ە کەی خۆمان، جا ڕۆیشتین، منی بە تەنیا لە ژوورێك دانا، خوانی مێزێکی تەنیایی بۆ ساز دام بە خواردنو خواردنەوە، کاك کانەبیو مێوانەکانی خەریکی یاری پۆکەرو کەم کەمە خواردنەوەو ئیتر، ناوە ناوە کاك کانەبی سەردانی دەکردمو پێی دەگوتم تۆ ئازادی خۆت وەرگرەو ئارام بگرە تا سەعات دوانزەی شەو سوپرایسێك (مفاجئەیەکم) هەیە، تا مێوانەکانم دەڕۆن تۆ نەبینن دواتر لە سەعات ١١ی شەو مێوانەکانی ڕۆیشتن، بۆ سەعات دوانزە دەهات لە ترومبێلی پیکابی تویتا ژمارەیەك چەکدار دابەزین من زانیم پێشمەرگەن، سەرەتا ئەوەی روو بە رووم بۆوەو یەکترمان ماچ کردو چاكو چۆنی، شەهید ریباز بوو، چاوم پێیان روون بۆوە، مولیدەیەکیان بۆ بار کردنو هەندێك خواردنو زەخیریان خستە ناو ترومبێلو لە دەور بەریش پێشمەرگەکانی دابەش ببوون، بەڵام هێندە نەوەستان زو ڕۆیشتن.

٤ – کاك (نیعمەت عەبدوڵڵا) برای شەهید رێباز، یەکێك بوو لەو کەسانەی لە وەزیفە دابڕا بوو ئەویش چەندساڵێك بە نهێنیو خۆ حەشاردانو جار جار پەیوەند کردن بەو برادەرە دڵسۆزو خۆڕاگرانەی متمانەی پێیی بوو ئاوا دەیگوزەراند، جا زۆر سێبووریم پێیی دەهات هەمیشە خۆی دەگەیاندە منو دادەنیشتینو باسی وەزعی سیاسیو دەنگوباسی شاخو جەنگی عیراقو ئێرانو ئایندەی کوردمان تاوتوێ دەکرد، هەروەها شیعری زۆر جوانی دەنووسی هەرجارەی بۆی

دەخوێندمەوە، منیش بە هەمان شێوە ئەو شیعرانەی کە دەمنووسی و بەو پێیەی بواری بلاوکردنەوەم نەبوو بۆ ئەوم دەخوێندەوەو چەندو چوونمان لەسەر شیعرەکان دەکردو بیرو ڕای خۆمان بۆ یەك ئاوەلا دەکرد، وتەیەکی خۆش، کوڕەکەم (ڕێبین) تەمەنی سێ ساڵ نیو بوو کاك نعمت دەیدواند، جارێك ڕێبین پرتەقاڵێکی بە دەستەوە بوو، کاك نعمت پێی گوت ئەوە گندۆرەیە بە دەستتەوەیە؟ ڕێبین تەڕدەست وەلامی دایەوەو گوتی نا نا (شفتی)یە زۆر پێکەنین، کاك نعمت گوتی بەخوا وەلامێکی وای دامەوە پەشیمانی کردمەوە ماشاالله زیرەك دەبێ، بەڵێ کاك نعمت فراغو بۆشاییەکانی ژیانمو گۆڕانەکانمی کەم دەکردەوە کە پێکەوە دەبووین هەر وها جار جار بە نهێنی خوی دەگەیاندە شاخو پێشمەرگەکانو وزەو ورەیەکی زیاتری پێ دەبەخشیم واتە دانەدەبڕام لە دەنگوباسەکانی شۆڕشی نوێو وەزعەکان.

٥ – لەو ماوەیەی خۆ حەشاردراویم نەخۆش کەوتم، ناردم لە دەرمانخانە دەرمانو حەبی (مسپرین)یان بۆ هێنام، بەلام تەندروستیم وای لێهات بە خوراندی هەموو جەستەم ڕانەدەگەیشتم دوارتر پولەکەی سپی لە جەستەمدا هەڵدەوەری گۆشتی لاشەم هەموو ببوو بە برین ماڵەوەمانو کەس وکارم زۆر لەو نەخۆشییە سەیرەی من دەترسان کۆتایی بە ژیانمەوە بهێنێ، نەشدەوێرام بچمە لای دکتۆرەکان، ناچار زۆر متمانەم بە ڕەوانشاد دکتۆر نافع ئاکرەیی بوو، ناردمانە دوای، ئاگاداری وەزعی ئێمەش بوو، کە هات گوتی ئەوە حساسییەتە، بزانە چ خواردنو یان دەرمانێکت پێناکەوێ، منیش حبو شرپوبکەی بە کارم دەهێنا، تەماشای کرد، گوتی زۆر ئاو بخۆوە ئەو حەبو دەرمانەش بەکار مەهێنە تا بەیانی ئێوارە دێمەوە بزانین چۆن دەبی، ئیتر دیار بوو ئەو حەبە بووە (مسپرین)

لێم نەکەوتووە، بەڵام بەر لەوەی دکتۆر بڕوات گوتمان ئەو کوڕەمان (ڕەوەز) سونەت نەکراوە، گوتی من سونەتی دەکەم، بۆ سبەی ئێوارە هاتەوە من چاك ببوومەوەو خوڕشتو هەڵوەرینی پولەکەکان نەما بوو زۆر دڵخۆش بووین، هەر ئەو ئێوارەیە کوڕەکەمی سونەت کردو ڕۆیشت جا زەرفێکی لە ژێر سەری منداڵەکەم دانا بوو کە کردمانەوە (٣٦) دیناری سویسری بوو کە ئەو کات ئەو پارەیە زۆر بوو، چەند ڕۆژێکیش دەهات بۆ سارێژ کردنی برینەکەی ڕەوەزی کوڕم، جا مرۆڤ- چۆن ئەو مرۆڤدۆستانە لە یاد دەکات، بەڕاستی ئەو سەردەم ڕۆحی کوردایەتیو مرۆڤایەتی زۆر بە هێز بوو.

٦ - مامۆستا حەمە سەعید سەلیمان مورتکەو کاك ئەحمەد قەساب، ماڵیان لەگەڵ ماڵی ئێمەوە دراوسێ بووین پشتمان بە یەکەوە بوو، جا مامۆستا حەمە سەعید لە خێزانێکی تێکۆشەرو پێشکەوتنخواز بوو، خاوەن هەلوێستو کورد پەروەر بوو، باوکی یەکێك بووە لە ڕابەرانی شۆڕشی فەلاحی دەشتی هەولێر کە لە گوندی قازی خانەوە سەری هەڵدا دژ بە کۆنەپەرستو فیوداڵەکان هەر وەکی لە ئەلقەکانی پێشوومدا بە دوور درێژی باسم لێوە کردووە، هەروا زاوای ڕەوانشاد عەبدوڵڵا سەیدۆك بوو کە ئەو بەڕێزە واتە عەبدوڵڵا سەیدۆك هەم برادەرو ناسیاوم بوو، جا لەگەڵ حەمەسەعید هەر زوو پەیوەندیو برادەراتیمان ڕەخسا، لە ماڵی خۆیان داوەتیان کردینو منیش وەزعی خۆمو تەحسین /ی برام، لێیانم نەشاردەوە چونکە دەمزانی (معدن)ەکەی ژەنگی نەگرتووەو کەسێکی پاکە ئیتر زۆربەی شەوان دەهاتە دوامانو ئێمەی دەبردە ماڵی خۆیان، چایە لە کوڵو میوەو چەرەزات دانانو خزمەتێکی زۆری دەکردین، جا هەر کارێکمان هەبووایە لە بازاڕ لە دەرمان کڕینو هەر شتێکی پێویستمان

بووایە بۆ ئێمە لەسەر پێ بووو ترومبێلیشی هەبوو، یەك دوو رۆژ بوو ددانێکم زۆر بە ئازار بوو کاتی خۆی پڕم کردبۆوە، جا ئەو ددانەم قوڕقوشمەکەی کەوت و نەمدەتوانی بچمە لای دکتۆر (تەلعەت شەریف) کاتی خۆی هەر ئەو ددانەکەمی پڕ کرد بۆوە، زۆریش لەگەڵ ئەو دکتۆرە نێوانمان خۆش بوو دەمێك بوو یەکترمان دەناسی، جا لای کاك حەمە سەعید باسم کرد کە لەبەر ئازاری ئەو ددانەم زۆر پەریشانم، گوتی من جێ بە جێیی دەکەم، ئێوارە هاتە ماڵەوە و پێیی گوتم سبەی ئێوارە لەگەڵ خۆم دەتبەم بۆ لای دکتۆر تەلعەت و قسەم لە گەڵیدا کردووەو تۆش دەناسێ بە نێو گەڕەکەکان دەڕوین تووشی هیچ مەفرزەیەك نابین من شارەزام چۆن دەتگەێنمە لای دکتۆر، هەروەها دکتۆریش پێیی گوتوومە هەر گەیشت، ڕایناگرم هەموو ئیشەکەی بە یەك جار بۆی تەواو دەکەم.

بۆ رۆژی پاشتر ئێوارەکەی لەگەڵ حەمە سەعید چووینە لای دکتۆر تەلعەت، چاکی و چۆنییەکی گەرممان کرد، یەکسەر داینیشاندم دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی ددانمو دواتر پڕ کردنەوەی کە بە ڕاستی زۆرم پێمەوە خەریك بوو، پێی گوتم حەز دەکەم ئەگەر لێم قەبووڵ بکەی یارمەتیەکت دەدەم، گوتم زۆر سوپاس وەزعم زۆر باشە، گوتی کەواتە خوا حافیزتان بێت، دەستی گرتم ئەوە چ دەکەیت نەکەی دەست بۆ گیرفانت ببەی، باش بوو بە سەلامەتی گەیشتمەوە ماڵ.

سەبارەت بە کاك ئەحمەد قەساب کە زۆر هاوڕێی کاك کۆسرەت بووو کەسایەتیەکی دیاری ناو هەولێر بوو، هەر دیواریان بە دیواری ماڵی کاك (حەمە سەعید)وە بوو هەر زوو پەیوەندی و متمانەیمان دروست بوو، جار جار لە ماڵی ئەوانیش دانیشتنمان دەبوو یان لە ماڵی کاك حەمە سەعید

کە دەهاتـە ئـەویٚو کـۆ دەبووینـەوە، کـورد بـەوەوە مـاوە کـە لـە ڕۆژانـی سەختو تەنگەتاویدا فریای یەکتر دەکەون.

–ماڵی کاك قوبادی جەلی زادەی شاعیر هەر لەو گەڕەکەی ئێمەوە بوو لە هەولێر گەڕەکی ئەندازیاران، ماڵیان لە ماڵی ئێمەوە نزیك بوو، ئەویش لە مـاڵ خـۆی حەشـار دابـوو لەبەرئـەوەی فـیراری سـەربازی بـوو، جـار جـار خۆمـان دەگەیانـد یـەکترو باسـی شـیعرو سیاسـەتو وەزعەکـەمان دەکـردو دڵمـان پێـك خـۆش بـوو، ئەگـەر پشـکنینو مەفرەزەیـەكو مەترسـییەك هەبووایە بیزانیبووایە ئاگاداری ماڵی ئێمەی دەکردەوە، منیش بە هـەمان شێوە.

نوکتەیـەکم بیر کەوتـەوە، یـەکێك لـە فیرارەکـانی سـەربازی کـە ماڵیان لـە تـەیراوە بـووە لەسـەر شـەقامی (٣٠) مـەتری، زۆر لـە وەزعـی خـۆی بێـزار بـووە، هـەر لـە مـاڵو خـۆ حەشـاردان، جـا ئـەو کـات (پـاص) یـان بلـێین (ئامانـە)ی هاتووچـوو هـەبوو بـە سـەر شـەقامی (٣٠)م دەسـووڕایەوە، ئـەو کوڕە گەنجە فیرارە دەڵێت کـیٚ دەمناسـیٚ لەبـەر دەرگـای ماڵـەوەمان سـواری ئەو ئامانەیە دەبمو تا لەو سەر لە گەڕانەوەیدا لەبەر دەرگـای مـاڵی خۆمـان دادەبـەزم، هەنـدێك دەرو دوکـانو ئـاوەدانی ببیـنم، کـە سـواری ئامانەکـە دەبێـت، هەنـدێك دەڕوا لـە وێسـتگەیەك دەوەسـتیٚ، پیرەژنـیٚ بـە نکـە نـك سـەردەکەویٚ، وا ڕێکدەکـەوێت خزمـی ئـەو گەنجە فیرارەیـە، جـا گەنجەکـە پـارەی پیرێژنەکـە دەدات، کـاتی جـابی ئامانەکـە بیتاقەیـەکی بچـکۆلانەی پـارە دانـی ئامانـە هـەبوو دەداتـە دەسـت پیریژنەکـەو پێـی دەڵـیٚ هـا بگـرە پـارەت درایـە، پیرێژنەکـە دەڵێت کـیٚ پـارەی منـی داوە، جـابی دەڵێـت ئـەو کوڕە گەنجـەی لـە دواوەوە دانیشـتووە، پیرێـژن ئـاوڕی لیٚ دەداتـەوە دەڵێت (هەی ڕۆ عەلۆکە ئەتۆ بە خـۆت فیراری پـارەت لـە کـویٚ بـوو پـارەی منـیش بدەی کوڕی خۆم)، هەر ئامانە لە وێستگەیەك دەوەستی کوڕە گەنجەکە بە پڕ پڕ لە دەرگای پشتەوەی ئامانەکە دادەبەزیٚو خۆی ڕزگار دەکات.

## (٥٣)

### ١٩٧٥ -١٩٩١

لە درێژە پێدەری ئەڵقەی (٤٨)دا کە لەو ڕۆژانەوە دەدوێم، کە لە قۆناغی خۆ حەشاردراوی دەژیام، جار جار سەردانی شەهید (محەمەد سەرسپی)م دەکرد هەم خزمو برادەر بووینماڵی لە ڕووناکی بوو لە لەگەڵ ماڵی ئێمە کە لە ئەندازیاران بووین لێك نزیك بووین، ئەو برادەرانەی کە لەوێ دەمبینین خزمو ناسیاوو برادەری منیش بوون زۆر دڵم پیانەوە خۆش دەبوو کە هاوبیرو ڕا بووین دەربارەی وەزعو دژ بە ڕژێمو کاری پارتیزانی پێشمەرگەکانو هەوادارییمان بۆ شاخو... هتد، زۆر بە داخەوە دوای ئەوەی بیستم کە سیخوڕەکانی دایرە ئەمنی هەولێر گرتوویانە، هەر زوو بیرم لەوە کردەوە هەندێك لەوانەی دەیاناسم کە هامشوی مامۆستا (محەمەد) یان دەکرد، ئاگاداریان بکەمەوە نەوەك ئەوانیش پەیوەندی ڕێکخستنیان لە گەڵیدا هەبوو بێ، جا دایکمو هاوسەرەکەم ڕاسپارد کە زوو بەم کارە هەڵسنو بچنە ماڵەکانیان، یەکەمجار چوونە ماڵی جوهەر کەریمو ئەویش ئاگاداری کاك قادر جمیلی کردبۆوەو ئاگاداری شەهید (عوسمان سەر سۆر دزەیی)مان کردەوە، هەروەها (ئەحمەد مەلا عوسمان) ماڵیان لە نزیك ماڵی ئێمە بوو، لە ماڵ نەبوو، دایکمو شلێری هاوسەرم چوونە ماڵی خوشکیو ئاگاداریان کردەوە، پاشان دەرکەوت لە ڕێگای ئاگادارییەکانی ئێمەوە (٧) کەس ڕزگاریان بووە لە گرتنو سزاو شەهید

کردنیان کە لە ئەڵقەی پەیوەندی ڕێکخستنی حزبی بوونە لەگەڵ شەهید محەمەد سەرسپی کە لە قەسابخانەکەی ئەمنی هەولێر لە ژێر ئەشکەنجەدا لەگەڵ تەحسین دەرگەلەیی شەهید کران، وەك شایەد حاڵ ئەوانەی بە ژیانەوە ماون (جوهەر کەریم - قادر جمیل برای هونەرمەند قەرەنی جمیل - ئەحمەد مەلا عوسمان) دان بەم ڕاستییەوە دەنێن هەر کەسێك بیەوێت باسی ئەو مەوزوعەیان لێ گوێبیست بێت..

-جەنگی بێ ئەمانی نێوان عیراق و ئێران هەر بەردەوام بوو، بە ناوی قادیسیەی صدام ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی کوژراوان و زامدارانی هەردوو لا، لە زیاد بووندا بوو، ژمارەی فیرار کردنی گەنجان و خۆ ڕزگار کردنیان، ئەویش لە زیاد بووندا بوو بە تایبەتی لە باشووری کوردستان و ئەهوارەکانی باشووری عیراق، ماوە ماوەش موالیدی یەدەگ بانك دەکران بۆ ریزی سەربازی، جگە لەوەی فشارێکی زۆر لە شارەکان هەبوو بۆ تەتەوع کردن و بوونیان بە جەیشی شەعبی، ئەمن و ئیستخبارات ڕۆڵی دڕندانە و دەستریژ کردنی فیرارو لە سێدارەدانی یاخی بووان و تێکۆشەران ئەویش ڕێژەکەی هەر لەبەرز بوونەوەدا بوو، جەنازەی سەربازو ئەفسەرو دەرەجەداران بە سەر چەنچەی تاکسی کە مأموری لەگەڵ دا دەبوو تەسلیم خێزانەکانیان بکەنەوە، نەدەویران بیانبەنەوە بەر دەرگای خاوەنەکانیان، لە دوورەوە دەوەستان، بەڵام عیراقی دەوڵەمەند و هاوکاریکردنی لە لایەن وڵاتانی خەلیجی عەرەبی و هەموو ئەورووپا کە دژ بە ئێران دەجەنگا، فەرمانێکی دەرکرد ئەوەی لە شەری قادیسیە شەهید بێ یان مفقود (ئەرزێکی ٣٠٠م لە شارو نیشتەجێی خۆی لەگەڵ ترۆمبێلێکی کرۆنا و ١٢ هەزار دیناری سویسری) دەدرێتە کەس و کاری شەهید کە بە پلە یەك نزیکە لە خاو خێزانەکەی، جا ڕژێم بەو شیرینیەی هەندێ لە

کەس و کاری شەهیدەکانی قادسییەی هێور کردنەوە کە دەنگیان لێ بەرز نەبێتەوە بۆ نموونە: کابرایەك کوڕەکەی شون بزر بووە (مفقود) لەو جەنگەی نێوان عیراق و ئێران، ئەرزێکی ٣٠٠ م وەردەگرێ لەگەڵ (١٢) هەزار دینارو ترۆمبێلێکی کرۆنا، خەریکی خانوو کردنەو پارەیەو هەیەو بە ترومبێلەکەی هاتوچۆی سەر ئەرزو خانووەکەی دەکات بۆ تەواو کردنی مەشغولە، لەو ئان و ساتەیە هەر کوڕەکەی لە یاد نەماوە، یەکێك لە ناسیاوەکانی بە پڕ تاوی دێ و پێیی دەڵێت: موژدە موژدە، ئەمڕۆ گوێم لە ڕادیوی تاران بوو، ناوی سەربازە گیراوەکانی عیراقی دەخوێندەوە کە لەبەرەکانی جەنگدا دەستبەسەر کراون، ناوی کوڕەکەی تۆی خوێندەوە بە گوێیانەی خۆم گوێم لێ بوو مانای وایە سوپاس بۆ خوا ماوەو زیندووە، وا بە دیار کەوتەوە، بزانە وەلامی باوکی کورە گیراوەکە یان بڵێین کوڕە مفقودەکە (ئەوجا نۆبەی ئەو قەوانەیە) واتە بەو هەواڵە دڵخۆش نەبووە نەکا ئەو هەموو شتانەی وەرگرتووە لێی وەرگرنەوە. بەڵێ بە سیاسەتەو دەم چەور کردنەی خەڵکەکە هەر وا چەندین بریارو فەرمانی دی سەبارەت بە موچە زیاد کردن و هەرزانکردنی کەڵ وپەل وخۆراك و پارە هەڵڕشتن توانی هەشت ساڵان ماکینەی جەنگ کارا بێت لەگەڵ ئەو هەموو خوینەی ڕژان و ویرانەی بەردەوام بووو کەسیش دەنگی لێوە نەیەێت.

–ئامـاژەم بەو کارەستەی هەڵەبجەی شەهید کرد بوو لە لە لایەن ڕژێمی بەعس و حکومەتە دڕندەکەی لە ١٩٨٨/ ٣/١٦ بە فڕۆکە هەڵگری غازی خەردەڵ ئەو شارە جوانەی کیمیا باران کرد، پێنج هەزار مرۆڤی بێ گوناه شەهید کردو زیاتر لە (١٠) هەزار بریندارێشی لێ کەوتەوە بە بێ ئەوەی هیچ وڵاتێکی خاوەن ویژدان بە دەوڵەتە زلْ هێزو ئیسلامییەکان و غەیرە ئیسلام کاردانەوەو بە دەنگەوەی هاتنی هەبوو بێت، جا لەو کاتەی من

لەبەردەوامییەکەی خۆم بووم لە ماڵو ژێر زەمینە خۆ حەشاردراوەکەم، ئەوەی لە دەستم هاتبێ قەسیدەیەکی پڕ بە ئێشو ئازارەکەی خۆمو کارەساتەکە بوو دامڕشت کە لە دیوانی کۆبەندی (کاریزە مەرجان)دا بەشی دووەمدا لە لاپەڕ (١١٩)دا هاتووە کە لەسەر ئەرکی یەکێتیی نووسەرانی کورد / مەڵبەندی گشتی چاپ کراوە لە ساڵی ٢٠١٤ / ئەوەش چەند کۆپلەیەك لەو قەسیدەی کە لە ژێر ناوی (هەڵەبجەی شەهیدو مار بارین) بوو:

لە جەنگەڵێ چڕو زەبەن
مارێکی زۆر جینگڵ دەدەن
ماریش ئەو تیرە مارانەن، چزوو تیژو هار
بە خوێنو قین، بە قەپ گرتن، بە ژەهر ڕشتن
گۆش کراون
وەچەی دەستی پسپۆڕو ڕاهێنەرانن
کارو ڕستی خۆ ویستو کەس نەویستانن
- هاتن مار هەڵگرانی زیندە کوژ
تیژ ڕەوو خوێنمژ
ملومۆش بە بۆنی خوێنەوە، لە ئاسمانی هێرۆشیمەیەکی تر
بە بەر چاوی جیهانەوە، بارەکانیان هەڵڕشت
(١)
بەو چاوانە بینیم لە پڕ
مارێ بە ژەهر ئاوس، سك پڕ
بە باڵای منارەی مزگەوتا هەڵگەڕا

(حاجی لەق لەق مار هات
ماری ژەنگ‌و ژار هات)
لانەی پووشینی پڕ ژار کرد
وتی وا جارێ لە پێشدا
وڕشەو نیشانەی بەهار مرد
(٢)
دابەش بوون، سەریان دەژەنییە نێو لانك‌و جۆلأنە
- ئێوە هێشتا ساواو وردن
بە ناوی مرۆڤایەتی، وا خەون‌و خەوم خۆشکردن
سەریان دەخستە نێو هێلأنەی چۆلەکان
نێو پەراسووی قەفەزان
بە ناوی شیعرو ناسکترین وشەی جوان
بە ناوی خۆشترین ئاوازو وتەی نیان
ئەگەر لانەی ئاسودەیی هەبێت.. لێرانەیە
بۆ فڕینتان ئاسمانێکی گەورەیە
(٢)
ئەمە خەونە، یان ڕاستییە؟!
ئەمە ڕەسمە، یان یارییە؟!!
فیلیمێکە، پشیلە، مشك ڕاو دەنێ
فیلیم وەستا،
نێوانی مشك‌و پشیلە،
چەند شەقاوێکی ژاردارە
لە یەك چرکەو لە یەك ساتێ

**نە مشك ڕاكردنی ما**

**نە پشیلەش قاچی لە دوا هاتو بیگاتێ**

**فیلیم وەستا**

**لەو شوێنەوە**

**ڕەق بوونەوە**

**تاد...**

**دوای ئـەو جەنگـە نەگریسـەی هەشـت سـاڵ بـەردەوام بـوو لـە نێـوانی عـیراق و ئێـران كـە لـە سـاڵی (١٩٨٠)وە دەسـتی پێكـرد، ئێـران ڕازی بـوو بـەوەی شـەڕ بوەسـتێ لەبـەرواری ١٩٨٨/٨/٨ كـە نـە عـیراق تیایـدا سەركەوتوو بوو نە ئێرانیش تەنیا ماڵ وێرانی لێ كەوتەوە بۆ هـەردوو لا، بـە ناچاری خومـەینی ڕازی بـوو گـوتی (ئـەوە پـەراخێكی ژەهـرەو نۆشـی دەكەم).**

(٥٤)

١٩٧٥ -١٩٩١

لە ئاداری ١٩٨٩ کە وەزعی خۆمو خاوخێزانم لەو پەڕی پەرپوتیو ناخۆشیدا بووین لە ڕووی گوزەرانو بیزاریمان نزیکەی پێنج ساڵ بوو خۆمو براکەم تەحسین هەر لە ماڵو ژێر زەمینو ڕاڕاییو خۆ حەشارد دانو جەنگی ئێرانو عیراقیش وەستاو هیچ ئەنجامێکی ئەوتوی لێ نەهاتە دی بۆ کورد جارێ، بۆیە لەو بەروارەی سەرەوەدا کە شەهید نوری نانەکەلی بە براکەی (ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی)ی گوت کە خاوەنی پرۆژەی پەلەوەری هەولێری بوو، بەڵکو (موحسین)ی برادەرمو خزم لە پرۆژەکەی خۆت ئیشێکی بدەیتێو موچەیەکی هەبێت، ئیتر لە ٣/٥/ ١٩٨٩ فەرمانم بۆ دەرچوو لەو پرۆژەیە دامەزرام، بەو پێیەی بەڕێوەبەری گشتی پرۆژەکە کاك (عەبدوڵڵا صابیر) بوو وەك خزم، جگە لەوەش کوردپەروەرو دڵسۆز بوو لە وەزعی من ئاگادار کرایەوە ئیتر ئەویش ئاگای لێم بوو لە ئەنجامی کار کردنم هەر زوو تێم گەیشتن کە چالاکمو ئیشەکانم بە جوانی ڕادەپەڕینم، فەرمانێکیان بۆ دەر کردمو کرام بە بەڕێوەبەری کۆی کۆگاگانی داکردنی پرۆژەی پەلەوەرو ورشەیەکی دارتاشینشی لێ بوو ئیتر لێپرسراوەتی ئەوشوێنەیان پێ سپاردم، زوو زوو پاداشت وەك ڕێزلێنانێك دەکرام جگە لە موچەکەم ئەو پارەیەشم وەردەگرت لەسەرئیشە ڕێكو جوانەکانم بوو تا ڕاپەڕینی بەهاری /١٩٩١ لەو پرۆژەیەی پەلەوەری

هەولێر کارم کرد، دواتر بووم بە بەڕێوەبەری ئیدارەی ئالیکسازی هەولێر کە ئەو دایرەیەش هەر هی بەڕێز ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی بوو، تا ١٩٩٦ لەو شوێنەش ئەو لێپرسراوەتییەم پێ سپار درا بووو موچەکەم باش بووو ئیدارەمان پێ دەکرد.

دەمەوێ ئاماژەیەك بە پرۆژەکانی پەلەوەری هەولێرو جوامێریو ئازایەتیو سەخاوەتی خاوەنەکەی (ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی) بکەم وەك شایەد حاڵێکی راستگۆو بە ویژدان:

١ – ئەو پرۆژەیە کوردایەتی لێ دەکرا بەو پێیەی ئەوەی ژنو کچە بارزانی بوو کە پیاوەکانیان لە ١٩٨٣/٧/٣١ لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە ئەنفاڵ کرا بوون، جا لەو سەردەمدا هەر وەکو کازانتزاکی دەڵێت: ئەگەر ئیمان بێ ئەوە مردووە.. ئەگەر ئەوین بێ، ئەوە فاسد بووە، ئیتر ژنو کچەکانی بارزانییە ئەنفاڵو بێ سەرو شوێن کراوەکان لە لایەن ئەو پیاوە خێرخوازە (ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی) لەو پرۆژەیەو لە دایرە پاشکۆکانی پرۆژەکەی خۆی دایمەزراندنو کاریانی پێدەکردن، خۆ پیاوێك، کەسێك نەیدەتوانی بە چاوێك سەیریان بکات بە خراپە چونکە یەکسەر فەسڵ دەکران لە کارەکانیان، بەڕێوەبەری گشتی عەبدوڵلا صابیر کە دەستڕۆیی لە لایەن کاك ئەحمەد پێ سپێردرا بوو بە خۆیشی پیاوێکی شەڕفمەندو جوامێر بوو، جا داڵدەدانو بە ئیش خستنی ئەو ژنو کچانەی بارزانیانو پاراستنی شەڕەفو کەرامەتیان جێگای شانازی بوو بۆ کاك ئەحمەدو کارمەندەکانی کە کەسێکیان دانەدەمەزراند ئەگەر جێگای متمانە نەبووایە بە تایبەتی لایەنی شەڕەفمەندیو داوێن خاوێنی چونکە لەو پرۆژانەیەدا ئەو هەموو ئافرەتانە کاریان دەکرد تا پارێزراو بن.

٢ - ئەو پرۆژەیە وەك قەڵەندەرخانەیەك بوو بۆ هەژارو لێقەوماوو فیرارانی سەربازیو دابڕاوان (فەسل)لە دایرەکانی ڕژێم، هەوا بۆ دەرچوانی زانکۆکان کە ڕژێم ژیانیانی دابین نەدەکردو دانەدەمەزران، جا لەو پڕۆژەیە بە بێ ئەوەی حسێب بۆ کەسەکانیش بکەن سەر بە چ حزبو لایەنێکن تەنیا ئیشیان جوان بووایە بێ خەوش لەو پرۆژەیە جێگایان دەبۆوە. جا من یەکێك بووم لەوانەی قاچاغو یاخی لە ڕژێمی ئەوسا هەم لەم پڕژەیە کارم دەکردو هەم شوێنێکی گونجاو بوو بۆ خۆ حەشاردانو لە دەرەوەی شار بوو. هەر وها وەك لە پێشدا ئاماژەم پێکرد بوو (تەحسین)ی براشم لە پرۆژەی پەلەوەری کەلەك نزیك چەمە دوبز لەوی کاری دەکرد بە هەمان وەزع.

٣ - کە لەو پڕۆژەیە ئەو چەند ساڵە کارم کردووە بۆ من زۆر ئاسانیش نەبوو، لەبەرئەوەی دەبووایە لە سەعات پێنجو نیوی بەیانیان بە تێر نەخەوتنی ئامادە بم کە ترومبێل جۆری (ڕیم)ی شانزە نەفەری دەهاتو کەسانی دی لەگەڵ بەندە کارمەندان کۆ دەکرایەوە بۆ سەر ئیش لەوێ دادەبەزین، شتێکی خۆشم بیر کەوتەوە، هەڵبەتە ئەو کاتی جاشە کوردە چەکدارەکان کاریان وا ڕێك خرا بوو کە (١٥)ڕۆژ لە ڕەبییە واتە سەنگەر بنو پانزە رۆژیش لە مال، ئەز قەزا وا رێك کەوتبوو ئەو ریمەی ئێمەی دەهێناو دەبرد، شوفێرەکانیان دوو برا بوون، (١٥) رۆژ یەکێکیان هاتووو چووی پێ دەکردین، ئەوەی تریش (١٥) ڕۆژی دی، رۆژێکیان بە یەکێکیانم گوت ئەرێ برا ئەوە (ڕیم)ە یان (ڕەبیە)یە؟ ئەو وتەیە لە پرۆژەکە بلاو بۆوە وەك نوکتەیەك. ٤ - کاك ئەحمەد خاوەنی پرۆژە بڕیاری دا، دیوارێکی بڵند بە بلۆك واتە شوورەیەك بە دەوری پڕۆژەکەی هەڵنیو دروستی کرد، جا شوورەکە بەشێکی بە نێو گوندی شاوێس

دادەچـوو، هەنـدێك خـەڵكی عەشـایری لێ بـوو، چـوو بـوون شـورەكەیان ڕووخاند بوو، یەكێكیان لـە كەسـەكانی ئەو كارەی كرد بوو بەرامبەر بـە شـوورەی ڕووخـا وەسـتا بـوو بـە شـێوەزاری عەشـایرییەكەی‌و ناوچـەكەی خۆی دەیگووت:

ما برا، بێنن لێ بڕایە
ئاسمانن لێ دیار نینە
نەفەسانن لێ تەنگ بووینە

٥ – لەو ماوەیەی لەو پرۆژەیە دەوامم دەكرد، دایكم تووشـی نەخۆشـی هەوكردنی سیەكانی ببوو، من زۆر خەمبار بووم چونكە دایكمم زۆر خۆش دەویسـت زیـاتر لـە پێویسـت، هـەر نـا لەبەرئـەوەی بـە هـەر سـێ بـرا لێیـی نەگەڕاوین نانێك بە تێر زگی خۆی بخوات یـان پێشـمەرگە بووینـە تووشـی غوربەت‌و ترس‌و خەممان كردووە یان كاری سیاسیمان كردووە ئەویش لە پێناو كوردایەتی، یـان خۆمـان حەشـار داوەو ترسـی گرتنمـان بـە دواوە بووە، كە ئەوەش بۆ هەموو دایكێك چەند نیگـەرانی‌و ڕاڕایـی‌و كۆڵەمـەگی بـووە، دوای ئـەوەی لەگـەڵ شـلێری هاوسـەرم چـووەتە لای دكتـۆر نـەجم سورچـی، ئـەویش حـەب‌و (٢٤) دەرزی بـۆ نووسـیوەو پێـی نـەگوتوون ١٢ دەرزی لێـدەدەن پـاش ٧ ڕۆژی تـر ئنجـا ١٢ دەرزییەكـەی تـر، جـا دوای ئەوەی هـەر ٢٤ دەرزی لەسـەر یـەك لێدەدرێ بـێ ئـەوەی مـاوەی هەفتەیـەك بـەینی بـدرێتێ، بۆیـە یەكسـەر تووشـی (عجـز كليـە) واتـە پەككـەوتنی گورچیلەكانی بـووە، دوای ئـەوەی بـۆ چارەسـەری تـەنیا دوو ڕێگایـان بـۆ دانا بوو كە باری تەندروستی تـەواو تێكچوو بوو، یەكـەم یـان شووشـتنی

گورچیلەکانی (غسل کلیە) یان خوێن تێکردنی کە لەگەڵ خوێنەکەی خۆی هاوخوێن بێت لە گرۆپی (ئۆ – ناقص) بوو، زیاتر بارو خەمم گرانتر بوو، ئەوەی دەستبارم بوو بۆ چارەسەری لەو سەردەمدا کاك ئەبوبکر مەلا ئیسماعیل نانەکەلی کە زاوام بوو، خوشکم هاوسەری بوو، لەگەڵ هاوسەرەکەی خوی، دایکمی دەبردە بەغدا واتە خەسووەکەی بۆ لای دکتۆر (مونزیر) کە پسپۆڕ بوو لە نەخۆشییەکانی هەناوو گورچیلە، ئیتر هەر جارەی دەرمانو چارەسەری دەهێنایەوەو ڕێنماییەکانی دکتۆریان جێبەجێ دەکرد، منو براکەمیش تەحسین هەر یاخی لە ڕژێمو نەمان دەتوانی هیچ کارێك بکەین بۆ ئەو دایکەمان، جا (١١) ساڵان خوا ژیاندیو ئەو دکتۆرەش مونزیر زۆر زیرەك بوو سەریان لێ نەدەبڕیو دەیانبردە بەغدا هۆکارێك بوو، وا ڕکەوت لە دوای ڕاپەڕینەوە ئەو دکتۆرە نۆرینگەی (عیادە)ی لە هەولێر داناو زوو زوو لە ماڵی ئەو خوشکەم کاك بەکر نانەکەلی دەعوەت دەکرێ پەیوەندی لە گەڵماندا زۆر خۆشە هەتا ئێستایش بە یادی ئەو ڕۆژانەی لە بەغدا چارەسەری دایکمی دەکرد، ئیتر بە داخەوە لە (١٩٩٦)دا دایکم کۆچی دوایی کرد، یانزە ساڵان بەو ئازارەوە ژیا کە هەموو مانگێك یەك یان دوو شووشە خوینی دەویست کاتێ تەندروستی تێکدەچوو بە خوێن تیکردنەکەوە دەهاتەوە سەرەخۆ، ئەو خوێنەش هەموو مانگان بە ئاسانی دەست نەدەکەوت چونکە ئەو گرۆپەی (ئۆ – ناقص) کەم بوو لە جەستەی زۆربەی مرۆڤەکاندا، هەر چەندە لە عێلو عەشرەتو خزمان ریزبەندی بۆ دەگیرا هەر جارەی یەکێك لەوانەی خوێنەکەی دەگونجا پێشکەشمانی دەکرد، شلێری هاوسەرم زۆربەی زۆری جارەکان ئەو دەیبردە خەستەخانەو لە گەڵیدا بوو، هەروا لەگەڵ ئەو کەسەی دەهات خوێن بدات دەبووایە خوێنەکە فرێش بێت، جا ئاسان

نییە ئەو هەموو مانگو ساڵانە بەردەوام هەر مانگێك دوو نەفەر یان نەفەرێك بەرن بۆ خەستەخانە، سستەرەکان یان برینپێچەکان کێشەیان ئەوە بوو دەمارەکان نەدەدۆزرانەوەو ئاوت دەبوو تا خوێن بۆ جەستەی بنێرن، جا هاوسەرەکەم شلێر ئەوەندە شارەزای ئەو کارە ببوو هەر جارەی خۆی دەمارێکی دەدۆزییەوە ئەم کارەی خوێن تێکردنی بۆ ئەنجام دەدا تا بە تەواوی شووشە خوێنەکە دەچووە نێو جەستەیو دەهاتەوە سەرە خۆی، شلێر هەر چەندە هاوسەرم بوو بەڵام قەت لە بیر ناکرێ ئەوەندە دڵسۆزو ماندوو بوو لەگەڵ ئەو دایکەم تا ماوم منەتباریمە،

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ ئیتر باڵەکانم لێ ڕواو ئازاد بووم بە ئارەزووی خۆم بێمو بچم، ساڵی (١٩٩٥) شەو درەنگ بوو دایکم وەزعی تەندروستی زۆر تێکچوو بوو، کەسمان دەست نەکەوت لەگەڵ خۆماندا بیبەین بۆ خەستەخانەو خوێنی لێ وەرگرین ناچار بووم پەنام بردە بەر یانەی ڕۆشنبیران لە هەولێر کە نووسەران لێی دادەنیشتن، چەندین مێز ئاوەدان بوو کە هەمویان لەو نووسەرانەی هەولێر برادەرم بوون، داوام لێ کردن بۆ خوێن بەخشین کە (ئۆ – ناقص)ە گروپەکەی، تەنیا ڕەوانشاد (مەحموود زامدار) گوتی خوێنی من دەشێت لە گروپی (ئۆ – ناقص)ە، گوتی فەرموو هەر ئێستا با بڕۆینو لە گەڕانەوە دێمەوە ئێرە، چووینە خەستەخانەو لەوێ خوێنمان لێ وەرگرتو گوتی بمبەرەوە بۆ یانە، هێشتا پێکەکەم لەوێ سارد نەبۆتەوە، چووینە یانە بەڵام هاوڕێکانی سەر مێز تەنیا یادی بەخێر خالید جوتیار مابۆوە ئەوانی دی ڕۆیشتبوونەوە بۆ ماڵ، بە گارسۆنەکە یان بڵێم بە بۆیەکەم گوت، چوار شیش جەگەری بۆ بێنەو هەر چ دەخواتەوە حیسابەکەی ئەو مێزە عایدی منە، زۆر منتباری بوومو گەڕامەوە خەستەخانە، دایکم هاتەوە سەر خۆ، ئەوەی دەمەوێ

لێرەدا بیڵێم هەڵبەتە خوێنی مەحموود زامدار سێ بەشی عارەق و (مەی)یە، چەند ڕۆژێك بوو ڕەوانشاد دایکم زۆر بە زەوق و پێکەنین و گفتۆی خۆش بوو، پێشتر ئەوەندە کەم دوو بوو بۆ وای لێ هاتووە؟ من دەمزانی مەسەلەکە خوێنەکەی مەحموودە، ئێ دایکم و ماڵەوەمان نوێژ دەکەن و عارەق لە لایان حەرامە، چەند مانگێگ تێپەڕی هەر بۆ خۆشی هەموو خاوخێزان دانیشتبووین باسم کرد، زۆر پێکەنین و دایکم گوتی ئەوەشت لە گەڵم کردووە، گوتم چاك نەبوو کاك مەحموودمان دەستکەوت و ئەو پیاوەتییەی لەگەڵ کردین.

لە ساڵی ١٩٩٦ دایکم ڕۆحی شاد بێت کۆچی دوایی کرد، بۆ من کۆستێکی هێندە گەورە بوو، هەموو بیرەوەریەکانی بە نێو دەمارەکانی خوێنمدا هەمیشە دەسووڕایەوە بە جۆرێك توشی سەر ئێشەیەکی وای کردم، چەند مانگێك لەسەر سەر دەسووڕام و ئاگام لەو دنیایە نەما بوو، دواتر کە چوومە لای دکتۆرێکی دەروونی، پێی گوتم حاڵەتێکی (صدمە) یە، حەبێکی بۆ گرتمەوە لە نۆرینگەکەی خۆیدا، ئیتر شەو ڕۆژ هەر دەخەوتم و وردە وردە دەهاتمەوە سەرە خۆ، هاوسەرەکەیشم زۆر کەشی وای بۆ دەڕخساندم هەر لە سەفەرو مێواندارىو ئاوەدانی بەرەو باشتر ڕۆیشتم، قەسیدەیەم نووسی بە ناوی (دایکم و کۆچی بە سوێ) کە لە ئەڵقەکانی پێشوومدا ئاماژەم پێکردووە چەند کۆپڵەیەکم لێ نووسیوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەمەوە.

لە دوای ڕاپەرینیش لە (١٩٩١)ەوە تا ١٩٩٦ هەر فەرمانبەری (ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی) بووم لە کارگەی ئالیکسازی هەولێر بەڕێوەبەری ئیداری بووم لەو کارگەیە، ژوورێکی تەنیا و ڕێك و پێکم هەبوو کە لە ناو شار بوو لە نزیك پارکی شانەدەر، ئازاد بووم، جێگری سەرۆکی یەکێتیی

نووسەرانی کورد لقی هەولێریش بووم، کە لە دوای ڕاپەڕین لەبەرواری ١٠/١١/ ١٩٩١ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران هەڵبژاردن کرا دەنگی یەکمم وەدەست هێنا ئێواران لە بینایەی (ئەسواق اربیل) نزیك پارێزگا شوقەیەکمان گرتبوو، دەوامم دەکردو کەم کەمە چالاکی ئەدەبیمان هەبوو، جا لەو کارگەیە زۆر یارمەتی دەدرام بە تایبەتی بۆ مۆڵەت پێدان لە هەر کۆڕو ڤیستڤاڵێك هەبووایە، هەروەها ئیشێکی کەمم هەبوو لەو ژوورەدا هەلێك بوو بۆ من، بۆ خوێندنەوەو نووسین، هەر بۆ خۆشی ئەو ماوەیەی لەوێ بووم:

١ - جوتیارانو عەلافەکان دوای وەرزی دروێنە، بۆ ئەو کارگەیە گەنمو جۆو گەنمەشامیو ئەو جۆرە بەرهەمانەیان دەهێنا کە دەکرایە عەلەف بۆ پرۆژەی پەلەوەری هەولێرو پیدانی بە پەلەوەرەکانی ئەوێ، جا بەر لەوەی بۆ جوتیارو عەلافەکان پارەی نرخی بەرهەمەکانیان بۆ سەرف بکرێت، بە دەزگایەکی کارەبایی تاوتوێی جۆری بەرهەمەکە دەکرا کە چەند زیوانو خۆڵو بەردو کەمو کوڕی هەیە، لە نرخو پارەکەی دەشکێندرا، لێپرسراوی سەرەکی ئەو کارە بە کەسێکی سریانی سپێردرا بوو ناوی (ئۆغستین) بوو ژوورەکەی لە تەك ژووری من بوو، ڕۆژێکیان جوتیارێك هاتە ژوورەکەی من گوتی ژووری (ئۆکسجین) کامەیە، منیش لە گەڵیدا چوومو ناوەکەم بۆ ڕاست نەکردەوە بڵێم (ئۆغستین) ە نەك (ئۆکسجین) جا بۆ جوتیارەکە ئاماژەم پێکردو گوتم ئەوەتە ئەو پیاوەیە، جوتیارەکە پێیی دەگوت کاك ئۆکسجین بۆ ئەو هەموو پارەیەت لە من داشکاندووە، بە سەری ئەو ئۆکسجینە گەنمەکەم دەڵێیی گەوهەری زەردە، ئۆغستین بە تیلەی چاوی تەماشای دەکردم وەك بڵێت، بۆیە ئەو ناوەی منت بۆ ئەو جوتیارە ڕاست نەکرۆتەوە تا بۆ خۆت پیم ڕابوێری، جا هەر جارەی

دەچوومە ژوورەکەی پێم دەگووت هاتووم هەندێك ئۆکسجین هەڵمژمو بگەڕێمەوە ژوورەکەی خۆم، ئەویش هەر چەندە لە لای جوتیارو عەلافەکان دوژمنێکی ئێسك گران بوو، بەلاّم پیاوێکی لەسەرەخۆو باش بوو، زۆر نێوانی لەگەڵ من خۆش بوو، یادی بەخێر ئێستا لە ئەوروپا پەناهەندەیە.

٢ - ئەو کارگەیەی ئالیکسازی هەولێر هەمان سیستەمی پرۆژەی پەلەوەری هەولێری هەبوو کە سەر بە کەسی (ئەحمەد ئیسماعیل نانەکەلی) بوو دەبووایە سەعات حەوت هەموو کارمەندو کرێکارو لێپرسراوەکانیان لەسەر ئیشی خۆیان بن، جا بە ڕێمو کۆستەرەکان دەگوازرانەوە سەر کار، بۆیە ئەوانەی لەو کارگەیە کاریان دەکرد سەعات پێنج لە ماڵ نانیان دەخواردو پێنجو نیو لەسەر جادەکان دەوەستان، دوای ئەوەی هەموو کەسە وەستاوەکان لێرەو لەوێ، ماڵ دوورو نزیك کۆ دەکرانەوە، لەبەرئەوەی کە زۆربەیان ئەوانەی لەو کارگەیە ئیشیان دەکرد نوێژکەر بوون، بەیانیان بەوە ڕانەدەگەیشتن خۆیان بشۆن یان کارەبا نەبوو، ئاو گەرم نەدەبوو لە ماڵەکانیان، جا لەو کارگەیە دوو حەمام یان بڵێین دوو گەرماوی لێ بوو بەیانیان خۆیان بسمیل دەکرد، یان ڕوونتر غوسڵیان لە خۆیان دەردەکرد، ڕۆژێکیان بینیم یەکێکیان لە کارمەندەکان ئەوە سەری داوەتە بەر مەغسەڵ یان بڵێم دەستشۆر سەری لە ملەوە دەشوات، کە لێبۆوە (پێم گوت ئەوە غوسڵی ماچ لە خۆ دەردەکەی؟) گوتی بەخوای برام تۆ هیچ خەمێك ناخۆی لێرانەدا بە هەموومان ڕادەبوێری، گوتم جار جار دەبێ بڵێین گوێیی مەدێ لێخوڕە دەشتە.

(٥٥)

١٩٧٥ -١٩٩١

ئەو شیعرو نووسینانەی بڵاوم دەکردەوە ئەگەر لە پەنای شیعری دڵداریو سروشتو مرۆڤدۆستیو جوانییەکانی ژیانکردنو خودو هەر شتێك بووایە بە هێماو ئاماژەییو ناوپۆشراوی باسێکی کۆژانو وەزعی کوردو تاوانو هەڵسو کەوتی ناپەسندی رژێمی تێدەکەوت، جا هەندێك لەو چالاکیانەم بە بەروارو هەبوونیانەوە وەك:

*جریدە العراق ١٩٧٦ ئەو شیعرەم لە لایەن ئازاد عبدلواحید وەرگێردراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی لە ژێر ناوی (بوابة القلب ومفاتیح العینین)

*لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٠ – ٤١) ١٩٧٧ لە ژێر ناوی (چوار وەرز) ئەم شیعرەم بڵاو بۆوە کە بە (هێما) باری نالەباری وەزعی گەلەکەم دەربڕیوە بۆ نموونە یەك لە وەرزەکان:

زستان

دەنگ دێ.. کێیە؟

منم زستان، هەورم پێیە

رەوانەم کرد، گومرگی پێکەنینی خۆر

لە چاوی ئاسۆ وەرگرێ

ئێوارەیە، شەو پەنجەی لە خوێن دەگرێ

*جا هەر لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٣) حوزیرانی ١٩٧٧ دا بە ناوی (شیعرەکانی ژمارەی پێشووم خوێندەوە) شاعیرو نووسەر (صلاح شوان)هەڵسەنگاندنێکی بۆ شیعرەکان کردووە کە لە ژمارە (٤٠ – ٤١) دا بڵاو بۆتەو، نووسیویەتی و دەڵێت:

(ئەو پارچە شیعرەی کە لە هەموویان سەرکەوتوو ترە شیعری (موحسین ئاوارە)یە چوار وەرز بۆیە هەوڵدەدەین لە دوایرا لەسەری ڕاوەستین.. هتد)

*لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٤٢)لە ئەیلولی/١٩٧٨ شیعرێکم لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕاوە (لە ئەدەبی گەلانەوە – شاعیری ناوداری ئێرلەندی، جێمز سیمۆنز)

*لە جریدەی عیراق – الملحق الشهری ٢٠٨/٤ فی ١٩٧٦/١٠/٢٦ شیعرێکی وەرگێڕدراوم بۆ سەر زمانی عەرەبی لە لایەن (سهیل الصباح) بە ناو نیشانی (نسمات الجبل) کە نووسیویەتی في قصیدة رومانسیة لشاعر الكردي المعاصر (محسن اوارە) بڵاو بۆتەوەو هەلسەنگاندنێکی بۆ کردووە.

* لە ساڵی ١٩٧٨ کۆمەڵە شیعری (شەوارە)م لە کتێبێکی قەوارە مام ناوەندی بڵاو کردەوە، شیعرەکان شیعری ئازاد بوون کە هێما و ناوپۆشراوی لە خۆ دەگرت لە مەڕ جوانیەکانی سروشت و ژن و دڵداری و نیشتمانی و ئازارەکانی نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول، هەروا زیاتر شیعری بەرگری و بەرەنگاری تیا بوو کە دەنگ و سەدای باشی هەبوو جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆری لە هەموو شارەکانی کوردستان سەرف بوو، هەر (سلێمانی)یەوەش لەلایەن شێخ ئەنوەر خاوەنی پەرتوکخانەی ئەنوەر بە سەدان دانەی بە قاچاغ ڕەوانەی کوردستانی رۆژهەلات کرد بووو

ژمارەیەکی زۆری لێ سەرف‌و بلاو ببۆوە.... لەسەر ئەو شیعرانەی نیو بەرگی (شەوارە)دا هەبوون هەندێك لەو شیعرانەدا لە لایەن وەرگێڕو شاعیرو نووسەران وەرگێڕدران بۆ سەر زمانی عەرەبی‌و فارسی‌و بیانی هەروا لێکۆڵینەوەی زۆریشی لەسەر کراوو بلاو کرایەوە. ئەو کات شیعر وەك کەپسول‌و حەبی ئازار شکێن بۆ کوردەو هەست بریندار بووەکەو هەڵگەڕانەوەش لە ڕژێم‌و بەرەنگار بوونەوەو بەرز کردنەوەی وەرەو خۆ ڕاگری هەروا هەڵشاخان‌و بوون بە پێشمەرگەو چوون بەرەو پیلی مەرگ‌و زیندانەکانی قەسر النهایەو ئەبو غرێب.. چەند نموونەیەك لەو بابەتانەی لەسەر کۆمەڵە شیعری (شەوارە)یان نووسی:

* لە / جریدەی العراق / ١٩٧٨/ لە ژێر ناوی (قصیدتان لشاعر محسن اوارە) ترجمە محەمەد بدری، دوو کۆپلە شیعر لە کۆمەڵە شیعری (شەوارە) بۆ نموونە لەو دوو کوپلە شیعرەی کە یەکێکیان لە ژێر ناوی (أمرأە) ئەو کۆپلەیە لە شەوارەدا بە ناوی (ئافرەتێك) نووسراوە هۆنراوەکە بەم شێوەیەیە:

**ئافرەتێکە.. ئاوارەیە**
**سێ منالی بە کۆڵێ پێ هەڵناگیرێ**
**هەر لە ڕێدا... هەر لە ڕێدا**
**ناشزانێ کامیان فڕێدا**

* لە ژمارە ١٨ /ی ١٩٧٨ (جلال وردە) کە ئێستا بە ناوی جەلال زەنگابادی دەنووسێ لە لوبنان لە ڕۆژنامەی (الهدف)ی فەڵستینی کە لە

لایەن جۆرج عەبش بلاو دەکرایەوە چەند کۆپەڵەیەك لە شیعرەکانمی بلاّو کردۆتەوە کە لە دیوانی شەوارەمدا هەیە.

*لە رۆژنامەی عیراق ١٩٧٨ (شەوارە) لە لایەن شاعیر لەتیف هەلمەت بە زمانی عەرەبی لێکۆلینەوەو هەڵسەنگاندنێکی تێرو تەسەڵی لەسەر شیعرەکان بلاّوکردووەتەوە بۆ ناساندنی بە ئەدیبو رۆشنبیرانی عەرەب.

* (هێرۆ گۆران) لە رۆژنامەی رێگای کوردستان (الشعب) ژمارە ١٥٣٢ ت٢ / ١٩٧٨ شیعرێکی لە شەوارەدا هەڵبژاردووەو وەریگێڕاوەتەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

*لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٥٣ ك٢ / ١٩٧٨ لە ژێر ناونیشانی (شەوارەو تیشکێکی رووناکی) شاعیر کەریم دەشتی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنێکی پڕو چڕی بلاّو کردۆتەوە.

*لە رۆژنامەی العراق ژمارە ٢٥ ت٢/ ١٩٧٨ عبدالغنی علی یحیا، کۆپلە شیعرێکی لە شەوارەدا هەڵبژاردووەو وەرگێڕاوەتەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

*لە ژێر ناونیشانی (چەند تێرامانێکی رەخنەیی لە کۆمەڵە هۆنراوەی شەوارە) ی موحسین ئاوارە، لە لایەن شەهید شەقی عەباس کاکەشین بلاّو کرایەوە.....

*لە ژمارە ٤٦٢ ل-ە ١٩/شوبات١٩٧٩ لە رۆژنامەی هاوکاری لێکۆلینەوەیەك لە لایەن ئەبوبکر حوسێن علی لەسەر کۆمەڵە شیعری (شەوارە) بلاّو کرایەوە.

*لە رۆژنامەی بیری نوێ ژمارە ٢٠٤ لە ١٩٧٨/٨/١٩ لەسەر کۆمەڵە شیعری شەوارە لێکۆلینەوەو هەڵسەنگاندنێك بە ناوی (کاروخ) بلاّو

کراوەتەوە، هەروەها لە جریدەی (الفکر الجدید) بە ناوی (متابعة نقدیة) وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

* لە ڕۆژنامەی جریدە العراق / ژمارە ٢٢ ت١/١٩٧٧ / لە ژێر ناوی قصیدتان موجزتان من الشعر الکردی المعاصر شعر (محسن أوارە) لە لایەن موکەرەم رەشید تالەبانی وەرگێردراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.

*هەروا لەو ساڵەدا چەندەها شیعری هێمادارو بەرەنگاریو بەرگریو وەرگێڕانو بابەتی دی ئەدەبی بڵاوم کردۆتەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بۆ نموونە: (شیعر لە ژێر ناونیشانی –کۆترە شینکەی سەر گومەزی چاوەکانم – لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٩) لە مایس/ ١٩٧٨.

*دوریانو شەوێکی سارد / شیعر / ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٠٣) لە ١٩/ ك١/١٩٧٧.

*شاری ئێواران /شیعر /گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ / ژمارە ٦٩ /ئاب/١٩٧٨ بڵاو کرایەوە.

*ئەو شیعرەم بە ناوی (شاری ئێواران) لە لایەن (محمود زامدار)ەوە وەرگێردراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی کە لە ڕۆژنامەی العراق لە ژمارە (١٢٨٥) لە ١٩٨٠ لە ژێر ناونیشانی (مدن الاماسی) من الشعر الکردی المعاصر لمحسن أوارە ترجمە محمود زامدار بڵاوکراوەتەوە.

*لە پاشکۆی ڕۆژنامەی عیراق بەشی کوردی لە ژمارە (١٢ – ١٣)ی شوباتو ئاداری / ١٩٧٨ دا شیعرێکم بڵاو کردەوە بە ناوی (بۆ ئەو شارەی دەچمو ناچم) مانا هەڵگرو هێما ئامێز بوو باس لە پێشمەرگەیەك دەکەم بە نهێنی بۆ شارەکەی کەرکوك دەچێت بۆ لای خۆشەویستەکەیو دەگەڕێتەوە بۆ بنکەکەی خۆی بۆ ناو شۆڕشی نوێی کورد، زیاتر خەیاڵو ناوپۆشراویو گەمەیەکی مانا هەڵگرو مەدلوولی سیاسیو نەتەوەیی لە

خۆ گرتوویی تیایە بوو کە بە ئاسانی خۆی نەدات بە دەستەوە بۆ سیخورە راپۆرت نووسەکانی رژێمی بەعس لەو سەردەمدا، هەندێك دێڕ لەو قەسیدەیە بۆ نموونە کە تیایدا هاتووە:

بۆ ئەو شارەی دەچم و ناچم
ئا ئەو شارە لەگەڵ فراوانیەکەیەوە
لە چاوە بچکۆلەکانم دانیشتووە
شاری خۆشەویستەکەمە
دەرگاکان، هەموو دەرگاکان، بە رەنگی رەنگ کەن
ماڵەکەیان دەناسمەوە
شەویش دابیٚ و گلۆپەکانیش دانەگیرسێنن
شەقامیٚ دەدۆزمەوە
دەستم لە زەنگی دەرگاکەیان گیر کات
-گوێم لێیەتی...
ئەوە هات، بۆ ساتیٚ لە لام دەمێنێتەوە
پۆلوەکانی چاوەڕوانیم دەخەوێنیٚ
چرای تەمەنێکی نویٚ پێدەکات و
تۆزی زەردی سەر سەر دڵم دادەوەشێنیٚ
-لە دواین کۆپلە دا لەو قەسیدە درێژەدا دەڵێم:
تۆو خوا ئەی مانگ
رکێڤ- لە ئەسپی کاتژمێرم مەدەو
کارمامزی میل راو مەنیٚ
هێشتاکە شەو ڕانەکشاوە

ڕۆیشتن لەغار بگرەوە
کێڵگەی ئارەزووم تێنووە
جۆگە لە رووبار بدزەوە
- ڕۆیشتم بڕۆ ژوورەوە
چپەی سەر لێو مەکە بە دەنگ
تۆش ئەی دەنگ مەبە بە هاوار
- سا خوات لەگەڵ
ئەی سوارەکە.. تۆ چ سوارێکی
ئەو تورەگە خۆڵاویەت لەسەر پشتایە
تێشووە نان و
خۆشەویستی و
بیرەوەریمی تیایە!!

*چیرۆکێك لە ژێر ناونیشانی (سێبەر) لە ژمارە (٥٢) لە ت١/١٩٧٨ لە ڕۆژی کوردستان پاشکۆی (شمس کردستان) بلاوم کردۆتەوە.

*گۆرانی قەرەجە گەرۆکەکان / وەرگێڕان لە عەرەبییەوە بۆ کوردی لە ڕۆژنامەی هاوکاری ١٣/ئاب/١٩٧٩.

* گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ / ژمارە ٧٥ لە تەموزی/ ی ١٩٧٩ / لێکۆلینەوەیەکی درێژ بە ناوی (ڕەنگدانەوەی وێنە لە شیعری نوێیی کوردیدا) بلاوم کردۆتەوە.

* شیعری شاعیر (کونتر کۆنرت) وەرم گێڕاوەتەوە بۆ سەر زمانی کوردی لە عەرەبییەوە لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٤٧٩ لە ١٨ / حوزیران / ١٩٧٩ بلاو بۆتەوە.

*چـۆڕاوگە / شـیعر / لـە پاشـکۆی ڕۆژنامـەی عـیراق ژمـارە ٢٧ لـە حوزیرانی / ١٩٧٩ بلاّو بۆتەوە.

*لـە ژمـارە ٢٧ لـە ١٩٧٩ نووسـەر ئیسـماعیل ڕۆژبـەیانی ئامـاژەی بـە شـیعرێکم کـردووە بـە نـاوی (ئـافرەتێکی ئـاوارە) نووسـینێکی لەسـەر نووسیوە.

*لـە گۆڤاری بەیان ژمارە (٦٦) لـە ئەیلول ١٩٨٠ / لـە ژێـر ناونیشـانی (شیعری نویێ یان داڕشتن بە سەر ڕێڕەوی پوختدا) نووسینی (ئەلفارین) لێکۆلینەوەیەکی درێژ لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی کوردی وەرم گێڕاوە.

*ئـەو نموونانـەی هێناومەتـەوە مشـتێکە لـە خـەرواری بـلاّو کـراوەو چالاکییەکانم هەر لە ساڵی هەفتاوە تا ساڵی ١٩٨٠، هەروەها یەکەم دیوانی چـاپکراوم شـەوارە کـە بـە دەنگـەوە هـاتنی و کاریگـەری و دەنگدانـەوەی هـەبوو هـەر وەك لەسـەرەوەدا لـەو بارەیـەوە چـەندێك لـە لێکۆڵینـەوەو لێدوان و وەرگێڕان لەو شیعرانەم کە ئاوڕی لێ دراوەتـەوە خسـتمە ڕوو بـە تایبـەتی کـە سـەردەمی شـیعری بـەرانگاری و بـەرگری بـوو هـەر وەك لـەو دیوانەشدا هەست پێدەکرێ ئەگەر بە ئاشکرا یان بە ڕەمزو ئامـاژەو هێماو ناوپۆشراوی دەکەوێتە بەر چاو. ئەگەرچی دابڕانی تێکەوتووە بە تایبەتی کـە ١٩٧٤ تـا ١٩٧٥ لـە ریـزی شـۆڕش بـووم و دەربـەدەری ئێـرانیش دوای نسـکۆی ١٩٧٥شۆڕشـی ئـەیلول ئـیتر زیـاتر لـە ١٩٧٦وە چـالاکی و بـلاّو کراوەکانم دەستی پێ کردۆتەوە، پێم وایـە بـۆ ئـەو بابـەت و دیوانانـەی کـە دوای شەوارە بلاّو بۆتەوە یان وەك دیوان بە چاپم گەیاندووە، دواتر تـەنیا ناوی دیوانەکان دەنووسمەوەو ناکرێ لەوە زیـاتر چیم بـلاّو کردۆتـەوە تـا ئەو کاتەی ٢٠٢٠ کە برمیلێك مەرەکەبم سەرف کردووە بیانووسم.

ئەگـەر ئاماژەیـەك بـە وتـە خۆشـەكانی (مـەحموود زامـدار) بكـەم كـە بـە دەیـان جـار، چ لــە ســەفەرو دانیشــتنەكانی ســەر مێــزو بۆنــەكان لــێم بیســتووەو دیومــە كــە نــاكرێ هــەمووی بگێڕمــەوە چــونكە هــەمووی هــی گێڕانــەوە نییــە، نێوانمــان زۆر خــۆش بــوو، زۆر جــاران لــە هــەفتاكان كــە دەچـوومە بەغـدا لەبەڕێوەبەرایـەتی رۆشـنبیری لـە دەسـتەی نووسـەرانی گۆڤـاری بـەیان و رۆشـنبیری بـوو لەوێـدا دەچـوومە لای یـان لـە چـایخانەی پەرلەمان كە زۆربەی نووسەرانی كورد لەوێ دادەنیشتن و یەكتریان دەدی، جگە لەو سالأنەی لە هەولێریش نیشـتەجێ بـوو زۆرێـك لـە شـەوان مێزێـك كـۆی دەكردینـەوە كـە عیشـق و شـیعرو ئـەوین دایدەگیرسـاند دەنگـی زۆر خۆش و بە سۆز بوو، سەرتا بەو گۆرانییە تێی هەڵدەكرد:

هەر سەیدزادەیێكی شاڵ كرمانی بێت
هەزار بەگزادە بە قوربانی بێت

جـا دەپەڕیـەوە هـەتا قۆریـاتی توركیشـی تێكـەڵ دەكـرد، ئـەوەی لەسـەر مێزەكە بوو زیاتر مەست دەبوون بە تایبەتی ئەگـەر رەوان شـاد ئیسـماعیل گـەیلانی ئـەو كـات لـە دانیشـتنەكە بووایـە هەسـتی دەوروژاو ئـەویش بـە دەنگـە خۆشــەكەی هــەڵی دەكــردە گــۆرانی، ئەگــەر بڵــێم محەمــەد عــارف جـەزراوی دووەم بـوو لـە لاسـایی كردنـەوەی جـەزراوی دا، جـا مـەحموود زامـدار زۆر تەردەسـت بـوو بـۆ هـەموو وەلأمێـك كـە زۆر جـاران بـرادەران تـەكبیریان لێ دەكـرد كۆدەتایـەكیان ڕێدەخسـت بكەوێتـە نێـو تەڵەكـەیان، بـەلأم زامـدار پـیرە مەلـەوان بـوو تێیـی نەدەكـەوت: بـۆ نموونـە لـە یـەك لـە ڤیستڤاڵەكانی گەلاوێژ لە سەلیمانی لە دانیشتنێكدا كە هـەڤالأنی پـارتی و

یـەکێتی و حزبـەکانی تـریش لـەو دانیشـتنەدا بـوون، بـەو پێیـەی زامـدار لەسـەر ئینتمـای پـارتی حسـێب بـوو، یـەکێك لـە بـرادەران دەیەویسـت بـە پرسیارێك تەنگەتاوی بکات و لێیی پرسی: یەکێتی چۆنە کاکە زامدار؟ جا مەبەستی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بوو، ئەویش تەڕدەست وەڵامـی دایـەوەو گـوتی (بـە گـۆڕی بـارزانی ئـەو یەکێتییـە زۆر عەزیمـە) وەلامێکـی وای دایەوە هەردوو حزب پێی ڕازی بن.

جـارێکی دی لەبــەرواری ٢٤ / ٧ / ١٩٧٧ دا یـادی چـلەی ماتــەمینی ڕەوانشـاد گیـو مـوکرانی بـوو، لـە هـەموو شـارەکانی باشـووری کوردسـتان ژمارەیـەکی زۆر لـە نووسـەران و شـاعیران ئامـادە بـوون، بـۆ ئێـوارەیش لـە باخەکــەی یانــەی پزیشــکانی هــەولێر خــوانێکی گــەورە بــە خــواردن و خواردنەوە، هەمووان لەسـەر ڕیـزە مێـزێ لێکـدراو بـە درێـژاو درێـژی دانـرا بوون، دانیشتبووین، جا بە دوور لەو دانیشـتنە لـە نـاو جولانەیەکدا، مـام هێمن /ی شاعیرو محەمەد مەولود /ی چیرۆك نـووس و محەمـەد عوسـمان / مێـژوو نـووس لـە نێـو ئـەو جولانەیـەدا دەلەرانـەوە، مـن لـەو دانیشـتنەدا بەرامبە بە مەحموود زامدار بووم لە پێکی دووەمیدا هەڵسایەوە سەر پـێ و توورە دیار بوو، یەك یەك دوگمەکانی پانتۆڕەکـەی کـردەوەو گـوتی دەچم میز بە پشتملی ئەو سێ زاتە دادەکەم، بۆچی نایەن لەگەڵ ئێمـە دانیشـن و خۆیـان پـەراوێز کـردووە، هـەر زوو کـوردۆ کـوڕی گیـو موکریـانی فریـای کەوت پێی گوت (مەحموود بیکە بۆ خاتری گیو موکریـانی وەزعەکەمان لێ تێك مەدە، زامـدار گـوتی هـەزار قـامووس بـە گـۆڕی، ئـەی ئەوانـە بـۆ نایـەن لێرە لەگەڵ ئێمەدا دانیشن؟)

سـەربردەو هـەڵس وکـەوت و کردەوەکـانی زامـدار زۆرن، کـە بەڕاسـتی خــۆش مەشــرەب و بــە ســەلیقە بــوو، نووســەرێکی پــڕ لــە زانیــاری و

ڕۆشنبیریەکی مۆدێرن، یادی بەخێرو ڕۆحی شاد بێت بە کۆچکردنی بۆشاییەکی فرەوانی لە نێوەندی ڕۆشنبیری جێهێشت و خەسارەتێکی گەورە بوو لەو نێوەندەدا.

-دوا بابەت کە لێوەوەی بدوێم بەر لەوەی بێمە سەر ١٩٩١ تا ٢٠٢٠ بە پانۆڕامەیەکی کورت ڕیزبەندی بکەم، دوا قسەم لە ١٩٧٥ - ١٩٩١ لەسەر داگیر کردنی (کوێت)ە کە لەبەرواری ١٩٩٠/٨/٢ بە بڕیاری صدام حوسێن و سەرکردایەتی بەعس، هێرشێکی کت و پڕی بە دەیان فەوج و فرقەی سەربازی بە مۆدێرنترین تانك و تۆپ و چەکی قورس و فڕۆکە هەر لە ئاسمان و لە زەویدا بە ئەنجامی گەیاند و کوێتی داگیر کرد، سوپاکەی صدام دەستی نەپاراست بە وێران کردن و تالآن و هەموو جۆرە بێویژدانیەك کە ئەنجامیان دا، وایان دەزانی ئەوە باشووری کوردستانە بە ئارەزووی خۆیان ئەنفالی هەزارانی کورد و ڕۆڵەکانی و کیمیا بارانی بکەن و هیچ وڵاتێك نقەی لێوە نەیەت، هەڵبەتە دوای کۆتایی جەنگی عیراق و ئێران صدام تووشی غروور ببوو ڕۆحێکی نەرگسییەتی لێ پەیدا ببوو وەك ئەو کوڕە گەنجە جوانە ئەفسوناوییەی لە خۆبایی بووەی لە ناو ئاودا وێنەی خۆی دەبینێت و شەیدای خۆی دەبێت و خۆی بە ئاوەکە دادەدات و دەخنکێت، بەڵێ (کۆنفۆشیۆس)دەڵێت: (هیچ کات شمشێر نەدەیتە دەست کەسێکەوە کە شارەزایی سەما کردنی نەبێ)

جا صدام کە (بە بۆنی کەبابەوە چوو نەیزانی کەر داخ کردنە) هەموو گێتی لەسەر کوێت بە دەنگەوە دێ بۆ ئەوەی سەربازەکانی عیراق لە کوێت وەدەر نێن و تەفرو توونایان کەن جا لە ژێر ناوی (گەردەلوولی تۆڵە)دا چەندین وڵاتانی زلّ هێزی بیانی و عەرەبی بە هێزێکی هاوبەش شکستیان بە سوپاکەی عیراق هێنا، لە ئەڵقەکانی داهاتوو ڕوونتر باسی گەردەلوولی تۆڵە دەکەم کە لەبەرواری ١٨/ ١٩٩١ دەستی پێکرد.

(٥٦)

## ١٩٨٥ - ١٩٧٥

## شەهید عبدولخالق مەعروف و قەڵەمێكی گڕنووس

* (مارسیل برۆست) دەڵێت: (من هەمیشە وام هەست كردووە كە مەرگ

جوان بێ،، ئەگەر نا چۆن دەتوانێ جوانترینمان لەگەڵ خۆی بەرێ) سەعات ٣,٥ی پاش نیوەڕۆی ١٠ / ٤ / ١٩٨٥ قەڵەمێكی جوانمەردی بوێر لە شوێنی مەرەكەب بە ناڕوا خوێنی لێ ڕژا بە دەستێكی ڕەشی نەگریس و شۆفینزم لەبەر دەرگای ماڵی خۆیاندا، ئەویش شەهیدی قەڵەم و كوردایەتی، پێشمەرگەیەكی دێرین شەهید (عەبدولخالق مەعروف)ە ئەو شەهیدەی هەمیشە بە پێوە وەستاوە، قسەو نووسین و پێناسینی زۆر هەڵدەگرێ بە تایبەتی كە منێك وەك هاوڕێیەكی نزیك و دواتر وەك خزمێكیش كە خوارزایەكی شەهید براژنمە، واتە لە دوو ڕێگاوە دەتوانم خوێنەرانی بەڕێز بە ژیاننامەی شەهید ئاشنا بكەم.

١ - سەرەتا چۆن بووین بە ئاشنای یەكتر ؟

لە ساڵی (١٩٦٩) لەو كاتەی كە (پ ٠ م) بووم و لە پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایانی شۆڕشی ئەیلول دەمخوێند كە بیناكەی كەوتبووە نزیك پردی چۆمان و لە خوار بەرزایی مەمی خەلان ئەسا

ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق لە مەمی خەلان بوو، لە نزیك پردەکەش چایخانەیەکی لێبوو خاوەنەکەی ناوی (فاتح ئاڵتوونچی)و خەڵکی کەرکوك بوو، زۆربەی بێژەرو کارمەندانی ئەو ئیزگەیە کە لە مەمی خەلانەوە دەهاتنە خوارەوە لەو چایخانەیە دادەنیشتن بۆ چا خواردنەوە یان نان خواردن، بە ڕێکەوت رۆژێکیان (عەبدولخالق مەعروف)ی شەهید لە تەنیشت من دانیشتووەو نایناسم، لەو کاتەدا (رەفیق چالاك)ی بیژەرو هونەرمەند کە لە ئێزگەی دەنگی کوردستان بێژەر بوو هاتە نێو چایخانەکەو چاوی بە ئێمە کەوت، من پێشتر ئاشنایەتیم لەگەڵ رەفیق چالاك هەبوو، کاکە رەفیق رووی لە عەبدولخالق کردو پێی گوت (ئای هەولێرینە بزانە کو کویی لێرەش یەکرتان گرتۆتەوە) شەهید عەبدولخالق گوتی کێ؟ گوتی ئەو کوڕە گەنجە (ئاوارە)، کاك عەبدولخالق پێیی گوت، خوا نەتگرێ خۆ من ئەو کوڕەی لە تەنیشتمەوەیە هەر نایناسم و نازانم کێیە؟ بە پێکەنینەوە (کەواتە پەلارەکەت لێرەوە بوەستێ (علی عیناد...) ئێستا خۆمان بە یەکتر دەناسێنین، پاشان کاکە عەبدولخالق لەگەڵ مندا کەوتە گفتو گۆ، لە ئەنجامدا دەرکەوت خەڵکی یەك ناوچەین و کەس و کاری یەکتریش دەناسین، ئیتر لەو رۆژەوە تا رۆژی شەهید بوونی، بووین بە دۆست و هاوڕێی یەکتر، زوو زوو دانیشتمان و هەتا هاوسەفەریش دەبووین بە تایبەتی بۆ ئێران بە تایبەتی (١٩٧٤)وە تا دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٥، زۆرتریش لە ساڵی (١٩٧٩)وە کە دوکانێکی داناو تەلەفزیۆن و ڕادیۆی چاك دەکردەوە تا ماوەیەك پاشان کارەکەی گۆڕی ئەمجارەیان بوو بە فرۆشیاری کەل و پەلی بیناو کەرستەی ئاسنین یان بڵێین (معدات) لە نێو شارو لە ژێر دامێنی قەڵای هەولێردا، ئەو دوکانەی ببووە مۆڵگەی ئەو بەڕێزانەی خاوەن هەڵوێست و کورد پەروەر

بوون و كۆنە پێشمەرگەو رۆشنبیرو ئەدیبان، پیاوێك بوو خۆی خاوەن خۆی بووو نەترس و جەربەزە، جا لەو ساڵەوە كە بریاری وا بوو هەر لە هەولێر بمینێتەوەو مایەوە تا رۆژی شەهید بوونی، بەردەوام لە ئێواراندا لە لای دادەنیشتم كە دنیاش تاریك دادەهات لەگەڵ چەند لە برادەرە نزیكەكانمان بەرەو یانەی ئازادی یان یانەی مافپەروەران شەومان بەسەر دەبرد.. جگە لەوەی لە زۆربەی سەفەرەكان هاوسەفەر بووین.

٢ -كورتەیەك لەسەربردەو ژیاننامەی شەهید

شەهید عەبدولخالق كەسایەتییەكی بەهێزی هەبوو، كورد پەروەرو هەموو گەنجێتیی بە پێشمەرگایەتی و جوانمەردی بە سەر بردووەو چاوتێرو سەر بڵند بوو، ڕاستگۆ لەگەڵ ناخی خۆی و بەرامبەرەكانی * لە ساڵی (١٩٥٤)دا لەگەڵ (٢٠٠) موستەعیدو فەقێدا داوای پەیمانگەیەكی ئاینییان كردووە بۆ ئەوەی لە پلەی (فەقێیاتی) رزگاریان ببێت، كەچی مەلاكانی ئەو سەردەم چوونەتە لای (متصرف)و ناڕەزاییان دەربڕیوەو بە (شیوعی)یان لە قەڵەم داوەو ویستویانە بە سزای بگەێنن و زیندانی بكرێت، ئەو كات لە هەولێر (ئیسماعیل حەقی) متصرف بووە، كە شەهید عەبدولخالق چووەتە لای جەنابی متصرف پشتگیری لە داواكەیانی كردووە.

*شەهید باوكیشی مەلا بووە سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مەلایان بووە، زۆر زیرەك بووە لە ساڵی (١٩٥٤) لە زانكۆی ئەزهەر لە میسر - قاهیرە وەرگیراوە بەڵام لەبەر هۆكاری سیاسی و كوردایەتی خوێندنی لەوێ تەواو نەكردووەو گەڕاوەتەوە كوردستان. *لە ساڵی (١٩٥٦)دا دەبێتە ئیمام تابوور لە سوپای عیراقدا، لەو ساڵیشدا دەبێتە ئەندامی پارتی

دیموکراتی کوردستان‌و لە ساڵی (١٩٦٠)دا بۆ یەکەمجار ئێزگەیەك لە گەرکی تۆپچی بەغدا بە نهێنی دادەمەزرێنیٚ‌و بە تەنیا هەر خۆی بەڕێوەی دەبات کە شەپۆلەکانی ئێزگەکە ناوچەیەکی فراوان لە خۆ دەگرێت، ئیتر بە گۆرانی‌و سروودو هەواڵەکان خەڵکانی ئەم دەوروبەرەی حەپەسان دەکات‌و دانیشتوانی کوردانی ئەو گەڕەکە دلخۆش دەکات‌و ورەیان بەرز دەکاتەوە، جا دایرەی ئەمن‌و هەواڵگری ڕژێم بە دوای کەشفکردنیدا لە هەولدا بوونەو نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە.

*لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٦٢)دا پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلول کردووەو بووە بە پێشمەرگەو دواتر لە (١٩٦٣) چووەتە ماوەت لە ئێزگەدا کاری کردووە وەك تەکنیکارێك‌و وزەی زیاتری بە ئێزگەکە بەخشیوە.

*لە ساڵی (١٩٦٥)دا بە کەرتبوونی پارتی دیموکراتی کودستان لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی واتە لەگەڵ دابڕانی هەڤالأن ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال‌و عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری‌و چەندەها سەرکردەو کادیرانی دیارو هەڤالأنی دی لە ناو شۆڕش، لەو سەردمدا دەچێتە ئێران – هەمەدان، دواتر هەر لەو ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ سەر کاری خۆی لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق، تا ڕێکەوتنامەی ١١ /ی ئاداری ١٩٧٠، ئیتر هەر لەگەڵ پێشمەرگایەتی‌و شۆڕش بووە.

*لە ساڵی (١٩٧١) لە ڕێگای ئیدارەی شۆڕشی ئەیلوول‌و مەکتەبی سیاسی (پ • د • ك) دەنێردرێتە (چیکۆسلۆڤاکیا) بۆ خوێندن‌و زیاتر زانیاری وەدەست بهێنێ لە لایەنی کاری هونەری‌و تەکنیکی بۆ بەهێز کردنی ئێزگە، جا لەم بوارەدا بڕوانامەی دبلۆم وەدەست دەهێنێ لە مەڕ دروستکردنی ئێزگەوە لە کۆمپانیای (ئیسلا)دا. * لە ساڵی (١٩٧٥) دەچێتە ئێران‌و دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلولی کوردستانی عیراق،

لەوێشەوە هەر لەو ساڵدا دەچێتە (ئەلمانیا)و دوو ساڵ لەوێ نیشتەجێ دەبێت پاشان سوود لە بەیاننامەی عەفوویێکی رژێمی عیراق دەبینێ دەگەڕێتەوە هەولێر.

٣ - شەهید عەبدولخالق و کەسایەتییە بە هێزەکەی

شەهیدی ئەمر کەسایەتییەکی بە هێزی هەبوو، هەر لە تافی گەنجایەتییەوە رۆحێکی یاخی بوون و شۆڕشگێرانەی کوردانەی لە ناخدا ئاگردانێکی گەش بووە، قەت بۆ دەسەڵات و ناڕوایی سەری خۆی دانەنواندووە، چاو تیرو سەربڵندو بە نەفس دەوڵەمەند بووە، کە لەسەر ئەرزدا دەڕۆیشت سروشتەکەی وا بوو هەر روو لە ئاسمان، هەڵبەتە وەنەبێ لەبەرئەوەی بە فیزو دەعییەو لووت بەرز بێت، نەخێر زۆر سادەو خاکی بوو بەلام شروشتەکەی خۆی وا بوو، رۆژێکیان پێم گوت (ئەرێ بە ژیانت قەت درهەمێکت دۆزیوەتەوە؟) زۆر پێکەنی و گوتی دەزانم مەبەستت چییە، لەوە دەترسم رۆژێکیش بکەومە ناو چاڵ و زێرابێکەوە، بەلام چی بکەم بە سروشت وام زیاتر تەماشای ئاسمان دەکەم، پێ دەچی تەمەنم لەسەر ئەرزا کورت بێ، گوتم خوا نەکا.. شەهید مرۆڤێك بوو بە قەلافەت گەورەو بالا بەرز بەلام بە هەست دڵ ناسك و بە سۆزو جوانپەرست و رێزی زۆری بۆ هەژاران هەبوو، لە نێو کۆمەڵگاش نەیتوانیووە بە ئاسایی و تەقلیدی بژیت هەمیشە جیاوازو رۆحێکی جوداوازی و یاخی بوونی تیا بوو، رۆشبیرو خاوەن فیکرو نووسەرێکی جوانمەردو بوێر بوو، بەرگری لە مرۆڤی چەوساوەو ستەملێکراو دەکرد، لەبەرەی مافخوراوان بوو، بە تایبەتی بەرگری لە مافی ئافرەتان دەکرد، وەك نموونەیەك سەبارەت بە رۆحە یاخیبووەکەی و جیاوازییەکەی.

* له ساڵی (١٩٧٩)دا ماڵیان له ئازادی بوو، ڕۆژانه به سواری پاسكیل دەهاته دوكانەكەی كه له بن قەلاتی هەولێر له چەقی شار بوو، پارەی ئەوەی هەبوو به ترومبێلێك بدات، زۆر له خزمان و برادەران پێیان دەگوت بۆ تۆ جوان نییه به پاسكیل هاتو وچۆ دەكەی، وەلامەكەی ئەوه بوو من دەمەوێت بەستەلەكی عەیبه بشكێنم له كەسایەتی من كەم ناكاتەوه چونكه ئەوەی من دەیكەم لەبەرژەوەندی گشتی دایه، پاسكیل ژینگه پیس ناكات و مەسرەفی نییەو تەنگ به خەڵك و جادەكان هەڵناچنێ، دەبا خەڵكیش ڕا بینم، ئەو ئازایەتیەو رچەشكێنییه پەیرەو بكات؟ دواتریش ئۆتومبێلێكی بچووكی كڕی (واكس واگۆن)، بەڵێ شەهید لەگەڵ دنیای پێشكەوتن و مۆدێرنەو علمانییەت و زانست و مەعریفەو مەدنیەت بوو دژ به عەقلیەتی پاشكەوتووو تقلیدی باوو خورافەو جەهالەت و كۆنەپەرستان هەر ئەوەش بوو گیانی پاكی بووه قوربانی بیرو بۆچوونەكانی (پۆل ڤالیری) دەڵێت (پیاوانی مەزن دوو جار دەمرن، جارێكیان وەكو پیاو، جارەكەی تریش وەكو پیاوێكی مەزن).

٤ – بەرهەمه به چاپكراوەكانی شەهید

١ – (ئەنتینا – به كوردی نووسیویەتی / ١٩٧٧ / كتێبێكی زانستییه)

٢ – (تەكنیكار – هەر به زمانی كوردی / ١٩٨٠ / زانستییه)

٣ – (اجهزه الارسال – به زمانی عەرەبی / ١٩٧٩ / كتێبێكی زانستیییه)

٤ – جگه لەم بەرهەمانه، دەستێكی بالای هەبوو له ڕاڤەو لێكدانەوەی ئەدەبی كلاسیكی كوردی یەكێك لەبەرهەمەكانی (كتیبی دیوانی نالی و كێ ڕاسته / ١٩٨٤ / به زمانی كوردی چاپكراوه) ٥ – (دواین كتێبی بەر له تیرۆر كردنی –ئادەمیزاد له كۆمەڵی كوردەواریدا / ١٩٨٥ / به زمانی

کوردی / کە ئەم کتێبە بوو بە مایەی لیدوانێکی زۆر لە لایەن پیاوانی ئاینیو مەلاکانو دوانگەکانی رۆژی هەینیو رەخنە لێگرتنو سەرکۆنە کردنی کە لە نێو خوێنەرانیش ئەم دەستو ئەو دەستی دەکردو تا ئێستاش لە گەڵدا بێ ئەم کتێبە بایەخو بەهاکەی بێ سنوورە هێندە خوێنەران بەدوا چوونی بۆ دەکەن، کرۆکی ئەم کتێبە پتر بەرگری کردن بووە لەسەر مافی ژنان کە لە زۆر شوێندا لە دەقەکانی ئاینی ئیسلامدا مافیان پێشێل کراوە، ئیتر ئەو کتێبەش بوو بە بەهانەیەك بۆ رژێمی بەعس تیرۆری بکات لە ١٠ /٤ / ١٩٨٥ دا، بە داخەوە زۆری بە بەرەوە بوو بە بەرهەمی برشتو فیکرو ئەدەبو رۆشنیبرییە بوێرییەکەی پێشکەشمان بکات.

ئەوەتا شاعیری داغستانی (رەسووڵ هەمزاتۆڤ-)یش دەڵێت (گوللەو میدالیا، هەردووکیان دەچنە سەر یەك سنگ، پیاوی ئازا یان لەسەر زینە یان لە ژێر زەوی).

(٥٧)

(نالی) دەفەرمووێ:

**دەوران-ی یە وەك هێلەگی سەودا سەری گێژم**
**بۆیە بە دەقیقی مەس-ەلە هەرچی دەبێژم**

-مومتاز حەیدەری لە ساڵی (١٩٧٠)وە یەکترمان ناسیوە بەلاّم پێش ئەم بەروارەیش دەنگوباسی نیو خێزانەکەیم بیستبوو چونکە لەو گەڕەکەی لێی دەژیام گەڕەکی عارەبانی کۆن ماڵی ئەوانیش ماوەیەك لەو گەڕەکە نیشتەجێ ببوون، مومتاز لە بنەماڵەیەکی پێشکەوتنخوازو تێکۆشەرو رۆشنبیرو کورد پەروەرو قوربانی دەر بووە بە خۆی‌و براکانی مێژوویەکی پڕ لەسەروەری‌و شانازی‌و شکۆمەندیان هەبووە هەر لە راوەدوونان‌و ئەزیەت‌و نا ئارامی هەمیشەیی‌و زیندان‌و لە سێدارەدانیش، مومتاز خۆی‌و براکانی (عاصم حەیەری‌و سالّح حەیدەری‌و موهیبب حەیدەری‌و جەمالّ حەیدەری‌و جمشید حەیدەری) کە (جەمالّ حەیدەری) لە دوای کۆدەتاکەی حیزبی بەعس لە ٨ / ی شوباتی ١٩٦٣ / دەستگیر کراو لە ٢١ /٢ / تەمووزی ١٩٦٣ / لە سێدارە درا) چونکە رۆلّێکی قیادی هەبوو لە نێو حزبی شیوعی‌و پاك‌و تێکۆشەرو خاوەن هەلّویست بوو.

* (مومتاز حەیدەری وەك خۆی).. هەر وەك (بودا) دەلّێت: (گەورەترین سەرکەوتوو ئەو کەسەیە بە سەر خۆیدا زالّ بێت) دیارە کاکە مومتازیش

هەر لە منداڵییەوە سەرو بەندی لەگەڵ بنەماڵەکەی لە خەبات و تیکۆشان و ڕۆشنبیری و ئازادی ویستی دانەبڕاوە وەك ڕۆشنبیرو نووسەرو کاری ڕۆژنامەنووسی هەر لە تافی گەنجییەوە تا ئێستا بەردەوام بووە، تەمەن درێژ بێت و بە ڕادەیەك لەو ساڵانەی / ٢٠١١ تا ٢٠١٥ بەردەوام بووە بە تەنیا گۆڤارێکی قەوارە گەورەو پڕو چڕ لە زانیاری و ئەرشیف - دوکۆمێنت ئامێز بە ناوی (ك ٢١) کە گۆڤارێکی کلتووری - زانستی - مێژوویی - بەڵگەنامەیی - نەتەوەیی - وەرزی ئازاد.. دەرکردووە بە زمانی عەرەبی و کوردی، هەروەها لە پاڵ ئەم گۆڤارەیش گۆڤارێکی دی دەرکردووە لە نێوانی هەمان ساڵانی ئامارژەم پێکردووە بە ناوی (لەیلا قاسم و لەیلا زانا) بە زمانی کوردی کە ماندوو بوون و ئەرکێکی ئاوا قورسی خستۆتە سەر شانی لە پێناوی خزمەتکردن بە کلتوورو مێژووی کوردو کوردستان و خەباتی نەتەوایەتی و نشتمانپەروەری بێگومان جێگای ڕێز لێنانە، (ئەراگۆن) ی شاعیر دەڵێت: (ئەراگۆن دەمرێ، ئەمە هەر ڕوو دەدات، بەڵام دوا ڕۆژی ئەراگۆن لە شیعرە مەزنەکانی دایە) خۆ مومتازیش دوا ڕۆژی لە کارە نەمرەکانی دایە کە پێشکەشی کردووین.

*کاك مومتاز سەبارەت بە دەستەبەر کردنی مافی (ئافرەت - ژن - خانمان) و هەر ناوێکی دی هەمیشە ڕۆڵی هەبووە و بڕوای بە ئازادی ژن و ڕێزلێنانیان و کار پێکردنیان و بەشدارکرنیان بێ جیاوازی کردن لەگەڵ ڕەگەزی پیاو لە هەموو ڕوویێکی بژیویاندا، کە بە کرداریش ئەم هەڵوێستەی هەبووە بۆ نموونە ئەو بەرهەمانەی لەسەر ئەم ڕەگەزە بڵاوی دەکردنەوە لە گۆڤارەکەی (لەیلا قاسم و لەیلا زانا) کە دروشمەکەی لەسەر گۆڤارەکە هاتووە (ژن: ژیانە).

*لەو رۆژە سەختانەی کە میللەتەکەمان پێدا تێپەڕ بووەو دوژمانی کورد لە نێو شارەکانی کوردستاندا زۆر دڕندەو مەترسیدار بوون، ئەوەندەی من کاك مومتازم دیوەو ئاشنایەتیو خۆشەویستیو هاو بیرو رای کوردانە بووینە وەك فەیلەسوفی هندی (بەیدەبا) دەڵێت: (ئەو کەسەی لەگەڵ دوژمنا بژی وەك ئەو کەسەیە کە مار بخاتە گیرفانییەوە) ئێمە مارمان لە گیرفاندا هەبووە بەڵام کاری خۆمان هەر کردووە، بە ڕاستی دەتوانم بڵێم کاك مومتاز یەکێك بوو لەو کەسانەی متمانەمان پێ دەکرد هەموو ئەو بڵاوکراوەو ئەدەبیاتانەی لە ناو شۆڕش دەردەچوون لە لای ئەودا بپارێزرێ، ئێستایش ئەو شریتانەی لە لا ماوە کە ئێمەی چەند شاعیرێك شیعری بەرانگاریو جۆرئەتمان خوێندووتەوە دژی رژێمو بۆ هەڵسانەوەو خستنە وەبەر هێنانەوەی ورەی جەماوەرو تەکاندانی شۆڕشگێڕانە ئەگەر بە شێوازێکی هێما ئامێزیش بوو بێ، کاك مومتاز لە لای خۆی پاراستوویەتی، متمانەی پێکراوەو لە ناو ماڵی خۆیدا ئەو تێکۆشەرانەی حەواندۆتەوەو داڵدەی داون کە مەترسی گرتنو فەرمانی دەستگیر کردنیان هەبووە بە ئاشکراو نهێنی لە رۆژە سەختەکاندا، لە لایەنی مادییەوە یارمەتی ئەو نووسەرانەی داوە کە پیویستیان بە یارمەتی بووە.

* کاك مومتاز پەرتووکخانەیەکی زۆر دەولەمەندو گەورەی هەیە، رۆشنبیرانو نووسەرانو خوێندکاران بە گشتی سوودیان لێ وەرگرتووە، کاك مومتاز هەمیشە چاو تێرو جوانپەرستو دەرگاکەی لەسەر پشت بووە بە گوڵو لێو بە خەندانو لە پێشوازیاندا بووە، هەروەها پەرتووکخانەکەی بەڵگەنامەی زۆر شاراوەو دەگمەنی تیایە بۆ رۆژی خۆی هەڵگرتووە، چەند جوانە کاتێ (ڤۆڵتێر) دەڵێت: (چ باکمە ئەگەر تاجێکم

لەسەر نەبێت، خۆ پێنووسێکی پاك و پیرۆزم بە دەستەوەیە کە لە هیچ دەسەلأتێك ناترسێت)

*کاك مومتاز ئەوەی لە نزیکەوە دیومەو دەیناسم و ئاشنایەتیم لە گەڵیدا هەبووەو ئاگاداری بوویمە، کەسێکە لە لایەنی کۆمەلایەتی زۆر بە تەنگەوەی دۆست و هاوڕێ و خۆشەویستانەوە بووە لە هەموو بۆنەکانی خۆشی و ناخۆشییەکاندا ئامادەیی هەبووەو دڵ و دەروون کراوەو چاوتێر بووە، جگە لەوەی لە زۆربەی فیستڤاڵ و کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنەکانی نەتەوایەتی و نیشتمانی و ئەدەبی و هونەری و هەتا وەرزشی لە نێو وڵات و دەرەوەی وڵات ئامادەیی هەبووەو نووسەرو ڕۆشنبیرێکی ماندووو خزمەتگوزار بووە

* زۆر ماوە دەربارەی ئەو چاوگە ڕووناکە بڵێم، بەلأم بۆ ئەوەی زۆرتر نووسینەکەم درێژ تر نەکەمەوە خاڵێکی دی کە ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کاك مومتاز ئەوەی قەناعەتی پێ نەبووایە ئەگەر تیایدا زۆر زۆریش زەرەرمەندیش بووایە هەڵویستی وەردەگرت و کارەکەی نەدەکرد بۆ نموونە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان کرا بە ڕاوێژکار بە پلەی تایبەت، بەلأم کە بینی هیچ کارێکی ئەوتۆی پێ ناسپێرن و تەنیا مووچە وەرگرتنەو بەس بۆیە بە زوترین کات دەستی لە کار کێشایەوە.. با دوا وتەیشم ئەوە بێ کە (کونفۆشیوس) دەڵێت: (چی بە کەڵکی مرۆڤ دێت گەر دنیا بباتەوەو خۆی بدۆڕێنی؟)

# پانۆڕامایەك بە كورتی و بە كوردی

(١)

١٩٩١ – ٢٠٢٠

دوای ئەوەی لە ٨/٢/ ١٩٩٠ صدام بڕیاری داو كوێتی داگیر كرد، لە ژێردروشمی (أم المعارك) واتە دایكی جەنگەگان، بەلاَم دنیا لەسەر كوێت هاتنە دەنگ‌و لە ١٩٩١/٢/١٨ دا بە ڕابەری ئەمەریكاو یەكدەستی ٣١ دەوڵەتی ئەوروپی‌و عەرەبی دژ بە عیراق‌و داگیركارییەكەی بە ناوی (گەردەلولی بیابان) بە چەند ڕۆژێك سوپاكەی عیراقیان وەدەر ناو شكستی خواردو ئالآی سپی هەڵكرد، زۆربەی ئەو سوپایەو هێزە داگیركەرە، ئەوەی گوژراوو برینداروسوتا، تەفرو توونا كران بە تێكشانی هەموو چەك‌و ئامێرە قورسەكانیانەوەو هەندێكیش لە سوپاكە ڕایان كردو گەیشتنەوە عیراق.

دوای ئەوە هەلێك ڕەخسا لە خوارووو ناوەندی عیراق ڕاپەڕین بەرپا بوو هەموو دام ودەزگاكانی حكومەتیان تەخت‌و وێران كرد.

هەروەها لە كوردستان ڕاپەڕین دەستی پێكرد لە ٦/ئادار /١٩٩١ لە دەروازەی ڕانیەوە، دواتر هەموو كوردستانی گرتەوە لە ٣/٢١ /١٩٩١ كە كەركوك ڕزگار كرا دوا وێستگەی ڕاپەڕین بوو. ئەگەرچی شەهیدمان هەبوو تا ئاستێك‌و خەڵكی بێ موچەو بە قات‌و قڕی‌و هەژاری‌و نەداری ئارامی گرت، بەلاَم ئازادی‌و سەربەخۆیی كوردستان كە دەستكەوتێكی

زۆری بــه دوا داهــات ئــەوەش دواتــر بــاس دەکــەین، بــەو بۆنەیــەوە قەسیدەیەکی درێـژم لەسـەر ڕاپـەڕین و بـە دەروازی ڕاپەڕینـەوە کـە لەوێـدا چاوی هەڵهێنا، جا چەند کۆپلەیەکی کورت دەخەمە روو لەو قەسیدەیەدا:

١ – راپەڕین لە دەروازەی رانییەوە
کێوەڕەش دەڵێت
کەوڵی بەفرو بەور لەبەر دەکەم
دوو کانی دەکەمە چاوێلکەو لە چاوانمی دەکەم
دوو تاوێر لە پێ دەکەم
فەرمان بۆ دوو ڕووبار دەر دەکەم
وەك دوو شەقام ڕاکشێن لە دامێنمەوە
ئەسپەکەم زین کەن، پیاسەیەك دەکەم
لە ناوچەی پشدەرو ڕانیەدا
لەم سەرەوە بۆ ئەم سەر
دێمەوە ژوورو دەچمەوە دەر
بەوە دڵخۆشم، سەردەرەی دەروازەکەمان
لە بالاو هەژمووونی دوژمنانمان بەرزترە
تێدەپەڕم سەرم نەوی ناکەم
چەند جوانە دەروازەی ڕاپەڕینی ڕۆڵەکانم
دەرگایەکە لە دەرگایە جوانەکانی کوردستانم

٢ - قەسیدەیەکی درێژ بە ناوی (ڕاپەڕین) لە لاپەڕەی (٢٢٥) لە کۆبەندی شیعر / دیوانی (کارێزە مەرجان)مدا کە یەکێتیی نووسەرانی کورد / مەڵبەندنی گشتی / لە٢٠١٤ بە چاپی گەیاندووە، چەند کۆپلەیەکی لێ دەخەمە روو:

ئاگر گەشتر
گورگەمێش و هەوەسبازە داوێن گڵاوەکان
داری زڕ ئاسا تێکدەشکان
هەر سیخوڕ بوو وەك جۆرجە کوێر
بە هەنگلە غارێ پڕ تاو
دەخزانە نێو قوڕو لیتاو
خوڵگەی دەستاڕ.. دیسانەوە گەڕانەوەی مێژوو
دەیبردنەوە بۆ کڕووپی ڕەگەزی پێشوو
***
مێرد منداڵێك
لوولەی دەبابەیەکی پەککەوتەی ڕادەکێشا
دەیبەمەوە.. بۆڕی زێرابەکەمان شکاوە
***
دوا شەوی ڕاپەڕین
چی بێ دیاری نەورۆزی ئەمساڵ
خوێندنەوەی دوا دێڕی داستانی کەرکوك
هەڵوەرینی مێردەزمە ئەفسووناوییە دەستکردەکان
تێکشکاندنی نێرگە سەختە وەهمییەکان

تەقاندنەوەی قەڵایە ئاوساوە فودراوەکان

پڕ بە قوڕگەکان، بە زار، بە بڵندگۆ

بە تاكو بە کۆ

ئازادی.. سەربەستی.. سەربەخۆیی

بڵێسەی باوەگوڕگوڕی گەشتر دەکرد

لە باوەشمدا پێشمەرگەیەك، چاوی لێڵ و پێڵوی گرانی

دوا وتەی لە دەم دەرچوو

ئەمە کەرکوکە ئازاد بوو

ك ك ك ك

کەرکوك

(٢)

وێستگەیەکی تر لەو ڕۆژە ڕەشانەی بە سەر گەلی عیراق و کورد داهات سوپای گاردی گۆماری عیراق بە بڕیاری صدام دەستی پێکرد سەرەتا لە خوارووی عیراق کە بە شێوەیەکی دڕندانە کەوتنە ویزەی عەرەبە شیعەکان و کۆمەڵکوژیان کردن، دوای کرانەوەی دەستی صدام بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانانە، هەڵبەتە ئەو ترس و چاوەڕوانکردنەش بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هێرش و تاوانەکانی بۆ سەر گەلی کورد و کوردستان، گومانی تیا نابێ و ڕوو دەدات، بۆیە پێشمەرگە بە چەکی سووك و ئیمکانیەتێکی کەمەوە چۆن بەرنگاری ئەو چەکە قورسە مۆدێرنانەی ڕژێمی بەعس بێتەوە لەسەر زەوی و ئاسماندا، جا لە ٢/ نیسان /١٩٩١ هێرشی سوپای حکومەتی عیراق بەرەو کوردستان هات، هەر چەندە بەرگری کرا لە لایەن پێشمەرگەو خەڵکە دڵسۆزەکە بەلام نەدەکرا میللەتکوژی لێ دەکەوتەوە، بۆیە ڕاپەڕین بووە دەرپەڕین لە هەموو کوردستاندا کە شارو شارۆچکەکان چۆڵ کران ئەو خەڵکە ماڵ و سەروەتی خۆی جێهێشت و بە هەورازو شاخ و کێوان کەوت و کۆچ و کۆڕەوی ملیۆنان بوو، ئەوەی ڕووی لە ئێران کرد یا سنووری تورکیا و یان بە منداڵ و پیرو کەنەفتەوە لەو سەرما بەفرو بارانەی نەخۆش کەوتن یان مردن، کارەساتێکی گشتی و بە کۆمەڵ بوو، هەبوو لە ناو هەر جۆرە ترومبێك بوو بێ یان بەنزین نەبوو ترومبێڵەکەی جێهێشتبوو، جگە لەو خاوخێزانانەی

بە گەورەو بچووکیانەوە بە برسیەتی و پای پەتی دەڕۆیشتن، من وەك خۆم و خاوخیزانم لێك دابڕابووین تەنیا (ڕێبین) کوڕە گەورەکەم کە تەمەنی (٨) ساڵان بوو لەگەڵ من مابۆوە، دایکم و خێزانم و (ڕەوەن)ی کوڕم کە تەمەنی (٧) ساڵان بوو لەگەڵ گچەکەم هەڵەز کە تەمەنی هەشت مانگان بوو، لەگەڵ (تەحسین) ی برام و خێزان و سێ منالی ساوای بە یەکەوە بوونە، من قاچم شکا بوو ناچار چوومە لای کاك کۆسرەت لەگەڵ ڕەوان شاد شاخەوان لە پیرمام لە باخچەیەك وەستا بوون، پیم گوت ئەوە من و ڕێبین لە خاو خێزان دابڕاوین ئەوان دەڕۆن نازانم لە کوێ دەیاندۆزمەوە، منیش بەرەو لای ئەوان دەڕۆم و پرسیار لە دۆست و خزمان و برادەران دەکەم لە ڕێگاو شارۆچکەکان دەنگوباسێکی ئەوان هەر دەستم دەکەوێ، کاك کۆسرەت هەمیشە هەڵوێستی هەر جوامێرانە بووە گوتی دەی ئەوەی تۆ بتوێ بۆت بکەم، گوتم وا بکە لەگەڵ کەسێك بە ترومبێڵەکەی بین من و کوڕەکەم و ڕێگای دەرچوونی ترومبێلان زۆر زەحمەتە وەرقەیەکم بۆ بنووسە لە ڕێگا ئاسانکاریمان بۆ بکەن، گوتی زۆر باشە، وەرە کاك (جەلال)واتە (جەلال بکر باپیر کۆیی) بوو برای مامۆستا باپیرە بکر باپیر کویی، کاك کۆسرەت پێیی گوت تۆ هەردەرۆی بۆ چۆمان کاك موحسین و کوڕەکەی تا سەر سنووری ئێرانیان ببە، کاك موحسین پێی لە بار چووە ناتوانی بڕوات ئەوەش وەرەقە بۆ ئەوەی لە ڕێگاکان ئاسانکاریت بۆ بکەن، جا کاك جەلال ترومبێلێکی لاندگرۆزی پێ بوو، ڕۆیشتین و لە ڕێگاکان لەبەر وەستان و زۆری چەقبەستوویی ترۆمبێڵەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە ناوە ناوە وەرقەکەمان نیشان دەداو کاك کۆسرەت هێندە خۆشەویست بوو لای پێشمەرگەکان کت و پڕ دەستخەت و ئیمزای ئەویان دەدی هەر زوو هەندێك ڕێگایان بۆ دەکردینەوە دەڕۆیشتین و دەوەستاین،

بەڵێ ئەو کۆچو کۆڕەوە ئەوەی بینیویەتی هەموو وێنە کارەساتەکانی لەبەر چاوە بەڵام من بە کامێرای هەستو ناخو گیانم هەموویم گرتووە، جگە لەوەی بە گوێ بیستوومە، دواتر بەشێکی لە وێنە شیعرەکەم دەخەمە ڕوو، نامەوێ زۆرتر درێژە بەو چیرۆکە بدەم، بە کورتی دوای ئەوەی خاوخێزانەکەم لەگەڵ دایکمو تەحسینی برام لە لای چەند خزمو ناسیاو برادەران گوتبوویان ئێمە ئاودیوی ئێران دەبین لە مهاباد لە ماڵی هوەنەرمەند ماملێ دەگیرسێینەوە، ئەگەر لەوێش نەبین، ئەوان شوێنی ئێمە پێ دەزانن لە کوێین، بەو پێیەی ئاشنایەتیمان لەگەڵ ماڵی ماملێ بە جۆرێك بوو کە هاوسەرەکەم لەگەڵ سلێمان (شۆڕش)ی کوڕی ماملێ کە ساوا بوونە شیریان پێکەوە خواردووە لە قەڵادزێ، میانەیان لەگەڵ ماڵی خەزوورمو ئێمەدا ئێستایش لە گەڵدا بێ هەر بەردەوامە، ئیتر بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بووم، من لێرەدا پرسیارەك لە خۆم دەکەم، ڕەوانشاد دایکم دوو شەقاو نەیدەتوانی بە پێیان بڕوا چۆن بە هەزاران کیلۆ مەتر تا ئاودیوی ئێران ڕۆیشتووە؟ واتە هەندێك بە ترومبێلی لۆری خێرخوازان ڕۆیشتوون دەنا ئەوەی تر هەمووی بەپای پەتی، جا دایكو هاوسەرکەمو کوڕەکەم ڕەوەز تەمەنی (٧) ساڵانو کچەکەم تەمەنی (٨)مانگان بووە لەگەڵ (تەحسین) برامو خاوخێزانەکەی کە منداڵیان ساواشیان پێ بووە، پێش گەیشتنی منو کوڕەکەم ڕێبین، ئەوان دەرباز بوونەو چوونەتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان / ئێران، کاتێ منو کوڕەکەم ڕێبین گەیشتینە سەر سنوور دەمویست لە مەرزەکە ئاوا بم، لەو دیوی تێڵبەندەکانی سەر سنوور چاوم بە تەحسینی برامو هاوسەرەکەم شلێر کەوتو دەستیان بۆم ڕاشەقاند وەك گوڵە نێرگزە تازەکانی بەهار گەشاینەوە، هەر زوو شلێر چووە لای سەربازەکانی ئەوێو پەنجەی ئاماژەی بۆ من دەکردو بانگ

كـراين‌و ئـاوديو بـووين‌و پێـك شـاد بووينـه‌وه‌، خـاو خێزانه‌كـه‌م يه‌كـه‌م قسه‌يان ئه‌وه‌ بوو گوتيـان ئێمـه‌ بـه‌ هـيچ شتێك مانـدووو قـه‌ڕس نـه‌بووين‌و ئازارمان نه‌كێشاوه‌ تـه‌نيا بـه‌و سجله‌ (تۆمارگه‌يـه‌) ئه‌ڕشـيفييه‌ قه‌بـه‌يـه‌ی تـۆ نه‌بیٚ كه‌ زۆر قوڕس بووو ده‌ستمان لێيی به‌ر نه‌ده‌بوو فڕێيـده‌ين بـه‌ زۆر بـه‌ پاڕانه‌وه‌و زه‌حمه‌تيش له‌و مه‌رزه‌ تا ڕێگايان داين ئاوديوی كه‌ين، هه‌روه‌ها شلێری هاوسه‌رم گوتی له‌ (شنۆ)يیٚ له‌ ناو ماڵێك ژوورێكيان پێداوين، ئه‌و دوو ڕۆژه‌ له‌گـه‌ڵ ته‌حسـينی بـرات هاتووينه‌تـه‌ سـه‌ر سـنوور چـاوه‌ڕوانی ئێوه‌مـان ده‌كـرد، دواتـر دوای پێـك شـاد بوونـه‌وه‌ هـه‌موومان چـوينه‌ (نه‌غـه‌ده‌)و كچـه‌ تاقانه‌كـه‌م هه‌ڵـه‌ز هێنـده‌ نـه‌خۆش بـوو، بـه‌ تـه‌مای ئـه‌وه‌ نـه‌بووين چـاك بێتـه‌وه‌، بـاش بـوو خـوا شـيفای دا، هـه‌ر لـه‌ویٚ بـووين خزمێكمـان ئاگـاداری كردينـه‌وه‌ كـه‌ بـاپيرم بـاوكی دايكـم كۆچـی دوايـی كـردووه‌ لـه‌و ڕێگايـه‌ی كـۆچ‌و كـۆڕه‌وه‌دا له‌بـه‌ری باشـووری كوردسـتان لـه‌ عيراقدا، ئه‌و خه‌به‌ره‌مان به‌ هه‌موو شێوه‌يه‌ك له‌ دايكمـان شـارده‌وه‌و پێمـان نه‌گوت باوك مردووه‌ تا ئه‌ ساته‌ی گه‌ڕاينه‌وه‌ هه‌ولێر، جا كاره‌ساته‌كان بۆ مليۆنـان كـورد هاوبـه‌ش بـوو لێـره‌دا باسـی خۆمـان ناكـه‌م زيـاتر چـونكه‌ ئـه‌وه‌ی ئێمـه‌ بينيوومانـه‌ خـه‌ڵكانی دی ديويانـه‌ هـه‌ر يـه‌كیٚ بـه‌ جـۆریٚ، تـا له‌سـه‌ر پێشـنياری فه‌ڕه‌نسـا نه‌تـه‌وه‌ يـه‌ككگرتووه‌كان هاتنـه‌ ده‌نـگ‌و بڕيـاری (٦٨٨) ی ئه‌نجومـه‌نی ئاسـايش ده‌رچـوو بـۆ ئـه‌وه‌ی كـورد پـارێزراو بێـت، هـه‌روه‌ها لـه‌ شـه‌ڕه‌كانی كـۆڕیٚ‌و شـوێنكه‌كانی تـری كوردسـتان سـوپای صدام شكستی پیٚ هێنراو له‌ زۆر شوێنی داگيركراو كشـانه‌وه‌، دواتـر بـه‌و بڕيـاره‌ی ئه‌نجومـه‌نی ئاسايشـی نه‌تـه‌وه‌ يـه‌ككگرتووه‌كان كـه‌ هێڵـی (٣٦) ده‌ستنيشـان كـرا بـوو بـۆ كوردسـتان، خه‌ڵكه‌كـه‌ زۆربـه‌ی هـه‌ره‌ زۆری گه‌ڕانه‌وه‌ شارو شارۆچكه‌كان‌و كاك مه‌سعودو مام جه‌لال چوونه‌ به‌غداو

گفیوگـۆ لـە نێـوان بـەرەی کوردسـتان و رژێـم دەسـتی پێکـرد، دواتـر لیژنەیـەکی پەیوەنـدی واتـە لیژنـەی (تنسـیق) پێکـك هـات کـە سـەرۆکی لیژنەکە کاك (فـاروق جمیـل) بـوو. پاشـان حکومـەتی عـیراق هـەموو دام و دەزگا و هێزەکانی عەسکەری و پۆلیسی لە کوردستان کشاندەوە بۆ دوای هێڵی دیارکراوی (٣٦)

پـێم وایـە باسـی کـۆچ و کـۆڕەو لـە لای هـەموو کـوردێکی ئـاوارەی ئـەو سەردەم کە بینیویانە بیرەوەری و فیلم و شیعرو رۆمـانی قەبـەی لێ بەرهـەم دەهێندرێ، جا منیش کارەساتەکان نەك وەك خەیاڵ بەڵکو واقیع کردوومە بە شیعرو خودی ناخی خۆمی تێکەڵ بووە کە ئازارو ناخۆشییەکانی لـە گەڵمـدا بوونـەو لـێم جیـا نەبوونەتـەوە جـا چـەند کۆپلەیـەك لـەو قەسـیدە درێـژەدا دەخەمـە ڕوو کـە لـە رۆژهـەلاتی کوردسـتان (نەغـەدە – ئێـران) نووسـیوومەو لـە کۆبەنـدی دیـوانی شـیعر بەشـی دووەمـدا هـاتووە لاپـەڕە (١٧٧) کە لە لایەن یەکێتیی نووسەرانی کورد / مەڵبەندی گشتی لە ساڵی ٢٠١٤ بە چاپ گەیانراوە بۆ نموونە:

**کۆچ و کۆڕەو**
**کوردستانەو بریندارە**
**جارێکی تر شڵەژانەو شڵەژانی شارە**
**شەققژن کەوتەوە نێوانمان**
**داڵی چلکن، تاڵە تیشکی قرتاند**
**سوڕایەوە بە دەماری گرژی هەمووان**
**دیسان کۆچەو رووەو شاخان سەر هەڵگرن**
**سەر خێڵ و پێشەنگ ون بووە**

سەرداری کۆچەریان، کۆچی وا گەورەی بەڕێوە نەبردووە
کۆچی کۆچانە.. کۆچی تەتەڵە کردنی مرۆڤو تەبارەی ویژدانە

(١)

بۆمبایەو دەتەقێ.. کۆپتەرەو دەڕواو دێ
ڕمبەی ئارییجیو قرمژنی تەقەی بەرگری
منداڵ لە زریکە دەداو ئافرەتەو دەگری
-ژنێك خۆی کوتایە قوڵتێ چەپاڵەی دات
کۆرپەی خستەوە هەناوی
شووشە شیرو مەمکۆڵەی لە دەست دەرپەڕی
- ڕەوە ڕەو، سەرەتای هەوراز بوونەوەیە
مندالەو ژیر نابێتەوە.. ئەمما.. ئەمما
دایکیش چۆلەکە ئاسا،
ورد ورد تیلمە نانی دەجویو لە دەمی دەنا

(٢)

لەنگەری کۆڕەو تێکچووە لێك دابڕانە
دابڕان دابڕنی خاوخێزانە
ئێوارەیەو شەوی بە دوا
چاوی باران.. نەبوونی نان
لەسەر زەویەکی سەرما بردەلەی
بەر کزەبای چەتری ئاسمان

(٣)

کۆڕەوە ڕەو
بە ڕۆژو بە شەو

- دوو مرۆڤن لە تەك یەكدا هاوشەقامێك
یەكەمیان پێخاوس، باركۆڵەی لە پشت ناوە
تامی باران تەزووی سەرما دەكێشێ
دووەم، جامی ترومبێلیش ناكاتەوە
باویشك ئەداو خۆی لێك ڕادەكێشێ
ئەوەیان، ڕێچكۆلەكانی لاڕێ دەگرێتە بەر
ڕێگا كورت كاتەوە
ئەویان، بە ڕاستە ڕێیانی قیرتاو، خەوە كوتكە دەیباتەوە
شاعیریش مرۆڤێك بوو
بەشێكی لە ژوورەوە، ئەوەی دی لە دەرەوە
یەكەم خەوت و دەرگا پاراستی
دووەم ڕاكشا و ئازاری هزر خواردی
بۆیە ئێستایش لە گەڵدا بێ
لە ژوورەوەی خۆیدا دەژی، مرواری ڕۆندكان هەڵدەڕێژێ
پرووشەی ئاهەكانی بە سەر هەژارە پێخاوسەكاندا دەپرژێ

(٤)

ڕێیی بەرەو كانی ڕەش بۆتەوە
زەمانێكە ڕێبواران بە سەریان نەكردۆتەوە
چەند هەنگاوێك.. گرمەی لوغمێك
سەر وەك گندۆرەی بێستانی كاولكراو گلۆربۆوە
لە سایدی مرۆڤایەتی دەرچوو
كەوتە نێو باوەشی مێژوو

(٥)

وا دێت گیانم گەرم بێت، ئاخ بۆ شوێنێکی گەرم

سۆبەیەکی هەڵایساو.. وشك کاتەوە جلی تەرم

(٦)

ئەمە چ شەوێکە، زریان‌و باران لە تەختی نێوچەوانی مرۆڤ– دەدات

سپێدەیێ کە رۆژ هەلات

ئاخۆ چەند گۆڕی تازەترمان پێ لێدەدات

ئافرەتێکە.. دوو منداڵی پێخاوس‌و گرینۆکی داوەتە پێش خۆ

لەگەڵ زگی هەشت مانگانی

دەڵێت کەی شەوم لێ ئاوا دەبێ‌و دەگەمەوە بەیانی

(٧)

منداڵێك بە کوڵ دەگریا

نانێکی گەرمی لەسەر سێڵی سوورەوە بوو فڕاند بوو

پەنجە ناسکەکانی ئاوسا بوون

دایکی بەو زگە برسییەوە زگی دەسوتا بۆ پەنجە سووتاوەکانی

شتێ نەماوە نەمدیبێ

وەك سەلکە سەهۆڵێك نەمکرۆشتبێ

...هەتا دوایی

بەڵێ هەر وەك نووسەرو زانای گەورە (جۆرج میریدس) دەڵێت:

(لەتە نان شتێکی وا گرنگ نییە، بەڵام بۆ ئەوەی لە برسا سکی دەگوشێ هەموو شتێکە)

*هـەر وەك لـە پێشـدا ئامـاژەم پێكـردووە دواى ئـەوەى هێڵـى ٣٦ سەپێندراوو حكومەتى عێراق لەو سنوورەى بۆى ديارى كرا بوو دامو دەزگاكانى كێشايەوەو ئابلوقەى لەسەر كوردستانيش دانا، ساڵانێكى زۆر هەژارىو نەبوونى رووى لە خەڵك كردو هەموو كەلو پەلو هەموو جۆرە خۆراكێك گران بوو، موچە زۆر بە ناوەختىو پچڕ پچڕى دەدرا، بەڵام ئازادىو سەربەخۆيى كورد لەو سەردەمدا چێژو خۆشييەكەى هەموو ناخۆشييەكانى پەردەپۆش كرد بوو، خەڵكى بەرگەى هەموو ئەو ژيانە سەختەى گرت، لە ١٩/٥/ ١٩٩٢ هەڵبژاردنى پەرلەمانى كوردستانو دامەزراندنى حكومەت ئەنجام درا، ئەو رۆژانە خۆشترين جەژن بوون لە مێژووى كوردا.. هەروها ڕاگەياندنى فيدراليەت بۆ هەرێمى كوردستان لەبەروارى ٤/١٠/١٩٩٢.

* لەگەڵ ئەو هەموو دەستكەوتو پێشكەوتنانەى رۆژ بە رۆژ لە كوردستان دەهاتە دى، هەر لە كردنەوەى زانكۆو پەيمانگاكانو رێكخراوە جەماوەرىو ديموكراسيەكانو دەستەبەر كردنى مافى ژنانو پێشكەوتنەكان لە لايەنى شارستانىو گەشتيارىو رێگاو بانو گۆڕينى سيماى شارو شارۆچكەكانو تا دەگاتە كردنەوەى فرۆكەخانەكانى هەولێرو سلێمانى، پتەوبوونى پەيوەندييە سەربەخۆييەكانى كورد لەگەڵ زۆربەى ولاتانى زل هێزو هى تر، دوا دەستكەوت بوونى هەڵەبجە بە پارێزگا، نامەوێ زياتر لەسەرى بڕۆم كوردو دنيا هەمووى لەبەر چاوە، بەڵام جێگاى داخە كە حزبە كوردستانيەكان هەميشە لە ململانێو شەڕو دژ بەيەك بوونە، هەڵبەتە دەستى دەرەكيشى لە پشتەوەى بووە، شەڕەكانيش لە ١٩٩٤ لە نێوانى يەكێتيى نيشتمانى كوردستانو پارتى ديموكراتى كوردستان كە بووە هوى شەهيد كردنى چەندين ڕۆڵەى

قارەمان و پێشمەرگەی بێ تاوان و ماڵ ویرانی و بە هەدر چوونی پارەو پوڵ و سەروەت و سامانێکی زۆری حکومەت و خەڵکەکە، هەروەها بەردەوامی شەڕو سەنگەر لێك گرتن و چاندنی ڕق و قین و کوشتاری لە لایەن پارتی و یەکێتی لە ٣١/ئاب/١٩٩٦ دا. لەو شەڕە براکوژییەدا، بەداخەوە هەبوون لە نووسەران و ڕۆشنبیرو هونەرمەندانیش کە ئاگری (بن کا) بوون لەو ململانێ و بە یەکا چوونانەدا بۆ بەرژەوەندی و سوودمەندی تایبەتی خۆیانەوە هەڵوێستی خراپیان هەبوو، هەر چەندە بەرەی خێریش لەو چین و توێژانەی ئاماژەم پێکردووە زۆرتر بوون لەبەرەی یەکەم ئاماژەم پێکردوون، هەروها لە ئەنجامی ئەو شەڕە ناوخۆییەی نێوانی پارتی و یەکێتی لە ساڵی ١٩٩٨ دا، تورکیا بە هێزێکی سەربازی و تانك و تۆپ و چەکی قورس هاتە نێو کوردستان و لە هێزی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانی داو ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەگانی سەر بە یەکێتیی شەهید بوون و بنکەو سەربازگەی لە زۆر شوێنی کوردستان جێگیر کرد،

*بە داخەوە ئێمەی کورد لە ناوەخۆمان هیچ دەستێك ناتوانێ ڕێکمان بخات، دەبێ دەستێکی بە هێزی دەرکی بێت و هەڕەشەو چاو سوورکردنەوەیشی لەگەڵ دابێ، ئەوە بوو، لە ساڵی ١٩٩٨ دا، بەڕێزان مام جەلال و کاك مەسعود بانگهێشت کران بۆ ئەمەریکا لە واشنتۆن، وزیری دەرەوەی ئەوسای ئەمریکا (مادلین ئۆلبڕایت) بوو، هەردوو سەرۆکی پێهێنانەوەو بەڵگەنامەیەکی پێ ئیمزا کردن کە نابێ جارێکی دی شەڕ لە نێوانیاندا ڕوو بدات

*لە مانگی نیسان / ٢٠٠٣ ئەمەریکا، عیراقی داگیر کردو حکومەتی بەعسی لە عیراق رووخاندو (پۆل بریمەر) وەك نوینەری ئەمەریکا لە عیراق

دانـرا بـۆ جێبـەجیٚ کردنـی کاروبـاری عـێراق‌و پێکهێنـانی حکومـەتێکی فیدراڵی فرە لایەن‌و حزب‌و نەتەوە، ئەوە بوو مـام جـەلال بـوو بـە سـەرۆکی کۆماری عێراق‌و کاك مەسعود بوو بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان‌و دان بە شەرعیەتی فیدراڵی هەریمی کوردستان نراو پێشمەرگەش وەك بەشێك لـە سوپای عێراق نەك میلیشیا‌و لە دەستووردا دیاری کرا.

(٣)

*لە دووتوێی ئەو پانۆڕامەیەدا:

(منو ژیانێکی دیو ئەدەبو کار و سەفەرو بارێکی تر)

١ – هەر وەك لە نووسینەکانی ئەڵقەکانی پێشوومدا زیاتر لەسەر یەکەم دیــوانم بــە نــاوی (شــەوارە) وەســتامو باســی ئــەو چــەند وەرگێــڕانو لێکۆڵینەوانـەی لـە بارەی بڵاو بوونەتـەوە لـە گۆڤـارو ڕۆژنامـەکانی ئێـرەو ئـەوێ، هـەروەها لـە هـەفتاکانو هەشـتاکان ئـەو چـەند بابەتـەی بـڵاوم کردۆتەوە وەك شیعرو لیکۆڵینەوەو وەرگێڕانو بەرهـەمی تـری ئـەدەبی لـە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا لەو سەردەمدا، جا ئەو دیوانو بڵاوکراوانـەی کـە زۆر زۆرن ناکرێ بە درێژی باسیان بکەمو بیانخەمە ڕوو بۆیە بە کورتی دەڵێم جگە لە شەوارە، ئەو بەرهەمە چاپکراوانەشم بە دوایدا هاتوون وەك:

*شەوارە / دیوانێکی شیعر / لە ١٩٧٨ دا بە چاپم گەیاندووە.

*ڕێــویو قەلەڕەشــکە / چــیرۆك بــۆ منــداڵان / لــە زمـانی عەرەبیــەوە وەرمگێڕاوەتەوە بۆ سەر زمانی کوردی / لە ١٩٨٢ بە چاپم گەیاندووە.

*چۆڕاوگە / دیوانی شیعر/ لە ١٩٨٤ دا بە چاپم گەیاندووە

*دەچنە ڕێواسان / لە ١٩٨٥ / دیوانی شیعر

*گوڵە یاقووتیەکان/لە ٢٠٠٠/ دیوانی شیعر

*گوڵناز / لە ٢٠٠٣ / دیوانی شیعر

*لە ژێر ساباتی شیعردا / لێتوژینەوەیەکی ئەدەبی / لە ٢٠٠٦ دا بە چاپم گەیاندووە

*لە کیشوەری جوانەکاندا / دیوانێکی شیعر / لە ٢٠٠٨ دا بە چاپم گەیاندووە

*نازی تاوس و ئاورینگی قوڵینگ/ دیوانێکی شیعر / لە ٢٠٠٨ دا بە چاپم گەیاندووە.

*خەڵات /کوڕاسێك لە شیعری منداڵان / ٢٠١١ / بە چاپم گەیاندووە

*قصائد من غناج التاووس و شراره الغرنوق / دیوان شیعر محسن آواره / وەرگێرانی بۆ سەر زمانی عەرەبی / لە ٢٠١٢ دا / لە لایەن وەرگێڕ موهەندیس (محەمەد حوسێن)وە.

* لە باخەڵی باخدا /دیوانێکی شیعر / لە ٢٠١٢ دا بە چاپم گەیاندووە.

*سێوێك بۆ هەڵدان، دەستێك بۆ گرتنەوە / دیوانێکی شیعر / ٢٠١٢ / بە چاپم گەیاندووە.

* کارێزە مەرجان (کۆبەندی شیعر لە دوو بەرگدا) بەرگی یەکەم (٤٩٤ لاپەڕە لە خۆ دەگرێ) (بەرگی دووەم ٥٠٤ لاپەڕەیە) لەسەر ئەرکی یەکێتیی نووسەرانی کورد / مەڵبەندی گشتی/ لە ساڵی ٢٠١٤ بە چاپیان گەیاندراوە.

*لە خونچەی دەم تەنگەوە تا گوڵێکی لێو پەڕ / دیوانێکی شیعر / لە ٢٠١٨ بە چاپم گەیاندووە.

*سەفەرێکی تر بە نێو مەملەکەتی شیعردا / چەند لێکۆڵینەوەیەك لە خۆ دەگرێ لەسەر شیعر، کە قەبارەکەی (٣١٢) لاپەڕەیە /لە ٢٠١٩ / لەسەر ئەرکی ئەکادیمیای کوردی هەرێمی کوردستان بە چاپیان گەیاندراوە.

*عەترێکەو لە نەوەی گوڵخانە / دیوانێکی شیعر / ٢٠١٩ / لەسەر ئەرکی رێکخراوی رێباز فاوندەیشن بە چاپ گەیاندراوە.

*أريج من سلاله الخمائل / ديوان شعر محسن أواره / ترجمه (محترم محەمەد) لسنه ٢٠٢٠

***

هەر لە رۆژی خوێندنەوەی یەکەم شیعرم لە ئێزگەی دەنگی کوردستان عیراقدا لە ١٩٦٩ دا بە ناوی سروودی پێشمەرگە کە ئەو کات پێشمەرگە بووم، تا ٢٠٢٠ جگە لەو کتێبانەی لەسەرەوەدا خستوومەتە ڕوو، بە ردەوام بوومە لە بڵاو کردنەوەی شیعرو لێکۆلینەوەی ئەدەبی و چەند کورتیلە چیرۆك و شانۆنامەو وەرگێرانی شیعرو بابەتی ئەدەبی هەمەجۆرو هەتا بابەتی وەرزش و سیاسی و کەڵەپوورو بیرەوەری و هەڤپەڤین.. هتد، لە گۆڤارو رۆژنامەو ئێزگەو تەلەفزیۆن، جگە لە بەشدار کردنم لە دەیان کۆڕو ڤیستڤاڵ و بۆنەکان و شیعرم خوێندووتەوە یان لێکۆڵینەوەم لەسەر شیعر پێشکەش کردووە لێرەو لەوێ و لە دەرەوەی ولاتیش کە ئەرشیفێکی دەوڵەمەندم هەیەو پارێزگاریم لێ کردووە لە هەموو بارە نالەبارە سەخت و ناخۆشەکان و ئاوارەیی و دەربەدەریدا، تا ئێستا بەرمیلێك مەرەکەبم سەرف کردووە، بەلاّم.. بەلاّم.. بەلاّم، کاری سەرەکیم و عیشق و خولیا و چارەنووسازیم بە پلەی یەك (شیعر) بووە زیاتر بایەخی پێ بدەم و لە پێشەوەی هەموو داهێنانێکم دایە.

* لە خولی راپەڕین ١٩٩٣ لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری کاروان بووم ئەو گۆڤارە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەردەچوو، گۆڤارێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بوو، بە شێوازێکی مۆدێرن و پێشکەوتوو ژمارە لە دوای ژمارە مانگانە دەردەچوو، سکرتێری

نووسین کەریم دەشتی بوو، دەستەی نووسەران بریتی بووین لە شاعیرو نووسەران (کەریم شارەزا - عەبدوڵڵا قادر گۆران - صلاح عومەر - موحسین ئاوارە - قوبادی جەلی زادە -خالد جوتیار - عەبدوڵڵا جوندی).

*میتۆلۆژیا / وەرزە گۆڤارێکی زانستی کلتوری بوو / ساڵی ٢٠١٠ ژمارە (١) لەبەرگێکی جوان و بە قەوارەی ٢١٦ لاپەرە چاپ کراو بڵاوکرایەوە، لەو گۆڤارەدا (خالد جوتیار / سەر نووسەرو خاوەن ئیمتیاز / موحسین ئاوارە / بەڕێوەبەری نووسین / هەروەها ڕاوێژکارانی گۆڤارەکە بریتی بوون لەبەڕێزان / مەحمود زامدار - د. مەولود ئیبراهیم حەسەن - جەلال سنجاوی - هونەرمەند غازی ئامانج) بەڵام بە داخەوە چۆن خالید جوتیار رۆحی شاد بێ سەری نایەوە، دواتر گۆڤارەکەیش هەر ئاوا بەردەوام نەبوو.

* بە بۆنەی بەستنی کۆنگرەی ماف پەروەران لە ژمار (١) ١٩٩٢دا، ژمارەیەکی تایبەت وەك رۆژنامەیەك دەرچوو، لەوێدا کە تەکلیف کرا بووم قەسیدەیەکی درێژی نزار قەبانی کە (٢١١) دێڕ بوو لە زمانی عەربییەوە بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێرم کە کوردییەکەی بەو ناونیشانە بوو (ژیاننامەی خودی عەرەبێکی خوێنڕێژ) لە هۆڵی کۆنگرەکەدا لە رۆژی یەکەمی دەستپێکی گۆنگرەکە ئەو رۆژنامەیە بە سەر ئەندامانی کۆنگرەو مێوانانی دابەش کرا، ئەوەی شایانی وتنە دوای چەند رۆژێك ئاگادار کرامەوە کە لە لایەن حزبێکی ئیسلامی بەناوی جیهادی ئیسلامی (مەلا ئەمین)سەرپەرشتی دەکرد، کوشتنم حەڵاڵ کراوە لەبەرئەوەی ئەو شیعرەی نزار قەبانی کوفرو ئیلحادی تیایە، دواتر لە ڕێگای چەند کەسێکی کەسایەتی هۆزەکەمەوە پەیوەندیان بەو حیزبە ئیسلامییە کردو پیان گوتن ئەو شیعرە هی موحسین ئاوارە نییە هی نزار قەبانی یە

وەرگێڕاوەتەوە، ئەگەر وایە بۆ لیژنەی فتوای عەرەبی و زانکۆی مەزهەر ڕەخنە لە نەزار قەبانی ناگرن، خۆی شیعرەکە لەسەر صدام حوسێن دانراوە، بە ناوی صدام قسە دەکات چ پەیوەندێکی بەو خزمەی ئێمەوە هەیە هەڕەشەی لێ بکەن، هەر چۆنێك بێت هەڕەشەکەیان لەسەر من لابرد، جا بۆ نموونە کە لە شیعرەکەدا هاتووە ئەو چند دێڕەو هەندێکی تریان مەبەست بووە گوایە کوفری تیایە بۆ نموونە:

ئەی خەڵکینە
وا من بوومە بە سولتانی ئێوە
بتەکانتان بشکێنن، پاش لار بوونەوەیان بمپەرستن
منداڵەکانتان جێبهێڵن بە بێ نان
ژنەکانتان جێبهێڵن بە بێ پیاو
بە دوام کەون، سوپاسمەندی بەخششەکانی خوا بکەن
لەسەر ئەو بەشەی پێیی بەخشیون
کە منی بۆ ئێوە ناردووە مێژوو بنووسمەوە... هتد

-هەروها لەو کۆنگرەیەدا تەکلیف کرام شیعرێك لەسەر ماف پەروەران بنووسم بشێ بۆ ئەوەی ئاواز دانەرێك بیکات بە سروودێك و لەو کۆنگرەیەدا لە لایەن هونەرمەندێکی گۆرانیبێژەوە لەگەڵ تیپێکی مۆسیقاژەنەوە بگوترێت، گوتم هەر چەند شیعر خۆ ڕسکەو خەیاڵ و ئیلهامیشی تیایە، بەڵام دڵتان ناشکێنم ئەوەش دەکەم، جا ئەو سروودەم دانی و لە ڕۆژی یەکەمی کردنەوەی کۆنگرەگە ئەگەر لە یادم مابێ

ڕەوانشاد هەنەرمەند (یحیا مەرجان) لەگەڵ تیپێکی مۆسیقاژەنی هەولێر ئەم سروودەیان چڕی کە شیعرەکە بەم شێوەیە بوو:

ئەی ماف پەروەر.. ئەی مافپەروەر
ئێوەن ویژدان، ئێوەن سەروەر
گەر یاساتان کردە پێوەر
ڕۆژهەڵاتی هاوولاتی
بۆ یەکسانی هەموو ساتی
لە تەرازووی ڕاستڕەوە
لا نەدەن لەو ڕێڕەوە
ئەی ماف پەروەر.. ئەی مافپەروەر
ڕێگاتان بە گریێو داوە
لە خەباتی نەپساوە
دەیان شەهیدتان داوە
سەروەریتان بۆ ماوە
ئەی ماف پەروە، ئەی مافپەروەر
بۆ نێوەندی خێرو شەڕ
پاراستنی سامان و سەر
ئێوەن ویژدان، ئێوەن سەروەر
ئەی مافپەروەر.. ئەی ماف پەروە
وشەی دەگمەن ڕەوایە
لە هەگبەو گەروو دایە
نەلەنگێت تەرازووتان

**نەپرووشێ ئارەزووتان**

**ئەی مافپەروەر.. ئەی مافپەروەر**

* وەك ریزلێنان لە ماندووبوونم و بەرهەمەكانم و بە سەر كردنەوەم لە چەندین بۆنەی ئەدەبی و فەرهەنگی و ڤیستڤال و ئاهەنگەكاندا لە نێو ولات و دەرەوی ولات و زانكۆكانی كوردستان تا ئەم ساڵ ٢٠٢٠ زیاتر لە (٣٠) جار رێزم لێ نراوە بە پیشكەش كردنی بڕوانامەی رێزلێنان و ئاڕمی هەمەجۆر .

***

*جگە لە بلاوكراوەكانم كە لە سەوەدا ئاماژەم پێكردووە، چالاكی بەردەوامیم هەبووە لە رێكخراوە ئەدەبی و سەندیكایی بۆ نموونە:

- لە ئەلقەكانی پێشوومدا باسم كردووە لە هەفتاكان ئەندامی دەستەی وێژەیی كوردی بوومە لە كۆمەڵەی هونەرو وێژەی كوردیدا لە ١٩٧٦ وە بۆ ماوەی چەند ساڵێك.

-لە ١٩٧٢ بوومە بە ئەندامی یەكێتیی نووسەرانی كورد

- ١٩٧٤ دوای هەڵبژاردن و دەنگم هێنا بووم ئەندامی دەستەی بەرێوەبردنی یەكێتیی نووسەرانی كورد / لقی هەولێر.

-لە ١٩٩٢ - ١٩٩٦ دوای هەڵبژاردن كە دەنگی یەكەمم هێنا بووم جێگری سەرۆكی یەكێتیی نووسەرانی كورد / لقی هەولێر.

- (١٩٩٩)وە ئەندامی كارای سەندیكای رۆژنامەنووسانی كوردستانم، هەروا ئەندامی فیدراسۆنی رۆژنامەنووسانی نێو دەوڵەتیم كە بارەگاكەی لە بەلجیكایە.

-لە ١٩٩٦ – ٢٠٠٤ راویژکار بوومە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان دواتر لە ٢٠٠٤ خانەنشین بوومە.

-لە ٢٠٠٦ . ٢٠١١، بەر پرسی بنکەی ئەدەبی و ڕۆناکبیری گەلاوێژ بوومە لە هەولێر

– لە ٢٠١٠ جارێکی دی دوای هەڵبژاردن و دەنگم هێنا، بووم بە جێگری سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد / لقی هەولێر تا ئەو کاتەی لە دوا نووسینەوەی ئەو بیرەوەرییانەم ٢٢/ ٤/٢٠٢٠ کە لە ماڵەوەم و دەرناچم بە هۆی بلاوبوونەوەی ڤایرۆسی (کرۆنا) هەر بەردەوامم لە یەکێتیی نووسەرانی کورد /لقی هەولێر وەك جێگری سەرۆکی نووسەران.

(٤)

چیرۆکی گەشتو سەفەرەکانمان بۆ دەرەوەی ولآت

١ – دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٤ هەڵبژێردرام بۆ ئەوەی (١٢) مانگ بچمە دەورەیەکی ڕۆشنبیری لە (یەکێتیی سۆڤیەت / مۆسکۆ) بە ناوی نەقابەکانی کرێکاران، بەڵام دایرەی ئەمنی هەولێر (؟)ی لەسەر من هەبوو، سەفەرەکەی لێ تێکدامو بۆ دەورەی سێیەم دانرام، کەچی شۆڕشی ئەیلولێ ١٩٧٤ شەڕ لەگەڵ ڕژێمی بەعس واتە حکومەتی عیراق دەستی پێکردەوە، منیش دیسان چوومەوە ریزی شۆڕشو پێشمەرگایەتی، زۆر عەودالی سەفەر بوومو ولاتێکی بە دەر لە عیراق ببینم، هەر چەندە چوومە ئێران جاری یەکەم کە هێشتا نسکۆی ١٩٧٥ ڕووی نەدا بوو، دواتر لە ١٩٧٥ کە نسکۆی شۆڕشی ئەیلول بوو ئیتر بە ناچاریو ئاوارەیی چوومە ئێران لە ئەڵقەکانی پێشوو باسم لێوە کردووە، جا وا یەکەم ولآتم بینی جگە لە عیراق تۆزێك قەرەبووی عەودالّیەکەمی ڕەواندەوە.

–لە (٢٠٠٥)دا دوای ئەوەی ڕێز لێنانی (ڕەوانشاد مام جەلال)م پێ ڕەوا بینرا لەگەڵ زۆرێك لە ئەدیبو ڕۆژنامەنووسو هونەرمەندان، کە بریتی بوو لە بڕوانامەیەكو زەرفێك گوژمەیەك پارەی تیا بوو، هەر وەك لە ئەڵقەکانی پێشوو بە درێژی باسم کردووە، ئیتر بەو پارەیە، دوای ئەوەی ئامۆزایەکم (ساجد مەلا رەحمان) لە میسر / قاهیرە / بازرگان بووو کۆمپانیەی هەبوو، داوەت نامەی بۆ ناردمو ڕەزامەندی حکومەتی میسری

وەرگرتبوو بە سەفەر بچمە لای ئەو، جا لە ٢٠٠٥/٣/١٠ چوومە دیمەشق – سوریا، پەیوەندیم بە ئامۆزاکەم (ساجد) کرد، ڕەزامەندی ولاّتی عەرەبی میسری بە ڕێگای ئەلّکترۆنی بۆ مەکتەبێکی فڕۆکەوانی دیمەشق نارد، ئیتر بتاقەی سەفەرم بۆ قاهیرە ٢٠٠٥/٣/١٦ کراو گەیشتمە فڕۆکەخانەی قاهیرە، لە فڕۆکەخانەدا ساجد لە چاوەڕوانیم دابوو پێك شاد بووین، بەرەو مالّەوەیان چووین چوونکە خاوخێزانیشی لەوێ نیشتەجێ بوون، لە مالّەوە گوتی ئەوە ژووری نووستن و تەوالێتی سەربەخۆو ئازادی خۆت لێرە لەو مالّەدا وەرگرە، پێم گوت ئامۆزا (خۆ مالّی خۆمان دلۆپەی نەدەکرد تا بێمە ئێرە؟) گوتی تەواو لە مەبەستەکەت گەیشتم، گوتم کەواتە سوپاس بۆ خوا پارەی باشم پێیە شوقەیەکی جوانی نێو سەنتەری قاهیرەم بۆ بگرە بۆ ماوەی یەك مانگ، بەلّی لە (مدینە النسر – نهایە أخر میترۆ – عمارە مستەفا نحاس) شوقەی لەوێی بۆ گرتم، هەموو ڕۆژێك بە ترۆمبیلەکەی لاندرۆڤر جێبب ئەمریکی دەهاتە دوام لە سەعات (٣) پاش نێوەڕۆ تا (٣)ی شەو هیچ شوێنێك نەدەما بۆی نەچین و نیشانی نەدابم، هەموو پێنج شەموان و هەینییەکانیش بەرەو دەرەوەی شارو شارانی سەر دەریاکانی دەبردم وەك (ئەسکەندەریە)... هتد، یەکێکی میسری کە هاوڕێی (ساجد) بوو پێی گوتم (الی یشرب من نیل لازم یرجع للنیل) واتە ئەوەی لە ئاوی نیل بخواتەوە دەبێ بگەڕێتەوە نیل) نیل واتە ڕووباری نیل، هەر واش کەوتەوە سەفەری ترم بۆ میسر کردەوەو قسەکەی ڕاست دەرچوو دواتر باسی ئەو سەفەریش دەکەم.. ئیتر تا مانگێك ئاوام بە سەر بردو دواتر گەڕامەوە دیمەشق و هەولێر.

٢ – یەکەم جارم بوو کە سەفر بکەم بۆ ولاّتێکی ئەوروپی بە هۆی ئەنجامدانی کۆنفڕاسی دەزگای بەدرخان لەگەلّ ژمارەیەکی زۆر لە

رۆژنامــەنووس و ئــەدیب و رۆشــنبیرانی کوردســتان، کــە لــە رێگــای فرۆکەخانەی هەولێر – دواتر فرۆکاخانەی ئەستنبۆڵ – پاشان لەبەرلین – ئەلمانیا گیرساینەوە، کۆی زانیاری ئەو سەفەرەمان لەو بەیاننامەیەی کۆتایی کۆنفراسەکە کە ئاماژەی پێکراوە تیایدا هاتووە:

بە چاودێری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان و ناڤەندا هاڤیبوون و یا لێکۆڵین و وەشانین کوردی و سەنتەری ئەورووپی بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی (کوردۆلۆجی) بە دروشمی (ئازادی و زۆرلێکردن) لە ئەلمانیا – برلین، لە رۆژانی (٢١ – ٢٠٠٧/٤/٢٢) لە هۆڵی (هارتناك هاوس) یادی بەرزی یەکەمین رۆژنامەی نۆبەرە (کوردستان) کرایەوە، ئامانج لە سازدانی ئەم کۆنفراسە ناساندنی مێژووی رۆژنامەنووسیی کوردی و کلتوری کوردەواریە بە شێوەیەکی ئەکادیمی بۆ ئەوەی دەنگی میللەتی کورد بگاتە ئەوانەی کە خەمخۆری کێشەی ڕەوای گەلی کوردستانن

ئەمساڵ (٨٠) رۆژنامەنووس و رۆناکبیرو نووسەرانی هەر چوار پارچەی کوردستان بە ئامادەبوونی نوێنەری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بە نوێنەرایەتی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان وپارتی دیموکراتی کوردستان لە ئەڵمانیا، ئەندامی پەرلەمانی عیراق – هاوپەیمانیی کوردستان و سەفیری عیراق لە ئەڵمانیا و ئەندامی پەرلەمانی بەرلین و.. جگە لە رووناکبیرانی کورد لە هەندەران و رووناکبیرانی بیانی کە ئامادەی کۆنفراسەکە بوون.

سەرەتای کۆنفراسەکە بە بروسکەی نوێنەری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، شازادە سینەم جەلادەت بەدرخان و لیژینەی بالای کۆنفرانس)

خوێندرایەوە، لە پاشان هەر یەك لە (پرۆفیسۆر ئەمیری حەسەن پوور، پرۆفیسۆر جۆیس بلو، دکتۆر جۆردی تەژیل گۆرکیس، دکتۆر ئیبراهیم سەیدۆ، پرۆفیسۆر جانێت کلاین، محەمەد مالمیسانژ، ستارت کیێر، عەبدوللاّ کەسکین، مونیف یەڵدزخان، سامی تان، کۆرۆغلو کار ئەسلاّن، سەلاحەدین بوڵوت، سیروان حاجی حوسێن، دکتۆر ماجید حەقی، فەرهاد موراسل، کەریم قادر (بەدران ئەحمەد) لە جیاتی ئەو بۆتان تەحسین – توانا عوسمان، یەحیا ئەحمەد فەرەج، (روناك فەرەچ) لە جێگای ئەو حەسیبە ئیبراهیم بابۆڵی و یونس حەمەد محەمەد)سیمینارو بابەتەکانیان پێشکەش کرد.

لەو دوو ڕۆژەی کۆنفراسدا ئامادە بووان لە کەشێکی ئازادو سەربەستیدا توانیان باس لە لایەنەکانی مێژووی ڕۆژنامەنووسی و دیرۆکی کوردی بکەن، هەروەها تواندرا ما `گنامەی بەدرخان، گۆڤاری هاڤیبوون، کوردناسی و فیلمی (هاوارا کوردا) چاپ و بلاّو بکرێتەوەو پێشکەش بە مێوانان بکرێت.

لە کۆتایی شازادە سینەم جەلادەت بەدرخان وتاری بنەماڵەی بەدرخانیان پێشکەش بە مێوانانی کۆنفراس کرد و، حمید ئەبوبکر بەدرخان بەیاننامەی کۆنفراسی بەدرخانی لەبەرلین پێشکەش بە ئامادە بووان کرد، ئەوەی شایانی باسە لێژنەی بالاّی ڤیستڤاڵ پاش بە کۆتا هاتنی کۆنفراس (گەشتێکی بە نێو شاری بەرلین بۆ مێوانان ساز دا) لێژنەی بالاّی ڤیستڤاڵ سوپاسی دکتۆر کەمال فوئاد، دکتۆر محەمەد ئیحسان، بەدران ئەحمەد حەبیب، دکتۆر ئەندریا فیشەرو عەبدولڕەحمان نەقشبەندی و هەموو ئەو کەسانە دەکات چ لە کوردستان چ لە دەرەوەی کوردستان کە ماندوو بوون،

له كاتی پشوودان‌و دوای كۆنفراسیش میوانای ڤیستڤاڵ ئه‌و ئازادییان پێ درا بوو كه بۆ هه‌ر شوێنێك ده‌چن یان چ چالاكیه‌ك ئه‌نجام ده‌ده‌ن تا رۆژی گه‌ڕانه‌وه‌دا كه به كۆ ده‌گه‌ڕینه‌وه، جگه له‌و گه‌شته‌ی به كۆ كردمان بۆ په‌رله‌مانی ئه‌لمانیا له برلین وشوێنگه‌ی هۆلۆكۆسی جینوسایدی یه‌هودیه‌كان‌و شوێنگه‌ی دیواره رۆخاوه‌كه‌ی ئه‌لمانیای خۆر هه‌ڵات‌و خۆر ئاوای، چه‌نده‌ها شوێنی دی گه‌شتیاری‌و مۆڵ‌و نیو بازاڕو شار، له‌به‌رواری ٢٠٠٧/٤/٢٥ له‌سه‌ر داوای (مه‌ڵبه‌ندی ئاوه‌دانی به‌رلین) كۆڕێكی شیعر خوێندنه‌وه‌یان بۆ ساز كردم، كه به‌ڕێزان عبدولموئمین ده‌شتی‌و زاهیر خۆشناو رێكیان خستبوو هه‌روه‌ها به به‌شداری خالید جوتیار بۆ قسه كردن له‌سه‌ر شیعره‌كانم، ژماره‌یه‌كی زۆر له ئه‌دیب‌و رۆشنبیرانی ڕه‌وه‌ندی كوردی له‌به‌رلین ئاماده بوون‌و هه‌ڵسه‌نگاندن‌و گفتو گۆ له‌سه‌ر شیعره‌كانم له لایه‌ن شاعیرو نووسه‌رانی ئاماده‌بوو كراو به سه‌ركه‌وتوویی كۆتایی پێ هات. سوپاس بۆ زۆربه‌ی ئه‌و براده‌رو خزم‌و ناسیاوانه‌ی له شاره‌كانی دی ئه‌لمانیا ئه‌ركیان كێشا بووو سه‌ردانیان كردین بۆ نموونه (كاك ئیدریس لاوه‌و گوشاد حه‌مه‌سه‌عید (كاروان).. هتد.

٣ - سه‌فه‌ری دووه‌مم بۆ ولاتی میسر/ قاهیره /ئه‌مجاره‌یان له‌گه‌ڵ چه‌ندین رۆژنامه‌نووس‌و ئه‌دیبان بوو به‌شدار بووم له ڤیستڤاڵی به‌درخان له قاهیره به بۆنه‌ی ١١٠ ساڵه‌ی رۆژنامه‌نووسی كوردی له ٢١-٢٠٠٨/٤/٢٢ كه له‌و شاره واته قاهیره یه‌كه‌مین رۆژنامه‌ی كوردی له باوه‌ش گرتووه ناویان نا (كوردستان) بۆ به‌رز ڕاگرتنی ئه‌و یاده، ده‌زگای چاپ‌و بلاوكردنه‌وه‌ی به‌درخان به هاوكاری رووناكبیران‌و رۆژنامه‌نووسانی كوردستان به ئاماده بوونی ژماره‌یه‌كی زۆر له

نووسەرانی میسرِیو خوێدنکارانی کورد، لە هۆڵی (ساقیە الصاوی) لە گەڕەکی (زەمالیك - قاهیرە)بۆ ماوەی دوو رۆژ لە بەیانیانو ئیوارانـدا چالاکییەکانی ئەنجام دا، جا لە یەك لە دانیشتنەکاندا ئەو شاعیرانەیش بە عارەبیو کوردی شیعریان خوێندەوە (جەوهەر کرمانج - موحسین ئاوارە /بە کوردیو عەرەبی - دڵشاد عەبدوڵلاَ - قوبادی جەلی زادە - ئاوات حەسەن ئەمین) لە لایەن شاعیر نازم دڵبەندەوە پێشکەش دەکرا.

لەم سەفەرەدا کە لە فرۆکخانەی سەلیمانیەوە بە فڕۆکەیەك فڕینو لە قاهیرەدا دابەزین بریتی بووین لەو رۆژنامەنووسو ئەدیبانە (فرید ئەسەسەرد - فریاد رواندزی - د. عەبدوڵلاَ عەلیاوەیی - رەهبەر سید برایم - جوهەر کرمانج - د. ئیحسان فوئاد - موحسین ئاوارە - دڵشاد عەبدوڵلاَ - قوبادی جەلی زادە - سامی هادی - محەمەد موکری - حمید ئەبوبکر - سمکۆ ئەنوەر - خالید جوتیار - نازم دڵبەند - ئاوات حەسەن ئەمین - حەسەن یاسین - یوسف ئەبوبکر - ستار علی یاسین - عەبدوڵلاَ ئەنوەر عەبدوڵلاَ - جمال عەبدوڵلاَ عارف - رەفیق ساڵح - شکری ئیسماعیل شهباز - دەشتی عبدالعەزیز شعبان.

دوای تەواو بوونی ئاهەنگی بەڕێوە چوونی ڤیستڤاڵەکە هەموو لایەك ئازاد بووین بۆ گەشتو گەڕان لە قاهیرەو دەوروبەری، سەفەرەکە بۆ ماوەی مانگێك ڕێگا پێدراو بوو، بەلاَم هەمووان بۆ ماوەی هەفتەیەك مانەوە، بەلاَم سەبارەت بە بەندە، ئامۆزاکەم (ساجد مەلا رەحمان) کە کۆمپانیای هەبوو لە قاهیرە نیشتەجیٚ بوو لە دوای هەفتەیەكو گەڕانەوەی هاوسەفەرەکانم، منی لەگەڵ خویدا بردو بۆ ماوەی سیٚ هەفتەی تر شوقەیەکی بۆ گرتمو میوانداری کردم، ئەوەی شایەنی وتنە بەر لە رۆیشتنی برادەرەکانم، ئەو ئامۆزایەم ساجد هەڵسا کەشتیەکی دەریایی

بە كریێ گرت و بە بە مۆسقا و گۆرنی و ئاهەنگێكی خۆش گەشتێكی دەریایی پێكردین لە رووباری (نیل)دا، بۆ ئێوارە لە كافترایەكی تەڕ بە گۆرانی و خواردن و خواردنەوە تا بەیانی بە خۆشی ئەو شەومان بەڕێ كرد، هەر چەندە وەك ئامۆزاو نزیك لە من و كوردێكی دڵسۆز ئەم ئەركەی كێشا كە هاوكات بوو لەگەڵ نەورۆزو (شم النسیم) لە قاهیرەدا، ئەو گەورەییەی نواند قەت لە بیری ناكەم.

دوای تەواو بوونی مانگێگ لە مانەوەم لە قاهیرە بە فڕۆكە لە قاهیرەوە هاتمە سوریا – دیمەشق، لەوێوە بۆ هاوسەرەكەم تەلەفۆنم كرد و گوتم وا لە سوریام و بەیانی دێمەوە هەولێر، پێیی گوتم حەز دەكەین تا هەفتەیەك و زیاتریش بۆ خۆت لە سوریا بمینێوە ئەگەر پارەشت پێ نەماوە ئەوە بۆت تحویل دەكەین، گوتم دیارە كێشەیەك هەیە یان لێم بێزار بوونە، گوتی هیچ نیە، دەزانم بگەڕێتەوە دیسان سەفەر دەكەیت تۆ زۆر حەزت لە سەفەرانە باشتر وایە ماوەیەكی تر بمینێیتەوە بۆ هێندە هاتوچۆ بكەیت، گوتم باشەو پارەم پێیە، هەفتەیەكی تر لە دیمەشق و لازقیەو حەلەب مامەوە، دوای ئەوەی گەڕامەوە ئینجا ژنەكەم پێی گوتم: حەزمان نەكرد ئەو خۆشییەی لەو سەفەرانە كردووتە بە سەر ناخۆشی دابكەوێت چونكە (ڕێبین) واتە كوڕەكەم بە ترومبێل لە پیاوێكی پیری دابوو لەسەر شەقام، هەر چەندە لەم رووداوەدا پیاوەكە بریندار نەببوو بەلام لەبەرئەوەی فشاری خوێن و نەخۆشی دی هەبووە لە چارەنووسی دەترساین بۆیە تا چاك بۆوەو لەگەڵ خزمانی تۆ چەند جارێك چووینە ماڵی پیاوەكە، بە دەست و دیاریەكی زۆرەوەو لێنەگەڕاین یەك سەعاتیش ڕێبین زیندانی بكرێ و لە ڕووداوەكەدا سوچی پیاوە پیرەكەی تیا بووە نەك ڕێبین، بۆیە گوتمان بە سەر ئەو ناخۆشییەدا نەگەڕێتەوە تا هەموو

کێشەو وەزعەکەمان چارەسەر کرد، زۆر سوپاسی ئەو هاوسەرە دڵسۆزەم کرد کە هەمیشە نەیهێشتووە خەم لێم بار بێ.

٤ – لە ٢٠٠٨/٨/٤ بۆ ماوەی (٨) رۆژ لەگەڵ گروپێکی گەشتیاری بە فڕۆکە لەگەڵ هاوسەرەکەم شلێر گەشتێکمان کرد بە گروپ بۆ لوبنان / بیروت / بە ڕاستی زۆر مەبەستم بوو لوبنان ببینم کە لە ساڵانی زوو گوێم لێ دەبوو دەیانگوت ئەگەر یەکێك نەخۆشی (سیل)هەوکی سینگی هەبووایە پیان دەگوت بڕۆ لوبنان چاك دەبییەوە، مام هەژاری شاعیریش کە تووشی ئەو نەخۆشیە بوو ماوەیەکی زۆر لە لوبنان مایەوەو نەخۆشییەکەی چارەسەر بوو، ئیتر پیویست ناکات لەو ماوەیەی لەوێ بووین کە بە ئۆتۆبیسی گەشتیاری کۆمپانیەکەی سەفەر هەموو شوێنە خۆشەکانی لوبنانمان بینی هەر لە دەریاو ناوچە شاخاوییەکان و مغارەی جعێتای یەك لە هەفتەمین سەرسامیەکانی دنیاو دەیان شوێنگەی گەشتیاری و سروشتی جوان کە نامەوێ وەك ناوهێنان زۆر درێژەی پێ بدەم، ئەوەی شایانی وتنە ئەوەبوو کە چووینە سەر چیایەك کە ١٢٠٠ کێومەتر لەسەر زەوی بڵندتر بووو هەوری تیا ئالا بوو، دێری مارشارییل /ی لێ بوو بە هەزران گەشتیاری لێ کۆ ببۆوە، جا ئەو ساڵی لە وڵاتەکەی خۆمان و کوردستان وشکە ساڵی بوو، ئیجای ئەوەم بۆ هات کیسەیەکی نایلۆن لەو هەورە پڕ کەمو بیهێنمەوە بۆ کوردستان ئەگەر بە سەر گوڵێکیش دایبارینم کە ئەم کۆپلە شیعری لێ کەوتەوەو لە دیوانی (سێویك بۆ هەڵدان و دەستێك بۆ گرتنەوە) کە لە ساڵی ٢٠١٢ بە چاپم گەیاندووە شیعرەکەیش:

**ولاّتێكی جوان بوو لوبنان**
**لەسەر بەرزترین ترۆپكی شاخێكیدا**
**لە نێو تەون و شەپۆلەكانی هەوریدا**
**سەوڵی خەیاڵم بەرەو وشكە ساڵی ولاّتەكەم كەوتە خۆ**
**ئارەزووم دەكرد**
**توورەگەیەكی نایلۆنی گەورە**
**پڕكەم لەو هەورە**
**بیهێنمەوە،**
**تا لە باخێكی ولاّتەكەی خۆم دایبارێنم**
**ئەگەر تاقە گوڵێكیشی پێ ئاو دەم**

٥ – لە ٢٠٠٨/٨/١٦ لەگەڵ حەمید ئەبوبكر بەدرخان بە فڕۆكەیەك و ژمارەیەك بووین چووینە ئوردن / عەممان / بۆ ئەوەی لە سەفارەی بەریتانیادا ڤیزە وەرگرین و لەوێوە بەرەو بەریتانیا بەرێ كەوین بۆ بەشداری كردن لە ڤیستڤاڵی بەدرخان بە بۆنەی ساڵرۆژی رۆژنامەگەری كوردستان و ئەنجامدانی چەند چالاّكییەكی ئەدەبی و هونەری و رۆژنامەوانی، جا لە سەفارەی بەریتانیادا داواتنامەی بەریتانیا لەگەڵ پاسپۆرتەكانمان هاوپێچ كردو تەسەلیممان كردو بۆ رۆژی دووەم وەرمان گرتەوە بە لیدانی ڤیزەكان و ڕەزامەندی سەفەر كردن كە بریتی بووین لەو چەند ئەدیب و رۆژنامەنووس و رۆناكبیرانە:

(كاكە مەم بۆتانی – فرید ئەسەسەرد – حمید ئەبوبكر بەدرخان – محەمەد موكری – دكتۆر نەبەز مەجید ئەمین – موحسین ئاوارە – كەماڵ غەمبار – قوبادی جەلی زادە – مەریوان مەسعود عەلی – كامەران عەلی

حەسەن – دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاویی – خالید جوتیار – ڕێبین محەمەد صۆفی – عومەر عەبدولکەریم محەمەدەمین.

بەڵام لەبەرئەوەی وەرزی گەشتیاریو عەتەلە بوو لەبەریتانیا ئێمەش ژمارەمان زۆر بوو، دوای هەوڵدانێکی زۆری چەند ڕۆژی بە هیچ شێوەیەك بلیتی فڕۆکەمان دەست نەکەوت دوای بە سەر کردنەوەی هەموو کۆمپانیە فڕۆکەوانیەکان لە عەممان، پارەی ئوتێلو هۆڵی ئاهەنگیش لە لەندن درا بوو، زۆر نا ئومێد بووین لەبەرواری ٢٠٠٨/٨/٢٠ شەو دەرچووین بۆ سوریا دیمشق بەڵکو لەوێ بلیتی فڕۆکەمان دەست کەوێ بۆ لندن، دوای ئەوەی لەوێش زۆرمان هەوڵ دا هەر ڕێك نەکەوت، ناچار لێکدابڕاین هەر یەکێکمان بۆ لایەك لە سوریا، من لەگەڵ کاك ڕێبین محەمەد صوفی کە خزمین لە دیمەشق / مساکن برزە / شوقەیەکمان بە کرێ گرت چەند ڕۆژێك لە دیمەشقماینەوەو پاشان گەڕاینەوە هەولێر.

٦ – دیسانەوە لەگەڵ دەزگای بەدرخان لە سەفەرێکی دی ئەمجارەیان بۆ سوید لەگەڵ چەند نووسەرو هونەرمەندێکی گەنجی شانۆیی لە ١/٤/ ٢٠٠٩ لە ئێوارەکەیدا لە ستۆکهۆڵم کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە هەبوو بۆ عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر لەو کۆڕەدا ئامادە بووین، شەو لە ماڵی بەڕێز هونەرمەند تەلار هیرانی ماینەوە زۆر خزمەتی کردووین لەو سەفەرەدا، بەیانی هەنەرمەندە گەنجەکانمان لەسەر شانۆدا چالاکییەکی جوانیان نمایش کرد بە چەند تابلۆیەکی شانۆیی کە جێگای خۆشنوودییو ڕەزامەندی کوردانی ڕەوەندو هونەرمەندانی سوێدی بوو، بەڕێزان سنوور زەکی هەناریو خەزورەکەی کاك نەوزاد عومەر ئاغا هاتنە ستۆکهۆڵم (منو حمید ئەبوبکر بەدرخانو خالید جوتیار) ئێمەیان بردە شارێکی دی لە سوید (ئۆبسالا) لەوێ لە ماڵی کاك سنوور ماینەوەو چەند ڕۆژێك

ڕێگایان پێ نەداین لەو ماڵە بڕۆین و زۆر خزمەتیان کردین و ئێمەیان لەو شارەدا گەڕاند، بەش بە حاڵی خۆم نازانم چۆن و بە چ سوپاسگوزاریەك ئەو ئەرك و خزمەتەی ئەو برایانەو خاوخیزانەکانیان پڕ بکەمەوە، هەروەها کە گەڕاینەوە ستۆکهۆڵم لەوێ دیسانەوە خوشکە تەلان هیرانی و رزگار شێخانی لە گەڵماندا بوون، دواتر هەمان گرووپ چوینە ئەلمانیا بە سەفەرێکی قۆناغ بە قۆناغ و بینینی شارو ولاّتانی تری هاوسنووری (سوید) بەم شێوەیە، ستۆکهۆڵم – مالومە – (دانیمارك)و لەوێوە بە کەشتی لە گەشتێکی زۆر خوشدا لە دورگەی هامبۆرك ئەلمانیا دابەزین، لەوێوە بە ئۆتۆبیس بەرەو (بەرلین) بە هەموو شارو شارۆچکەو گوندە جوانەکانیان گوزەرمان دەکرد قوناغ بە قۆناغ، لەبەرلین گیرساینەوە، پێویستە سوپاسمەندی و گەورەیی بەڕێز (زاهیر خۆشناو) لە یاد نەکەین کە خۆی یەکێك بوو لە ڕەوەندی کورد لە ئەلمانیا و برادەرمان بوو بەردەوام لەگەڵ ئێمە بوو بە خۆو ترۆمبیلەکەی لە هاتوچۆداو گەڕان بە نێو شاردا، دوای چەند رۆژێك روخسەتم لە گرۆپەکە وەرگرت و بە فڕۆکە گەڕامەوە سوید و دیسان کاك سنوور زەکی هەناری لە ستۆکهۆڵم پێشوازی لێ کردم و منی بردەوە ماڵی خۆیان و بە خۆو ماڵە براکانی زۆریان خزمەت کردم تا (بلیتی فڕۆکە)م بۆ ناردرا لە لایەن کچە خوشکم و هاوسەرەکەی کاك شەمال لە نەرویج و، چەند رۆژێك لەو ماڵەی کچە خوشکەکەم مامەوە ئەو شارەی ئەوان لێیی نیشتەچێ بوون ناوەکەیم لە یاد نەماوە لە نزیك (ئۆسلۆ) بوو، پاشان هەڤاڵ براکەی شەماڵ کە لە (ئۆسلۆ)واتە لە پایەتەختی نەرویج، تا هەفتەیەك ڕێگای پێ نەدام بڕۆم زۆری گەڕاندم و سوڕاندم لە ئۆسلۆدا، چاوم بە هەندێك لەو خزمانە دەکەوت و داوەتیان دەکردم، دوای ئەو چەند رۆژەی لە نەرویج مامەوە

دیسان گەڕامەوە سویدو لەوێوە هاتمەوە بۆ هەولێر، بە ڕاستی لەو سەفەرانەمدا بۆ ئەوروپا تێبینی ئەوەم کردووە کە خزمو برادەرو ناسیاوەکانی پەناهەندە کە لەوێن کاتی ئێمە دەبینن هێندە لەسەر پێ و لە خزمەت دەبن ئەگەر بڵێم شەرمەزارمان دەکەن.

٧ - بە بەشداریم لە نۆیەمین فیستیڤاڵی بەدرخانییان لە شاری (تبلیس)ی پایەتەختی کۆماری گورجستان (جۆرجیا) لە ڕۆژانی (٢١ - ٢٣)ی ئاداری / ٢٠١٢ بە هاوکاری (ماڵا ئێزدیا لە جۆرجیا) لە ژێر دروشمی (کەلتوور ئایندەی گەلانە) کە یەکەم ڕۆژ هاوکات بوو لەگەڵ جەژنی نەورۆز لە (هۆڵی کۆنسێرتی تبلیسی)بە ئامادە بوونی نوێنەری وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گورجستان و بالیوزی عیراق بەڕێز تەیب بەرواری و بەشداری بەرپرس و ئەندامانی ماڵا ئێزیدیا لە جۆرجیا و پتر لە (٨٠) مامۆستایانی زانکۆو ڕۆژنامەنووس و ئەدیب و میدیاکارو هونەرمەندان، فیستیڤاڵ دەستی پێکرد بە سروودو وتارو دواتر لە پانیلەکانی ترو ڕۆژەکانی بە لێکۆڵینەوەو شیعرو شانۆگەری مۆنادرامی و هەروەها گۆرانی و هەڵپەرکێ و جگە لە گەشت و گەڕان لەو شارەدا.. هتد ئیتر چۆن بە سێ پاسی گەشتاری لە هەولێرەوە چووینە تورکیاوە لە باکووری تورکیاوە بە قۆناغ ڕۆیشتین بە نێو ئەو سروشتە جوانەی شارو شارۆچکەو ناوچە شاخاوی و گەشتیارەکانی تورکیا بۆ نموونە هەر لە جزیرەوە تا ئاماد - ئاگری داغ - قارج - ئەرز ڕۆم..هتد تا نێو گورجستان، پاش چەند ڕۆژێك بە هەمان ڕێگا و خۆشنوودی گەڕاینەوە هەولێر. ئەو سەفەرە ئیحای قەسیدەیەکی پێ بەخشیم کە لە دیوانی (لە خونچەی دەم تەنگەوە تا گوڵێکی لێو پەڕ) ل ٩١ لە/ ٢٠١٨/ لە ژێر

ناونیشـانی (ئەلوەسـتەیەك‌و نیگایـەكی یـاقووتی بـۆ تـۆ جۆرجیـا) بـلاْوم كردۆتە وا بەشێكی لێ دەخەمە ڕوو:

جۆرجیا... جۆرجیا
من تۆم بینی بە جوانییەكی جیا جیا
كچ‌و كوڕە جوانەكانت لە شەوێكی شەڕابیدا
كراسە ڕەشەكانی شەویان ئەدڕی
تەسبیحە هیلاك‌و خەمەكانی ڕۆژەكانیان دەپساند
بە گۆرانییە سۆزدارەكانیان، لانكی شاریان دەهەژاند
تۆم بینی لە بەیانییەكی زەردباودا
وەك شەمامەیەكی خاڵدار لە نێو دەستەكانی (لێرمەنتۆڤ-)
كە بۆنی دەكردو بۆنە خۆشەكەی
هەموو جۆرجیا و موسافیرانی سەر مەست دەكرد
جۆرجیا.. جۆرجیا
زەمانی زوو ناوی تۆم دەبیست
ئەگەر یەكێ جوان بووایە
دەیانگوت ئەڵێیی گورجییە
ژنانی ولاْتەكەی من جۆرە قوماشێكیان دەكڕی
پێیان دەگوت (جۆرجێت)
دوای هەڵكشانی تەمەنێكم، دەرگەت لێ كردمەوە
باوەشت بۆ گرتم-ەوە
گورجیەكانی تۆم بینی، هەندێكیان بە گۆچان‌و چاویلكەوە
پیرو كەنەفت‌و ماندوو،

بەلأم هێشتا ئاساوەری سیمای جوانیان لێ دەتکایەوە
جۆرجیا.. جۆرجیا
تەواو ڕەباس نەببووم لە شیلەو شیلأوی هۆشبەرانەی جوانیەکەت
لەگەڵ هاوسەفەرەکانم بڕیارمان دا
سەبەتەیەك گوڵ لە باوەش کەین
بە خۆمان و گوڵەکانمانەوە ئاوا بین
بۆ ولأت و هەرێمێکی دی، هاوسنووری تۆ جۆرجیا
بۆ شوێنێکی مەستکارو پیرۆزمەند
بۆ بوخارەو سەمەرقەند
لەوێش کۆتکێ لەو شەڕابە ئاڵە یادئامێزەی
جەلالەدین ڕۆمی و سەهروەردی بنۆشین
لە پاڵ دیوارە دێرینەکانی پشوێ بدەین و دانیشین
بڵێین وا تۆشمان جێهێشت جۆرجیا
هەر ولأتێ، جوانی و بەرامی خۆی هەیە
ئەویان لە ئەمەیان جیا
جۆرجیا
جۆرجیا... جۆرجیا

٨ – ئەوەی تا ئێستا باسم کرد زیاتر سەفەرەکانم بوو بۆ دەرەوەی ولأت، بەلأم ئەگەر ئاوڕکیش لە باشووری کوردستانەکەی خۆمان بدەینەوە بەو سروشتە دڵڕفێنەی هەیەتی هەر لە تاڤگەو کانیاوو ڕووبارو ڕەزو باخەکان و چیاو شاخە سەرکەشەکانی بە تایبەتی کە لەو سالأنەی دواییانەدا بایەخێك زۆر باش بە ئاوەدانی و ڕێگاو بان و تونێل ناوچە

گەشــتیاری وجوانکاریــەکانی دەرە شــار دراوە چ لــە لایــەن حکومــەتی هەرێمی کوردستان یان لە لایەن خەڵکەوە، هەروەها دروستکردنی سەدەها کۆمەڵگــەی نیشــتەجێیی و ئــوتیلی گەشــتیاریی و ترفیــك و خزمــەتگوزاریی زۆرو هاتنی گەشتیاران لە ڕێگای کۆمپانیەکانی گەشتیاریی و ئاسانکاری کردن بۆ حەوانەوەیان بە قسەی عەرەبەکان کە دەڵێن (شمال جنە) واتە کورسـتان بەهەشـتە، لـەو دواییانـەدا زیـاتر سـەفەر بـۆ شـارو شارۆچکەو گونــدو دێهاتــەکانی کوردســتانەکەی خۆمــان دەکــەم، جــا یــەك لــە بیرەوەرییــەکانم کــە قــوڕگمی نوســاند بــووو گریــانی لــێ گــیر ببــوو کــاتی (هیران) لـە ناوچەی خۆشـناوەتیم بینـی کـە لـەوێ پێشـمەرگەو مامۆسـتای شـۆڕش بـووم لـە ١٩٧٩ دا، ئـەوکات تەمـەنم (١٧) سـاڵان و لـە ئـەوجی گەنجایــەتی بــووم، ئــەو شــوینەی لێــی دەخــەوتم و قەتابخانەکــەو ڕەزو باخەکانی و بارەگاکان و ئێواری دابەزینم بۆ پیاسـەیەك هـەمووی وەك فیلم دەهاتەوە بەر چاوم، هیرانم بینیەوە لە ساڵی (٢٠١٢) بۆ گەشت و سەیران بە خاوخێزانەوە چوو بووین کە ببوو بە شارۆچکەیەکی گەشتیاری واتە نێــوانی تەمــەنی ئەوســام و ئــەو کاتــەی ســەفەرەکەمان بــۆ ئــەوی جیاوازییەکەی (٤١) ساڵ بوو، جا ئەوەی لێرەدا مەبەستەمە بیڵێم لە نیو ئـەو شارۆچـکەیە جوانـەدا بینـیم گـەنجێك گیتـارێکی لـە شـان کـردووە، خەیاڵم بۆ ڕۆژانی ئەوسا ڕۆیشت کە تفەنگێکم بە شانەوە بوو، کت و پڕ خۆم بووم بە کەسی دووەم لەو شیعرەدا کە لە ل ١٠٤ / دیوانی عەترێکەو لە نەوەی گوڵخانە / ٢٠١٩ هەولێر بە چاپم گەیاندووە بڵاو بۆتەوە واتە تفەنگ بووە بە گیتار کەتیایدا دەڵێم:

**لێره ئاساوەری هەمان قوته خانووی دامێن شاخ**
**ئاساوەری هەمان ڕەزو باخ**
**لەسەر گۆپەكەی ئەوێ بەرزایی**
**ئلساوەری سەنگەرو شوورەی سەنگچین**
**ڕێ هەمان ڕێ، بۆ سەركەوتن هاتنه خوارەوه**
**هەمان وێنەیەو تفەنگم به شانەوه**
**كەچی ئێستا ئەم ناوچەو هەواره**
**سەیرانگەیەو هاوینه هەواره**
**نازانم تفەنگەكەم چی به سەر هاتووەو له كوێیه**
**ئەوتا له جیاتی ئەو تفەنگه**
**گیتارێكم به شانەوەیه، لەم جێو ڕێیه**

٩ – لێرەدا كۆتایی به باسكردنی ئەو سەفەرانەم دەهێنم هەر چەنده به تەنیا یان لەگەڵ هاوسەرەكەم چەند جارێك سەفەرمان كردووه بۆ ئێران‌و بینینی هەموو شاره گەشتیاریەكانی شیماڵی ئێران‌و پایەتەختەكەی (تاران) زۆربەی شارەكانی دی ڕۆژهەڵاتی كوردستان‌و ئازەری‌و باشووری ئێران‌و..هتد، هەروەها توركیاو به هەموو شاره گەشتیاریەكانی به باكوری جوان‌و دەلالی كوردستانیشیەوه، من بۆ خۆم زیاتر له (٤٠) جار هەر دوو مانگ یان سێ مانگ جارێك به تەنیا یان لەگەڵ هاوڕێكانم سەفەرم كردووه بۆ توركیاو شارەكانی، هەڵبەته بیرەوەری‌و سەربردەی زۆرم له لایه بیگێڕمەوه بەڵام بوارەكەی هەر هێنده دەگونجێ كه لەسەرەوەدا باسم كردووه، ئەو عەوداڵیەو پەرۆشیەم بۆ سەفەر پێم وایه بۆ ئەو زوڵم‌و فشاره دەگەڕێتەوه كه پێش ١٩٩١ له لایەن ڕژێمی عیراق‌و

بەعس چوونە دەرەوەی وڵاتم لێ قەدەغە کرا بوو، بۆیە وەك حاڵەتێکی دەروونی پاڵی پێوە ناوم کە خۆم قەرەبووی ئەو ستەمە بکەمەوە، دەکرێ پێم بڵێن ئەی پارەی ئەو هەموو سەفەرانەت لە کوێ هێناوە، ئەوەی ڕاستی بێت زۆربەی سەفەرەکانی ئەورووپا زیاتر لەگەڵ گرۆپی دەزگای بەدرخانیان بووە کە زۆربەی مەسرەفەکانی بۆ دابین کردووین، هەروەها بۆ خۆم‌و خاوخێزانم تا ئێستا ئەو خووو ڕەوشتەمان هەیە نازانین پارەو زێڕو موڵك کۆ بکەینەوە، پەنجەرەکانی خانووەکەمان بێ شیش‌و ڕایەڵی کەتیبەیە، ئەگەر دزێکیش بیەوێ خۆی لە ماڵمان کات هیچی دەست ناکەوێ لە پارەو خشڵ‌و شتێکی بەهادار چونکە سەفەر لە لای ئێمە پێش هەموو پاشکەوتێکە.

## چەند ڕووداوێکی کارەسات و وێرانەیی
## کە مێژوو تۆماری کات

١ - سەرهەڵدانی داعش و تاوانە بێ ژمارەکانی لە عیراق و سوریا بە گشتی و لە کوردستان بە تایبەتی، تەقینەوەکانی بێ ئان و سات و سەرەڕۆیانەی کە لە لای ئەوان گرنگ ئەوە بوو مرۆڤ- قڕ بکەن و هەموو شوێنگە جوانەکان وێران کەن لە ژێر دروشمی ئیسلام و خواوەندی مەزن، بە هەزاران شەهیدو مێرخاسی لێ خستینە ژێر خاك و دەیان شارو شارۆچکەو گوندی لێ وێران کردین، هەر چەندە پێشمەرگەو شەرەڤانانی قارەمان بە پاڵپشتی هێزی هاوبەشی نێودەوڵەتی ئەمەریکاو ئەورووپا قڕیان کردن بەڵام ئاساواری تاوانەکانیان لە رادە بەدەر بوو، یەکێك لە هێرش و ستەمکارییەکانیان بۆ نموونە:

لەبەرواری ٣ - ٤ /٨ /٢٠١٤ ئەو کارەساتەی شەنگالێ بوو کە هێرشیان کردە سەر ئێزیدیەکان و تاوانی کۆمەڵکوژی و جینۆسایدیان ئەنجام دا بە کوشتنی پیاوەکانیان و بردنی کچ و ژنەکانیان وەك دیل و جاریەو سەبایەو هەتك کردن و فرۆشتنیان، هەروەها ڕهێنانی منداڵەکانیان لەسەر چەك و ئەنجامدانی تاوان و وەرگەڕاندنیان لە دین و مەزهەبی خۆیان بۆ سەر دین و پەیڕەوی هزری داعش و دینی ئیسلام، کارەساتەکان بە گشتی کاری تێکرد بوون بە چەند کۆپڵە شیعرێك دابکەوێتەوە بۆ نموونە ئەو کورتیلە

شیعره له دووتوێیی شیعرەکاندا که له دیوانی چاپکراوم (عەترێکەو له نەوەی گوڵخانه) له ۲۰۱۹ لاپەڕە (۱۱٥) دا هاتووه تیایدا دەڵێم:

**(شەنگاڵ)**

**پیاوەکانیان لەبەر دەم ژن و منداڵەکانیاندا، گولله باران دەکرێن**
**کچ و ژنانیان بە تاڵان دەبردرێن**
**وەك ئەوەی پیاوەکانیان**
**شتێکی نامۆی تەڕەو قوڕس بن بە سەر لقی درەختێکەوە**
**درەخت بە خۆیەوە نەیانگرێ**
**کچ و ژنانیان وەك ئەوەی ڕێبوارێکی برسی بۆنی نانی برژاو بکات و بیدزێ و بە حەلاڵی بزانێ**
**ئاوا زەواجی جیهادی (نکاح)یان پێدەکرێ**
**ئەمە چیرۆکێکی تراژیی و حەقیقەتە، نەك خەیاڵی**
**چیرۆکی پیاوو ژنانی شەنگاڵی!!!**

۲ – بەروارێکی دی شووم و کارەساتبارو خەمێکی قورس و گەورە ئەویش له ١٦/ ١٠/ ۲۰۱۷ بە چاوپۆشی ئەمریکا و بەریتانیا، بە کۆدەتایەکی دەرەکی دەوروبەری باشووری کوردستان و هێرشی حەشدی شەعبی و سوپای عیراق بۆ سەر کرکوك کە زیاتر له (٤٠) شەهیدی پێشمەرگەی قارەمانی یەکێتی نیشتمانی لێ کەوتەوە بەڵام دواتر زانرا هێرش و کۆدەتایەکی لەبەرگری کردن و خۆ بە کوشتدان و وێرانێکی له ڕادە بەدەرە بۆیە مەیدانی بەرنگاریان چۆڵ کرد، کرکوك کەوتەوە دەست حەشدی شەعبی و ڕژێمی عیراق، هەروەها داقوق و دووزخورماتوو و دوبزو

مەخمووڕو زوماڕو شەنگاڵ دەشتی موصل..هتد، ئەوەی ڕاستی بێت بە تەمای ئەوە بوون هێرش بۆ ناو هەولێریش بهێنن، بەڵام لە پردیّو سحێڵە لە لایەن هێزی پێشمەرگەو پارتی شکستیان پێهێناو ڕایانگرتن، لە دوای ئەو بەروارەیشەوە تا ئێستا لە کرکوك‌و ئەو شارو شارۆچکانەی لەسەرەوەدا ناوم هێناون بە گوندەکانی دەوروبەریانەوە، ڕژێمی عیراق‌و حەشدی شعبی‌و ڕەگەزپەرستانی عەرەب بەردەوامن لە دەربەدەر کردنی کوردان‌و نیشتەجیّ کردنی عەرەب‌و جێبەجیّ کردنی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەو گۆڕینی دیموگرافی ناوچەکان.

٣ - کارەساتێکی دی گەورە لە ٣ / ١٠ / ٢٠١٧ کۆچی دوایی (مام جەلال تالەبانی) بوو کە هەموو عیراق بە گشتی‌و کوردستان بە تایبەتی بۆشاییەکی دەسەلاٌداری‌و تەبایی‌و ڕێکخستنەوەی لا تەراز بوو (صمام الامان)و تەکبیرکارو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدارێکی گەورە لە دەست چوو، داخێکی گران بوو، ڕۆحی ئارام‌و شادبێت.



لە ڕاستەوە: ڕێبینی کوڕم، موحسین ئاوارە، ڕەوەزی کوڕم









ڕەشید ئەحمەدی باوکم لەگەڵ هەرسێ کوڕەکەی

(جەلال، موحسین، تەحسین)



۲۰۱۹/ هوتێلی چوارچرا (لەگەڵ هەلەزی کچم)



ئاداری ۱۹٦۹ (موحسین ئاوارە بە تەنیا)

نەورۆزی ۱۹۷۰/ لە راستەوە: کانەبی مستەفا، م. ئاوارە، مەحموود

راوەستاوەکە: پێشمەرگەیەك، دانیشتووەکە: تاهیر گۆمەشینی




**دوو وێنەو دوو زەمەن**

**وێنەی یەکەم لەڕاستەوە: بەندە لەگەڵ شلێرخانی هاوسەرم ١١/١١/١٩٨٣**

**وێنەی دووەم: لە ساڵی ٢٠١٩ گیراوە.**



٢١/٨/١٩٨٦- دایکم، شلێری هاوسەرم، دوو کوڕەکەم



٢٠١٩ تورکیا- ئەستنبۆڵ

موحسین ئاوارە



١٩٦٩ هيران
رۆژگاری
پێشمەرگایەتی



١٨/٣/١٩٧٧ هەولێر –هۆڵی گەل (لە کۆڕێکی شیعریدا)



١٩٧٠/٤/٧

راوەستاوەکان: ئازاد حەمە گەمحان، کانەبی مستەفا

دانیشتووەکە:موحسین ئاوارە



**٢٠٢٠ لە کۆڕێکی ئەکادیمیای کوردی**



**ت ٢/ ٢٠٠٨ سلێمانی هۆڵی دیالۆگ**

**لەگەڵ کۆمەڵێ نووسەرو ڕووناکبیر**



٢٠١٩ توركيا- ئەستەنبۆڵ (موحسین ئاوارە)




هەولێر- بارەگای لقی هەولێری یەکێتیی نووسەرانی کورد

لەگەڵ میوانانی رۆژهەڵات




٢٠٠٤/١٢/٤

لەگەڵ کۆمەڵێ شاعیرو نووسەری شاری هەولێر



جۆرجیا – مۆزەخانەی ستالین ٢٥/٤/٢٠١٢




**ماڵی کاک کۆسرەت**

**لەگەڵ کۆمەڵێ نووسەرو شاعیری هەولێر**

## ملتقى الرواية الكردية -دهوك٢٠١٢



**دهۆك ٢٠١٢ لەگەڵ کۆمەڵێ شاعیرو نووسەر**



**٢٠١١/٥/٦ کۆیه**

**له راستەوە: سەعدوڵلا پەرۆش، محەمەد موکری، فەرید زامدار، ئاوارە**



**١٩٦٨/٣/١٥ گەشتی قوتابیانی ئامادەیی هەولێر بۆ بەستۆڕە**




**٢٠٠٧/٤/٢٦ ئەڵمانیا- بەرلین**

**لە راستەوە: موحسین ئاوارە، زاهیر خۆشناو، خالید جوتیار**



**١٩٧٦/٥/١٢ گازینۆی سەفین لە هەولێر**

**لە راستەوە: مەولود ئیبراهیم، ئاوارە، جەوهەر کرمانج، جەلال بەرزنجی**



میوانانی کۆنفرانسی بەدرخان لە بەرلین لەبەردەم پەرلەمانی ئەڵمانیا ٢٢/٤/٢٠٠٧




٢٠١٢/٤/٨

لەگەڵ عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیردا



نیسانی ٢٠٠٩

نەرویج- ئۆسلۆ



٢٠٠٧/٤/٢٥ ئەڵمانیا – بەرلین

لە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەدا



سوریا- لازقیه ٢٤/٦/٢٠٠٤



١٩٧٦ماڵی سامی شۆڕش

لە ڕاستەوە: ئاوارە، نەژاد عەزیز سورمێ، محەمەدەمین دهۆکی، کەمال میراودەڵی، شێرکۆ بێکەس



میسر/ قاهیره- گۆڕەپانی تەحریر (مۆزەخانە) ٢٥/٤/٢٠٠٨

لە راستەوە: رەهبەر سەید برایم، سمکۆ ئەنوەر، خالید جوتیار، ئاوارە



سلێمانی- دوکان ٢٠٠٤

لەگەڵ بەڕێز مام جەلال



شەقلاوە ١٩٩٢ لەگەڵ د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ



هەولێر- هۆڵی گەل ٢٤/٨/١٩٧٣ لە كۆڕێكی شیعریدا



سۆلاف ١٩٩٥/ لەگەڵ كۆمەڵێ شاعیرو نووسەردا



ئەڵمانیا- بەرلین ٢٥/٤/٢٠٠٧



هەولێر- عەنکاوە

لە راستەوە: عوسمان موفتی، فەلەکەدین کاکەیی، جەمیل عیسا، عبدالغنی علی یحیی، موحسین ئاوارە





**١٩٧٤/٢/١٨ پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایان- هەولێر**

**لە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەدا**



مەهاباد ١٩٧٥ دوای نسکۆی شۆڕش

وێنەکان لە راستەوە: برهان عەلی، عەلی رەسول، ئاوارە/ رەشید، ئاوارە، نەوزاد محەمەد عەلی، عەلی رەسول



١/١٢/٢٠١٤ لە راستەوە: ئاوارە، عەدنان موفتی، مەدحەت بێخەو



١٨/٧/١٩٧٠ ناوپردان

له راستەوە: عەدنان موفتی، کەنعان موفتی، ئاوارە




**٢٠ی کانوونی یەکەم ٢٠١٨**

**یەکەمین دیداری هاوچەرخ**




**مالّی خەسرەو جاف ٢٠١٨**

**لە راستەوە: عەباس عەبدوڵلا یوسف، مەسعود پەرێشان، پیرداود مەخموری، ئاوارە، خەسرەو جاف، عەبدولرەحمان فەرهادی، نەوزاد رەفعەت**